## لەم ژمارەیەدا

### ● لێکۆڵینەوەی رامیاری:



### ● مێژوو:



### ● زانست:



### ● لێکۆڵینەوەی ئەدەبی:



### ● لێکۆڵینەوەی زمانەوانی:



### ● مۆسیقا:



### ● کەلەپوور:



---

وێنەی بەرگ:
پەنجەرەکانی خانووی حاجی سەعیدی تووتنچی لە سلێمانی
مامۆستا (عبدالرقیب یوسف) ناردوویەتی.

رۆشنبیری نوێ
حوزەیرانی ١٩٨٨
ژمارە ١١٨

گۆڤارێکی وەرزانەی لێکۆڵینەوەیە
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات



ناونیشان

دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
وزیریە تەنیشت المعهد القضائی ت٤٢٥١٨٤٦

# بە بۆنەی تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر شۆڕشی ١٧ - ٣٠ی تەمووزی نەمر

## شۆڕش و . .
## ڕەوت و . .
## بەخشندەکان

نەوزاد سورچی

●

بەرلەوەی باس لە سەرەتاکانی شۆڕشی ١٧ - ٣٠ی تەمووزی مەزن بکەین و باسی سەرەتاکان و سەرکەوتنەکانی شۆڕش بکەین، دەبێ بۆ یادێکی تری نەمر سەری ڕێزو نوازشت دابنەوێنین، ئەویش یادی ئەو ڕۆژەیە کە سەرۆکی بەڕێز، سەرکردەی قارەمان صدام حسین - خوا بیپارێزێت - پلەی یەکەمی سەرکردایەتیی شۆڕش و حزب و دەوڵەتی وەرگرت. . جا
ە یادی ئەم ڕۆژە پیرۆزەدا دەبێ یادی ئەم دەورە مێژوویی یە بکەینەوە کە ئەو قارەمانە هەڵکەوتووە گێراویەتی بەر لە شۆڕش و دوای شۆڕش، کە مامۆستاو بنیات نەرو ئەندازیارو کەشتیوانی کەناری سەلامەتی بووە بۆ گەلی عیراق و بۆ نەتەوەی عەرەب. .
بەم جۆرە سەرۆکی سەرکردە ڕابەری هەموو دەستکەوت و هەنگاوە مەزنەکانە کە ئێمە بەکورتی لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەست نیشانی دەکەین.

بیست ساڵ لەمەوبەر، پاش سەدان ساڵی ئێش و ئازارو نەهامەتی و ژێردەستیی شاڵاوی بێگانە. . . دوای سەدان ساڵی هەڵمژینی تاڵاوی تاریکی و دواکەوتن و ئەشکەنجەو بێهیوایی. . . دوای سەدان ساڵی بزربوون و داپچڕاوی و پەرش وبڵاوی لە سێبەری قوڕسی بێگانەدا، لەو سەردەمە تاریکەدا کە تاڵاوی دواکەوتن و بێهیوایی لەلا لێوی گەلە مەزنەکەمان دا دەمەیی، دوای ئەم نەهامەتی و ئەشکەنجەو تاریکی یە، شۆڕشی ١٧ - ٣٠ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ کە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست سەرکردایەتی کردو سەرکەوتووانە تەقاندی یەوە هاتە مەیدان بۆ ئەوەی سەرەتای سەردەمێکی تازە لە ژیانی عیراق و خەڵکی عیراق دا دروست بکات، بۆ ئەوەی ڕێگایەکی فراوان تەخت بکات لەبەردەم بینای شۆڕشگێرانەی یەکێتی خوازی بەهێزی عیراق دا تا ببێ بە بازوویەکی ئاسنینی زەبروەشێن و لێهاتووی هەڵ گرتنی ئۆباڵی مێژوویی نەتەوەیی و نیشتمانیی خۆی تا وا بکات نەتەوە پێبنێتە زەمینەیەکی پێشکەوتنی وەها کە لەمەوە ئامانجە ڕزگاری یەکانی خۆی بەدی بهێنێت و پێویستی یەکانی یەکێتی نەتەوەیی دابمەزرێنێت و گەشانەوەی کۆمەڵایەتی و شارستانانەو ڕاستیی بهێنێتەدی.

تەمروز

مانگی شۆڕش و ئاهەنگ گێران

لە چواردەی تەمووزی ئەمساڵمان دا ٣٠ ساڵ بەسەر شۆڕشی ١٤ی

تەمــووزی پیــرۆزی ساڵی ١٩٥٨دا تێدەپــەڕێو لە ١٧و ٣٠ی تەمــووزی ئەمســاڵەش دا بیــت ساڵ بەسەر شۆڕشە مەزنەکەی ١٧ ـ ٣٠ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨دا تێدەپەڕێ.

ئەوەی ئاشکــرایــەو ڕوونــە هەر دوو شۆڕش، شۆڕشی ١٤ی تەمــووزو شۆڕشی ١٧و ٣٠ی تەمووز، بۆ سەربەستیو ڕزگاریو ژیانێکی خۆش و پڕ لە بەختەوەری بەرپابوون. بەڵام ئەوە بوو، شۆڕشی یەکەم لەبەر چەند هۆیەك ئامـانجـە سەرەکی‌یـەکـانی گەل و ئاواتە مەزنەکانی وەدی‌نەهێناو ئەو کەسانەی شوێنی پیــاوەکــانی ڕژێمی پاشــایــەتیـان گرتــەوەو لەســەر تەخت و کورسی جێگیربوون و دەســەڵاتیان وەچەنگ کەوت، نەك هەر ئارەزوو و ئاواتی گەلیان جێبەجێ نەکردو پشت گوێیان خست، بەڵکو سیاسەتێکی پڕ لە دڕندایەتیی ئەوتـۆیـان بەکـارهێنـا کە کاربــەدەســتانی پێشــووش بیــربــان لێ‌نەکردبووەوەو بەخەیاڵیان دا نەهاتبوو.

کاربەدەستانی نوێ لە ئامانجە پیرۆزەکانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ئەمرو ڕێبازە پێشکەوتن خوازەکەی لایان داو دەستیان بە لێدان و ئازاردانی خەڵکی کردو بەر لە هەموو شتێکی، پەلاماری پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالــستیان داو گەلێکیــان لە ئەنــدامــان و لایــەنگیـرانی ئەم پارتــە کۆڵ نەدەرە گرت و کـوشــت و خستــە بەنــدیخــانــەو ژێـر چەشنــەهـا ئازارو سزادان. سەرۆکی تێکــۆشــەریشمــان هەڤــاڵ «صــدام حسین» خوابپـارێـزێ ڕووبــەڕووی کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی بوو و تووشی گەلێ ئەشکەنجەو ئازار هات و ئازایانەو دلێرانە باجی ســەربەستیو ئازادی ـ دا.

بەڵێ. پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیــالــست، زیــرەکــانــە کاربــەدەستــە ســەربــازی‌یــەکــانــی ڕســوا کردو تێکــڕای گەلــی هان دا بۆ ئەوەی دژی دیکتــاتــۆریــەتی ســەربــازی تێبکـۆشێت و خەبـات بکات. بەعس سەری بۆ دیکتــاتــۆریــەت نەنـوانـدو تۆزقــاڵێـك لە ســیــاســەتە شۆڕشگێڕی‌یەکەی خۆی لای‌نــەداو ئەم هەڵــوێستــەشی بوو بە جێگــای ڕەزامــەنـدی هەمــوو خەڵکی بەشەرەفی عیراق، ئەوانەی تەواوی بڕوای خۆیانیان بە ڕۆڵی بەعــی هێناو بە نهێنیو بە ئاشکراش پاڵپشتی خەباتی ڕەوای پارتیان کرد، هەرچەندە پارتی بەعــی لە ڕۆژی دامەزراندنی‌یەوە شێرانە دژی نۆکەرانی ئیمپریالیزم خەباتی کردووەو جەنگاوە.

بەر لەوەی شۆڕشــی ١٧و ٣٠ی تەمــووزی ساڵــی ١٩٦٨ بەرپــابــێو ســەرکــەوتــنــێکی مەزن بە سەرکــردایــەتی پارتی بەعس و هەوڵ و کۆششی تێکۆشەر هەڤاڵ «صدام حسین» وەدەست بهێنێ، عیراق و گەلەکەی لە بارو زروفێکی ناڵەباردا دەژیان و ئاغاکان و پیاوەکانی ســەردەمی پێشوو سەرلەنوێ ســەریان بڵند کردبوو و بزاڤ و جموجووماڵی گومان لێکراویان ئەنجام دەداو نەخــۆێنــدەوارییو دواکــەوتن و نەخــۆشی هەروەکــو جارانی پێشــوو مابــوونەوەو مەسەلەی دیموکراتیەت و کێشەی کوردیش ئاڵۆزتر ببوو و کۆمپانیا نەوتی‌یەکانی سەر بە ئیمپریالیزم بە سەربەستی نەوتی عیراق و سامانەکانی تریشیان بۆ خۆ دەبردو ڕادەکێشا. لەگەڵ ئەم بارە ناڵەبارەش دا گرتنیو کوشتنی نەیارانی ڕژێم بەتایبەتی گرتن و کوشتنی ئەندامانی پارتی بەعس بەردەوام بوو.

کاربــەدەستــان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرژەوەنـدی ئیمپـریالیزم و کۆنەپەرستان و نۆکــەرانیــان دەچــەسپــانـدو سیاسەتی دەرەوەشیان سوودی بە دوژمنانی گەل و نەتەکەوە دەبەخشیو بەرژەوەندی دوژمنانی گەلیان لە عیراق و لە ناوچەکەدا قایم دەکرد.

لەو ســەردەمــەداو لەبــەر ئەو هۆیــانــەی باسمان کردن، تەنها پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالــست بۆی هەبوو، وەك پارتێکی شۆڕشگێڕو دڵسۆز بۆ گەل و نەتــەوەو لێپــرســراو بەرامبــەر چارەنــووسیان، شۆڕشێکی مەزن ڕێك بخات لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨دا، شۆڕشێکی سپی ئەنجام بدات. شۆڕشەکە سپی بوو، تا ڕادەیێك دۆست و دوژمن سەریان لە پاك و خاوێنیو عەدالەتی سوڕما بوو و، ئەم شۆڕشە سپی‌یەش لە ڕۆژانی یەکەمی هاتنی پارتی بەعس بۆ سەر حوکم، مرۆڤــایــەتیو یەکــسانیو پارتی بەعسی پیشــان دا، بەعــس سەرلــەنــوێ لاپــەڕەیێکی نوێی بۆ هەمــوو عیــراقی‌یــەکــان کردەوەو مرۆڤی عیراقیی بە گەورەترین و بە نرخترین سەرمایە دانا. ڕاستە، تەنها یەك دڵۆپە خوێنیش لەم شۆڕشە سپی‌یە مەزنەدا نەڕژا، دڵی کەسیشی نەشکاندو هەست و نەستی کەسیش بریندار نەکرا. بگرە هەتا ئەو کەسانەی کاتی خۆی ئازاری بەعسی‌یــەکـانیـان دابـوو، لێیــان بووردراو وەك مرۆڤێکی سەرلەنوێ لەدایك بێ تەماشا دەکران و مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکرا.

گرینگترین ئەرکێك دووچاری هەر شۆڕشێکی پێشکەوتنخواز دەبێت کاتێ کە دەســەڵاتی سیــاسی دەگــرێتــە دەست ئەرکی چەسپــاندنی دەســەڵاتەکەیەو پاراستنیەتی لە پیلان گێڕانی دوژمنان و کۆنەپەرستان.

شۆڕشــی ١٧ ـ ٣٠ی تەمــووزیش هەروەکــو هەمــوو شۆڕشــە پێشکــەوتنخــوازەکــان لە ســەرەتــای بەرپــابــوونی‌دا دەستی کرد بە چەسپاندنی دەســــەڵاتی شۆڕش و زامن کردنی سەر کردایــەتیی ڕاستــەقینــەی پارت. ئەم کارەش کارێکی وا ئاسان و ئاسایی نەبووە لەبەردەم شۆڕش دا بەڵکو ڕەوتێکی ئێجگــار ســەخت و ئاڵــۆز بووە، ئەوە بوو شۆڕشی تەمــووز هەر لە ســەرەتــای بەرپــابــوونی‌یــەوەو ســەرکــەوتنی بەسەر پیرۆی کۆنەپەرستی عارفی‌دا دەستی بە چارە سەرکردنی بارودۆخی سیــاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری کرد، دوا بە دوای ئەوە دەست کردن بە چارەکردنی هەموو ئەو بارو دۆخانەی کە تووشی وڵات و میللەت بوویــوون پێش بەرپــابــوونی شۆڕش، بە گوێــرەی نەخشەیێکی وردو زانستانەو شۆڕشگێڕانە بۆ ئەوەی ئیتر دەرفەتی پیلان گێڕان و کۆنــەپــەرستــان نەدات جارێکی‌تــر خەیــاڵی ئەوە بکــەن کە بتــوانن شۆڕش لەنــاوبــەرن و گەل و نیشتمــان سەرلــەنــوێ بخەنەوە ژێر باری نەهامەتیو ژێر ستەم و چەپۆکەی بیگانەو دەربەگایەتی‌یەوە.

شۆڕشی تەمــووز، شۆڕشێکی ئاســایی نەبــوو کە تاقمێــك لەسەر کورسی حوکم لابـبــرێت و تاقمێــك نوێ بێتــە جێگـــایــان، بەڵکــو شۆڕشێــك بوو لە ناوجــەرگــەی زروفێکی ســەخت و ئاڵــۆزو پڕ تەنــگە و چەڵــەمــەوە بەرپــابوو کە وڵات و میللەتی پێدا دەڕۆیشت بە دەست کۆنەپەرستانەوە، بۆیە دەبوایە پارت

که سەرکردەو راپەڕێنەری ئەم شۆڕشە مەزنە بوو دەسەڵاتی شۆڕشگێڕیو سەرکردایەتی‌کردنی پتەو بکردایەو روویەڕووی گیروگرفتە نیشتمانیو نەتەوەیی‌یە بنەڕەتەکان و ئەرکەکانی گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕی ببوایەتەوەو پیلان و مەترسی‌یەکانیشی لە شۆڕش دووربخستایەتەوەو ڕێگای شۆڕشگێڕانەی تایبەتی خۆی بگرتایەتەبەر.

شۆڕشی تەمووز لە ناوەڕۆك و مەبەست دا شۆڕشێکی ڕزگاریخوازی دیموکراتی سۆشیالستیی یەکگرتن خواز بوو و بەردەوامە لە وەردیهێنانی ئەو نەخشە وردو زانستانەی بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەم لایەنانەی دای‌ناوە، بۆ ئەوەی تەواو ڕێگا لەبەردەم ڕاپەڕاندنی ڕەوتی ئەو بەرنامەو پەیرەوە فراوانانەی دای‌ناون خۆش ببێت و بە زووترین کات، عیراقی نوێ دروست بکات.

**دەسکەوتەکانی شۆڕش و**
**پیلانی دوژمنان**

کورتە باسێکی ئەو دەسکەوتە مەزنانەی شۆڕشی ١٧ ـ ٣٠ی تەمووزی نەمر بۆ گەلی عیراقی نوێی وەدەست هێناون، ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم شۆڕشە نەك تەنیا لە قەبارەوە پێشکەوتووەو پێ‌گەییوە، لە چەشن و ناوەڕوکیش دا لە پێشکەوتن و پەرەپی‌دان و گەشەسەندن بەردەوامە. وەك شۆڕشێکیش لە ئەنجام دانی بەرنامە شۆڕشگێری‌یەکەی بەردەوامە بۆ بنیاتنانی تاقیکردنەوەیەکی نموونەیی لە ڕێڕەوی چوارچێوەی چەسپاندنی ئاسۆدەری یەکگرتنی تەواو لە نێوان بیرو باوەڕو پێویستی‌یەکان و جی‌بەجێکردنی هەل و مەرجی هەر قوناخ و بارو دۆخی خودیو مەوزوعی‌یەوە.

مەبەستمان لەم باسەدا بە سەرکردنەوەو هەڵ سەنگاندنی ئەو دەسکەوتە مەزنانە نی‌یە کە شۆڕشی گەل وەدی‌هێناون، بەڵام بە کورتی ـ بە تایبەتی کە سەرەکی فەرمانده (صدام حسین) خوابیپارێزێ ئالای ئەو شۆڕشەی هەڵ گرتووە، بەم جۆرەی خوارەوە دەتوانرێ سەیری دەسکەوتەکان بکرێ:

- سەربەخۆیی سیاسی
- خۆماڵی‌کردنی نەوت و گەڕاندنەوەی سامانی گەل بۆ گەل.
- جێ‌بەکردنی کێشەی کوردو دانی خۆڕێبەری (حکم ذاتی)
- دامەزراندنی بەرەی نیشتمانیو نەتەوەیی پێشکەوتنخواز.
- چارەسەرکردنی بنەڕەتانەی کشتوکاڵ
- پێش‌خستنی پیشەسازیو کردنی وڵات بە بنکەیەکی پتەوی پیشەسازی.
- خوێندنی ئەوزیمیو قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواریو خۆڕایی‌کردنی خوێندن.
- دەست گرتن و پتەوکردنی شۆڕشی فەلەستین.
- بەهێزکردنی سوپا بە باشترین چەکی تازەو مەشقی نوێ.
- بووژاندنەوەی بازرگانی.
- دەسکەوتە گەورەکانی تایبەت بە کەرتی لاوان و ئافرەتان.
- بڕیارە مەزنەکانی گۆڕینی باری کۆمەڵایەتی
- پتەوکردن و کردنی وڵات بە بنکەیەکی بەهێزی کشتوکاڵی ـ پیشەسازیو پشت بەستن بە توانای ناوخۆ.
- دانانی نەخشەو بنچینەی نەگۆڕاو دەربارەی دیارکردنی جۆرو چۆنیەتی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی عەرەب و جیهانی سێ‌یەم و دەرەوە.
- پاڵپشت گرتنی گشت بزووتنەوەکانی ئازادیخوازی جیهانیو... سەدان پرۆژەو بڕیاری مەزن و نەخشەی گۆڕانکاریی بنەڕەت و سەرتاپاگیری.

**سەرەکی فەرماندەو... خۆڕێبەریی کوردستان**

---

هیچ گومانی تێدا نی‌یە کە بەڕێز سەرۆکی فەرمانده (صدام حسين) خوابیپارێزێ وەستای داڕێژەری بەیاننامە مێژوویی‌یەکەی ئادارەو خاوەنی ئەو باوەڕە بلیمەت و مەوزووعی‌یە بوو کە جورئەتی مەبدەئیانەو باوەڕی تەواوی بە مافی گەلی کورد لە خۆڕێبەری‌دا، خۆڕیبەری بۆ خەڵکی کوردستان هێنایەکایەوە. بۆیە هێنانەدی خۆڕێبەریو تێ‌گەیشتنی تێ‌کۆشانی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لە پێناوی‌دا، ڕەنگ دانەوەی بیری خولقێنەرانەی صدام حسين ـ ی سەرکردەیەوە، لە کانگایەکەوە هەڵ قوڵاوە کە لە غەیری خۆشەویستی عیراقی کوردو عەرەب بەو لاوە هیچ شتێکی‌تری تێدا نی‌یە، خۆشەویستی‌یەکی ئەوەندە گەورەو دڵسۆزانە کە هەموو ئارەزوویێکی دژ بە بەرژەوەندی‌یە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵانی خەڵکی عیراقی لەناو دەچێت و دەپووکێتەوە... خۆشەویستی‌یەکی بەند بە ئیرادەیێکی پۆڵایینی لە رووخان نەهاتووی ئەوتۆ کە وای لە هەموو دوژمنە جۆربەجۆرەکانی ڕژێمی شۆڕشگێڕی عیراق بکات، بە توندی بکەونە خۆ، بۆ لەناوبردنی ئەم قەڵاسەختە.

بەڕێز سەرەکی فەرماندە دەربارەی پاشەڕۆژی عیراق و هەڵسوکەوتی پاشەڕۆژ، لە کاتی باسکردنی پرۆژەی خۆڕێبەری‌دا لە ڕۆژی بیست و چواری ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٣دا وتی: «ئێمە لە لێکۆڵینەوەی ئەم پرۆژەیەدا ئامانجێکی سەرەکیمان هەیە ئەویش ئەوەیە بزانین چۆن پاشەڕۆژی عیراق بنیات دەکرێت و ڕێکخەری ئەو پەیوەندی‌یانەی کە کوردوعەرەب و، پەیوەندی عەرەب بە کۆمەڵ و دەوڵەت کە لەناو چوارچیوەی‌دا دەژین ڕێك دەخەن، کامانەن: هەروەها بۆ دەست نیشان کردنی شێوەی ڕێك خستن پەیوەندی‌یەکانی هاوڵاتی کوردی گەلەکەمان بە دەوڵەتەوە، ئێمە دەمانەوێت بگەینە ڕاستی، نەك بە شێوە گشتی‌یەکەی بەڵکو دەمانەوێت بگەینە هەموو لایەکانی ئەو ڕاستی‌یە». ئەم بۆچوونەی سەرەکی فەرماندە بەسە بۆ ئەوەی ئەوپەڕی دڵنیایی بە هەموومان بدا، کە مەسەلەی کورد شتێکی ڕواڵەتی سیاسەتی نی‌یە، بەڵکو مەسەلەیەکە بە هەموو لق و پەناو مێژوویەوە لە ویژدان و بیری سەرکردایەتیی شۆڕش دا جێی تایبەتی خۆی هەیە.

هەر لەم بارەیەوە، بەڕێز سەرۆکی فەرماندە صدام حسین، لە وەڵام دانەوەی چەند پرسیارێکی ڕۆژنامەگەرێك «ئێوە کە ئامانجی سەرەکیتان

یەکێتی عەرەبە، چی وای لێ کردن خۆبەڕێوەبەری، بدەن بە کورد؟»، ئایا مەسەلەی کورد بڕایەوە؟ قۆناغی پێکەوەژیانی عیراقیانەی کوردو عەرەب چۆن دەبینن؟.. هتد، وتی: «لە بڕیاردانی خۆبەڕێوەبەری‌دا دوو مەسەلەی سەرەکی هەن کە ئەمانەن: مەسەلەی مەبدەئیە زیندووەکەو، واقیعی زیندووی بەرەوپێشەوەچوو و دیاردە نوێیەکانی.

مەسەلەی مەبدەئی لای حزبمان ئەوەیە کە پێویستە بایەخ بە ڕای گەل بدرێت و ڕێزی لێ بگیرێت لە واقیعی زیندووش دا، گەلی کوردمان خۆی خۆبەڕێوەبەری ویستوە، چەند ڕووکاری خراپیش هەبوون یاریان بە هەندێ لە ڕێبازەکانی دەکردو دەیان ویست لەژێر ئەم پەردەیەدا گەلی کورد بکەن بە دوژمنی شۆڕش، ئەگەر گەلی کورد خۆبەڕێوەبەری نەویستبایە، بێگومان نەمان دەدایێ، بەڵام کورد خۆبەڕێوەبەری ویست و ئەگەر دانمان بەم مافەدا نەنایە خوێنێکی زۆر دەڕژاو، زۆر دەرگای جیابوونەوەو لێک دابڕان لەنێو گەل دا دەکرایەوەو، مادام خۆبەڕێوەبەری پەیوەندیی یەکێتیێ لەنێوان گەلی عیراقی یەک گرتوومان دا... لەنێوان کوردو عەرەب دا بەتینتر دەکات ئیتر خۆگێل کردن بەرامبەر ئەم ڕاستیانەو گوێ‌پێ‌نەدانی وا لە مرۆڤی دەکات کە لە مەبەئیەت دووری بخاتەوەو خزمەتی ڕاستەقینەی هەڵوێستی شۆڕشگێڕانە نەکات...».

هەروەها سەرەکی فەرماندە لە وەڵامەکەی‌دا وتی: «پاراستنی خۆبەڕێوەبەری گەلی کوردمان لەناو هەر جۆرە یەکیەتیێک دا کە لە نێوان عراق و هەر هەرێمێکی تری عەرەب دا دێتە دی، دەڵێین، پاراستنی ئەم خۆبەڕێوەبەری‌یە مەرجێکی گرنگی دروست بوونی ئەو یەکێتی‌یەیە، چونکە خاوەنی خصوصیەتەکە کە گەلی کوردمانە، ئەگەر تەماشای کرد خصوصیەتەکەی کە مافی خۆبەڕێوەبەری‌یە، لەناو عمومیەت دا کە یەکێتی عەرەبە دەکوژرێت، بێگومان دژی ڕادەوەستێ هەتا ئەگەر ئەو عمومیەتە هەندێ لە بەرژەوەندی‌یە مەبدەئیەکانیشی بۆ جێ‌بەجێ بکات. لەم ڕوانگەیەوە دەڵێین کە خصوصیەتی خۆبەڕێوەبەری حاڵەتێکی دژ نی‌یە بەرامبەر عمومیەتی کە یەکێتی عەرەبە...».

سەرەکی فەرماندە لە قسەکانی‌دا بەو پەڕی واقیعیانەو، بە ڕێزەوە، ویست و ئیرادەی گەلی کورد ڕادەگەیەنێت و هەرگیز وەکو دەستەڵاتدارانی پێشووی عیراق، ئەم خۆی لە بنەڕەتی مەسەلەکە لانادات.

سەرەک فەرماندە دەڵێت: «کورد خۆبەڕێوەبەری دەوێت و ئەمە مافی ڕەوای خۆیەتی...» ئەم بۆچوونەی بەڕێز سەرۆک صدام حسین خۆی لە خۆی‌دا ڕێزلێنانێکی گەورەیە لە خەباتی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لە پێناوی مافی ڕەوای خۆیان و بۆ یەکەم جار لە مێژووی ناوچەکەدا سەرکردەیەک بەم ڕوونی‌و ئاشکرایی‌و بێ‌پەرواو بێ‌ترس لە ستراتیجیەتی دەوڵەتان و باری دەوڵەتە گەورەکان، بە دەنگێکی بەرز، دەڵێ گەلی کورد خۆبەڕێوەبەری ویستووەو ئێمەش ئەم داواکاری‌یە بە ڕەوا دەبینین....

لە ساڵی ١٩٧٨دا، سەرەکی فەرماندە صدام حسین بەرامبەر (١٥٠) ڕۆژنامەنووس، هەر لەم بارەیەوە، وتی: «خۆبەڕێوەبەری بۆ گەلی کوردمان، بڕیارێکی بەجەرگانەو مەبدەئیانەی ڕاست و ڕەوا بوو، ئەم بڕیارە کارێکی ڕاستەو، ئێستاش هەر ڕاستەو، هەریش لەسەری دەڕۆین».

کاتێکیش کە بەڕێز سەرۆک، دەیەوێت خۆشەویستی گەلی کوردمان لە عیراق دا دەربڕێت، دەڵێت «ئێمە شاخەکانمان تەنیا لەبەر ئەوە خۆش ناوێن چونکە پارچەیەکن لە عیراق، بەڵکو لەبەر ئەوە خۆشمان دەوێن چونکە (بەشێکن) لە گەلەکەمان کە لەناو ئەو شاخانە دەژین...».

بەڕێز سەرەکی فەرماندە پەنجەی بۆ ئەو ڕاستی‌یە ڕاکێشاوە کە شێوازی دەستووری نابێتە هۆی بەشکردنی گەل، بەڵکو لە ڕێ‌لادان دەبێتە هۆی دابەشکردن و زیان گەیاندن بە گەل، چونکە گەلەکەمان لە کوردستانی خۆشەویست دا خۆبەڕێوەبەری ویست، کە مافێکی زۆر ڕەوایەو دەبێتە هۆی پتەوکردنی بنەماکانی یەکیەتی‌و بەهێزتربوونی عیراقی، لەسەرمان هەموومان ئەم مەسەلەیە بە مەسەلەیێکی بنەڕەت و گرنگ دابنێین لە ژیانمان دا، نەک هەر کورد، بەڵکو عەرەبیش لەسەریەتی هەست بکات کە خۆبەڕێوەبەری پێویستی‌یە بۆ عیراق‌و پێویستی‌یە بۆ گەلی کوردمان لە کوردستانی عیراق.

سەرۆکی فەرماندە بە دانانی شاری دێرینی هەولێر بە پایتەختی هاوینەی عیراق، باشترین بەڵگەی دڵسۆزی‌و خۆشویستنی بەرامبەر بە گەلی کورد خستەڕوو. هەمیشەش گوزەرانی خەڵکی ناوچەکە بەسەر دەکاتەوەو بە پێوەری مەوزووعی‌و زانستیانەوە تاقیکردنەوە شۆڕشگێڕی‌یەکە هەڵ دەسەنگێنێت بۆ مەبەستی بەرەوپێشەوە بردنی‌و گەیاندنی بە ئاسۆی ئاوات. بۆیە سەرۆکی لێهاتوو دەڵێت: «لەوانەیە یەکێک لێم بپرسێت و بڵێ، ئایا خۆبەڕێوەبەری بەپێی هەڵ سەنگاندنی تۆ گەیشتوتە چاکترین ئەو حاڵەتەی گەلی کورد هیوای دەخوازێت؟ من لە وەڵام دا دەڵێم، نەخێر، نەک هەر خۆبەڕێوەبەری نەگەیشتوتە چاکترین ئەو حاڵەتەی ئومێدی دەکەم بۆ گەلی کوردمان، بەڵکو هەموو یاساکانی تری وڵات لە عیراق دا نەگەیشتوونەتە ئەو ڕادەیەی بۆ گەلی عیراق ئاواتمە، چونکە ئێمە هەمیشە ئومێدی ئەوە بۆ گەلی عیراقمان دەکەین لە کوردستان و غەیری کوردستان، کە حاڵەتی چاکترو باشترو لەو حاڵەتانەی پێی گەیشتووین ساز بکەین و بیان ڕەخسێنین بۆ بەرژەوەندی گەلی مەزنی عیراقمان...».

**بەرنامەی کار...**

---

سەرۆکی لێهاتوو (صدام حسین)، هەر لە سەرەتای سەرهەڵ دانی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالست، بە فیکری تیژ و شیکردنەوەی وردو زانستانەو کاری تێکۆشانی بەردەوام، هەمیشە ڕێ‌ڕۆشن کەرەوەی ڕەوت و ڕێباز بووەو، خاوەنی فیکری هۆشمەندو زانستی‌و شۆڕشگێڕیی بووە، بۆ پەرینەوەو دەربازبوونی خەباتی جەماوەری پارت لە گشت ئەو قۆناخانەی پیانەوە تێ‌دەپەڕی‌و دەوری سەرەکی ڕاپەڕاندنی شۆڕشە پیرۆزەکەی عیراق بووەو هەمیشە بە پەرۆشی یەکێتیی عەرەب و نیشتمانی عەرەبی بووەو بەردەوامەو، لە

گشت بارو بۆنەیەك دا، بانگی دڵسۆزانەی بۆ ئەم ئاواتە ڕاهێشتووەو بە پەرۆشیەتی. لەم بارەیەوە، بەڕێز سەرەکی فەرمانده دەڵێت: «لەبەر ڕۆشنایی دۆخە نێو دەوڵەتی‌یەکانی ئێستاو ڕێ‌تێچوونی پەرەسەندنیان لە پاشەڕۆژ و ئەو ڕێ‌تێچوونە ترسناکانەی کە لەوانەیە لێوەی بێنە کایەوەو هەڕەشە لە سەربەخۆیی‌و ئاسایشی‌و نەتەوەیی عەرەب بکەن لەلایکەوە ئاسایش و ئاشتی لە جیهان لەلایەکی ترەوە، بۆ بەدەنگەوەهاتنی ئۆباڵی نەتەوەیی بەرامبەر بە نەتەوەی عەرەب، بە گەل و خاك و شارستانیەت و کەلەپوورەوەو بەپێی بیرو باوەڕەکانی بزووتنەوەی بێ‌لایەنی، عیراق وا خۆی دەبینێ کە داواکراوە دەست پێشکەری بکات بە دەرکردنی ئەم بۆ زانینە (مەبەست ڕاگەیاندنی نەتەوەیی‌یە) بۆ ئەوەی ببێتە بەرنامەیەکی کار بۆ، یەکەم: ڕێك خستنی پەیوەندی‌یە نەتەوەیی‌یەکان لەنێوان ولاتانی عەرەب داو...، دووەم: بەڵێن و پەیمانێك دەبیت لەلایەن نەتەوەی عەرەبەوە بەرامبەر بەو ولاتانەی بۆ ئەو بەرنامەی کار دەنوێنن و پابەندی دەبن... بۆ زانینەکە بەم بنەڕەتانەی خوارەوە بەندە... تاد».

بەم جۆرە بەڕێز سەرۆك، هەشت بنەڕەتی بۆ کاری عەرەبی دانا لە بواری تێکۆشانی جەماوەری عەرەب بۆ ڕێگار ـ ئاسان کردن لەبەردەم یەك گرتنی عەرەب دا.

**یەکێتی‌و... بەهێزبوونی گەل**

---

ڕۆڵە ئازاو چاونەترسەکانی عیراق، هەمیشە هەوڵیان داوەو دەدەن کە نیشتمانەکەیان بپارێزن و، هەمیشە ئامادەن بۆ بەرزکردنەوەی ڕێزو پایەو شوێن و ناوی ئەم ولاتە ڕەنگینە. ڕادەی سەرکەوتنیش لە پێکەوەژیانی برایانەو پاراستنی خواست و ئامانج و ویستی هاوبەش، بەندە بە ڕادەی یەك بوون و یەك گرتن و یەکێتی نیشتمانی. جا ئەرکی پێك هێنانی بەرەی پێشکەوتنخواز، لە گرنگترین و بایەخدارترین ئەو ئەرکانە بوو کە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست، لە یەکەمینی ڕۆژانی شۆڕشەوە، بیری لێ دەکردەوەو بەپێی تیورە شۆڕشگێری‌یەکەی، پێك هێنانی ئەم بەرەیەی بە پێویست زانی‌و، بۆ یەك بوون و یەك گرتنی ڕۆڵەکانی ولات و لێ‌پرسینەوەو خواست و ئامانج و ئەرکی هاوبەش، هەر دەبێت ئەم بەرە پێك بهێنرێت و یەکێتی نیشتمانی بهێنرێتەدی.

شۆڕش ئەوەی زانی کە دارشتنی بینای یەکێتی نیشتمانی لەسەر نباغەی جێ‌بەجێ‌کردنی سەربەخۆیی ئابووری‌و سیاسی‌و ڕزگاربوونی کۆمەلایەتی‌و، فراوان کردنی سنووری سەربەستی‌و دیموکراتی‌و دانی مافی نەتەوەیی‌و ڕۆشنبیری‌و مافە ڕەواکانی تری گەلی کوردو برا کەمایەتی‌یەکان، دادەمەزرێت.

ئەوە بوو، شۆڕش دەستی کرد بە بیناکردنی یەکێتی نیشتمانی گەل و، دەستی دایە کۆمەڵێك بریاو کاری شۆڕشگێرانە بە نیازی پتەوکردن و زێدە ڕەگە داکوتاندنی ئەم کارە شۆڕشگێری‌یە، پاش ئەوەی کە پایەو بنەڕەتەکانی سەربەخۆیی‌و سەربەستی نیشتمانی دارشت و سامانی سروشتی ولاتی بۆ گەل گەڕاندەوەو، بەرەی نیشتمانی‌و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی بەرپاکردو، خۆڕێبەری بە گەلی کورد داو نباغەی دیموکراتیەتی دانا، توانی بەم جۆرە یەکێتی نیشتمانیمان بکاتە قەلایەکی بەرزو، گشت هاولاتی‌یەکی دڵسۆزیش هەست بە سەربەرزیی ولات و نیشتمان بکات و پێکەوە دەست لەناو دەست، یەك دڵ و دەروون و یەك بیرو باوەڕ، گشت توانای بخاتەکار بۆ پتەوکردنی یەکێتی نیشتمان.. بۆ سەربەستی‌و سەربەخۆیی‌و سەربەرزیی ولات.. بۆ پاراستنی ولات و پەرەپێ‌دان و پەرەسەندنی عیراق و زیاتر پێش خستنی عیراقی نوێ‌و هاوولاتی نوێ.

بەم شێوەی سەرەوە، شۆڕش بە سەرکردایەتی سەرەکی فەرماندە صدام حسین سەلماندی کە توانایێکی مەزن و تەواوی هەیە بۆ فەرماندەیی گۆڕانکاری‌یە گەورەکان و هێنانەدی ئاسوودەیی ژین و سەربەرزی‌و سەربەستی‌و پێویستی‌یەکانی بەهێزبوونی گەل، بەبێ ئەوەی هیچ هێزێکی نەزان و خەشیم بتوانێ کار لە ڕەوتی بەردەوامی بینای عیراقی نوێ‌و مرۆڤی نوێ بکات ئەو عیراقەی ئەمڕۆ بووەتە ڕەمزی سەربەرزی‌و پەرەسەندن و پەرەپێ‌دانی هێزی عیراق و بەتوانابوونی.

لە ئەنجامی ئەم دەسکەوتە مەزنانەو ڕەوت و کاروانی دیاری شۆڕشی عیراق، ئیمپریالیزم و زایۆنی‌و دوژمنانی شۆڕش، بۆ ئەوەی ڕێ لە ڕێبازی شۆڕش بگرن و جوولانەوەی شۆڕش لە سنوورێکی تەسکەبەردا بوەستێنن و نەتوانێت کاروانی ئامانجە پیرۆزەکانی بەرێتە سەر، دەیان پیلانیان بۆ داناو هەوڵی ڕاپەڕینیان ـ دا ـ بە شیوەی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆوە.

پاش ئەوەی ئیمپریالیزمی جیهانی‌و زایۆنی دوژمن توانای خۆیان تاقی‌کردەوەو بۆیان سەلما کە ڕاستەوخۆ ناتوانن دەست لە شۆڕشی عیراق بوەشێنن، هەڵسان ئەم ئەرکەیان بە ڕژێمی تازەبابەتی تاران سپارد بۆ ئەوەی لە چواری ئەیلوولی ساڵی هەشتا، دەست درێژ بکاتەسەر خاك و ئاو و گەلی عیراقی صدام حسین.

**ڕووڕەشانی مێژوو**

---

پیلان و ئامانجە بۆگەنەکانی یەکگرتنەوەی ڕژێمی خومەینی‌و ڕژێمی دیمەشق و قەوارەی زایۆنی، لای جیهان و ڕای گشتی‌و گشت هاولاتیێکی عەرەب و غەیری عەرەب ئاشکراو ڕوون و دیارەو پێویست بە دووپات کردنەوە ناکات. ئەوەی لێرە پەنجەی بۆ ڕادەکێشین ئەوەیە:

ـ ڕژێمی ـ حافظ أسد ـ ی تاوانبارو دەستە خوێن مژەکەی، لاوازو بەرەو نەمان دەڕۆن. مانەوەی ڕژێم بە پەرستنی ئیمپریالیزم و زایۆنی‌و بەجێ‌گەیاندنی پیلانەکانیانە. هەڵبەتە بەرژەوەندی ئیمپریالیزم و دوژمنانی نەتەوەی عەرەبیش لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و کەنداوی عەرەب، تا ڕادیەك، بە هۆی ڕژێمی تاران مسۆگەر دەکرێت و دەپارێزرێت، چونکە ڕاپەڕێنەری پیلانەکانە.

دەستەی تاوانباری رژێمی دیمەشقیش، کارکەری دڵسۆزی راپەڕاندنی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزمە لە ناوچەکەدا.. بەم جۆرە پەیوەندییێکی پتەو لە نێوانیان دا پەیدا دەبێت و.. سەرۆکی رژێمی دیمەشقیش، بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیو تەنیا مانەوەی لەسەر کورسی حوکم دا ـ ئەوەی لایانە سەبارەت بە یارمەتیدانی رژێمی تاران برسترێ، دەبێت (دڵسۆزانە)و بێدەنگ رای پەڕێنێت..!! وە بڕیاری قەدەغەکردنی تێپەڕبوونی نەوتی عیراق بە خاکی سوریاداو دانی جۆرەها چەك و جبەخانەوشارەزایی سوپایی بە خومەینی، نزیکترین بەڵگەن.

ـ دۆستایەتیو هاوکاری نێوان زایۆنی دوژمن و رژێمی خومەینی، ئاشکراو بەهێزو پتەوە... لە لێدانی دەزگای ئەتۆمی عیراقی بگرە تا دەگاتە کردنەوەی پردێکی ئاسمانی لەنێوان ـ تل ابیب و تاران دا ـ بۆ ناردنی جۆرەها چەك و جبەخانەو شارەزایی بۆ رژێمی خومەینی... ئەمەیان با بڵێین هیچ!!.. لەوە سەیرتر وتەکەی کاتی خۆیو ئێستای خومەینییە، خومەینی دەیەوێت ـ بەهۆی زایۆنیزمەکانەوە ـ لە ڕێگای رژێمی (حافظ اسد)ەوە، خاکی داگیرکراوی فەلەستین لەژێر دەستی ـ جولەکەکان ـ رزگار بکات!!!.. سەربەخۆیی لوبنانی (بەشکراو) بپارێزێت...!!! بێگومان (بە گوێرەی خەونە سەوزەکانیان و پیلانە بۆگەنەکانیان)، رزگارکردنی خاکی فەلەستینیش، بەهۆی یەك گرتنەوەی هەر دوو رژێمی نەفام و رەگەزپەرست و قەوارەی زایۆنی، پێویست بە «بێهێزبوون»ی عیراقی شۆرش دەکات..!!!!

وە بەپێی ڕێکەوتننامەی خەیاڵ پلاوی خۆیانەوە (بۆ رزگارکردنی خاکی فەلەستین)، دەبێت ئێرانی خومەینی (عیراق داگیر بکات)و زایۆنیش نیوەی خاکی سوریا بخاتە ژێر دەستییەوە ـ بۆ ئەوەی تەنیا حافظ اسد ـ لە (سەرۆکایەتی) نەکەوێت..!!!

ـ رژێمی خومەینییش ئەوەی بۆی دانرابوو رای پەڕاندو بەردەوامە... دەرکردن و لە سێدارەدانی ئافرەت و گەنج و پیرانی کوردستانی ئێران... لێدانیان بە تۆپ و ناپاڵم و فڕۆکەو ئاگری سووتێنەر... چونکە تەنیا داوای ماف دەکەن..!!.. داوای خۆرێبەری دەکەن.. چۆن خومەینی (مافەرەواکان) لە کیسی خۆی بۆ کورد سەرف بکات؟!!!!.

ئەسەدیش، لەو کاتەی عیراقی شۆڕش، خۆرێبەری بە گەلی کورد ـ دا، رایگەیاند کە وا (عیراق ناوچەیەکی کرنگی خاکی عەرەبی پێشکەش بە غەیری عەرەب کرد..!!!!). ئەمڕۆکە ئەسەدی تاوانبارو ڕووڕەش دەیەوێت، لە قوژبنێکی کۆشکی کۆماریدا، بانگی (خۆرێبەری) بۆ کورد رابهێڵێت!!!

گەلی کورد لە ئێران وەکو گەلانی تری ئێران بەدەستی خوێن مژو خێزانی پەهلەوییەوە تووشی ستەمکاریو زۆرداری هاتووەو هەزاران لاوی لەپێناوی سەربەستیدا بەخشیوە.. شەهیدی نەمر قازی محەمەدمان لەبیر ناچێتەوە کە دامەزرێنەری کۆماری کوردی مەهاباد بوو لەگەڵ هاورێکانیدا کە لە مەیدانی چوارچرا لە شاری مەهابادا سەرکەوتنە سەر سێدارەو بۆ دوژمنانی میللەتی کورد ملیان کەچ نەکرد.

دوای ئەوەی رەزاشا کۆماری نوێی کوردستانی، بە پشتیوانی ئیمپریالیزمی ئاغایو زایۆنی زربرایەوە، لەناوبرد... گەلی دلێری کورد لە کوردستانی ئێران، ئەم کارەساتەو، دەیان کارەساتی تری ئەوساو ئێستایان لەبیر ناچێتەوەو بەردەوام تاو بە خەباتی چەکدارانەی خۆیان دەدەن و خوێنی پاکی خۆیان لەم پێناوەدا دەرێژن، تا ئەو کاتەی رژێمی جادوگەران کرنوش بۆ ئیرادەی ئەم گەلە قارەمانە دەبات و ـ چاری ناچاریش بێت ـ دەبێت هەر دان بە مافی رەواو سروشتیی کوردی کوردستانی ئێران دا بنێت.

**پاراستنی گیانی سەرکەوتن و.....**
**توانای لەبن نەهاتووی شەرکەرانمان**

---

لە کاتێك دا هۆیەکانی دوژمنداریتیو هەڵوێست و مەرج و بیرو باوەڕەکان بەسەر دەکەینەوە، لە هەمان کات دا، بۆ دوژمن و هاوپەیمان و هاوکارانیو سەرانسەری دونیا دووپات دەکەینەوە کەوا عیراق لەم جەنگەدا سەرکەوت و، بەردەوام لە پاراستنی گیانی سەرکەوتن تا وەدیهێنانی سەرکەوتنی یەکجارەکی، چونکە:

ـ بەرامبەر بە سەرکردایەتییەکی نەزان و دواکەوتوو کە حوکمی ئێران دەکات، دەبینین سەرکردایەتیی عیراق، سەرکردایەتییەکی لێهاتووەو بەجەرگ و پێکراوە، دزانێت چۆن پەرە بە توانای گەلی دەدات و وە چۆن عونسرەکانی هێز تێکەڵاو دەکات تێکەڵاوکردنێکی زیندووانە بۆ ئەوەی وڵات بگەیەنێتە مەبەستە ویستراوەکانی.

ـ بەرامبەر بە ئاشوب و ئاژاوەی ناو ئێران و کێشەو ناکۆکی نێوان دەست و پێوەندی رژێم، دەبینین لە عیراق دا، گەلێکی یەك گرتووی خاوەن سەرکردایەتییەکی مەزن و بەهێزو لێهاتووە کە سەرکردایەتیی بەرێز سەرەکی فەرماندە تێکۆشەر «صدام حسین»ە.

ـ پەیرەوی عیراق پەیرەوی ئاشتیو مافە... لە پێناوی پاراستنی خاك و مێژوو و ئێستاو دوارۆژدا دەجەنگێت. پەیرەوی رژێمی گەندەڵی جادووگەرانی ئێران لەسەر ناهەقییەتیو شەڕو شۆق و رەفزکردنی ئاشتیو بەردەوام بوونی دوژمنکاریتی وەستاوە.

ـ سەرانسەری دونیا رێزی عیراق و سیاسەت و دیبلۆماسیەتەکەی عیراق دەگرێ، چونکە لەسەر مافەو بەرەوانی لە سەربەستیو ئازادیو سەربەرزی دەکات و حەزی لە ئاسایشە ـ رێزی سەربەخۆیی گەلان دەگرێت، بەڵام رژێمی ئێران بەر توانج و رەخنەی زۆربەی هەرەزۆری وڵاتانی دونیا کەوتووە، چونکە دژی سەربەستیو ئاسایش دەوەستێت و رێزی سەربەخۆیی گەلان ناگرێو حەز بە دەست تێوەردانی کاروباری ناوخۆی وڵاتان دەکات.

ـ لەو کاتەی ئابووری ئێران شکستەو روو لە وێران و رووخان دەکات لە

ئەنجامی سەپاندنی جەنگ بەسەر عیراق داو سووربوونی رژێم لەسەر درێژەپێدانی. لە هەمان کات دا، دینگەی ئابووری عیراق، رۆژ دوای رۆژ، بەرزترو پتەوتر دەبێت و. . . لەگەڵ بەردەوام بوونی جەنگ، کارەکانی بنیاتنان و پەرەپێدانی بەردەوامە.

- پێشکەوتنی عیراق لە رووی پیشەسازیی جەنگ و پشت بەخۆبەستن لە بواری دروستکردنی چەشنەها چەك و جبەخانەی جۆربەجۆر. . دواجار مووشەکەکانی (الحسین) بۆ لێدانی بارەگاو کون و قوژبنەکانی جادوگەران و شارەکانیان و لەبن هێنانی تێکرا ڕاگیرەکانی ئابووری‌یان، ئەمانە هەموویان دەوری سەرەکی‌یان بینی لەوەی کە سەنگی تەرازووی جەنگ زیاتر بەلای عیراقەوە بێت و زووتر دەرفەتی ئاشتی‌و کۆتایی‌پێهێنانی شەڕی سەپێنراو بێتەکایەوەو سەرکەوتنی یەکجارەکی بێتە ئارا.

ئەم لایەنانەو دەیان هۆو لایەنی‌تر وایان لە شەڕکەرانی عیراق کردووە کە هەمیشە وره بەرزبن و هێزو توانایان لەبن نەیەت و بەردەوام سەرلەنوێ بیبێتەوەو. . . . زیاتر لە حاڵەت و باری نوێی عیراق دا نزیك بینەوەو قووڵتر تێکەڵاو بن. . . ئەمەیش بە شێوەییکی گومان لێ‌نەکراو. ڕادەی پتەوی بەستنەوەی مرۆڤی عیراقی نوێ بە خاکەکەی‌و بیرو باوەرەکانیەوە دوویات دەکاتەوەو دەی‌سەلمێنێت.

بێ‌گومان ئەم حاڵەتەش، حاڵەتی هەرەبەرزی نیشتمان پە رووری‌یەو هەتا هەتایەش، مێژوو لە پەرەکانی پارێزراوی خۆی‌دا، بەدێرین و نەمری‌یەوە هەڵی‌دەگرێت.

جا لەگەڵ ئەم حاڵەتە نوێ‌یەدا، جەنگاوەری خوێن گەرمی نەبەردی عیراقی شۆڕش، سەرەڕای ڕشت بوونی ورەو مەعنەویاتی بەرزی، وا زیاتر هەوڵ و تواناو زیاتر قوربانیدانی سەرلەنوێ دەکاتەوەو، پتر هان دەدات بۆ بە جێ‌گەیاندنی بیروباوەری (شەڕ لەپێناوی ئاشتی) لە ڕێگای لەناوبردنی زۆربەی زۆری رەگەزپەرستانی رژێم و تێك شکاندنی هێزی فاشی عەسکەریی دوژمن. . بەتایبەتی لایەکانی ئابووری‌و باری عەسکەری‌و کاروباری ناوخۆ وا لە ئەوپەری شڵەژاوی‌و شپرزەیی نزیك بۆتەوە، کە ئەمەش کۆتایی‌و سەرنگووم بوونی دەستەو دایەرەی رژێم پیشان دەدات.

دەبێ ئەو ڕاستی‌یەش دوویات بکەینەوە کە هەمیشە بەرزبوونەوەی ورەو مەعنەویاتی جەنگاوەری عیراقیش بە چەند هۆی سەرەکی‌یەوە بەندە، لەمانە:

- باوەری تەواوی بەو مەسەلەیەی لە پێناوی‌دا دەجەنگێت.
- عیراق چاوی لە بستێك خاکی ئێران نی‌یەو هێرشبەر نی‌یە.
- شەڕکەری عیراق، هیچ ڕێگاو هۆو شێوازێکی‌تری نی‌یە جگە لە شەڕکردن نەبێت.
- گشت پێداویستیی سەرکەوتنی بۆ باوکراوەو لەژێر دەستایە.

هەر بۆیە دەبینین جەنگاوەری عیراقی نەك تەنیا مەعنەویاتی بەرزە، بەڵکو خورتەو هەمیشە توانای شەڕکردنی سەرلەنوێ دەبێتەوە. بێ‌گومان ئەم شێوازو هۆی سەرکەوتن و پاراستنی، هەموویان بۆ سەرکردایەتی‌کردنی ڕاستەوخۆی بەڕێز سەرەکی فەرماندەو لێهاتوو صدام حسین دەگەڕێتەوە. . . بەتایبەتی سەرکردایەتی کردنی عەسکەری‌و ئابووری.

## سەرچاوەکان


بۆ ئامادەکردنی ئەم باسە، سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١. وتاری بەڕێز سەرەکی فەرماندە صدام حسین لە ١٧ی تەمووزی **ساڵی ١٩٨٧**.

٢. صدام حسین، الاعلان القومي استجابة لدواعي المسؤولية، بغداد ١٩٨٠.

٣. علي طعمة، صدام حسين - الفكر والممارسة، بيروت ١٩٨٣.

٤. «ڕاپۆرتی سیاسی سەربەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی»، وەزارەتی ڕاگەیاندن، دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی، کانوونی دووەمی ١٩٧٤.

٥. محسن احمد محمد، الفكر الاشتراكي لحزب البعث العربي الاشتراكي، وزارة الثقافة والاعلام، سلسلة دراسات (٣٠٢) لسنة ١٩٨٢.

٦. گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»، ژمارەکانی (٩٤)و (٩٧)و (١٠٠).

٧. المجلة العسكرية - العدد الثالث لسنة (٦٤)، تموز ١٩٨٧.

٨. ڕۆژنامەی (القادسية)، ژمارەکانی (٢٢١٧)و (٢٢٠٣).

٩. ڕۆژنامەی «هاوکاری» ژمارە ٨٩٧.

١٠. ڕۆژنامەی «الثورة» لە ١٩٨٧/٦/٢١

١١. «پاشکۆی عیراق» ژمارە (٣٧)ی حوزەیران و تەمووزی ١٩٨٠ (ژمارەیەکی تایبەتی‌یە بە جەژنەکانی تەموز).

١٢. **گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ژمارەکانی (١٠٦)و (١٠٧)و (١٠٩)و (١١٧).**

١٣. **مجلة «الجامعة» مجلة شهرية تصدرها جامعة الموصل (عدد خاص) تشرين الثاني ١٩٨٠.**

١٤. معادلة العراق لمصلحة من؟ سەروتارەکانی ڕۆژنامەی (الثورة) لە ڕۆژانی (١٢)و (١٣)و (١٤)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٩.

١٥. گۆڤاری «کاروان» ژمارەکانی (٣٤)و (٤٦)و (٥٦).

١٦. ڕۆژنامەی «الثورة» - پاشکۆیەکی تایبەتە بە یادی دە ساڵەی شۆڕشەکانی تەموز ١٩٧٨.

١٧. الحكم الذاتي عمق وحدة العراقيين، منشورات دار العراق للصحافة والنشر، ١٩٨٦.

# في ذكرى ثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز المجيدة ودور السيد الرئيس القائد صدام حسين في مسيرة الثورة.

نەوزاد سوورچی

**قبل الخوض في الحديث عن بدايات ثورة ١٧ ـ ٣٠تموز المجيدة ومرحلة انتصارها ومسيرتها المظفرة حتى اليوم وعطاءاتها الثرة في كل جانب من جوانب حياة شعبنا وامتنا، يجدر بنا ان نقف باجلال وخشوع امام ذكرى عزيزة هي الجوهر في مكنون الثورة، ذكرى تسلم السيد الرئيس القائد صدام حسين ـ حفظه الله ـ الموقع القيادي الأول في الحزب والدولة وذلك سنة ١٩٧٩، وثمة حقيقة ساطعة وهي ان الباحث عن مسيرة الحزب قبل الثورة وبعدها والباحث عن مسارات الثورة ومعطياتها يجد أن صدام حسين كان المفكر الذي ينير بفكره الثاقب وتحليلاته العلمية المستنبطة من نضاله ونضال امته درب مسيرة الحزب وانه كان رجل المهمات الصعبة والمواقف المستعصية والربان الذي قاد السفينة الى شاطىء الامان. انه مخطط الثورة ومرشدها البارز وانه باني صرح مجدها. وهكذا فاننا نجده واقفاً موقف القائد والمعلم والرفيق أمام كل الانجازات والتحولات العظيمة في حياة شعبنا والتي سيشير اليها البحث بايجاز.**

يتطرق البحث الى الذكرى العشرين لاندلاع ثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز العظيمة التي خطط لها وقادها وفجرها الحزب القائد ـ حزب البعث العربي الاشتراكي، حيث يعيد الى الاذهان الفترة المظلمة الذي عاشها العراق في مرحلة ماقبل الثورة، والاوضاع الفاسدة المتردية ابان الحكم الرجعي العميل آنذاك.

يتحدث البحث عن بدايات الثورة وكيفية التخطيط لها وتفجيرها، والتغييرات الجذرية التي حدثت مابعد الثورة مباشرة ـ ثم يستذكر مراحل البناء الثوري في مسار ثورة السابع عشر والثلاثين من تموز المجيدة. فيتحدث عن المرحلة الاولى الشاقة والمعقدة والتي كانت الثورة تناضل فيها على أربعة اصعدة في آن واحد... بناء السلطة المركزية وارساء دعائم البناء الثوري الجديد وكسب ثقة الجماهير والتفافها حول الثورة، ثم تصعيد النضال ضد القوى الامبريالية وركائزها وعملائها، وتصعيد العمل على إزالة الأجواء السلبية واللا موضوعية بين القوى التقدمية واشاعة أجواء جديدة من العلاقات الكفاحية وفي اطار العمل الوطني المشترك. اضافة الى التوجه الجدي والعملي لوقف النزيف البشري والمادي في الشمال والذي كان يهدد الوحدة الوطنية. وابتدأت المرحلة الثانية والتي تداخلت مع المرحلة الاولى خلال عام ١٩٧٢ وهو عام الانجاز التأريخي: التأميم وتحرير الثورة النفطية من براثن السيطرة الامبريالية وتحكم الاحتكارات الاجنبية. وبعد إنعقاد المؤتمر القطري الثامن للحزب خلال عام ١٩٧٤ وصدور وثيقته المركزية ـ التقرير السياسي ـ ابتدأت المرحلة الثالثة في مسيرة الثورة، وهي مرحلة الاستقرار الثوري وارساء المنطلقات المركزية والاساسية لنظرية عمل الحزب على كافة الاصعدة والميادين.

ويلخص البحث أهم المنجزات والمكاسب الثورية العظيمة التي حققتها قيادة الحزب والثورة على الاصعدة كافة، كتعزيز قيادة الحزب للمجتمع والدولة وتعزيز وصيانة الاستقلال السياسي والاقتصادي، ورسوخ تطبيق الحكم الذاتي وانشاء مؤسساته التشريعية والتنفيذية واستكمال اداراته المختلفة، وتعزيز العمل الجبهوي وبناء الجيش العقائدي وتلسيحه باحدث الاسلحة والمعدات و... اضافة الى احداث جملة من التحولات الاشتراكية في ميادين الصناعة والزراعة والعلاقات الانتاجية وتواصل مسيرة التحولات الاجتماعية والثقافية والتربوية على نطاق الحزب ومختلف مؤسسات الدولة... الى غير ذلك من المنجزات والمكاسب الثورية.

يتطرق البحث الى دور الجيش في حماية الدولة المستقلة، وكيفية بناء جيش عقائدي لتنفيذ المهمات والاحتمالات المستقبلية... ويذكر البحث بعضاً من طروحات السيد الرئيس القائد صدام حسين «حفظه الله» بهذا الشأن، ودوره العسكري الفذ في قيادة المعارك والاشراف المباشر. ويختتم كاتب البحث بحثه باطماع ومخططات الدوائر الامبريالية والصهيونية بدفع نظام الدجل والشعوذة في ايران بفرض حربها على عراق الثورة.. ثم الى اهم الضربات الموجعة لقواتنا المسلحة الى النظام الايراني المتخلف المشعوذ... ودخول عنصر التفوق العراقي الجديد في الحرب بصنعه صواريخ (الحسين).

# بهەلکەفتنا بیرهاتنا شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەها نەمر

# بیرهاتنا شۆرەشێ و راوەستانەك

● مختار فائق ●

هاتنا شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەها پیروز لسالا ١٩٦٨ بەرسڤا عیراقێ بۆ دژی وێ سیاسەتا نە دجهـ دا و چەفت یاکو رژێمێت بەرێ بکار دئینا، وان رژێما یێت کو خۆ فەرز کربۆن لسەر عیراقێ.. هەروەسا ئەڤ شۆرشە هات دژی سەهیونیاو ئیمپریالیێ و وان هەمی نەخشەو پیلانێت وان کو دهاتنە گێران دژی عیراقێ.

سەرکەفتنا ڤێ شۆرەشێ دوان بارو زروفێت سەخت و دژواردا، رەسەنایەتیا عیراقێ و عیراقیا بنەجیهـ کرو هەروەسا زیرەکی و هشیاریا حزبا سەرکردە، حزبا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی دیارکرو بنەجیهـ کر. ڤێ حزبێ یاکو بریار دابۆ دوان بارو زرووفێت نازك و دژواردا شۆرەشێ بکەت و دەستێ جەماوەری ژ مللەتێ عیراقی بگریت و وان رزگار بکەت ژ زولم و زۆرداریێ و دەردەسەریێ و عیراقێ پێش بێخیت و شۆرەشەکا کۆمەلایەتی و ئابوری و پەروەردەیی هەلێخیت دعیراقێ دا.

شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەها نەمر یاکو ئەم دڤان رۆژان دا ئاهەنگا دگێرین بیرهاتنا وێ یا بیستێ، ڤێ شۆرەشێ روویێ گەشێ نەتەوایەتی و ونیشتمانی یێ شۆرەشا ١٤ی تیرمەهێ ڤەگەراندەڤە دەمێ ڤێ شۆرشێ هەول ددا سروشتا خۆ دخەباتێ دا دژی کەڤنە پەرست و ئیمپریالیا بجهـ بینیت. کو نمونەیەکێ روهن و گەش و زیندی پێش کێش کرە وەلاتێت جیهانا سێ دگرنگیا پروگرامێ پارت و شۆرەشێ داو رێکا سەربەخۆیێ و رزگارکردنێ.

بێ گومان شۆرشەکا وەکو شۆرشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەهێ کو مجد بیت لسەر بیرو باوەرێت خۆ ژسەخمەراتی ئارمانجێت مللەتێ خۆ خەباتێ بکەت و هەردەم هەول بدەت کو پەیوەندی و هەڤالینییەکا راست و درست دانیت دگەل دەولەتان دا بۆ خزمەت کرنا عیراقێ و بەرژەوەندییا عیراقێ و مللەتێت جیهانا سێ.. دبێژین کو شۆرشەکا هۆسا هەردەم سەرکەفتن بۆ ناهێتە نڤیسین هەکە قوماندارو سەرۆکەکێ ژیرو زیرەك و خورت نەبیت و خودان بیرو باوەر نەبیت، یان ژی سەرۆکەکێ خودان بیروویاوەرەك نەبیت دپارتەکێ دا کو خودان تەجرویەو خەباتەکا دێرین نەبیت.

درێبازێ پێش کەفتی دا یێ شۆرەشێ هند دەست کەفتێت شۆرەشگێرو ئابوری و کۆمەلایەتی و نەتەوەی هاتنە بجهـ ئینان بۆ کورێت مللەتی.. کو ب کورت ترین دەم دا عیراق هاتە ڤەگوهازتن ژ بارەکی بۆ بارەکێ دی یێ پێشی کەفتی.. هاتە ڤەگوهازتن ژ پاش کەفتن و فەرق و جودایی و دەردەسەریێ و نەخویندەواریێ بۆ بارەکێ گەلەك پێش کەفتی لپێش چاڤێ وەلاتێت جیهانا سێ. ڤەژینەکا ئابوری و کۆمەلایەتی و لهەمی عیراقێ دا پەیدابۆ. دەستهەلدانەکا بەرفرەهـ هاتەکرن ژبۆ نەهێلانا نەخویندەواریێ.. هەروەسا چارەسەرکرنا بن بڕ یا مەسەلا کوردی کو چارەسەرکرنەکا ئاشتی خواز بۆ. کو چەندین سالێ چۆن و ئەو میرییێت بەری نهو نەشیان ڤێ مەسەلێ چارەسەر بکەن، تاکو شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمە هاپیرۆز هاتی داکو بدلسۆزی بەرێ خۆ بکەتە مەسەلا کوردی و ڤیا ژدل ڤێ گرفتاریێ چارەسەر بکەت و ژدل ڤیا مافێت رەوایێت مللەتێ کورد بدەتێ.. ئینا ئەویو بەیاننامـا یازدەی ئاداری دەرکر و لدوی ڤێ بەیاننامێ، مللەتێ کورد مافێت خۆ یێت رەوا ژ مافێت پەروەردەیی و نەتەوەیی و کۆمەلایەتی وەرگرتن دپەرژانێ ئوتونومی بۆ کوردستانا عیراقی.

هەروەسا شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەها پیرۆز شیا ل ئێکی حوزەیرانا سالا ١٩٧٢ شۆرەشا میللی کرنا نەفتا عیراقی هەلکەت کو دربەکا گەلەك مەزن بۆ و پشتا کومپانییێت مونوپولێت نەفتێ شکاندو شیا نەفتا عیراقێ رزگاربکەت

ژدەستێ وان کومپەنی‌یا ییت کو پۆ چەندین سالان ژ بەهرا مللەتێ عیراقی دمێتن و دخارن. وئەو بەهرا عیراقیا ژنەفتا وان دچۆنە دبەریکێت مۆنۆپولێت بیانی‌دا..

لێ دەمێ نەفتا عیراقێ شورەشا مەمیللی کری‌و گەهاندیە عیراقیاو ئەو هەمی کومپەنی‌یێت مۆنۆپۆل بێ بەهر کرن و نەفتا عیراقی هەمی بۆ عیراقیا ما.. کو ئەڤ پێنگاڤە ژی دربەکا دژواربۆ دژی ڤان کومپەنی‌یاو بەرپەرەکێ روهن و گەش کو بحەرفێت زێرین هاتنە نڤیسین دديروکا مللەتێ عیراقێ‌دا. هەروەسا میللی کرنا نەفتا عیراقی ئەنجامەکێ ئابوری‌و هونەری بجهـ ئینا بۆ عیراقێ.. ئو دیسا هەکە مرۆڤ هویر بەرێ خۆ بکەتە بریارا میللی کرنا نەفتێ دێ بینیت کو دوبرەکا سیاسی‌و نیشتمانی ژی یا تێدا.

سەرکەفتنا عیراقێ دمیللی کرنا نەفتێ‌دا سەرکەفتنەکا گەلەك پێ تڤی‌بۆ بۆ ڤان هەمی سەرکەفتنێت عیراق بدەست دئێخیت دشەرێ مەیێ بیرۆزدا دژی رژێما ئیرانیا دوژمن. چنکو ئەگەر ئەو بریارا گرنگا میللی کرنا نەفتێ نەبا.. دا وەلاتێ وە کەڤیتە بن بارێ کەڤنە پەرستی‌و ئیمپریالیێ‌و نەخاسمە لبن دەسەلاتیا کومپەنی‌یێت مۆنۆپولێت نە نەفتێ. بەلێ حزبا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی‌و سەرۆکێ مەیێ قوماندار صدام حسین ـ خودێ بهێلیت ـ بهەمی زیرەکی‌و ئازایەتیا خۆ شیا دگەل ئێککرتنا کورێت مللەتێ‌وە شیان دەرسەکا وەسا دژ وار بدەنە دژمناو کومپەنی‌یێت نەفتێ کو هەتا هەتایێ ئەوێ دەرسا دژوار ژ بیر نەکەن.

ئول ل دەلیڤێ پەروەردەو فێرکرنێ‌دا قومانداریا پارت و شۆرەشێ پیتەیەکێ گەلەك دا ڤی دەلیڤەی‌و یاسایێ فێرکرنا بهەروە دەکرو دەست هەلدانا نیشتمانی‌یا نەهێلانا نەخوێندەواریێ کارەکێ گرنگە کرە سەر بەلاڤ کرنا زانینێ لهەمی گوندو باژێرێت وەلاتی‌و دەڤەرا کوردستانێ بتایبەتی.

هەروەسا شۆرەشێ بهزاران قوتابخانە ڤەکرن بهەمی قوناغێت خاندنی لهەمی دەڤەرا کوردستانێ.. ودگەل ڤێ چەندێ ژی هژمارەکا گەلەك زۆرا رێك و پرێت بەرفرەهـ هاتنە ڤەکرن لهەمی دەڤەرا کوردستانێ و داکو هەمی گوندو باژێر ژێك نێزیك بین و پەیوەندی هەر دبەردەوام بن لناڤ بەرا هەمی کورێت مللەتی‌و هێزا کەهرەبێ‌و ئاڤی‌و تلفزیون گەهشتە هەر مالەکێ ژ گوندێت کوردستانێ و بڤێ چەندێ رەوشەنبیری‌و شارستانی بەلاڤ دبیت و دگەهیتە هەر هاولاتیەکێ دلسۆز ژکورێت مللەتی‌و هەروەسا میری دێ شێت هەمی جۆرێت خزمەت گوزاریا گوزاریا بگەهیتە کورێت مللەتی، ییت کو بەری شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەهێ چو رەنگێت خزمەت گوزاریاو چو رەنگێ شارستانیێ نەدگەهشتە وان ژ بەر دوریا گوندو باژێرێت وان.

ئول دەلیڤێ چاندن و گشت و کالێ‌داو ژ بلی بەلاڤ کرنا زەڤی‌و زارا لسەر جوتیاراو رزگار کرنا جوتیاری ژ زولما دەرەبەگا.. شۆرەشێ کارەکی وەسا کر داکو دەستێ هاریکاریێ بگەهینتە هەر جوتیارەکی‌و نەخاسمە جوتیارێ کورد چنکو رەڤەرا کوردستانێ گەلەك زولم و زۆردارئو تەپەسەری دیتبو لسەر دەمێت چۆییدا..

براستی شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەها نەمر دەرگەـ ڤەکرن بۆ هەمی تەخێت کۆمەلا عیراقی داکو هەمی کورێت مللەتی بدلسۆزی بەشداریێ بکەن دئاڤاکرنا عیراقا مەزن دا..

هەروەسا شۆرەشێ دەلیڤەیەکێ بەرفرەهـ دا ئافرەتا عیراقی ومافێت رەوایێت کۆمەلایەتی دانە ئافرەتا عیراقی‌و یەکسانی‌یەك پەیدا کر لناڤبەرا ژن و مێراو ئافرەتا عیراقی ژی چ درێغی نەکر دڤی دەراڤی‌داو خۆ هاڤێتە شۆلی‌و بەشداری کر دهەمی لایەنێت ژیانێ‌دا و بەشداری کر درێزێت لەشکرێ میللی‌دا و سەرکەفتنێت دیار بدەست ئێخستن دهەمی دەلیڤان داو ئافرەتا عیراقی نهۆ برایێ خۆو مێرێ خۆو خزم و کەسی‌و کارێت خۆ هان ددەت و پالڤە ددەت کو پشکدار بن دشەرێ مەیێ پیرۆزدا دژی رژێما ئیرانیا چەپەل.

ئافرەتا عیراقی‌و دایکا عیراقی دسەردەمێ شەرێ‌دا پێشوازیا کورێ خۆ یێ شەهیدە دکەت بچەپلەو تلیلی‌یا.. کو ئەڤ نموونەیە قەت روی‌نەدایە ددیرۆکا چ دەولەتان دا..

ئەڤە هندەکن ژ دەستکەفتێت بەرکەتی‌یێت شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەها پیرۆز کو رێبازەکێ رزگارکرن و سەربەخۆیی‌و سەربەخۆیێ‌و بۆ وەلاتی پەیدا کرن.. هەر وەسا ئەو سیاسەتا نەتەوایەتی یاکو شۆرەش لسەر چۆی دەمێ بەرەڤانیا ئاخا وەلاتێت عەرەبی دکەت و پشت گیریا فلسطینێ دکەت و هەر وەسا ئەو راوەستان و هەلوێستێ مرۆڤایەتی لبەرانبەر وان وەلاتێت تازە پێرادگەهن، وئەو هاریکاری‌یێت بەردەوامێت شۆرەشێ بۆ هەمی بزاڤێت ئازادی خواز. ئەڤ هەلوێستێت پێشکەفتن خواز ییت پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی بونە ئەگەرێت سەرەکی کو شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تیرمەها پیرۆز ببتە ئارمانج بۆ وان هەمی نەخشەو پیلانێت دام و دەزگەهێت ئیمپریالیزم و سەهیۆنیا.. چنکو قەت بدلێ وان نینە شۆرەشەکا هۆسا پێش کەفتن خوازو ئازادی خواز بسەر بکەڤیت و پێش بکەڤیت لدەڤەرا رۆژهەلاتا ناڤەراست. ڤێجا گەلەك دام و دەزگەهێت ئیمپریالی هەول دان گەلەك نەخشەو پیلانا بگێرن دژی عیراقا شۆرەشێ.. و درب دانانا بنگەهێ (تەموز) یێ ئەتومی یێ ئاشتی‌خواز لعیراقێ ژلایێ دژمنێ سەهیۆنی‌ڤە نیشانا وێ کەرب و کینەتێ‌یە یا ددلێ وان داو ددلێ یاوەرێت وان دا لدەڤەرێ دژی عیراقا مەیا رەنگین.. بەلێ عیراق بهەمی هێزو شیانا خۆو بهەمی بیرو باوەرێت خۆڤە لبەرانبەر وان نەخشەو پیلانا راوەستاو قەت دەلیڤە نەدا دژمنان دەرا خۆ دعیراقا مەدا ببینن.

قارەمانێت عیراقێ ژی چنکو خودان بیرو باوەرن و خودان قومانداریەکا سەرکەفتی‌نە رۆژ لدوی رۆژێ سەرکەفتنێت مەزن و بناڤ و دەنگ بدەست دئێخن دژی فارسێت عەجەمێت سەهیۆنی..

هەروەسا دڤێت لڤێرە مرۆڤ خویا کەت و یا هەژی گوتنێ‌یە کو ئەڤ بیرهاتنە رێك دکەڤیت دگەل بیرهاتنا وەرگرتنا سەرۆکێ قوماندار صدام حسین ـ خودێ بهێلیت ـ بۆ دەسەلاتداریا سەرکێشیا قومانداریا پارت و شۆرەشێ وەرگرت کو ئەڤ تەجروبە بۆ ئەگەرێ دەست نیشان کرنا هەمی نمونێت

فيداكاريێ و قوربانيداني و سەركەفتنێ . . كو دەورێ گرنگێ مێژوویی یێ سەرۆكێ قوماندار صدام حسين ـ خودێ بهێليت ـ ديار دبيت دەمێ ئەوی بخۆ سەركێشيا رێبازێ مە یێ سەركەفتی كری و عيراق پێش ئێخستی . .

ئێدی سلاڤ و هزار سلاڤ بۆ سەركێشێ كاروانێ مە یێ سەركەفتی صدام حسين دڤان رۆژێت رەنگين دا . .

سلاڤ بۆ مێرخازێت كورێت مللەتێ مە ژ كوردو عەرەبا يێت كو شەڤێ دكەنە رۆژ و رۆژێ دكەنە شەڤ داكو بەرەڤانيا عيراقا شۆرەشێ بكەن . .

سلاڤ بۆ بيرهاتنا بيستێ يا شۆرەشا ١٧ ـ ٣٠ تيرمەها نەمر .

# وقفة أمام ذكرى الثورة وتسلم السيد الرئيس القائد صدام حسين الموقع القيادي الأول في الحزب والدولة .

**مختار فائق**

تطل على شعبنا العراقي العظيم هذه الأيام الذكرى العشرون لثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز المجيدة التي فجرها وقادها حزب البعث العربي الاشتراكي، والتي كانت مسيرتها حافلة بالانجازات والمكاسب العظيمة التي تحققت لجماهير شعبنا العراقي بعربه وكرده . . وتحقيق أماني شعبنا من خلال النهوض والتطور الحضاري الشامل تحت راية البطل المنصور، الرئيس القائد صدام حسين ـ حفظه الله ـ.

تعتبر ثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز إنعطافة تأريخية في حياة العراقيين لانها النموذج الحي المتمثل بالنمو والأصالة وبناء المستقبل المشرق الذي يتطلع نحوه شعبنا . . وحين نحتفل بهذه الذكرى فأننا نحتفل بذكرى عزيزة وغالية على قلوب كل العراقيين . هي ذكرى تسلم الرئيس القائد صدام حسين الموقع القيادي الاول في الحزب والدولة حيث تجلت أروع صور التضحية والأيثار ورسمت معالم البناء والتطور والوثوب للدفاع المجيد عن عز العراق وبنائه الشامخ في معركة قادسية صدام المجيدة.

ومن هنا لابد أن نؤكد على الدور التأريخي للقائد الرمز صدام حسين مهندس ثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز المجيدة ومخططها الاول، وباني مجد العراق العظيم . . حيث تغير وجه العراق الحضاري سواء على طريق انجاز الاستقلال السياسي والاقتصادي، أو عن طريق انجاز خطط التنمية القومية وإستكمال مشاريع الخطط المقررة رغم ظروف الحرب المفروضة علينا.

فقد تمكن العراق وبفضل العقل المفكر للثورة السيد الرئيس القائد صدام حسين من بناء جبهة داخلية قوية ووحدة وطنية صلبة تستند على التآخي الأبدي بين الشعبين العربي والكردي وحل القضية الكردية وتحقيق الحكم الذاتي لمنطقة كردستان وانبثاق هيئات ومؤسسات الحكم الذاتي.

ان ما أنجزته ثورة تموز المجيدة وما أرسته من دعائم مادية ومعنوية لنهضة شعبنا وانطلاقته على طريق التقدم والبناء والنهوض هو الذي أثار حقد وعداء القوى الاستعمارية والصهيونية ضد شعبنا وهو الذي دفع النظام الايراني الحاقد لشن عدوانه الغاشم ضد قطرنا المناضل بغية ايقاف عجلة البناء والتقدم التي بد أتها ثورة تموز عام ١٩٦٨ .

غير أن العراقيين الغيارى وعلى امتداد ثمان سنوات الحرب إستطاعوا أن يقاتلوا وينتصروا وكانت إراداتهم القوية الثابته في الصمود والنصر هي التي تحكم مجريات الحرب ووقائعها . .

أن شعبنا الكردي الذي يرفل اليوم بالمنجزات الرائعة لثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز المجيدة ويزهو بالانتصارات العظيمة التي تحققها جحافل قواتنا المسلحة البطلة على امتداد جبهات القتال سيظل وفيا لمبادىء ثورته أميناً على مكاسبها وسداً منيعاً بوجه الغزاة المعتدين.

أن الثورة التي امتزجت فيها دماء وعرق الشعب العراقي العظيم بكرده وعربه في الدفاع عن أرضه لايمكن الا أن تنتصر وتحقق كامل أهدافها التي جاءت من أجلها لاسيما إذا كان فارسها وقائدها المناضل صدام حسين ـ حفظه الله ـ.

# لە یادی بیستەمین ساڵەی سەرکەوتنی شۆرشی ١٧ - ٣٠ی تەمووزی مەزن دا

# با هەر شەکاوە بێت ئالای شۆرشی تەمووزی پیرۆز

نشمیة منصور

وا یادی بیستەمی شۆرشی پیرۆزی ١٧ - ٣٠ی تەمووز دەکەینەوە کە یادی رۆژێکی نەمرتری لەگەڵ خۆیدا هێناوە، ئەویش یادی وەرگرتنی سەرۆکی فەرماندەی بەرێز (صدام حسین)ە بۆ پایەی سەرەك كۆماری‌و وەرگرتنی پلەی پێشەوەی سەرکردایەتی حزب و شۆرشە. ئەگەرچی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ شۆرشی مەزنی تەمووز تەرخان کراوە، بەڵام سەرۆکی بەرێز بەر لە شۆرش و پاش شۆرش هەر رۆشن کەرەوەو پێشاندەری رێی دوورو درێژی حزب و شۆرشە. هەر خۆی سەرکردەی رێگاو بیرکەرەوەو مێژوونوسی نەتەوەو سەرکردەی بێ‌هاوتایە..

لە مانگی تەمووزی هەموو ساڵێك دا، گەلی عیراقی تێکۆشەرمان، لە سەرانسەری وڵاتە خۆشەویستەکەمان دا، خۆی بۆ زەماوەندو ئاهەنگ گێران بە بۆنەی جەژنەکانی ئەو مانگەوە ئامادە دەکات.

مانگی تەمووز، پایەو بایەخێکی بەنرخ و تایبەتی لەناو خەڵك و هاووڵاتیانی عیراق دا هەیە. چونکە بەراستی‌و بە هەموو شانازییەکەوە دەتوانین بڵێین: تەمووز، مانگی شۆرش و راپەرین و سەرفرازی‌و ئازادی‌و تێکۆشانەو گەلی عیراقمان بە کوردو عەرەبەوە، گەلێ مەردایەتی‌و پاڵەوانیەتی لەم مانگەدا، بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دا نواندووە.

ئەوەی شایانی باسە، گەلێ میللەت و نەتەوەی تریش لە جیهان دا، شۆرش و راپەرینەکانیان لە مانگی تەموزدا دەستی پێکردووەو رووی‌داوەو سەرکەوتنیان بەسەر زوڵم و زۆرداری‌و دکتاتۆریەت وەدی‌هێناوە، وەك شۆرشی فەرەنساو شۆرشی کوباو شۆرشی گەلی میسرو گەلی جەزایرو... هتد.

بەڵام لە عیراق دا، تەمووز، واتایێکی قووڵتری وەرگرتووەو پتر پێشوازیی لێ‌دەکرێت و پتر ئاهەنگی پێ‌دەگێردرێت و زیاتر بایەخی پێ‌دەدرێت، چونکە لەم مانگەدا، مانگی تەمووزی پیرۆز، دوو شۆرش و (شۆرشی تەمووزی ١٩٥٨ و شۆرشی ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨) یەك راپەرین (راپەرینەکەی ٣٠ی تەمووزی ١٩٦٨) بەرپابووەو سەرکەوتووەو، جگە لەو سێ رووداوە مێژووییە گرنگانە، رووداوێکی تری بەنرخ و یەك جار مەزن لە هەمان مانگ دا رووی - دا، ئەویش لە تەمووزی ساڵی ١٩٧٩ بوو، کاتێ کە سەرەکی فەرماندە تێکۆشەر - صدام حسین - شوێنی پێشەوەی لە پارت و دەوڵەت دا وەرگرت.

ئا بەم جۆرە، تەواوی گەلی عیراق و میری نیشتمانپەروەرو پارتی بەعسی سۆشیالستی عەرەبی تێکۆشەر، تێکرا، هەر لە سەرەتای مانگی تەمووزی هەموو ساڵێك دا، چالاکی دەنوێنن و خۆیان بۆ پێشوازی رۆژانی شۆرش و راپەرینەکانی گەل لەم مانگە پیرۆزەدا ئامادە دەکەن. مانگی شۆرشەکەی گەل و سوپا لە ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨دا... مانگی شۆرشەکەی گەل و سوپا بە سەرکردایەتی پارتی بەعسی سۆشیالستی عەرەب لە بەرەبەیانی رۆژی ١٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨دا... مانگی راپەرینەکەی گەل و سوپاو پارت لە رۆژی ٣٠ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨دا.... مانگی وەرگرتنی شوێنی پێشەوە لە پارت و دەوڵەت دا لەلایەن سەرەکی فەرماندەی تێکۆشەر صدام حسین.

میری نیشتمانپەروەرو پارتی بەعسی سۆشیالستی عەرەب و تێکرا گەلی عیراقمان، بە چاوێکی پڕ لە رێزەوە ئامانج و ئەنجامەکانی ئەو شۆرش و راپەرینانەو رۆڵی پارتی بەعس و سەرکردایەتی تێکۆشەر سەرەك كۆمار هەڵ دەسەنگێنن، هەروەها بەهەمان چاو سەیری دەسکەوتە مەزنەکانی شۆرشی ١٧ - ٣٠ی تەمووز دەکەن کە لە ئەنجامی تێکۆشانێکی بێ‌وچان لەلایەن پارتی سەرکردەو گەلە نەبەزەکەمان و سەرەکی فەرماندە (صدام حسین)ەوە (خوابپارێزێ) هاتنەکایەوە.

ئەگەر بێت و ئاورێك لە مێژووی عیراقی هاوچەرخ بدەینەوە، بۆمان روون دەبێتەوەو ئاشکرا دەبێت، کە زۆربەی شۆرش و خۆپیشاندان و راپەرینە گرنگەکان و کاریگەرەکانی گەلی عیراق لە دوای دامەزراندن و لەدایك بوونی پارتی بەعسی سۆشیالستی عەرەب بەرپا بووەو سەرکەوتنی وەدی‌هێناوە. وەك راپەرینەکەی کانوونی ساڵی ١٩٤٨و خۆپیشان دانەکانی ساڵی ١٩٥٢و ساڵی ١٩٥٦و شۆرشی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨و

شۆڕشی ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣و شۆڕشی ١٧ ـ ٣٠ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨.

ئێمەی تەواوی گەلی عیراق لەو کاتەی کە ئاهەنگە بەم بۆنەیەوە (شۆڕشەکانی تەمموز) دەگێڕین ئەگەر هات و لە رابردووی نزیکمان وردبینەوە دەبینین، شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ رۆڵێکی باشی لە گۆڕینی عیراق دا هەبووە، بەتایبەتی لە بواری لێدان و لەناوبردنی رژێمی پاشایەتی و دەرەبەگایەتی، هەرچەندە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ نەیتوانی، یان بۆی نەکرا ـ لەبەر چەند هۆیێك ـ خواست و ئاواتەکانی گەلی عیراقمان جێبەجێ بکات لە ئەنجامی لادانی کاربەدەستانی ئەو ساتە لە رێبازی شۆڕش، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە بوترێت ئەوەیە: کە ئەم شۆڕشە گەلەکەمانی وریا کردەوەو رێی بۆ لەناوبردنی هەموو زۆردارێك خۆش کرد، ئەگەر هات و دژی داواو خواستی گەل وەستا.

بەڵێ شۆڕشی ١٤ی تەمموز بە ئامانجەکانی نەگەیشت و ئیمپریالیزم و نۆکەرانی هەوڵیاندا، رێڕەوی مێژوو بەرەو پاشەوە بگەڕێننەوەو دووبارە کۆنەپەرستی و دەرەبەگایەتی و زوڵم و زۆرداری بۆ وڵاتەکەمان بهێننەوە، بەڵام پارتی بەعس دوای تاقیکردنەوەو خەبات و ئەزموونێکی زۆرو دەوڵەمەند، توانی ئازایانە پیلانەکانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرست و نۆکەرانیان پووچەڵ بکات و لەناوببات.

ئەمە بوو، لە بەرەبەیانی رۆژی ١٧ی تەممووزی ساڵی ١٩٦٨ دووبارە توانای بێتەوە سەر حوکم و سزای نۆکەران و زۆرداران بدات و عیراق و گەلە تێکۆشەرەکەی بەرەو پێشەوە، بەرەو شارستانیەتێکی نوێ و پێشکەوتوو ببات و توانی، بەتایبەتی لە دوای راپەڕینەکەی ٣٠ی تەممووزی هەمان ساڵ دا، بە دەیان دەستکەوتی مەزن و گرنگ و بەنرخ و شۆڕشگێڕانە دابین بکات.

**تێڕوانینێکی مێژوویی بارودۆخ:**

---

بۆ ورد هەڵ سەنگاندنی سرووشت و قەوارەی بزووتنەوە سیاسی یەکەی پارتی بەعسی سۆشیالستی عەرەب، دەبێت ئاورێك لە بارو دۆخەکانی پارت لە عیراق و نیشتمانی عەرەب دا لە ماوەی نێوان ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣و ١٧ی تەممووزی ١٩٦٨دا بدەینەوە. لە ١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣دا تاقیکردنەوەی پارت لە عیراق دا کە جێی ئاوات و خواستەکانی پارت و جەماوەر بوو، سەری نەگرت. ئەم سەرنەگرتنەش، سەرەرای زیان و لە دەست چوونی ژمارەیێکی زۆری تێکۆشەرو خەباتگێڕانی پارت، پارت و جەماوەرەکەی تووشی گیروگرفتێکی دەروونی ترسناك کرد

لە ٢٣ی شوباتی ساڵی ١٩٦٦دا کاتێ دەستەی شوباتی یەکان لە سوریادا، بە ئینقیلابێکی عەسکەری دژی دەسەڵاتی پارت هەڵ ستان، دووبارە پارت دووچاری گیروگرفتی ترسناکتر بووەوە، بۆ یەکەم جار بارێکی نالەباری تایبەتی پر مەترسی و گیر هاتەکایەوە، بەتایبەتی لە رووی سەپاندنی دەسەڵاتی زۆردارانە بەسەر پارت دا.

دوابەدوای ئەم دوو نەهامەتی یە، دووبەرەکێکی ترسناك، تێکرا پارتی گرتەوە، کێشەی رێك خستنیانەو بیری توندو تیژ لەنێوان ریزەکانی دا سەری هەڵ دا. ئەمەش گرانایێکی تایبەتی پر مەترسی هەبوو لەسەر لقی پارت لە عیراق دا.

بەڵام پارت لە عیراق دا، دوای حەوتەمین کۆنگرەی نەتەوەیی کە لە شوباتی ساڵی ١٩٦٤ دا لە دیمەشق گیراو کێشەی دووبەرەکی یەی لە رووی رەوایی پارتی یەوە بە لایەك دا خست، بەرەبەرە رووی کردە یەك بوون و یەك گرتن. تێکۆشەرانی پارتیش بە توانایێکی بەرزترو بڕوایێکی قووڵترەوە، دەستیان بە هەنگاو نان بەرەو پاشەڕۆژ کردەوە.

هەرچەند پارت و تێکۆشەرانی، پاش رووداوەکانی (٥)ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٤، زەبرو زەنگیان بەدەست دەسەڵاتی (عارفی)یەوە چەشت و لە ئەنجامی دا، زیانی رێکخراویی و باری ماددی و دەروونیی ناخۆش و ناهەموارو پر لە دوودڵی هاتەکایەوە، پارت خۆی لە گەرمەی رووداوەکان دا، بە یەك گرتنێکی زیاتر لە جارانەوە بینییەوە، هەروەك چۆن خۆی دەبینی، جەماوەریش وەها دەبیینی کە توانای بەرەنگاری کردن و دەست وەشاندنی هەیە لە رووی دەسەڵاتی عارفی دا بە خەباتێکی پتەو و بەرفراوان ئەو چەند مانگانەی بەدوای پاشگەزبوونەوەکەی ١٨ی تشرینی دووەم و تاقیکردنەوەی (٥)ی ئەیلوول دا هات، چەند سەرکردایەتێکی نوێی پارتییانەی لە جۆرەها ئاست دا هێنایە کایەوە، کە لێهاتوویییان لە خەباتگێڕان دا چەسپاندو سەنگێکی هەست پێکراویان پێك هێنا لەناو پارتی داو بە خاڵی جەمسەرگەری ئیجابی دەژمێردران لەناو ریزەکانی دا.

پێش ئەوەی برینەکانی پارت و جەماوەرەکەی بەتەواوی لە کارتێ کردنی دووبەرەکی یەکەی یەکەم جارو جێ پەنجەی لێدانەکەی دەسەڵاتی عارفی لە (٥)ی ئەیلوول دا ساڕێژ ببێت، پاشگەزبوونەوەکەی ٢٣ی شوبات رووی دا کە تێی دا هەرچی دەسکەوتە ئیجابییەکانی قۆناغی پێشوو هەیە، هەمووی شێواندو، ناچار پارت سەرلەنوێ خۆی خستەوە ناو خۆخەریك کردن بە کێشەکانی زۆرانبازی رێکخراوی و ئایدیۆلۆجی و، ناو کۆڕی دوودڵی دەروونی یەوەوە، تا بەستنی کۆنگرەی بەروەخت کە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٦دا گیراو تێی دا سەرکردایەتێکی نوێی هەرێمی هەڵ بژێردرا، لەم بارو دۆخەدا مایەوە.

بەم کۆنگرەیەو ئەو کردەوە رێکخراوییانەی بە دوای دا هاتن، توانرا رێکخراوی پارتی لە دەست و پێوەندەکانی بەرەی شوباتیی جیابکرێنەوە کە رێکخراوێکی لاوازی سەربەخۆیان بە ناوی پارتی یەوە پێکەوە نابوو.

فراوان بوونی هەردوو کەرت بوونەوەکە لەناو وڵات داو ئەو بارە رێکخراوی و دەروونی یەی لێیانەوە بەرپا بوو، بووە هۆی ئەوەی کە پارت ژمارەیێکی لە سەرکردەکانی پێشووی و کارزانە پێشکەوتووەکان و ئەندامان و لایەنگیرو جەماوەرانی لەدەست بچێت، هەندێکیان کەوتنە بەر زەبری ورە بەردان و تۆقاندن و، هەندێکی تریان هەر لەبەر ئەو هۆیانە لە کۆڕی تێکۆشان

گۆشـەگـیـربـوون و ئەوانـی تریـشـیـان لەگـەڵ ئەم لا، یان ئەو لای دوویەرەکی یەکەدا کەوتنە ڕێ.

لە چوارچێوەی ئەم هەموو بارانەدا، پارت لە بارێکی یەك جار گران و ئاڵۆز خۆی بینی یەوە، کە دەبـوایـە لەلایـەکـەوە بەرەنگـاری لە دەسـەڵاتی عارفی بکـردایـەو خۆشی لە لێـدانـەکـانی ئەو لا بدایـە، ـ لە هەمـان کاتیش دا ـ لەلایەکی ترەوە دەبوایە لە ڕووی ئایدیۆلۆجی و ڕێکخراویی و سیاسی یەوە بەگژ دوویەرەکی خوازەکان دا بچوایەو بەرپەچی ئەو تاوانە پووچانەشی بدایەتەوە کە دەخرایە پاڵی. لە گەرمەی هەموو ئەمانەش دا، دەبوایە جەماوەرانیشی ئامادە بکـردایـەو بڕوایـانی بەلای خۆیدا رابکێشـایـەو توانـای جێبەجێ کردنی ئەو بیـروڕاو درووشمـانـەی خۆی بچەسپاندایە کە بە هۆی ئەو بارە باسکراوانەوە تووشی چەند جۆرێکی تەنگ و چەڵەمە ببوو.

**باری گران و ئاڵۆزو..**

**تەنیا دوو ڕێگا**

لە ئەنجـامی دامـەزرانـدنی پێـوەنـدی چاك لە نێـوان شوبـاتی یـەکـان و دەسـەڵاتی عارفی و، زیـاتـر هان دانی ڕژێمی عارفی بۆ دەسـت وەشـانـدن، توونـدو بەزەبـرتـر لە تێکـۆشـەرانی پارت و بەردەوام بەئـاگاخستنەوەی ڕژێم، بەنیازو چالاکی و مەبەستەکانی پارت لەلایەن سەرکردەکانی شوباتی یەکانەو، پارت خۆی لە بارێکی گران و ئاڵۆزتردا بینییەوە.

پارتـی بەعـسـی عەرەبی سۆشیـالـست، لەم قۆنـاغـەدا، ڕووبـەڕووی گەورەترین دەست درێژ ی بووەوە کە لە مێژووی دوورو درێژ ی پڕ لە ئەرکی گران و ترسـنـاك و باری سەخـت و ئاڵـۆزیدا ڕووی دابێت. ئەم جارەیـان پێـوەنـدی بە بوونـی پارت و پاشـەڕۆژی و پێـوەنـدی بە جەمـاوەرو سەرکردایەتی کردنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕ یەکەی دا، هەبوو،

پاشگـەزبـوونـەوەی (شـوباتی)، ناوی پارتی بەعـسی عەرەبی سۆشیالستی لەخـۆ ناو، دەستی بەسـەرحـوکم دا گرت لە سوریـاو چەنـد پەیمـانێکی هاوکـارانـەیی عەرەبی و جیهـانی گرنگ بەست و، بەمەش کارێکی وای کرد، پارتی خـستە بەردەم «مانەوەو بەردەوام بوون».

لە چوارچـێـوەی ئەو بارانـەی باسـکـران و بارو دۆخـی بزووتـنـەوەی شۆڕشگێڕیی ناو وڵات و نیشتمـانی عەرەبی دا، دوو ڕێگـا لەبەردەم پارت دا هەبـوون: یان وازهێنـان لە بیـرو باوەڕی دەسـەڵات گرتنـە دەست لە هەر هەرێمێك لە وقۆناغەداو، دەست دانە بەرنامەیەك بۆ خەباتی (سلبی)یانە بۆ قۆناغێکی مێژوویی دوورو درێژ و وا دانان کە پارت و بزووتنەوەی شۆڕشی عەرەب، لە هەموو لایەنێکەوە، بە قۆناغێکی دامەزراندنی نوێدا دەڕۆن.

یاخـود گەڕان بە دوای شێـوازێکی نوێدا بۆ گۆڕینێکی شۆڕشگێـڕانـەو دەسـەڵات گرتنـە دەست، لە هەر هەرێمێـك دا بێت، مەرجـەکـانی باری مەوزووعی و پێـداویستی یـەکـانی قۆنـاغی نوێ ڕەچاو بکات و بەهۆی شوێنی نوێیـەوە، هەوڵی سەرکـردایـەتی کـردنی بزووتنـەوەی جەمـاوەر بدات بەرەو ئامـانجـە نەتـەوەیی و کۆمەڵایەتی یەکان و، بۆ دووبات کردنەوەی ڕووی ڕاستی پارت و بیـرو باوەڕو ئامـانجـەکـانی و سەلمـانـدنی دەورە پێشـڕەوی یـەکەی لە بزووتنەوەی شۆڕشی عەرەب دا.

ڕێکخراوی پارتیش لە عیراق دا، ئاشکراو بێ پێچ و پەنا ڕێگای دووەمی هەڵ بژارد.

ئەم ویست و ئیرادەیەش هەر ئاوا بە توانا، بەدرێژایی ساڵانی نێوان ١٨ی تشرینی دووەم ساڵی ١٩٦٣و ١٧ی تەممووزی ساڵی ١٩٦٨) مایەوە.

**ساغ کردنەوەی سێ خاڵی گرنگ**

---

پشت بەستن بە توانا خۆیی یەکانی پارتی بزووتنەوەی جەماوەران بۆ تەفرو توونـاکـردنی حوکمی پاشگـەزبـوونـەوەکەی تشرین ـ بێ گومان ـ دواخـستنی کارگوزاری شۆڕش، گێرانە دەگەیان بۆ ماوەیێکی زۆر دوورو درێژ و خوگرتن بۆ هەمـوو ئەو ڕووداوە (سـەلـبـی)یـانـەی کە بەهـۆی دواخستنـەکـەوە دێنـەپێشـەوە، سەرەڕای باری هەرێمی و نەتـەوەیی پارت، کە سەریـان دەکـردە سـەر بۆ وەدەست هێنـانی دەسـەڵاتی سیـاسی. لەبـەر ئەو هۆیـانـە، بارو دۆخی عیـراق لەوەدا نەمـابـوو ڕێگای چاوەڕوان کردنێکی زۆر بدات، تا دەهات دۆخەکە زیاتر سەرەولێژ دەبووەوە، بە جۆرێك کە هەموو لایـەنـەکـانی بزووتنـەوەی نیشتمـانی و ئەو دەسکـەوتـانـەی گەل کە بە هۆی خەباتێکی درێژخایەنەوە هاتبوونە دی، تووشی مەترسی بن. ئەوە سەرەڕای ئەوەی دۆخی عیـراق لەوەدا نەمـابـوو، ئیتـر ئارام بگـرێت، بێجگـە لەوەی بزووتنەوەی شۆڕشی عەرەبی کەوتبووە ژێر بارێکی گران و ترسناکترو هەڕەشەلێ کراوتر.

لە کاتێـك دا پارت کە هەوڵی ئەوەی دەدا پێـویستی یـەکـانی ڕاپـەڕین و ڕووخاندنی دەسەڵاتی عارفی بدات و مـوگەر بکات، دەبوایە ئەم لایەنانەی خوارەوەشی ساغ بکردایەتەوە:

(١). بایـەخ دان بە هاوپـەیمـانێتی تایبـەتی، بە گوێـرەی پێویستیە واقیعی و تەکنیکیەکان کە تایبەتین بە ڕاپەڕین و دەسەڵات گرتنە دەست.

(٢). کۆششی دڵ سـۆزانـەو کاری بەردەوام لە چوارچێـوەی بەرەیـەك دا، تا دەتوانرێ هێزی نیشتمانی و نەتەوەیی بە پێشکەوتنخوازەکان بگرێتەوە.

(٣). تا دەتـوانێ هەوڵی ئەوە بدات، نێـوەنـد سیـاسی و عەسکەری یەکان لە زۆرانبازی نێوانی و دەسەڵاتی عارفی بێ لایەن بکات.

لەبەر هەڵمەتی چەکدارانە بۆ سەر ڕژێمی عارفی و ڕووخاندنی، لە ڕووی تەکنیکیەوە لە تواناداا نەبوو، ئەگەر هێزەکانی پاسەوانی کۆماری کە دەوری کۆشکی کۆماریان دابوو، سەنگێکی تایبەتیان تێیدا نەبێت، لەو کاتەدا وا پێویستی کرد کە پەیمان لەگەڵ (داود)دا ببەسترێت کە فەرماندەی ئەو هێزانە بوو. ئەمـە هەرچـەنـدە کە پارت بە وردی ڕێبـازە سیـاسی و تەمـاعکـاری یـە تایبەتیەکانی (داود)ی دەست نیشان کردبوو.

بەلام (عبـدالـرزاق النـایف)، لەگـەڵ هەوڵ دانـە فێڵبـازی یـەکـانی دا بۆ

نزیـك بوونـەوەی لە پارت و تێ گـەیشتن لە مەبـەستـەكـانی لەگـەڵ نیمچـە خـستنـەرووی ئارەزووەكـانیدا بۆ بەشـداریكـردنی لە كرداری گۆڕینی ڕژێم داو، لەگـەڵ سەركـردنـە سەرێكی زۆر داواكـاری ئیبـراهیم داودیش بۆ پەیمـان بەستنی لەگـەڵ نایف دا، لەگـەڵ ئەمـانـەدا هەمووی، بڕیاری پارت توونـدو ئێجگـارەكی بوو لەوەدا كە هاوكـاری لەگـەڵ دا نەكـرێت، چونكە بە گومان لێكراو دادەنرێت. لە كاتی دانانی نەخشەی شۆڕش دا سەركردایەتی بڕیاری دابوو كە تیپێكی چەكدار لە هەڤاڵە مەدەنییەكانیان ڕابسپێرن، هەر كە شۆڕش دەست پێ كرا ئابلۆقەی نایف بدرێت لە خانوەكەیدا، ئەگەر هەوڵی هاتنەدەرەوەو بەربەرەكانی كردنیشی ـ دا ئەوا لەناوببرێت.

سەركـردایـەتیی قوتـری نەخشەی تەكنیكی شۆڕشی لەسەر بنچینەیێكی وا كێشـابـوو كە پەلامـاری هێنـرەكـانی پاسـەوانی كۆمـاری بدرێت و دەستیـان بەسەردا بگیرێت و عبدالرحمن عارف ـ یشی بە هێزی چەك ناچار بكرێت كە خۆی بەدەستەوە بدات، ئەمەش بە پشتیوانی لیوای دەیەمی زرێپۆش كە بارەگـاكـەی لە (الـورار) بوو، بەرەو بەغـدا بكـەوێتـەڕێ، ئەو بەرە مەدەنیـە ئایـەتیـانـەش كە سەر بە دەزگـای پارتین، دەورێكی تایبەتی ببینن بۆ تەگەرە خـستنە بەر ڕێی بەرەی دوژمنان و، ئەركەكانی شۆڕش جێبەجێ بكەن، تا سـەركەوێت.

لە نەخشـەی سەركـردایـەتیش دا ئەوە دانـرا بوو كە ئەندامان ڕاستـەوخۆ لە هێرش بردنـە سەر پاسـەوانـانی كۆمـاریداو ڕووخـاندنی ڕژێم دا بەشداری بكـەن. سەرەڕای بەشـداریكـردنـی هەنـدێ لە هەڤـاڵـە سەربـازە خانەنیشێن كراوەكان و هەندێكیتر لە هەڤاڵانی مەدەنی لەم كارەدا.

ئەمـەش لە هەڵ سـەنگـانـدنی پێـویستی سەلمـانـدنی مەسـەلەیەكی زۆر گرنـگـەوە هەڵ قوڵا بوو لە ژیـانـی پارتـیداو لە كارگـوزاریـیـە شۆڕشگێـڕییـەكـەیو ڕەوتی دواڕۆژیدا، سەركـردایـەتی پارتی نابێ تەنیـا سەركردایەتی كردنی فیكرو ئاراستەكردن و نەخشـەكێشان بێت و بەس، بەڵكو پێویستە لە ئیشوكارو ڕاپەڕینیش دا پێشڕەو بێت و هەموو مەترسییەكانی بخاتە ئەستۆی خۆی. ئەمەش وای لێ دەكات كە ڕاستەوخۆ بە واقیع و پێداویستیو سەرئەنجامەكانیەوە بەسترابێت.

سەركردایەتی قوتری، وە بە گوێرەی نەخشەیەكی زانستیو تەكنیكییەوە، توانی ئەو لایەنانەی سەرەوە بهێنێتەدیو لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٦ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨دا لە ماڵی ئەمینـداری نهێنی سەركـردایـەتیی قوتـری كۆبێتەوەو چاو بە دوا شـێوەی نەخشـەی ڕاپـەڕینـە چەكـدارانەكەدا بخشێنێتەوەو كاتژمێر سێی بەرەبەیانی ١٧ی تەمووز بە كاتی ڕاپەڕاندنی شۆڕش دابنێ.

**ڕاپەڕاندنی شۆڕش**

---

لە كاتژمێر سێی بەرەبەیانی ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨دا، ئەو هەڤاڵانەی ڕاپـەڕینـە چەكـدارانـەكـەیـان پێ ڕاسپـێـردرابـوو هەڵیـان كوتـایە سـەر كەتیـبەی تانكەكانی پاسەوانی كۆماریو دەستیان بەسەردا گرت و بەتەواوی چواردەوری كۆشكی كۆمـارییـان دا، لە هەمـان كاتیش دا بە تەلـەفۆن لە بارەگـای سەركـردایـەتیی كەتیبـەی پاسـەوانی كۆمـارییـەوە پێـوەنـدی بە (عبدالرحمن عارف)ەوە كراو داوای لێكرا كە خۆی بەدەستەوە بدات و ژیانیشی پارێزگاری بكـرێت و بە سەلامـەتی بۆ دەرەوەی عیـراق ڕەوانـە بكـرێت، (عبـدالـرحمن عارف) لە سەرەتادا ئەم داواكارییەی ڕەت كودەوە، بەڵام كە فەرمان درا بە هێـرش بردنـە سـەر كۆشـك و گوللەبـاران كردنی. . كاتێكیش عارف خۆی بە ئابلۆقەدراویی تەواو دیو زانی كە بەرگەی بەرەنگاری كردن ناگرێت، ملی بۆ داواكاری شۆڕش شۆڕكردو داوای خۆبەدەستەوەدانی كرد. ئیتر دەمەو بەیان لە كۆشكی كۆمارییەوە بەرەو دەرەوەی عیراق بەڕێكرا.

لە كاتی ڕاپـەڕانـدنی شۆڕش دا لیـوای دەیـەمی زرێپـۆش بەرەو بەغـداد كەوتبـووە ڕێ. ئەوەی لێرەدا شیاوی ناوبردنە، سەركردایەتی كاتێ بە كتوپڕی داواكـاریـیـەكـەی نایفی پێ گـەیشت بۆ بەشـداربوونی لە شۆڕش دا، وای بۆ دەچوو كە نایف نەهێڵێت لیوای دەیەمی زرێپۆشی بەرەو بەغداد ببزوێت، بۆ ئەوەی خۆیو پشتیوانەكانی زۆربەبن لەناو ئەو هێزانەدا كە لە ئارادا بوون. . . بەڵكو سەركردایەتی لەو باوەڕەش دا بوو كە نایف ئەفسـەرێك بنێرێت بۆ لای لیـوای ناوبـراوو داوای لێ بكـات كە بوەستن و بەرەو بەغـداد نەكشێن، بە بیـانـووی ئەوەی كە شۆڕش تەواو بووە، ئیتـر پێـویـست ناكـات هێـرشەكەیان بەردەوام بێت. بۆ ئەمەش سەركردایەتی، هەڤاڵانی لیوای دەیەمی ڕاسپارد كە یەجگـار پێـویستـە بە ورەیـەكی بە هێـزەوەو لە هەمـوو بارێك دا بەرەو بەغداد بكشێن و گوێنەدەن بە هیچ فەرمان و داوایەكی دژ بەم ڕاسپاردەیە.

ئەوەی سەركـردایـەتی بۆی چووبـوو ڕوویدا، دوای خۆبـەدەستـەوەدانی عارف، نایف خێـرا ئەفسـەرێكی نارد بۆ لیـوای دەیـەمی زرێپـۆش كە بەرەو بەغـداد كەوتبـووە ڕێ، ڕایسپـارد كە بوەستن و بگـەڕێنـەوە، چونكە شۆڕش سەریگـرتـووەو تەواو بووە. . . بەڵام هەڤـاڵان لەوێ بە وردی ڕاسپـاردەكانی پارتیـان بەجێهێنـاو داواكـەی ئەویـان ڕەت كردەوەو بەردەوام بەرەو بەغـداد كشان، تا لە (ابو غریب)دا جێی خۆی گرت.

لە بەرەبەیانی ١٧ی تەمموزدا بەیاننامەی شۆڕش لە ڕادیۆوە بڵاوكرایەوە، بەڵام بارێكی ئێجگار وردو ناڵەبارو نەسرەوت كەوتبووە نێوان ڕیزەكانی پارت و نێوەندە جەماوەرییەكانەوە دوای بڵاوكردنەوەی پێكهێنراوە نوێیەكەی حكومەتی شۆڕش كە (عبـدالـرزاق نایف) تێـدایـەو پایـەی سـەرەك وەزیـرانی پێدراوە، چونكـە خەبـاتگێـڕانی پارت ئاگـایـان لەو گۆڕانانە نەبوو كە لە دوا ساتەكانی پێشی شۆڕش دا ڕوویدابـوو. . . وە ئاگـایـان لەو نەخشـەیـەش نەبـوو كە لەلایەن سەركردایەتییەوە دانرابوو بۆ لەناوبردنی نایف.

لەناوبردنی نایف كارێكی ئاسان نەبوو. . نایف لەناو هێزەكانی پاسـەوانی كۆماریداو، هەروەها لەناو بینای كۆشكی كۆماریدا هەندێ پشتیوانی هەبوو، وە بارەگای هەڤاڵ ئەمینداری نهێنی سەركردایەتی قوتری پارتیش لەوێ بوو، جا هەر كردەوەیـەك گومـانـی بخـستـایـە دڵی نایف و داودو پشتیـوانـە ناسـراوەكـانیـانـەوە، لەوانە بوو ببوایە هۆی لەناوچوونی سەركردەكانی پارت و

پشتیوانەکانی لە کۆشکی کۆماری. ئەوە بوو لە ٣٠ی تەممووزی ١٩٦٨دا بریار درا کە نەخشە دانراوەکە ورد رابپەڕێنرێت. لەو کاتەش دا داود لە دەرەوەی عیراق بوو.

لە کاتـژمێـر سێی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە نەمرەدا هەندێ لە هەڤاڵە سەرکردەیی یەکان نایفیان لەناو کۆشکی کۆماری گرت، بە شێوەیەکی بەجەرگانەو بە وردی کە ئەو تاقمەی گومان لە دڵسۆزییان دەکرا لە کۆشك و دەوروبەری دا هەستی پێ نەکەن و نەوروژێن، پێش راپەڕاندنی کاری گرتنەکە بە چەند دەقیقەیەك هەڤاڵ شەهید (حماد شهاب) راسپێردرا کە لیوای دەیەمی زرێپۆش بەکاربهێنێت بۆ ئابلۆقەدانی کۆشکی کۆماری لە هەموو لایەکەوە... هەروەها کاری زۆر گورج و گۆڵانە کرا بۆ مسۆگەرکردنی دەست بەسەراگرتنی هێزەکانی پاسەوانی کۆماری و بەرەنگاربوونی هەر ڕووداوێکی تر کە گومانی ئەوەی لێ بکرێت ڕوویدات. لە هەمان کاتیش دا ئەوەی گرنیگ بوو جێبەجێ بکرێت بۆ ناردنی نایف بۆ دەرەوەی وڵات هەمووی ئامادەکرا.

لە کاتـژمێـری شەشی ئێوارەدا ئەمینداری نهێنیی قوتری، بەیاننامە مێژوویی یەکەی ٣٠ی تەممووزی لە رادیۆوە بڵاوکردەوە.

بەم جۆرە بەرەی پیلانگێران کە دژی پارتی و شۆڕش بوون لەناوبردران.

ساتەکانی نێوان کاتژمێر سێی بەرەبەیانی ڕۆژی ١٧ی تەممووزو سێی پاش نیوەڕۆی ٣٠ی تەممووز لە هەموو ساتەکانی تر وردترو ناخۆشتر بوون لە ژیانی پارت و بوون و دوارۆژیداو، لەسەر بزووتنەوەی نیشتمانی لە وڵات و بزووتنـەوەی شۆڕشی عەرەب دا، بەڵام لە هەمـان کاتیش دا، ئەو کاتانە پیرۆزبوون و لەناو جەرگەی مەترسیی ئازارو پەشێوی یەکانی دا شۆڕشی پارت و جەماوەری مەزن، شۆڕشی حەفدەی تەممووزو سی تەمووز لەدایك بوو، بۆ وەدەست هێنانی هیواو ئاوات و خواستەکانی گەل و نەتەوە.

شۆڕشی سپی:

لەبەر ئەمە سەرکردایەتیی پارتی بەعسی سۆشیالستی عەرەب وای بینی کە دەسەڵات وەدەست هێنانی ئەم جارەیان پێویستە زۆرانبازی خوێناوی تێکەڵ نەبێت، کە ڕووی شۆڕش و مەبەستەکانی بشێوێنێت و کارەساتە خوێناوی یەکانی ساڵی ١٩٦٣ بێنێتەوە یاد، لەبەر ئەوە نەخشەی شۆڕش وا دانرابوو کە بە هەڵمەتێکی وردو پتەوەوە لەگەڵ ئاگا لەخۆبوونی تەواوەوە بۆ ڕوونەدانی هیچ جۆرە بەرەنگاربوونەوەیکی خوێناوی ڕژێمی عارف بروخێنرێ، بریار ـ درا (عبدالرحمن عارف) بە سەلامەتی بۆ دەرەوەی عیراق رەوانە بکرێت، پشتیوانەکانیشی بە هەمان شێوە رەفتاریان لەگەڵ دا کراو هیچ جۆرە تۆڵەسەندنی دڵرەقانە دژ بە هیچ لایەنێکی هەڵگەڕانەوەکەی تشرین نەکرا. هەروەها بەرامبەر هیچ کەسێکیش لە دەزگاکانی ئاسایش کە نەتڵی خوێناوی خەباتگێرانی پارت و جەماوەرانی بووە، هەموو جۆرە چەوساندنەوەو ساردیو سوکی پێکردنی تاڵیان دەرخوارد دابوون، تەنیا ئەوانەی لێیان گیردرا گیردران و ئەوانی‌تر وازیان لێهێنرا... تەنانەت سەبارەت بە (عبدالرزاق نایف)یش، بریار ـ درا کە بە بالیۆزی بۆ دەرەوەی عیراق بنێردرێ... هەروەها هەمان شتیش لەگە (ابراهیم داود)یش بکرێت.

سەرکردایەتی زۆر بە تەنگە ئەو رێبازەوە بوو، رێگای هیچ جۆرە خوێن رشتنێکی نەدەدا مەگەر لەو پەری ناچاری‌داو بۆ پاراستنی شۆڕش و پارت نەبوایە... لەو قۆناغەدا هیچ جۆرە بارێکی وا نەهاتە پێشەوە کە پێویستی بە توندو تیژی خوێناوی بێت.

ئەم ڕێبازە ئەنجامی سوودبەخشی خۆی سەلماند.. شۆڕش بەرەنگاری، کاری پێچەوانەی توندو تیژ نەبووەوەو، بارێکی گرژ لە وڵات دا نەخولقاو پارت توانی یەکەم قۆناغی شۆڕش بە سەلامەتی ببڕێو هەر لە سەرەتاوە خۆی بۆ کاری ئیجابیو بنیاتنان تەرخان بکات.

دروشم و تەکنیکی «شۆڕشی سپی» زۆر ڕاست بوون و لە کاتی خۆی‌دا ئامانجە سیاسیو دەروونی یەکانیان بەتەواوەتی بە جێگەیاند.

چارەسەرکردنی بارو دۆخەکان

---

شۆڕشی حەفدەی تەممووز، لە یەکەم ڕۆژەوەو بۆ ماوەی چەند مانگێك دوای ئەوە ناوی «شۆڕشی سپی» لێنرا. پارتیش لەو کاتەدا بە پەرۆشەوە دەیڕوانیە ئەو ناو لێنانەو، بەپێی شیکردنەوەیکی سیاسیو دەروونیانە کە شوێنەوارەکانی بەسەر نەخشەی شۆڕش و کارەکانی پارتی‌یەوە لە دوای شۆڕشەوە دیاربوون.

عیراق ساڵەهای دوورو درێژ لە گەرمەی زۆرانبازی‌یە خوێناوی‌یەکان دا ژیا کە لە نێوان هێزە نیشتمانی‌یەکان دا ڕووی دەدا، لەو ماوەیەدا خوێنی هەموو هێزە نیشتمانی‌یەکان لە هەموو لایێکی وڵات دا ڕژا بێ ئەوەی ئەنجامێکی بەسەند بە دەستەوە بدات کە پێوەندی بەهێنانەدی ئامانجە نیشتمانی‌یە گشتی‌یەکانەوە یان بە دەسکەوتە زۆرەکانی‌یەوە هەبێت، پاشگەزبوونەوەکەی تشرینی... هتد، ئەمانە هەمووی هۆی ئەوەی پێوەندی‌یەکانی نێوان پارت و هەندێ لە بەرەکانی جەماوەران (سلبی) بێت.

شۆڕشی تەممووز، هەر لە ڕۆژانی یەکەمی سەرکەوتنی‌دا، وە بە گوێرەی تیۆری‌یە زانستیو شۆڕشگێری‌یەکەیەو وردو چاونەترسانە، دەستی بە چارەسەرکردنی بارو دۆخی سیاسی و ئابووریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری کرد، بۆ ئەوەی ئیتر دەرفەت و بواری ئیمپریالیزم و کۆنەپەرست و پیلانگێران، باو نەبینێت، جارێکی‌تر یاری بە وڵات و میللەت و سامانی گەل بکەنەوە.

لە ڕووی سەربەخۆیی سیاسی‌یەوە، شۆڕشی ١٧ ـ ٣٠ی تەممووز، دەستی دایە پاك کردنەوەی بنەرەتی تۆرە سیخوریی و بەکرێگیراوەکان و رزگارکردنی وێتی نیشتمانی لە هەموو کۆنێك، ئینجا «بنیاتنانی دەسەڵاتداری‌یەکی ناوەندیی نیشتمانی بەهێز».

لایەنی بیریو ڕۆشنبیریش بایەخێکی بنچینەیی هەبوو لە پتەوکردنی سەربەخۆیی سیاسی‌دا، چونکە ئەگەر میللەت رزگار نەبێت لە زەبری

كارتێكردنی فیكریو ڕۆشنبیریی بێگانە، لە پاشەڕۆژدا، بەشێكیان بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆوە هەر لە ژێر ئەم كارتێكردنانەدا دەمێننەوەو ئەمەش بارێكی گران و ژەهرێكی مێشك خۆرە.

لەبەر ئەمە، شۆڕش زوو داوای ڕۆشنبیركردنی تێكڕا گەل و، لاوان بەتایبەتی، كرد. . . ڕۆشنبیریێكی نەتەوەییو سۆشیالستیو دیموكراتیانە، بۆ ئەوەی ببێتە قەڵایەكی سەخت دژی ئەو تیۆرو تەوژمە فیكریو ڕۆشنبیرییە بێگانانەی، لەگەڵ ئامانجە نەتەوەییو مرۆڤایەتییەكانمان دا ناگونجێن.

بەم جۆرە، بەپێوەكردنی دەسەڵاتداریتی شۆڕش و سەركردایەتی كردنی لەلایەن پارتەوە، سەركردایەتییكی نیشتمانیانەی توندوتۆڵ، ناوەڕۆكێكی ڕاستەقینەی بەسەربەخۆی سیاسی بەخشیو، بەسەر دەرزگاكانی دەوڵەت و دەستە جۆربەجۆرەكانیدا سەپاند، كە لە هەڵوێستی خواستی نیشتمانی سەربەستانەوە، بەرژەوەندییە نیشتمانیو نەتەوەییەكانەوە، ڕەفتار بكەن.

لە ڕووی سەربەخۆیی ئابووریشەوە، شۆڕش ڕووبەڕووی ئەركی دوو شەڕ بووەوە، كە شەڕی بەرهەم هێنانی نیشتمانیانەی نەوت و شەڕی بەرهەم هێنانی نیشتمانیانەی گۆگرد بوو، سەرەنجام، توانی خەونی گەلی عیراق و هەموو پێشكەوتوخوازانی جیهانی وەدیبهێنێت لەو كاتانەی كە زەبری كاریگەری لە كۆمپانیا مۆنۆپۆلەكانی نەوتی ئیمپریالی وەشاند، كە یاریان بە سامانەكانی گەلی عیراق دەكرد بە درێژایی دەیان ساڵ.

بە گەڕانەوەی ئەم سامانە مەزن و سەرەكییە، شۆڕش نەخشەی گەشەی تەقینەری كێشاو دەستی دایە پیشەسازیكردنی وڵات و كردنی عیراق بە دەوڵەتێكی پێشكەوتوو لە پیشەسازیدا.

شۆڕی (١٧ ـ ٣٠) تەمموز، بایەخێكی زۆری بە نەخشەكێشان و بەرنامەكانی پەرەپێدان ـ دا، بە ڕادەیەك توانیان پاش ماوەیەكی كەم دەوری مەزنی خۆیان لە گەشەپێدان و ڕێگای گۆڕانكاری سۆشیالستیانەدا ببینن.

## شۆڕش و . . . خۆڕێیەری بۆ كوردستان

پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالست، هەر لەو ڕۆژەی شۆڕشی تەمموزی بەرپاكردو سەركردەی شۆڕشی كرد، لەبەر ڕۆشنایی نەخشەیەكی وردو زانستانەدا، ڕووی كردە مەسەلەی هەڵایساوی نێو عیراق. . مەسەلەی كورد، بۆ ئەوەی ئەم كێشەیە چارەسەر بكات، چارەسەركردنێكی بنەڕەتیو ئاشتیو دیموكراتیانە.

ئەوە بوو بەیاننامە مێژووییەكەی ئادار لە یازدەی ئاداری ساڵی ١٩٧٠دا، وەك چوارچێوەیەكی ڕاست و دروستی چارەسەركردنی ئاشتیو دیموكراتیانەی مەسەلەی كورد بانگی بۆ ڕاهێلرا. . . بەمەیش پەیوەندیی برایانەی هەر دوو گەلی كوردو عەرەب، خرایە مەودایەكی باشترو خەباتی هاوكۆیان ڕەگاژوتركراو، گەلی كوردی قارەمانیش، لە دەرەتانی مێژووی هاوچەرخی خۆیدا، هەنگاوێكی گەورەی بەرەو پێشەوە هەڵ هێناو جۆرەها ئامانج و هیواو دووربینیو چەشنەها خەباتیتری هاتە كۆڕی سیاسەتی سەرجەمی ئەم گەلەوە، بەتایبەتی پاش جاڕدانی یاسای خۆڕێیەری كوردستان و دامەزراندنی هەر دوو ئەنجومەنی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دەیان دەسكەوتی تری مەزن كە ئەم ناوچەیە بە خۆیەوە بینی.

دوژمنان هەمیشە هەوڵی ئەوەیان داوەو دەدەن كە ڕەنجە دڵسۆزەكانی شۆڕش لەم ناوچەیەدا پەك بخەن و كۆسپ بێننە ڕێگەی، بەڵام ئەم جۆرە بیرو باوەڕە، ئەمڕۆ لە هیچ سووچێكی ناوچەكەدا جێی نابێتەوە، ئەو ڕەنجە دڵسۆزەی پارت و شۆڕش دایان، سەوز بوو و هاتە بەرو بە بیرو باوەڕی ڕەسەن لە قووڵایی گەل دا بنجی داخست و ڕیشەی داكوتاوەو لەسەركردایەتییە مێژووییەكەی دوور ناكەوێتەوەو بەرەی نیشتمانیو نەتەوەییە پێشكەوتووخوازەكەی دەپارێزێت و ئامادەیە پارێزگاری لەو مافانە بكات كە دەستی كەوتووە و دەسكەوتە نیشتمانییەكانیتر لەگەڵ جەماوەری گەل دا بپارێزێت.

**عیراقی نوێو . . . پیلانی دوژمنان**

لە ئەنجامی دەسكەوتی گەورەو مەزن و ڕەوتی دیاری شۆڕش، ئیمپریالیزم و زایۆنیو كۆنەپەرست و دوژمنانی شۆڕش، بۆ ئەوەی ڕێ لە ڕێبازی پەرەپێدان و عیراقی نوێ بگرن و چوولانەوەی شۆڕش لە سنوورێكی بەر تەسك و دیاریكراودا بوەستێنن و نەتوانێ كاروانی ئامانجە پیرۆزەكانی بەرێتە سەر، دەیان پیلانیان داناو هەوڵی ڕاپەڕاندنیان دا ـ بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ ـ.

دوای ئەوەی ئیمپریالیزم و زایۆنیو دەست و بێوەندەكانیان هەموو هەوڵ و توانای خۆیان تاقیكردەوەو بۆیان سەلما كە ڕاستەوخۆ ناتوانن دەست لە عیراقی صدام حسین بوەشێنن، هەڵسان ئەم ئەركەیان بە خومەینی سپارد بۆ ئەوەی لە چواری ئەیلوولی ١٩٨٠دا دەست درێژ بكاتە سەر خاك و ئاو و گەلی عیراقی نوێ.

لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە گشت ئەو داستانانەی هێزە چەكدارەكەمان و تێكڕا گەلی عیراق، دژ بە دەستەی گومڕاو چەپەڵی قوم و تاران وەدەستیان هێناوە، بەسەر بكەینەوە، تەنیا ئەوەندە دەڵێین: شۆڕش زەبرێكی بەژانی سەرەواندە دوژمنان و ئەوانەی داویان بۆ عیراق دەنایەوەو پشتی ئاواتی پەل هاویشتن و پیلانی ئیمپریالیزم و زایۆنی عەجەمەكانی شكاند . .

لەشكری قادسیەی نوێ بە سەركردایەتی سەرلەشكری لێهاتووو بێنموونەی سەرەكی تێكۆشەر (صدام حسین) خوابیپارێزیت، سەری نیشتمانیوگەل و نەتەوەی عەرەبی بەرزكردەوە. نەك هەر لە مەیدانی جەنگ دا، بەڵكو لە مەیدانی پەرەپێدان و پێشكەوتنیش دا، كە هەوڵی وەستاندنی ڕێڕەوەكەیان دەدا، لەو مەیدانەشیدا، عیراقی نوێ توانی بەردەوام هەنگاوی بەرەو پێشەوەتر هەڵ بنێو. . . ڕۆڵەكانی عیراق بەرپرسیاریی خۆیان دەزانن وزیاتر ڕەنجیان داوەو دەدەن بۆ بنیاتنانی پرۆژەو بەگەڕخستنی مەكینەی ئابووریو بەردەوامی

ز یانی رۆژانەی سروشتی. . . لە هەموو شوێنەکان دا بێ ماندووبوون کار دەکەن.

## شەڕفرۆشیو دوژمنایەتی:

ستەمکارانەی فارسی ڕەگەزپەرست، هەرچەندە درێژە بکێشێت دەبێتە مایەی تێك شکاندنی مەکینەی دەستدرێژیو دوژمنایەتیی فارسی لەلایەکەوەو، پەرەسەندنی هێزی سوپاییو ئابووریو سیاسیو کۆمەلایەتیو مەعنەویی عیراق لەلایەکیترەوە.

هەر کە ئەم باسەش دەکرێت، یەکسەر دەبێت پەنجە بۆ دەوری مەزنی بەڕێز سەرەکی تێکۆشەر (صدام حسین) خوابیپارێزێت ڕابکێشرێت.

بەشداری‌یە مەزن و کاریگەرەکانی سەرەکی لێهاتوو تێکۆشەر (صدام حسین)، لە فیکری عەسکەریو لە کاری هونەرەکانی جەنگ دا پڕشنگدارە لە بەشداری‌کردنە گەورەکانی‌تری، بۆ بنج داکوتانی بنەماکانی تیوری بەعسیانەو پەرەپێ‌دانی داهێنەرانە بۆ فیکری پارت، لەپاڵ سەرکردایەتی‌کردنی بۆ کاری ئاوێتەبوونی بەردەوامی نێوان تیوریو پراکتیك.

ئەم بەشداری‌کردنەش بایەخە سەرپەرو کاریگەرەکەی لەپاڵ خاسیەتەکانی خۆی‌دا هەڵ دەخات، وەك لە چەندین چارەسەری فیکریو عەمەلی‌دا کە لەنێو جەرگەی جەنگ و لەپاڵ سەرکردایەتیی (صدام حسین)ی شۆڕە سوارەوە هاتۆتە کایەوە بۆتە نموونەی نویشکێکی فیکریی ڕادەبەدەرو بەرز بۆ گشت لایە عەمەلیەکان، کە دەبێتە مایەی ڕۆشن کردنی ڕاستە ڕێگەی بەردەم سوپای دلێرو گشت گەلەکەمان و. . . لە هەمان کاتیش دا دەست نیشانی گشت شێوازو هۆیە نوێو باس نەکراوەکان دەکات، بۆ ڕووبەڕووبوونی هەموو ئەگەرێك کە لاپەڕەکانی لەمەولای جەنگ دەگرێتەوە، بە جۆرێك کە دەبێتە مایەی دەست گیرکردنی بەرزترین ئەنجامێك لە کۆڕی جەنگ و سەرکەوتنی هەمیشەییو یەك جارەکی بەسەر فارسی دوژمن دا.

هاتنەناوەوەی پیشەسازی عەسکەریو ڕادەی بەرزی ئەو پێشکەوتنەی عیراق لەم ڕووەوە دەیبینێت، بەتایبەتی لە ڕووی خۆدرووست کردنی مووشەکەکانی (الحسین) کە جیهانی سەرسام کردو، عونسرێکی پتەو و بەهێزی خستە مەیدانی جەنگ بۆ ئەوەی باشترو وردتر تەرازووی جەنگ بەلای عیراق بێت و بۆ بەرژەوەندی عیراق بمێنێتەوەو ئاشتی نزیك بکاتەوە ئەمانە هەموویان، بەرهەمی بیری تیژ و زانستانەی بەڕێز سەرەکی لێهاتوو تێکۆشەر (صدام حسین)ن.

بەڵێ. . بەم شێوەیە شۆڕشی مەزنی تەمموز، بەسەرکردایەتی شۆڕەسوار (صدام حسین)، ساغی‌کردەوە کە لە هەموو دوژمنان و لە هەموو نەهامەتیو تەنگانەیەك دا بەهێزترە. شۆڕشێکە نوێ‌یە لە تەرزدا. . . شۆڕشێکە بۆ کامەرانیی مرۆڤ و پێشکەوتنی مرۆڤ کار دەکات. . شۆڕشی هەموو گەلەو برواداری پێشکەوتن و یەکیەتیی هەموو گەلە.

## سەرچاوەکان

---

بۆ ئامادەکردنی ئەم باسە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


١ ـ علي طعمة، صدام حسين، الفكر والممارسة، منشورات مؤسسة الهيثم، بيروت، ١٩٨٣.

٢ ـ وتاری بەڕێز سەرۆکی فەرماندە صدام حسین لە ١٧ی تەمموزی ساڵی ١٩٨٧دا.

٣ ـ ڕۆژنامەی «القادسية»، ژمارەکانی (٢٢٠٢)و (٢٢٠٣)و (٢٢٠٦).

٤ ـ ڕاپۆرتی سیاسیی سەربەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی، کانوونی دووەم ١٩٧٤.

٥ ـ گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ژمارە ١١٤ی حوزەیران ١٩٨٧.

٦ ـ گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ژمارە ١٠٧ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٥.

٧ ـ گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ژمارە ٩٤ی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٨٢.

٨ ـ گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ژمارە ١٠٩ی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٨٦.

٩ ـ ڕۆژنامەی «الثورة»، پاشکۆیەکی تایبەتە بە یادی دەیەمی شۆڕش، ١٧ی تەمموزی ساڵی ١٩٧٨.

١٠ ـ الحكم الذاتي عمق وحدة العراقيين، منشورات دار العراق للصحافة والنشر، ١٩٨٦

١١ ـ گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٠ی تەمموزی ساڵی ١٩٨٣.

١٢ ـ گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ٤٦ی تەمموزی ساڵی ١٩٨٦.

١٣ ـ گۆڤاری «ڕۆشنبیریی نوێ»، ژمارە ١١٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٧.

١٤ ـ الاعلان القومي، اصداء وافاق، وزارة الثقافة والاعلام، دائرة الاعلام الداخلي العامة، السلسلة الاعلامية (٨٩).

١٥ ـ ڕۆژنامەی «هاوکاری»، ژمارە ٩٠٧.

١٦ ـ ڕۆژنامەی «هاوکاری»، ژمارە ٨٨٩

# عندما حمل السيد الرئيس القائد صدام حسين راية الموقع الأول في الحزب والثورة.

نشمية منصور

**تمر علينا الذكرى العشرون لثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز المجيدة متضمنة ذكرى عزيزة ليوم خالد آخر هو يوم تسنم السيد الرئيس القائد صدام حسين لمنصب رئيس الجمهورية واستلامه الموقع القيادي الأول في الحزب والدولة. ورغم ان بحثنا هذا قد خصص للثورة المجيدة الا ان فكر سيادته ونضاله وحكمته وتدبيره كان قبل الثورة وبعدها المنار الأول لمسيرة الحزب وثورته. فهو رجل الحزب الاول ورجل الثورة ورجل الفكر والنظرية والتطبيق العملي. انه رجل التاريخ الذي سطر بنضاله وذهنه وفكره وعمله تاريخاً جديداً لجانب عظيم من سفر امة مجيدة. انه الرفيق المناضل القائد المنصور صدام حسين ـ حفظه الله ـ**

عندما تعاظم مسيرة الثورة وتتعمق تدابيرها وتتضح مضامينها المركزية وتترسخ قاعدتها الجماهيرية، ياخذ الفعل الثوري طابع الشمولية كمنهج يحتوي المعطيات ويحدد المسارات الآنية والمستقبلية... وثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز التي قادها حزب معروف بتقاليده النضالية الاصيلة وتسلحه بعقيدته القومية الاشتراكية، تقف اليوم وبعد عشرين عام من تسلسل الافعال الثورية على ارض الواقع.. تجربة متميزة ومنهجاً جديداً في البناء الثوري والمواجهات المصيرية والترابط الصميمي بين المهمات الوطنية والمهمات القومية.

ونمو الثورة وتصاعد تدابيرها يكشف عن مضامين حركة التغيير الثوري من خلال اعتماد النظرة العقلانية الثورية واحكام التوقيت وحساب الصفحات المتعددة على صعيد المواجهة وعلى صعيد اصدار القرار.

ويتطرق البحث الى ان ثورتنا لم تكن حدثاً عابراً او انقلاباً يضاف الى جملة الانقلابات التي شهدها العراق والعالم الثالث بل كانت حركة تغيير جذري شمولي استهدف بناء تجربة عميقة الجذور والابعاد والمضامين في الموقع السياسي وفي المواقع الاجتماعية والاقتصادية والثقافية والتربوية... وكان منهج الثورة وسوف يظل يعتمد على بناء الانسان الجديد وبناء المجتمع الجديد بافاق قومية اشتراكية تضع الانجاز القطري في سياق الطموح القومي الستراتيجي.

يستعرض المقال الاوضاع والظروف والتحديات على الساحتين القطرية والقومية قبل اندلاع الثورة. ويتطرق الى ثورة الرابع عشر من تموز عام ١٩٥٨، والمسارات الشاقة والمعقدة، والمراحل المختلفة التي ناضلت فيها الثورة وفي اصعدة مختلفة في آن واحد.

فيها الثورة وفي اصعدة مختلفة في آن واحد.

يتصفح المقال ـ تأريخياً ـ واقع القطر قبل اندلاع الثورة وكيفية تخطيط مناضلي الحزب لتفجيرها ـ وعلى رأسهم القائد الملهم المناضل صدام حسين (حفظه الله).... والى اهم الخصوصيات الخاصة بالثورة وقطعها الاشواط الصعبة والشاقة.

يستعرض المقال ابرز الانجازات والمكاسب الثورية التي حققتها الثورة على الاصعدة كافة لتحقيق امل جماهيرها ودفع عجلة التقدم الى الامام وبناء الانسان العراقي الجديد كي يجد نفسه ودوره في بناء المجتمع العراقي الاشتراكي المزدهر. ثم يوجز المقال محاولات ومخططات اعداء الثورة من الصهيونية والامبريالية والطغمة الخمينية الحاقدة بغية النيل من عراق صدام حسين (حفظه الله) واشعالهم نار الحرب وفرضها على العراق العظيم.

يختتم المقال بذكر الملاحم البطولية لجند القائد الملهم وسطرها اروع الانتصارات على الطغمة الحاقدة في ايران. ثم ذكر كيفية دخول عنصر آخر مضاف الى عناصر التفوق العراقي في الحرب ذلك البدء بالتصنيع العسكري واعتماد القطر على امكانياته الذاتية في التسليح، خاصة في صنع صواريخ الحسين لدك اوكار الدجل والشعوذة في عاصمة المعتدين طهران والمدن الايرانية الاخرى.

# سوڵتان سەنجەری سەلجوقی
# کوردستان سلێمان شاهـ ئەبوهـ

م. جەمیل ڕۆژبەیانی

## پێشەکی:

دۆستی بەڕێزم «مامۆستا مەلا شکور مصطفا» کە بەڕاستی پشکنەرو لێکۆڵەرو توێژینەرەو تورکی وفارس وکوردیو عەرەبی چاك ئەزانیو پیتە لاتینی یەکانیش ـ تەنانەت هی تورکیاو ئادەربایجان شارەزایەو لە خوێندنەوەی بەرهەمی نووسەرانیان دا سەرکەوتووی ناو خوێندەوارانی کوردە. ئەم مامۆستا بەڕێزە جارجارە منیش لەگەڵ خۆیا بەکێش ئەکا بۆ هەندێ باس کە بەڕاستی بۆ گەیشتن بە ئەنجامی ڕاستەقینەی بابەتەکە تووشی مانویەتیەکی زۆر دەبین. بەڵام دەرچوون بێ کە مرۆڤ توانی خۆی عەودال کا بۆ ئەوەی بەپێی دەسەلاتی شتێ لە باسەکە هەڵبکرێنیو خزمەتی زمانەکەی بکات لە ڕووی میژوویی و ئەدەبی یەوە ـ مەخابنە نەیکات..

مامۆستا شکور لەم ڕۆژانەدا بەشی دووەمی ئەو ووتارەی بۆ ناردم کە لەتورکیی ئادەربایجانی یەوە بەناوی «میژووی کورد لەسەدەی شازدەیەم»دا وەری گێراوە بە کوردی ـ بەشی پێشوی بلاو کردوتەوەو من شتێکم لەسەر نووسیبوو ووتارەکە پەڕمویە بەزۆر سەرچاوەدا، و خۆی لە خۆیا ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی «شەرەفنامە» و هەندێ کتێبی ترە کە دەربارەی میژووی صەدەی شازدەیەم دواون.[1] کاکی نووسەر خۆی زۆر ڕەنجی کێشاوەو هەوڵی داوە ڕاستەقینە بدۆزێتەوەو هەڵەکان ڕوون بکاتەوە، بەڵام بەداخەوە بەسەر زۆر هەڵەدا سادەیانە تێپەڕیوە کە ئەمەیان بۆ یەکێك ـ موقیت بژی ـ کە هەزاران هەزار کتێب و سەرچاوەی باشی تیایە دەربارەی میژووی کورد ـ نابێ ڕوبدات، دەبوایە هەڵی بسەنگێنیو ئنجا زۆر ورد لەسەری بنوسێ.. ئەو ئەم کارەی نەکردووە دەبێ ئێمە بیکەین، بەڵام هەروەك کوردواری ووتویانە: (کنگرو ماستیش بە وەعدەی خۆی) من جارێ نووسین لە سەر ووتارەکە ئەهێڵمەوە بۆ هەلێ کە هەمو ووتارەکە بەراوورد بکەم ولێی بکۆڵمەوە، بەڵام ئێستەکە وەك بەرکوڵ لەم سێ سەرناوە ئەدوێم:

«سوڵتان سەنجەری سەلجوقی ـ کوردستان ـ سلێمان شاهـ ئەبوهـ.» لە خودی ووتارەکە کە مامۆستا شکور وەری گێراوە بەکوردی ئەم چەند دێرە هەڵئەێنجم:

(ئەو خاکەی کوردی لەسەر دەژی سەردەمانێکی دوورو درێژ میژوونووسانی ئێران و عەرەب بە نێوی جۆراجۆری واوەیان نێو بردووە ئێمە لە سەرچاوەکان دا ئیدی تووشی نابین بەڵام لە ناوەندی صەدەی دوازدەهەم دا سوڵتان سەنجەری سەلجوقی بۆ ئەوەی سەر سنوری ویلایەتەکانی نێوان ئاذەربایجان و لوڕستان ـ لەمانە هەمەدان و دینەوەرو کرماشان ـ دیاری بکات و بەشی ڕۆژهەڵات بە کرماشانەوە بیەستێ بەشێکی لە کوردستان بە سەربەخۆ جاڕداوە هەر بەناوی ئەو خەڵکەویشی لێی دەژیان نێوناو لەپاش ئەوە لە دەساوێژ و قۆچانی ڕەسمیی دەوڵەتی سەلجوقی ناوی کوردستان نووسرا، شاری «بەهار»یش بو بە پایتەختی سوڵتان سلێمانی برازای سوڵتان سەنجەری سەلجوقی لە ساڵانی ١١٦١دا بو بە پادشای ئەو شارە (٥/١١٧) ئیدی بەم ڕەنگە دیروك نووسی ئێرانی «حەمدولای قەزوینی» ناوی کوردستانی بۆ یەکەم جار لە کتێبەکەیدا نووسیو چەسپاندی) ـ ٦٢، ١٢٧ز، ١٢٩ ـ ....) کە سەرنجی ئەم دێڕانە ئەدەم بۆم دەرئەکەوێ نووسەری ناميلکەکە ئەم دێڕانەی لە کتێبی (بلدان الخلافة الشرقية) کەی «لیسترنج»ەوە گواستوتەوە نەوەك لە «نزهت القلوب»ی ]موستەوفی قەزوینی»یەوە گەرچی خودی ئەو دیاردیشی بۆ لاپەرەکانی (نزهت القلوب) کردووە.. جگە لەم کاکی ئاذەربایجانی یە بەهەشتی «ئەمین زەکی بەگ»یش لە بەرگی یەکەمی (خلاصة تاريخ الكرد وكردستان)دا ٣ ـ ٤ ـ ٥ ـ هەر ئەم باسەی لە «لیسترنج» وەرگرتووە، گەرچی ناوی (نزهت القلوب في المسالك والممالك)ی هەر لە خۆڕا بردووەو پاشکۆی (في المسالك والممالك)یشی بۆناوی کتێبەکە زیاد کردووە. جارێ با لێرەدا دەقی ئەوەی لە (نزهت القلوب)دایە بکەین بە کوردی بۆ ئەوانەی ئەم کتێبەیان نەدیوە، ئنجا ڕەخنەکان ڕاست بکەینەوە: لە لاپەرە ١٢٧ نزهت القلوبی چاپی کتێبخانەی طەهوری تاران بەم جۆرە نووسراوە:

(بابی دەیەم باسی جێگەکانی کوردستان: کە ئەویش شازدە ویلایەتە، هەوای ناوەنجی یە سنوری نووساوە بە ویلایەتەکانی عیراقی عەرەب ـ

خوزستان ـ عیراقی عەجەم ـ ئاذەربایجان ـ و دیاربەکرەوە، مزەی دیوانی ئەم ویلایەتە (وارداتی وەزارەتی سامان و دارایی) لە سەردەمی «سلیمان شاهـ بوە» (!؟)دا نزیکەی دو صەت تومانی ئەم سەردەمەبووە، بەڵام ئێستەکە بیست تومان و پێنجصەد دینارە کە هاتۆتە دەفتەرەوە. ویلایەتەکان ئەمانەن: (ئالانی ـ ئالیشتەر ـ بەهار (دژێکە سەردەمێ پایتەختی سلیمان شاهـ ئەبوهـ بووە) ـ خفتیان ـ دەربەند تاج خاتون ـ دەربەند زەنگی ـ دزبیل ـ دینەوەر ـ سوڵطان ئاباد چەمچەمال ـ شارەزور ـ کرمانشاهان ـ کرندوخوشان ـ کەنگەوەر ـ مایدەشت ـ هەرسین ـ وە سطام) ئەمە دەقی نووسینەکەی «نزهت القلوب»ە کەناوی سوڵطان سەنجەری تێدا نی‌یە، تەنیا ناوی (سلیمان شاهـ ئەبوهـ) هەیە کە سەری لە مێژ ونووسان تێك داوە، هەروەك لەمەودووا لێی دەدەوێن: ێسترنج لوسترنك ـ سەرزەوی ناسێکی (جوغرافی) لێزان و پەیجوییکار بووە فارسیشی زۆر باش زانیوە زۆر سەیرە چەند شتێك ئەداتە پاڵ «موستەوفی قەزوینی» کە نە لە «نزهت القلوب»و نە لە «تاریخی گزیدە»دا هەیە، ئەمین زەکی بەگیش هەر ئەمە لێی ڕوویداوە، من خۆیشم کە «شەرەفنامە»م وەرگێراوە بە عەرەبی لەبەر ئەوەی سەرچاوەی مێژوویم نەبووە پشتم بە ئەمین زەکی بەگ و هەندێکی تری قایم بووە بەسەر هەڵەکانا بە سادەیی تێپەریوم. ئەمەدەقی نوسینەکەی (لیسترنك)ە ـ کە بەشیر فرانسیس و گورگیس عەواد کردویانە بە عەرەبی: (ئەوەی کە دەربارەی بنەچەی ئیقلیمی کوردستان دەوترێ ئەمەیە: دەگێرنەوە: کەلەنیوەی صەدەی شەشەمدا (سەدەی دوازدەیەم) سولطان سەنجەری سەلجوقی بەشی لای خۆرئاوای هەرێمی چیای (اقلیم الجبال) ـ واتا ئەوی سەر بەکرمانشایە ـ دابڕی وناوی‌نا «کوردستان»و «سلیمان شاهی برازای کردە فەرماندەی ـ کە بە نازناوی ئەبوهـ یا ئەبو ـ ئەناسرا. ئەم سلیمان شایە لەوەدووا لەساڵانی ٥٥٤ ـ ٥٥٦ك (١١٥٩ ـ ١١٦١ز) بوو بەجێ نشینی مامی لە سەرۆکایەتی بنەماڵەی سەلجوقی و پادشایی هەردوو عیراق دا. کوردستان لە سەردەمی سلێمان شادا گەشایەوەو پەرەی سەند گەشانەوەیێکی زۆر بە شکۆ بەجۆری کە دەرئامەدی بەرزەوە بو بۆ دو ملیون دیناری زێڕ ـ کە ئەکا نزیکەی دو ملیون ئیسترلینی ـ ئەو دەرئامەدە دە قاتی ئەوەی ئێستەیە کە ئیقلیمەکەلەم سەدەی هەشتەمە (چواردەمەیە)دا ـ کە سەردەمی دەسەڵاتی مەغولە وموستەوفی نووسەر خۆی کۆکەرەوەی (موستەوفی) دارایی و سامانی دەوڵەت بووە.. سلیمان شاهـ «بەهار»ی کرد بووە پایتەختی خۆی (٢٢٧. ٢٢٨) سەردێر ئنجا با بێینە سەر هەڵەکان:

ناوی سوڵطان سەنجەری سەلجوقی هاتووە، ئەویش لە لاپەڕە (٢٦)دا بەم جۆرە: شیخ زاهید عەبدالرەحمانی خازینی جێوەجیوەییکی (جدول) ڕێك خست بۆ سولطان سەنجەر کە بەهۆیەوە بتوانرێ لە هەموخاکی ئێران دا لای قیبلة بناسرێ... ئیتر ناوی سوڵطان سەنجەر نەهاتووە، باسی ئەوەش کە وولاتی بەش کردبێ بە چەند ئوستان ئەویش نەهاتووە.

ب ـ بەر لە سولطان سەنجەر ناوی (وڵاتی کورد) ـ کە ئەکات کوردستان ـ بەپتر لە صەت ساڵ پێشتر هاتووە:

١ ـ ئیبن حەوقەل ئەبوقاسم محەمەد کوری حەوقەلی بەغدایی کە لە نیوەی صەدەی چوارەمی کۆچیدا مردووە لەو نەخشەیەدا کە بۆ کتێبەکەی کێشاویە (لاپەرە ٣٥٦ چاپی عەرەبی ـ ١٠٢ ترجمەی فارسی) لە بەشی هەرێمی چیادا (الجبال) لە سەر بەشێکی نەخشەکەی نووسیوە (مصایف الاکراد ومشاتیهم) ئەمە بەڵگەیێکە لەسەر ئەوەی لەوەبەر جێی کوردەکان دیار بووە.

٢ ـ «مەحمود کوری حوسەینی کوری محەمەدی کاشغەری» ـ کە ساڵی ٤٦٦ك مردووە ـ واتا پێش لە دایك بوونی سوڵطان سەنجەر بە چەند ساڵ ـ لە کتێبی «دیوان لغات الترك»دا نەخشەیێکی تایبەتی بو وڵاتان کێشاوە و ناوی «بلاد الاکراد = کردستان»ی تۆمارکردووە.

جا بەمانەدا بۆمان دەرئەکەوێ ئەوەی ووتراوە کە ناوی کوردستان لە سەردەمی سوڵطان سەنجەری سەلجوقی‌یەوە پەیدابووە ڕاست نی‌یەو پشتیوانەیێکی مێژویی نی‌یە.

ج ـ هەرگیزاو هەرگیز سلیمان شای برازای سولطان سەنجەر نازناوی (ئەبوهـ) یا (ئەبو) یا (ئیوە) یا (ئیوائی) نەبووە. ئەو تەنیا لەلایەن (خەلیفەی عەبباسی‌یەوە نازناوی (معزالدین ابو الحارث)ی دراوەتێ و لە سەردەمی سەنجەریشدا هەرگیز فەرماندەی (بەهار = وەهار) نەبووە، ئەو لە سەرەتادا کراوە بە سەرداری قەزوین، پاشان دژی سولطان مەسعود شۆرشی کردووەو خراوەتە زیندان، کە سوڵطان محەمەدی سەلجوقی لەسەر تەخت دانیشتووە، سلیمان هەڵاتووە بەرەو خوراسان بۆ لای سەنجەری مامی و کردویە بە جێ‌نشینی خۆی (وەلی عەهد)، کە سوڵطان سەرنجەر لەلایەن غوزەکانەوە دیل کراوە سلیمان هەڵاتووە بۆ بەغداو پەنای بردۆتە بەر خەلیفەو ناوی سوڵطانی داوەتێ بەڵام سوڵطان محەمەدی سەلجوقی بەسەریا زاڵ بووەو لە موصل خستویەتی‌یە بەندیخانە، پاش مردنی سوڵطان محەمەد ساڵی (٥٥٥ ك) کراوە بە سوڵطان، بەڵام چونکە بێکارەو هەمیشە سەرخۆش بووە (ئەرسەلان کوری طوغروڵ سەلجوقی)یان لەجێ‌ی داناوە، و لە قەڵای (عەلاء الدەولە کاکۆیە) لە هەمەدان خستویانەتە زیندان و تیا مردووە (ساڵی ٥٥٦ ك) تەنیا هەشت مانگ پادشایی کردووە، ئیتر چۆن گومان دەکرێ لە سەردەمی پادشایی هەشت مانگی کابرایێکا کوردستان بووبێ بە بەهەشت و گەنجینە؟؟!!

ی ـ کەوابێ با بگەرێن بزانین ئەم سلێمان شاهەی کە کوردستان لە سەردەمی ئەوا بۆتە بەهەشت کێ‌یە؟ مێژ ونووسان بۆچ سلیمان شای کوردی «ئەیوانی = هەیوانی»یان لێ بووەنە سلێمان شای (ئیوائی = ئیواقی) تورکمان؟؟ ئەم نازناوانە (ئەبوە، ایوە، ایوا) لەکۆیوە هاتوون:

١ ـ ساڵی ٥٦٨ ك (برجم ایوائی) بە هەندێ تورکمانەوە یاخی‌بوو شاڵاوی کردە سەر هەمەدان و شاری دینەوەری تاڵان کرد «ئیلدەکز پاڵەوان» کە فەرماندەی ئەو ناوە بوو و لەلایەن خەلیفەوە نێررابوو بۆ سەر (نەخچەوان)، هەر کە ئەم

هەواڵـەی بیست بە پەلـە گەڕایـەوە بۆ هەرێمەکە جا (برجم) لە ترسا هەڵات بەرەو خواروو «ئیلدەکز» تا نزیکی پردەکەی خانەقین ڕاوی‌نا (١١/ ٣٥٩ الکامل)

٢ ـ ساڵی ٦١٠ خەلیفـە «سلێمـان کوڕی ترجم»ی لە فەرمـانـدەیی عێڵی ئیوائی تورکمـان لادا و برا بچکـۆڵـەکـەی دانـا بە فەرمـانده، سلێمان سکاڵای بردە بەر «منکلی» ـ کە یەکێ بوو لە کۆیلەکـان و ساڵی ٦٠٨ ولاتی چیـای داگیـر کردبوو ـ ناردی برا بچکۆڵەکەی سلیمانی کوشت (١٢/ ٣٠١ الکامل

٣ ـ ساڵی ٦١٤ك کە لەشکـرەکـەی (خـوارەزم شاهـ عەلاءالـدین محـەمـەد کوڕی تەکش» ولاتی چیـای داگیـرکـردو بەرەو بەغدا بە لەشکرەوە کشا لە دەوری هەمەدان بەفرێکی زۆر ڕێی بەستن و زۆریان لەناوچوون، لەم هەلەدا عێڵەکانی بەنی (هـەکـاری) کوردو (بەنی برجم)ی تورکمان ـ مەبەسـت ئیوائی‌یە ـ تاڵانیان کردن ١٢/ ٣١٧

٤ ـ ساڵی ٦٢٣ك «ئیوائی» لە دەوروبەری ئورمیە بوون و شارەکانی «ئەسنە = شنـو و ئورمیـە»یـان داگیـرکـرد و باج و پیتـاکیان لە شاری خوێ وەرگرت و کەوتنە تاڵان و یـرۆ «سـولطـان جەلال الـدین خوارەزم شاهـ» کە چوبـووە سەر شـاری «خـلاط»و گەمـارۆی‌دا بوو لە ترسی ئەوەی نەوەك بەفـر ڕێیـان بگـرێ و بە کارەسـاتـەکـەی زانی گەڕایـەوە بۆ سـەرکـوت کردنیـان و لەنـاکـاو دای بەسەریانا کوشتـارێکی زۆری لێ‌کـردن وزۆری بە دیل گرتن وژ ن ومنداڵەکانیانی کرد بە کۆیلە ١٢/ ٤٦٢ الکامل

٥ ـ ساڵی ٦٥٢ك دەستـوێنی (بـرجم ئیـوائی) ئاژاوەوخراپەیێکی زۆریان لەو ولاتی چیـا ددس پێ کرد لە بەغـداوە لەشکـرێکی بەهێـز نێـررایـە سەری‌و کوشتـارێکی زۆر کرا لە ئیـوائی‌یـەکـان و سەرەکـانیان بردن بۆ بەغداو زۆریشیان بەدیل گرتن ٢٣٩١١ / ١١ الکامل

٦ ـ سلیمان شاهـ کوڕی برجم کە پێشەنگی تیرەی ئیوائی‌یە لە تورکمانەکانە ٢/ ٣٧٠ ابن ابی الحدید شرح نهج البلاغة). بەرچەم لەسەر سەنگی جەعفەر تیرەیێکە لە تورکمانان و لە ئەسەد ئاباد نیشتەجێن (تاج العروس)

لەم دەربـڕینـانـە بۆمان دەرئەکەوێ تیرەیێکی تورکمان هەبووە ناوی (ئیوائی یا ئیواقی) بووەو جارجارە بە ناوی سەردارە گەورە کەیانەوە (برجم یا بەنی برجم)یان پێ‌وتووە ـ کە مەبەسـت ووشەی (پەرچەمی تورکمانی‌یە (واتا ئاڵا کە لە تووکی لە کلکی ولاغی بەرزە دوروست ئەکـرا)وا دیـارە ئەو سلیمـان شاهـەی کە کوڕی پەرچـەمی سەرۆکی ئیـوائی‌یـە پاش ئەم هەرایـانـە براوەتـە بەغـداو بەهـۆی ئەو تورکمـانـانـەی کە لە دەزگـای خەلافـەتـا پێشکـەوتـوبـوون لە دەربـاری خەلیفە نزیـك کراوەتـەوە و بووە بە یەکـێ لە گەورەپیـاوان. . وە خوشـکـێکی داوە بە (بدرالدین لولوئی) والي موصل. . ئەوەبوو کە ساڵی ٦٥٦ هولاکو سەری پەڕاندو سەرەکەی نارد بۆ (بدرالدین لولوی زاوای کە لەوێ سەرەکەی بکات بە دارا.

مێـژ ونووسـان ئەم سـلێمان شـاهـ ئیوائی تورکمانەی کوڕی بەرچەمیان لە جێی (سلیمان شـاهـ ئەیوانی = هەیوانی) کورد بە هەڵە کردووە بە پادشای کوردستان و شـاری (بـەهـار = وەهـار)ی لای هەمـەدانیـان کردووە بە پایتـەختی، ولەولاوە کردویـانـە بە برای ژنی (سـولطـان جەلال الـدین خوارەزم شاهـ) کە لەوەپێش هەمـویـانی قەلارکردو ژ ن وماڵیانی کرد بە کۆیلە!!! لەلایێکی تریشەوە کردویانە بە برای ژنی (شـەرەفـالـدین ئەبـوبـەکـری کوڕی بەدرالـدین محـەمەدی کوڕی خورشیـدی پادشـای لوڕی بچـوك). ئەم هەڵـەیـانـە هەر لەبەر ئەوەڕوی داوە کە هەردوکیـان لەسـەردەمی «هـولاکـو»دا ژیـاون و هەردویـان هەر لەو دەورەدا کوژ راون. . وەکو ڕوونی ئەکەینەوە: جارێ با دەقەکان بنوسین:

١ ـ ڕەشیـد الدین فەضل اللاە لە کتێبی «جامع التواریخ» ب١ لا ٦٠٦ نووسیویە:

لە سەردەمی خەلیفە موستەعصەم دا «حسام الدین خەلیل بدر خورشید بلوچی» (لـوڕو بلوچی بە یەك دانـاوە) کە یەکێ بو لە سەردارانی کورد سەر شورکـردن بۆ خەلیفـەی خـستـە پشتگـوێ‌وخۆی دایـە پەنـای مغـول، لە سەرەتـاوە ڕوی کردە «خـۆلـەنجـان»ی سـەر بە «نەجەف» (مەبەستی نەجەف ئابادی لای ئەصفەهانە) پاشـان دای بە سەر دەست و پێـوەنـدانی (سلێمان شـاهـ) داو کوشتـارێکی زۆری لێ‌کـردن و تاڵانی کردن و لەوێـوە ڕوی کردە قەڵای «وەهـار = بەهـار» کە هی سلێمان شاهـ بو گەمارۆی‌دا سلێمان شاهـ کە ئەم هەواڵەی بیست داوای ماوای لە خەلیفە کرد وبۆ ڕەتاندنی (حسام الدین خەلیل) ڕوی کردە وەهار و تا گەیشتە حەلـوان هێـزێکی زۆری کۆکـردەوە، حـسـام الدین خەلیلیش هێزێکی زۆری لە موسوڵمانان و مغول پێك هێنا لەجێگەیی ناوی «سەهەر»ە تەقین بەیەکا، سلیمان شاهـ بوسـەیێکی (کـەمین) سازکـردبـو، کە شەڕ گەرم بوخۆی بە شکـاو دانـاو وهـەڵات حـسـام الـدین خەلیل ڕاوی ناو کەوتە دوی تا لە بوسەکە ڕەت بوون، لەم کاتەدا لەشکر لە کەمینەوە ڕاپەڕین و دەوریان گرتن زۆریان لێ کوژ راو خەلیل دەستگیـرکـرا و کوژ را براکـەی پەنـای بردە چیـا پاشـان داوای ئەمـانی کردو هاتە خوارەوە. سلیمـان شاهـ دو قەڵای لە ولایـەتی لوڕستـان داگیـرکـرد: یەکـەم «شیگـان» کە دژێکی زۆر سـەخت و بە پشتـە ـ دووەم قەڵای «دز» کە لە ناوەنـدی شاری «شاپور» دابو

٢ ـ حەمدوللاە موستەوفی لە کتێبی «تأریخ گزیدە» لاپەرەکانی ٥٥٢ ـ ٥٥٧ دا بە وەرگـرتن لە کتێبی «زوبـدەت التەواریخ»ی ئەبو القاسم جەمال الدین محەمەد عەلی کاشی ـ کە ساڵی ٨٣٦ك مردووە نوسیویە:

کە شوجـاع الـدین خورشیـدی پادشـای لوڕ مرد «سـەیف الـدین ڕۆستـەم» محـەمـەدی برازای لەجێی دانـرا حـسـام الـدین خەلیـل بەدری کوڕەزای شوجـاع الـدین لەم کارە تووڕەبو چولە «دار الخەلافە = بەغدا» دانیشت، پاشان خەڵکی لوڕستان «سـەیف الدین ڕوستەم»یان لادا وکوشت و «شەرەف الدین ئەبو بەکـری برایـان کرد بە پادشـاهـ. . » ئەم شەرەف الـدین خوشکی سلیمـان شای خواستـووە ـ کە ئەم شـەرەف الـدین ئەبـوبەکـرە ژار خوار کراو مرد «عیـزالـدین گرشـاسـف»ی برای لەجێی بووە پادشـاهـ وژنـەکەشی خواست کەناوی «مەلیکە خاتون» بو خوشکی «سلیمان شاهـ» بو کە لەمەودوا بە نازناوی (شیهاب الدین ئیـوە) ناو ئەبـرێ حسـام الـدین خەلیـل بەدر کەئـەمـەی بیست لە بەغداوە چووە خوزسـتـان ولەشکـرێکی پێکـەوەنا و شاڵاوی کردە سەر عیزالدین گرشاسف وبە سەریـا زاڵ بو بەلام لەبـەر خاتـری «مـەلیکە خاتون» کردی بەجێ نشینی خۆی

زۆری نەبرد لە گەڵی تێکچوبانگی کردە لای خۆی و کوشتی «مەلیکە خاتون» ئەو سێ کورەی لە «عیزالدین گرشاسف» بوبوی و ناویان: شوجاع الدین خورشید، سەیف الدین ڕوستەم ونورالدین محەمەد بو وهێشتا منداڵ بوون ناردنی یە لای «شهاب الدین سلیمان شاه ئیوە»ی برای، ئەمە بووە هۆی دوژمنایێتی ی سەخت لەنێوانی حسام الدین خەلیل بەدر و شیهاب الدین سلیمان شاه ئێوەدا بەجۆری کە لە یەك مانگدا (۳۱) جار کەوتنە شەررموە سەر ئەنجام «سلیمان شاه» شکاو هەڵات و قەڵای بەهار و هەندێ لە ویلایەتی کوردستان کەوتە ژێر دەستی لورەکان. بەڵام پاش ماوەیێ سلیمان شاه لەگەل حسام الدین کەوتەوە شەڕ ولەسەر سنوری «دهلیز» شکستی دا بە حسام الدین و گەڕایەوە.

حسام الدین خەلیل لە تۆڵەی ئەم شکستەدا چووە سەر «عومەر بیك»ی برای لەگەل کومەڵێ کەس و کاریا هەموی کوشتن. ئەممما یەوەتا چەند ساڵێ ئنجا «سلیمان شاه» بەیارمەتی «دار الخلافە» بەشەصت هەزار سوار و ونۆ هەزار پیادەوە چووە سەر «حسام الدین خەلیل»، ئەم بە سێ هەزار سوار و ونۆ هەزار پیادەوە لە بیابانی «شاپور»دا بەرانگاری بو لە سەرەتادا سلێمان شکستی خوارد، بەڵام ڕای نەکرد وپێ ی داگرت حسام الدینیش جەختی لەسەر شەڕ کرد وکوژ را، سەرەکەیان برد بۆ سلیمان شاه و لاشەکەیان سوتاند سلێمان شاه ووتی: ئەگەر بە ساغی بتان هێنایە لام ئەمانم ئەدا وە ئەم چوارینە فارسی یەی ووت:

بیچارە خلیل بدر حیران گشتە ×× تخم هوس «بهار» درجان کشتە

دیو هوسش ملك سلیمان میجست ×× شد درکف دیوان «سلیمان» کشتە

ئەمە کوردیی چوارینە کەیە:

خەلیلی بەدری بێچارە سەری لێ شیوا ×× ئارەزووی تەختی «بەهار»ی لێ بووە هێوا

خێوی هەوەسی موڵکی سلیمانی ئەویست ×× دیوی سلێمان کوشتی و (لور قوری پێوا)

هەژار لە وەرگێڕانی شەرەفنامەدا چوارینەکەی بەم جۆرە کردوتە کوردی:

بێچارە خەلیل خشتی دڕا بەر پشتی ×× ئاواتی بەهاری ڕشت بەخوێن شوشتی

دێو هاتبو تا تەختی سولەیمان بگرێ ×× دێوێکی سولەیمانی گەیشتێ کوشتی

ئەم شەڕو هەرایە ساڵی (٦٤٠ = ١٢٤٢) ڕوی داوە...

٣ ـ عەلاءالدین عەطا جوینی کە ساڵی (٦٥٨ك کتێبی تەئریخی جیهان گوشای) نوسیوە ناوی سلێمان شاه ی نەبردووە، بەڵام لەو ذەیلە چەند لاپەرەییەدا کە دراوەتە پاڵ نەصیرالدین طوسی سێ کەس بەگەورە پیاوانی سەردەمی «موستەعصەمی خەلیفە» دانراون: وەزیر ـ دواتدار ـ سلیمان شاه..

(٣/٣٨٠ ٢٩٠)

٤ ـ ئێمە باسەکە لە شەرەفنامەوە ئیدی وەرناگرین، چونکە ئەو یا ڕاستەخۆ لە کتێبی زوبدەت التەواریخی وەرگرتووە، یا لەتەئریخی گوزیدەوە..

ئنجا بابێ ینە سەر ئەوەی کە ئەم (سلیمان شاه)ەکێ بووە؟ سلێمان ئیوائی کوری پەرچەم، کە خۆیان وعێڵەکەیان هەر دەمە لەجێ یی بوون (شنو ـ ئورمیە ـ ئەسەد ئاباد)!! یاخود ئەم سلیمان شاهە کورد بووە و پادشای بەهار بووە و جارجارە لە تاو شاڵاوی حسام الدین خەلیلی سەر بە مغول خۆی لە بەغدا قایم

کردوە؟ بۆیەکەم جار «زانای بەرێز محەمەد عەبدالوەهابی قەزوینی» کە «تەئریخی جیهان گوشا»ی چاپ ـردووە بە توێژینەوەولێ کولینەوەیێکی زانایانەوە پەراوێزیکی زۆری لە سەر ـ ـسیوە، لەلاپەرە ٤٥٠ ـ ٤٦٢ ب٣ دورو درێژ باسی ئەم سلیمان شاهەی کردووە، پاشان ڕای خوی دەربارەی بەم جۆرە دەربڕیوە کە گومانی ا... دبێ ئەم سلیمان شاه پادشای کوردستانە چۆن دەبێ **سلیمان** شاه ئیوائی پیاو گەورەی بەردەستی موستەعصەمی خەلیفەبێ جانوو **سیوریە**: (... لەگەڵ ئەوەش دا کە نیشتەجێی گای سلیمان شاه. ـ وەك ڕوون کرایەوە ـ لە هەرێمی کوردستاندا بووە بەڵام نازانرێ پاش ئەوە کەی؟ چووەتە دەربەری خولەفا؟ وشا... ـدای کردوتە نیشتەجێ ی خوی؟ هەر ئەوەندەم بۆ دەرئـ ـەوێ ئەم پیاوە لە... ی بیست ساڵێکی دوادوایی ژیانیا تا کوژ ڕانی لە هەرای هولاکودا لەڕیزی سەرداره گەورەکانی بەغدادا ناوی هاتووە...) ب٣ ٤٥٥ ـ ٥٦٢ پەراویز

وادیارە محەمەدی قەزوینی چاوی بەکتێبی (مونتەخەب التەواریخی موعینی ی نەطەنزی نەکەوتووە کە ساڵی ١٣٣٦ لە تاران چاپ کراوەو ساڵی ١٣٣٥ هـ. ش. «ژان اوبن»ی مێژ وزانی فەرانسی پێشەکی بۆنوسیوە و هەڵەکانی ڕاستکردۆتەوە ئێمە ئەوە لێرەدا وەرئەگرین کە ئەوکتێبە دەربارەی چون کوژ ڕانی سلیمان شاه نوسیویە ئەوەبومان ڕون ئەکاتەوە کە (سلیمان شاه ئیوائی تورکمان)و سلیمان شاهی کورد پادشاه وەهار هەرگیز یەك نین:

١ ـ لە تەئریخ گوزیدە وشەرەفنامەدا نوسراوە: (پاش کوژ ڕانی حسام الدین خەلیل بەدر براکەی لەجێی دانیشت کەناوی «بەدرالدین مەسعود» بو، ئەم پادشایە بۆ سکاڵا ڕوی کردە دەرباری «منگو قائان»ی مغول لەوێ ووتی: من لە بەر ئەوەی کەخۆم بە سەر بەنێوە دەزانم لە «دار الخلافە» یارمەتی دوژمنەکانم ئەدەن وبۆ ئەوە هاتوم بگەنە فریاما بەکۆمەك، جا لەگەل «هولاکو»دا ناردیانەوە بۆ ئێران کاتێ کە بەغدا گیرا داوای لە هولاکو کرد: پاش سەرکەوتن (سولەیمان شاه) بە ئەو بسپێرن تاتۆڵەی لێ بسێنێتەوە. هولاکو ووتی: ئەم قسەیە زۆر زلە ئەوە تەنیا خوا ئەیزانێ، کە بەغداد داگیر کراو «سلێمان شاه» کوژ را «بەدرالدین مەسعود» داوای کرد خانم و کەس و کاری بە ئەوبسپێرن، ئەو بردیانی یە لورستان و بە خێوی کردن تا بەغدا جارێکی تری ئاوەدانەوەبو، ئەوجەلە بەخانمەکانی ووت: ئەوانەی ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بەغدا با بڕۆن، ئەوانەی نایانەوی بڕۆن وئەمێننەوە لەخزم و کەسی خۆم مارەیان ئەکەم، هەندێکیان چونەوە بەغداو هەندێکیان مانەوە مارەیانی کرد لە کور و خزمەکانی. (شەرەفنامەی فارسی لاپەرە ٦٦ ـ ٦٧ عەرەبی ٦٢ ـ ٦٣ وتەئریخی گوزیدە ٥٥٥ ـ ٥٥٨

٢ ـ ئەمە دەقەکەی «مونتەخەب التەواریخی موعینی نەطەنزی»یە:

(.... حسام الدین خەلیل کوری بەدر کە لەگەڵ سلیمان شاه کەوتە شەڕەوە زۆر ئازایانە شاڵاوی دەکردە سەر لاکانی ڕاست و چەپ و جەرگەی لەشکرەکە، بەڵام لە ناکاو لە ئەسپەکەی گلا و هێزەکەی سلێمان شاه بەدیل گرتیان و بەشمشێر دایان پاچی تا پارچە پارچەیان کرد. پاش کوژ ڕانی «بەدرالدین

مەسعودی برای ساڵی ٦٤٠ چووە دەربـاری «خـەطا» ئنجا لەگەڵ (هولاکوخان) داگەڕایەوە ئێران کە بەغدا داگیر کرا، لەشکرێکی «مغول»ی هێنایە سەر «سلێمـان شـاهـ»و لە تۆڵەی براکـەیا کوشتی و کەس و کاری ناوماڵی دابەش کرد بەسـەر نزم ترین کەسـانی تیرەی لوڕدا. . . . تا ئەڵێت: پاش مردنی «بەدرالدین مەسعود» پەی دەرپەی لە نێوانی کوڕانی «حسام الدین خەلیل بەدر»و کوڕانی (سلیمـان شـاهـ)دا شەڕ و هەرا ڕوی ئەدا و پەنـایـان ئەبـردە بەرسەردارانی مغول سەرئەنجـام ئەوانـەی کوڕانی «حـسـام الدین»یان ئەپاراست قـەیان چوبەگوێی «ئاباقاخان»دا و دوستوری‌دا کوڕانی سلیمان شاهیان هەمو کوژتن. لاپەرە ٥٩.
لەم دەقـانـەی کە هەڵێنجـرا زۆر بەڕونی بۆمـان دەرکـەوت کە «سلیمـان شاهـ پادشـای کوردستان کە شاری وەهار = بەهار پایتەختی بووە هەرگیز برازای سوڵطان سەنجەری سەلجوقی نەبووەو هەرگیزاو هەرگیزیش کوڕی پەرچەمی ئیوائی ئیـواقی تورکمـانیش نەبـووە ـ کەوتمـان یەکێ بووە لە کۆڵەکەکانی خەلافەتی عەباسی لە سەردەمی موستەعصەم دا وئەوەبو کوژ را و سەلکەکەی نێررایە موصل کە بەدرالدین لولوی زاوای ببینێ و لەسەر شەقامی موصل بۆپەند بیکات بە دارا. .
هەروا دەبێ بزانین کە «مەلیکە خاتـوون» خوشکی سلیمان شـای کورد بووە نەك سلێمانی ئیوائی هەروا جەلال الدین خوارەزمیش هەر خوشکی ئەم سلیمان پادشاهـ کوردەی خواستووە بۆ ئەوەی لە کورد نزیك بێتەوە هەروەك لە کوردستانی ئەولاش خوشکی مەلیك ئەشرەفی باپیرەگەورەی ئەمیر شەرەفخانی خواستبو هەر بەونیازە، بەلاّم خود پەسەندی وکەمترخەمی دای بەکوشت

پەراوێز:

---

(١) لێرەدا نووسەر باسی بیروڕاکانی د. محمد اسکندر اوغلی (شمس)ی مێژ وونووسی ئاذەربایجانی سۆڤیەتی دەکات لە کتێبەکەی‌دا «شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی وەکو سەرچاوەیەك. بۆلێکۆڵینەوەی مێژ ووی گەلی کورد» (باکۆ، ١٩٧٢، ١٤٣ لاپەڕە) کە لە بنەڕەت دا نامەی دکتۆرا بوو لەلایەن ئەکادیمیەی زانستەکانی کۆماری ئەذەربایجانی سۆڤیەتی‌یەوە لەساڵی ١٩٦٧دا دەمەتەقێی لەسەرکرا. ئەمەش دووەمین وتارە کە مامۆستا شەکور مصطفی دەی‌کا بە کوردی.
(٢) ئەمەی ناوکەوانە واتا (لوڕ قوڕی پێوا) لەلایەن وەرگێڕەوە بۆسەنگی هەڵبەست زیادکراوە

# السلطان سنجر السلجوقي ـ كردستان ـ سليمان شاه أبوه

## م. جميل الروژبياني

ترجم الأديب الملاشكور مصطفى من التركية الآذربايجانية الى الكردية كتاباً عنوانه (كردستان في القرن السادس عشر) واتخذه مقالات متسلسلة، نشر القسم الاول منه في (روشنبيرى) وكنت علقت عليه بحواشي، والآن قد عد القسم الثاني منه للنشر وأطلعني عليه فوجدت فيه اخطاء وقع فيه المؤلف وغيره من القدماء أمثال (ليسترنج في كتابه بلدان الخلافة الشرقية) ومحمد امين زكي بك في كتابه خلاصة تأريخ الكردوكردستان وغيرهما

والاخطاء التي اعتنيت بتصحيحها في هذا المقال:
١ ـ ان ما قيل من ان السلطان سنجر السلجوقي فصل مواطن الكرد وسماها (كردستان) غيرصحيح.
٢ ـ ان ماقيل من ان سليمانُ شاه السلجوقي ابن اخي السلطان سنجر كان يلقب (أبوه) وكان ملك كردستان وعاصمته (بهار)، غير صحيح
٣ ـ ان ماقيل من ان سليمان شاه بريرچم الايوائي التركماني الذي قتل في حملة هولاكو على بغداد عام ٦٥٦هـ وارسل برأسه ليعلقه بدرالدين لؤلؤ حاكم الموصل ـ وكان زوج أخته ـ على شوارع الموصل وانه هو الذي قتل حسام الدين بدر أمير لرستان ان هذا الرأي خطأ.
فسليمان شاه ايواني هيواني الذي كان ملك كردستان وعاصمته (بهار) كان كرديا وهو الذي قتل (حسام الدين بدر) ثم اقتص منه اخوه مجدالدين فقتله في حملته عليه في كردستان بمعونة من قوات المغول في نفس العام.
وبهذه التصحيحات تنفرج امام قراء التأريخ مسالك مشرقة

# چۆنێتی وهۆکارەکانی پەیوەندیگردنی صلاح الدین لەگەڵ خەلیفە المنصور الموحدی

د. محسن محمد حسین
ئوستادی یاریدەدەری مێژووی ئیسلام
بەشی مێژووی کۆلێجی پەروەدەکردن زانکۆی بەغداد

پێشەك:

ڕای لێکۆڵینەوەی مەوضوعیی ڕووداوو کارەساتی مێژوویین پێویست بەوە دەکات کە خاوەن ڕا توانایەکی تەواوی خوێندنەوەی لەسەرخۆی کتێبگەلی کەنەپووری هەبێت، ئەم خوێندنەوەیەش وەنەبێت بۆ فێربوون و شارەزابوونی وردی نووسینەکانی پێشینان و سەرنجدانێکی قووڵی ئەو نووسراوانە بێت و ...س. بەڵکو بۆ ئەوەبێت ئەنجامێکی بەرێوجێ (معقول)ی ئەوتۆی ...وەبەدەست بێنێت کە ئەو ڕووداوو کارەساتە بە شێوەیەکی ماقوولتر ...ی بکاتەوە، نەك هەر بە کۆمەڵە ڕووداوێکی دوابەدوایەکی لێك دابراوو ...یت تەریك و بێپەیوەند دابنێت. واتا مێژوویەك لەبەر ڕۆشنایی موتالآیەکی سەروەرو تێروتەسەلی کتێبگەلی کەلەپووردا لێك بدرێتەوە، مێژوویەکی ...مەبەستەو لەسەر بنەمای ئەوتۆی سازدەبێت کە ئەنجامگەلی چاوەڕوان کراوی لێوە پەیدادەبێت. ئەم مەبەستەش ئەوە نییە کە وەکو دەڵێن مێژوو خۆی تازەدەکاتەوە، بەڵام ڕووداوی زۆریش بە درێژایی زەمان، بەردەوام ڕوویداوەو هۆکاری هاوشێوەو چونیەکیان بووەو ئەنجامگەلی چاوەڕوان کراوو جەخت بۆ هێنراویان لێکەوتووەتەوە. ئەوەتا مێژوو بەزم و ڕێچکەو مانای خۆی هەیەو دیارە جگە لەوە ـ جاروباریش ـ دەتوانین لە چوارچێوەی سەرچاوەکان دەرچین و نهێنییەکی زۆریش بدۆزینەوە کە نووسەرانی ئەو ڕووداوو کارەساتانە دەریان نەبڕیوە. بۆیە ئەگەر چۆنێتی ئەو ڕووداوانە بهێنینەوە بەرچاوو بەراووردیان بکەین دەتوانین دووبارە پێکهاتن و دروست بوونیان بهێنینەوە یادو سەرلەنوێ تێکهەڵکێشیان بکەینەوە، هەرچەندیشە ڕابوردوون و هیچ شتێکیشیانمان لەبیرنەماوە، دووبارە تێکهەڵکێشانەوەی کارەساتی ڕابووردوو، بەم تەرزە، شتی سەیری وەهامان بۆ دەخاتەڕوو کە لە ڕێی ئاسەوارو بەڵگەنامەشەوە پەیپێنەبراوە ئەوەشە سوودی شیکردنەوەو لێکدانەوەی مێژوو.

ئەم باسی پەیوەندییەی نێوان صەلاحەددین و خەلیفەی المنصور (الملك الموحدي یعقوب* کوڕی یوسف کوڕی عبدالمؤمن کوڕی عەلی)یە، باسێکی ئاڵۆزاوەو هەندێ مێژوونووس و نووسەرانیتر، کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا ناومان بردوون لێی دواون، بەڵام باسەکەیان نەگەیشتووەتە ئەو پایەیەی کە ئێمە دەمانەوێت، هەندێکیشیان باسەکەی کورتوکوڕە، یان باسی لایەنیتری ئەم مەبەستەیان کردووە.

لە چمکێکی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، باسێکی قروقپی سەرچاوەکانی سەردەمی صەلاحەددینمان کردووە کە هیچ شتێکیان دەربارەی چۆنێتیی ئەو پەیوەندییەو نامەو نامەکارییەی نێوان ئەو دوو جیهادکەرە (المشرقي والمغربي)یە نەنووسیوە. ئەم بێدەنگییەش شتێکی واق وڕهێنە. ئەو بارو دۆخەشمان ڕوون کردووەتەوە کە صەلاحەددینیان ناچارکرد داوای کۆمەك و

یاری لەو خەلیفەیە بکات.

جا ئەو بارودۆخە هەلومەرجی پێداویستی سەندنەوەی ئەو زەوییانە بێت کە خاچدروشمان داگیریان کردبوو، یان لە ناچاریی پەیوەندیی ساردوسڕو لالووت و - جاروباریش پەیوەندیی ناکۆکی - نێوان ئەو دوو پێشەوایەوە هاتبێتەکایەوە.

بەڵێ جێی خۆی بوو صەلاحەددین ڕووی کۆمەکی سەربازی لە خەلیفە **(الموحدی) بنێت و داوای لێبکات کە بەشێك لە کەشتیگەلە بەهێزەکەی بە دەریادا بنێرێت بۆ سەر عەکاو لە کۆششی بێپشووی صەلاحەددین دا کە بۆ ڕەوانـدنـەوەی ئەڵقەی بێ‌کەڵێنی گەمارۆی ئەم شارە گرنگە بەختی‌دەکرد یاریـدەی بدات، بەڵام هیـچ کۆمـەکێکی لە خەلیفـەوە بۆنـەهـات. لە لایەکی‌ترەوە ئەوەشمان ڕوون کردووەتـەوە کە خەلیفەش حەقی بوو دەستی یارمـەتیی بۆ درێـژ نەکـرد چونکـە باری ناوخـۆی وڵاتـەکـەی لەوەنـەبـوو کە بتوانێت و، ئیسپانیو پورتوگالی‌یەکانیش لە نیمچە دوورگەی ئیبریادا مرخیان لێخۆش کردبوو، سەروەریش تەنگیان بە موسوڵمانانی ئەو وڵاتە هەڵدەچنی کە زەوییەکانیان پێ‌چۆڵ بکەن و دەستیان بە سەردا بگرنەوە.**

**واش پێدەچێ کە مەسەلەی** نازناو (الالقاب)یش لەو سەردەمەدا کارێکی **گرنگی لە چاکیو خراپیی** پەیوەندیی نێوان سەرۆکانی موسوڵمانان کردبێت، **سەرەرای ئەوە لە نێـوان هەنـدێ** کاربـەدەستـانی هەردوولادا واتـا ئەیـوبیو **دەوڵـەتی (الموحـدیە)دا** تێك ترنجان و نیگەرانی گەلێك ڕوویان دا، ئەوانە بە گشتی بوونە هۆی ئەوەی کە هەلی دۆستایەتی نێوان هەردوولا نەرەخسێت و پەیوەندی‌یەکی چاك لە نێواندا نەیەتە کایەوە.

**(باسەکەمان:)**

دوای ئەو سەرکـەوتنـە مەزنـەی کە لەشکـری صەلاحـەددین لە شەڕە یەك لایی‌یە (حطین)دا وەدەستی‌هێنا، ئەو سەرکردەیە گورجانە لەشکری کردە سەر (عکا). بێ‌گومان ئەم سەرگەرمیو گورجوگۆڵی‌یەشی بلیمەتیو لێزانینی شەڕو کارسـازیـی سـەربـازیو کارزانـیو شارەزایـیو دووربـینـیـی ئەو سەرکردەیەمان بۆ دەردەخات، چونکە گرتنەوەی شاری عەکا، بوو بە کوتەکێك لە تیـرەغـەی پشتی دوژمنی داگیـرکـار درا. ئەوبـوو ئەو شارە بوبوو بە بەردی بناغەو کۆمەك گای هەموو ئەو ئاواکراوو نشینگانەی کە خاچدروشمان لەسەر خاکی فەلەستین دایانمەزراندبوون، جگە لەوەش بە (دایکی وڵاتەکەو). خوشکی إرم ذات العمـاد)یش دادەنـرا، سەنـدنـەوەی شاری عەکا، ڕێگای هاتوچۆی ناودەریای نێوان هەردوو تای دەوڵەتەکەشی واتا نێوان میصرو شامی پێکـرایـەوە کە لەوەپێش کەوتبـوە ژێـر ڕکێفی خاچـدروشـمـانـەوە. بەڵێ سەندنەوەی عەکا لە دوژمن کە تەنها دوای حەفتەیەك لە شەڕی پڕشانازیی حطیـن واتـا لە ١٠ی تەمـوزی ساڵی ١١٨٧دا ئەنجـام درا، شاکـارێکی لەشکرگێڕی یەکەم و سەرکەوتنێکی لەشکرکێشی نایابە.

لەبـەرئـەوە صەلاحـەددین خۆی خۆش خۆش سەری لە شارەکـە دەداو لە هەموو کاروبارێکی ووردەبووەوە تا کردی بە قەڵاو قایمکارێکی پڕ ئازووقەو پاریـزگـەیـەکی سەربـازیی بەهێـزی ئەوتـۆ کە بتـوانێت تا ماوەیـەکی زۆر بەرگەبگرێت و شل نەبێت.

هەرچی خاچـدروشـمـانیـشـە، ئەوە کەوتنەخۆو، بۆ داگیرکردنەوەی شارەکە دەستیـان کرد بە دابین کردنی چەك و جبـەخانەو ئامادەکردنی پێداویستی‌ترو، هێـزەکـانیشـیـان لەشکـرێ لە دوای لەشکـر بە سەرۆکـایـەتیی میـرگـەل و کەشیشگەلیانەوە بەرەو خۆرهەلاتی شارەکە ملیان دەنا.

صەلاحـەددینیش کە ئەو هەموو سەرکەوتنانەی دەزگیرکردبوو، دەستی‌کردبوو بە نەخشـەکێشانی پاراستنی ئەو شارانەی کە لە ژێر دەستی‌دا بوون و ڕزگاری کردبوون. ئەوەبو مانگەکانی بەرایی ساڵی (١١٨٩ز/ ٥٨٥ك)ی بە سەردان و لێوردبـوونـەوەی شارە ئازادکـراوەکانی ساڵی (١١٨٧ز/ ٥٨٣ك)وە بردەسەرو لەو ماوەیـەدا، دەوروبـەری (بیت المقـدس)و عەسقـەلان و عەکای پشکنیو تاقیی‌کـردنـەوەو شووراو قەڵاو قایمکـارەکـانی تازەکـردنـەوەو بەرێـوەبردنی ئەم شارانـەشی ڕێـك خست. ئنجـا،داوای لە (تقي الـدین عمر کوری شاهنشا) کرد کە برازای خۆیەتی، بە لەشکرەوەو بەو موسوڵمانانەشەوە کە دەچنە پاڵی بەرەو (ئنطاکیە) بکشێت و بەرامبەر ئەم شارە لەشکرگای خۆی دابمەزرێنێت نەوەکا کاربەدەستی ئەو شارە کاتی تەواوبوونی ئاگربەستەکەی کە لەگەڵی‌دا مۆرکـرابـوو بە هەل بزانێت و پەلاماری ناوچـە موسـوڵمـانەکانی دەوروپشتی شارەکە بدات.

صەلاحـەددین ئەوەشی دەزانی کە ڕزگـارکـردنی (بیت المقـدس) دەبێتـە هۆی ئەوەی خاچـدروشـمـان بکـەونـەخـۆو سەرلەنوێ ئەوروپا لە موسوڵمانان گاڵ دەن و بهـرووژێنن. ئەوەبـو وێنـەیـەکی حەزرەتی عیسـایان بە لەکەداری سازکردو ناردیان بۆ ئەوروپا کە گوایا مـوسـوڵـمـانـەکـان ئـەتـکیـان کـردووەو گـۆڕەکـەشیـان پـیـس کـردووە!! (٣)

(گـریـگـۆری هەشتـەم)ی پاپای ئەو سەردەمـەش کە بەسـەرهـاتی (بیت المقـدس)ی کەوتـەگـوێ، دەستـوبـرد نامەیەکی بۆ دەست وپێو لایەنگرانی ڕۆژئاوای خۆی نووسیو باسی دۆخی پڕمەترسیی تێدا بۆ هۆنینەوەو گاڵی‌دان کە دەست بدەنـەوە خاچ و بەڵێنی سەرفـرازییـانی لە هەڵـەو تاوان و گونـاهـ پێدان و تاوان و پاراستنی موڵـك و مالیـانی گرتـە ئەستـۆی خۆی. پاپـا (کلیمـەنتی سێیـەمیش) سەروەر ئەوە هەر لە هەڵپـەو کۆشش دابوو، پاشان (فـریـدریـك باربـارۆسـە)ی قەراڵی ئەڵمـان و (هێنـری هەشتـەم)ی شای ئنگلـتـان و (فیلیپ ئۆگستـوس)ی شای فەرەنـگ پێکـەوە پەیوەنـدییان کردو باجی (دەیـەکی) لەنـاوبـردنی صەلاحـەددینیـان بەسـەر خەڵکی وڵاتـەکەی خۆیـان دا سەپـانـدو (٤) دەیـەکی داهـاتی زەویشیـان بۆ خەرجی جەنگی شەڕفرۆشانەی بەسەرخۆرهەلات دا سەپێنراوی خاچدروشمان، تەرخان کرد. کاتێکیش (ڕیچـارد شێـردڵ)، تەختی باوەمـردەی خۆی گرتـەوە، فەرمـاندەی لەشـکـرکێشیی ئنگلیـزی کەوتـەدەست. لەشکـرەکەی (باربارۆسە)ش بە سەد هەزار چەکداری پڕمەشق و تەواو ڕێکوپێك دەخەملێنرا.

ئەم لەشکرە قورس و گرانە لە مارتی (١١٩٠ز/ ٥٨٦ك)دا لە گەرووی

تەنگەی) دەردەنیل بەرەو کەناراوەکانی ئاسیا پەڕینەوە. هەرچی (ئیسحاق ئیجیلۆس)ی قەراڵی بیزەنتەشە ئەوە هەناردیە لای صەلاحەددین کە هەر دۆستێتی و دوژمنایەتیی ناکات و داوای دەکرد لە پەڕینەوەی باربارۆس کە حەربووە ڕێی بدات لێی ببوورێت. میرگەلی سەلجوقیەکانیش لە وڵاتی ڕۆم (تورکیای ئێستا) ماستاویان بۆ باربارۆسە سارددەکردەوەو پێشیان خۆش بوو جوێکە خۆشیان هەر دوژمنی صەلاحەددین بوون. لەبەر ئەوە لەگەڵ باربارۆسەدا پەیمانی دابەشکردنی خاکی ئەیوبیانیان پێکەوە مۆرکرد.

صەلاحەددینیش نەیکردە نامەردی، لە هەمو لایەکی دەوڵەتی ئەیوبی و جیهانی ئیسلام دا بانگەوازی جیهادی لێ هەڵ داو لە ڕەمەزانی ٥٨٥ی کۆچی وت تشرینی یەکەمی ١١٨٩زدا (بهاءالدین یوسف)ی مێژوونووسی کە (کوڕی شداد)یان پێ دەگوت ناردە لای (الناصر لدين الله)ی خەلیفەی عەباسی ئەمەخوایە غیرەتی بێنەجۆش و دەستی یارمەتی بۆ صەلاحەددین درێژ بکات.[٥]

ئەوەی ڕاستیش بێت ئەو مەترسی یە قورس و گرانەی کە ئەو لەشکرڕانی یەی ئەڵمانە تووشی وڵاتی شامی کرد تا هێرشی مەغۆلیش بەڵای وەها بەسەر ئەو وڵاتەدا نەهاتبوو.[٦]

عەکا کە شارێکی زۆر گرنگ بوو، صەلاحەددین بڕیاریدا کە دەورووپشتی چۆڵ نەکات و بیپارێزێت، میرگەلی شامیش ڕێ لە ئەڵمانەکان بگرن و دەستەویەخەیان بن. بۆ ئەوەش کە شارەکانی فەلەستین نەکەونەوە ژێر چنگی خاچدروشمان، صەلاحەددین فەرمانیدا کە شوورەی دەوری هەندێکیان برمێنن و، لەسەر فەرمانی ئەو شوورەی شارەکانی (طبریە)، (یافا)، (ارسوف)و (قیساریە) ڕووخێنران.[٧]

خواوراستان باربارۆسە کەوتە بن ئاوە ساردەکانەوەو خنکا. بەم لێقەومانە ئەژنۆی لەشکرڕانیی ئەڵمان و گەلەکۆمەیتری خاچدروشمان شکاو وورەیان کەوتەکزی و شڵەژان. (فریدریکە چکۆلە)ی کوڕی باربارۆسەش ئەو لێهاتوویەی نەبوو، کوڕی ئەو بارەش نەبوو. پەتاو نەخۆشیش لە ناو ئەو لەشکرە بێشومارەدا بڵاوبووەوە، (الملك الظاهر شهاب الدين غازي)ی کوڕی صەلاحەددینیش کە فەرمانڕانی حەڵەب بوو، کوتەکی پشت شکێنی خۆی لێوەشاندن و هەڵی کەندن و ڕاوی نان.[٨] لەبەرئەوە فریدریك لەوە زیاتر کە بەرەو باشوور داکشێت هیچی تری پێ نەکرا، ئەوەبوو لە دوادوای ساڵی (١١٩٠ز/ ٥٨٦ك)دا بە خۆی و پاشماوەی لەشکری شکاوییەوە گەیشتە عەکا.

صەلاحەددین ئەوەندە دووربین بوو کە هێزەکانی خۆی بەسەر ناوچەکانی وڵاتەکەدا دابەش کردبوو، ئەوەبوو بەشێکی قورسی لە عەکا مۆڵ پێدابوو، بەشێکیشی لە ژێر فەرماندەی (الملك الافضل نورالدين علي)ی کوڕیدا لە لای شاری حومص دانابوو تا ئاگای لە جموجووڵ و ڕەفتاری دوژمنانەی خاچدروشمان ببێت و لەگەڵ میرنشینی تەرابلوس دا (کە دوژمن بوو) هەمیشە بۆ دەستەویەخەو پەلامار لەسەرپێ بێت. هێزی سێیەمیشی لە دەوروبەری شاری (صور) بۆ سووسەی بزووتنی دوژمن دانابوو، نەبادا (مەرکیز کۆنراد) بخەڵەتێ و دەستێك لە موسوڵمانانی ناوچەکە بوەشێنێت. هەرچی هێزی چوارەمە ئەوە لە بەندەرەکانی میصردا مۆڵ بوبون بە تایبەت لە بەندەری (دمیاط)و (ئەسکەندەرییە)دا، نەوەکا خاچدروشمان لە دەریاوە هێرش بهێنن، تا بتوانن بەریان بگرن و کەناراوەکانی میصر بپارێزن. بەشی پێنجەمی لەشکریش بەرامبەر (ئنطاکیة) هەڵی دابوو بۆ ئەوەی درەوشە لە مشتی شاکەی گیربکات و نەخەڵەتێت کە مۆڵەتی ئاگربەستەکە تەواوبێت، قەڵات و قایمکارە ئازادکراوەکان داگیربکاتەوە.[٩]

ئەم نەخشەو پیلانی بەربەرەکانێ و بەرگی یەی صەلاحەددین لە هەموو قۆڵێکەوە لەگەڵ لەشکرڕانیی سێیەمی خاچدروشماندا، دەستیدایە، چاودێرکاران (المراقبون) ناچاردەکات کە مێژووی خەباتی چەکدارانەی صەلاحەددین بە دوو قۆناغ دابنێت و، ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز)ش بە سنووری نێوان ئەو دوو قۆناغە لەقەڵەم بدات.

**(گەمارۆی عەکا:)**

هەر ئەوەندەی هێزە ئەڵمانی یەکە گەیشتە عەکا، کۆمەك و بارو بارخانەی یارمەتی لە ئەلمانیاو ئنگلستان و فەرەنساو صقلیەوە بەسەریدا داباری و، ئەنجام بۆیان کرا بە هێزی سەر ووشکانی و هێزی دەریاییشەوە کە لە هێزی موسوڵمانان زۆرتر بوو ـ گەمارۆیەکی چڕو کەلێن گرتی پتەوی شارەکەبدەن، ئەوەبوو بە درێژایی کەناراوەکانی عەکا لە دەریاوە بۆی کەوتنە سەر ووشکانی و عەکایان لە هێزەکانی ئیسلام دابڕکردو هەموو کەلێن و کەلەبەرێك و ڕێگەو ڕێچکەیەکیان بۆ عەکا لە موسوڵمانان بڕی و،[١٠] شاری عەکا بە خۆی و دانیشتوان و هێزەکەی ناوییەوە گەمارۆدرا. صەلاحەددینیش کاتێك کەوتەخۆ گەمارۆدەرانی گەمارۆدا، کار لە کار ترازابوو. بەڵام گەمارۆکەی درێژەی کێشاو چەند شەڕێکی خوێنینی تێدا ڕوویدا کە چەکی هەمەجۆری ئەو سەردەمەو فروفێڵی کوشتاری ئەو کاتەی تێدا خرایەکارو هەردوو لاش تووشی بێ خارو باری و برسێتی بوون و خاچدروشمێکی زۆریش لە برسانا پەنایان بردە بەر سەربازگاکانی ئیسلام و خۆیان دا بەدەستەوە.

لە نیسانی (١١٩١ز / ٥٨٧ك)دا (فلیپ ئوگستوس)ی شای فەرەنگ بەخۆی و لەشکرەوە گەیشتە سەربازگەکانی خاچ دروشمان و ئاهی پێداهێنانەوەو تای تەرازووی خاچدروشمان دای لە قورسی. ڕیشاردی شێردڵیش دوای چەند حەفتەیەك گەیشتە باڵیان و بە کۆمەك تەنگەی گەمارۆی عەکایان شەتەك دا. بەڵام پارێزەرانی شارەکە لە ناوەوە خۆیەختانە دەجەنگان و بورج و دەبابەی دوژمنیان شەوو ڕۆژ بێ ووچان دەدایە بەر ئاگرو نەوت. بەڵام گوزەرانی ناو شارەکەیان تا دەهات تاڵ و سەختتر دەبوو،[١١] خەڵکی شارەکەش قورسایی کوشتارەکەیان کەوتبوە سەر شان و ماندوێتی و شەونخوونی کەشەنگی کردبوون.

صەلاحەددین سەربازگەکانی خۆی، تا بتوانێت بەری شاڵاوی دوژمن بگرن لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی باشتر دەگۆڕی، ئەو ئاڵوگۆڕەش لەبەر




عه‌ککا له‌ کاتی ئابلوقه‌ دانه‌که‌دا
شوێنی به‌یه‌ك گه‌یشتنی له‌شکری ئیسلام و خاچ په‌رسته‌کان

حربیی جێگەو درێژەکێشانی مانەوەو بۆنی لاشەی کوژراوان ـ کە نەخۆشیی بە تایبەتیش لە وەرزی هاوین دا زۆر لێ دەکەوتەوە، ـ شتێکی پێویست بوو. شوورەی شارەکەش بەردەوام کەوتبووە بەر خرکەی مەنجەنیق تا کەلێن و کەلەبەری تێ کەوت و ئەو پتەوی‌و قایمی‌یەی جارانی نەما. دانیشتوانی ناو شەرەکەش، بە تایبەتیش جەنگاوەرەکانیان وەکو وتمان، کوشتارو شەونخوونی‌و بێ‌خەوی‌و ئێشکچێتی‌و کەمیی خۆیان و زۆریی فرمان و ئەرکی کەوباری‌تری جەنگ پەرێشانی کردبوون. کاتێکیش خاچدروشمان کەلێن و کەلەبەری شوورەی شارەکەیان بە ئاشکرا دی، ئیتر لە هەموو لایەکەوە جۆی‌کشان و ملیان لێ‌نا. صەلاحەددینیش بە خۆی‌و لەشکرەوە لێی نەوەستاو پەلاماری سەنگەرەکانی دوژمنی داو غیرەتی دەنایە بەر سەربازەکانی‌و، هەواری «موسولمان هاوارە»ی بانگەوازکارانی لەشکر لە کەللەی سەربازەکان دا دەنگی دەدایەوە. بەلام توانای پارێزەرانی شار تەواو کەوتەکزی‌و، لەسەر هەلومەرجێکی زۆر شارەکەیان دا بەدەستەوە کە مەرجێکیان ئەوەبوو سەربازەکانی پارێزگەی شارەکە دلنیابن نەکوژرێن. وتوویژ و مەرج و بەدەستەوەدانی شارەکە هێشتا نەبرابووەوە، ـ واتا هێشتا هیچ پێکهاتنێك مۆرنەکرابوو ـ کە لەو لاوە سەربازانی ریشارد چنگیان نایە خوێنی موسولمانان و سێ هەزار دیلی ئیسلامیان قەلاچۆکردو سەربری.[١٢]

شەرەکانی ئەم گەمارۆ درێژخایەنەی شاری عەکایە کە نزیکەی دوو سالی (لە ئابی ١١٨٩ ـ تەموزی ١١٩١) کێشا بە گەورەترینی شەرەکانی ماوەی سەدەکانی ناوەراست دادەنرێت.[١٣] ئەو شەرەی لەو پارچە زەوییەی ولاتی فەلەستین دا رووی‌دا گەلێك لە (شەری واتەرلو)ی نێوان ناپلیۆن و هێزەکانی بەریتانیاو دۆستانی بەریتانیا، کە لە سالی (١٨١٥)دا رووی‌دا، سەختتر بوو.[١٤]

هەرچەندە دەولەتی ئەیوبیی میصرو شام خاوەن سامان و دەولەمەند بوو، هەرچەندیشە میصر لە رووی ئابووری‌یەوە بایەخدارو داهاتێکی بێ‌شوماری هەبوو، بەلام شەری بێ‌ئامانی وەکو ئەوەی عەکا خەرج و خوارێکی ئەوەندە زۆری دەوێت، بۆژەی دەولەتێکی وەکو دەولەتی ئەیوبی کە سالەهای سال بوو بۆ هەلکەندن و دەرکردنی داگیرکاران خەرج و سەرفێکی بێ‌پایانی دەکرد، پێی‌هەل نەدەستاو لە باریدا نەبوو.[١٥] لە رووی سەربازی‌و لەشکرگێریشەوە ئەم دەولەتە لەوە زیاتر نەیدەتوانی شانی بداتەبەرو بەربەستی لێشاوی شەپۆل لەسەر شەپۆلی لەشکرکێشی هەموو رۆژئاوا بکات کە لێگا لێگا بەرەو ولاتی رۆژهەلاتی موسولمانان مەوجی دەدا. بۆیە صەلاحەددین دەبوو داوای یاری‌و کۆمەك لە هێزە ئیسلامی‌یەکانی‌تر بکات و بتوانێت شانی بداتەبەر. ئەویوو باسمان کرد کە چۆن «کوری شدادە»ی ئەسپاردەی بەغداد کرد کە قازیی لەشکرەکەی بوو تا یارمەتی‌یەکی دلسۆزانەی چنگ بکەوێت و، بۆوەستانێکی شایست کە وەکو دەبوو بێت لە بەغدادەوە وەدەست بێنێت، بەلام قازیی مێژوونووس بە هەناسەی ساردو دەستی بەتال گەرایەوەو خەلیفەی عەبباسی قایل نەبوو هیچ کۆمەکێك بە صەلاحەددین بکات. ئەم قایل نەبوونەش بە شێوەیەکی رووکاربابەتانەو سەرنجێکی یەك لۆ (احادي النظر) رووداوێکی مێژووی پێ‌لێکدراوەتەوە، واتا هەندێك دەلێن: هۆی نازناوەکەی صەلاحەدین بووە کە «الملك الناصر». بەلام ئەم هۆیەی کە دەی‌لێن ئەوە ناهێنێت کە خەلیفە پشت لە صەلاحەددین بکات و یاریدەی نەدات؛ ئەوەتا صەلاحەددین بەوە قایل نی‌یەو، دەیداتەدواوەو دەلێت مەسەلەی نازناو ئەوە ناهێنێت و دەلێت: «من تەنها نیازم وایە ولات گیری‌یەکی تەواوکار بۆ میری موسولمانان وەدەست بێنم».[١٦] واتا هەموو خەباتێکم بۆ ئازادکردنی ئەو زەوی‌یەیە کە هی خیلافەتی عەبباسی‌یە.

مەسەلەی ئەم نازناوەی صەلاحەددینیش وەنەبێ خۆی بۆ خۆی دۆزیبێتەوە، بەلکو راستی‌یەکەی ئەوەیە کە دوا خەلیفەی فاطمی واتا «العاضد بالله» ئەو نازناوەی خەلات کرد، لە کاتێکیش دا ئەو نازناوەی خەلات کرد کە لە سالی (٥٦٤ك /١١٦٩ز)دا، لە جێگەی «اسدالدین شێرکۆ ـ الملك المنصور»ی مامی صەلاحەددین کە کۆچی دوایی‌کردبوو، صەلاحەددینی کرد بە وەزیرو ئەو نازناوەشی پێ‌بەخشی، کە لەو کاتەدا هیچ خەلیفەیەکی عەبباسی ئەو نازناوەی نەبووە. ئەو سەردەمەی ئەم نازناوە بە صەلاحەددین خەلات کرا خەلیفەی بەغداد «المستنجد بالله» بووە کە نزیکەی دە سال «٥٥٥ ـ ٥٦٦ك/ ١١٦٠ ـ ١١٧٠ز» فەرمانڕان بووە، پاش ئەویش لە نێوان سالانی (٥٦٦ ـ ٥٧٥ك/ ١١٧٠ ـ ١١٧٩)دا (المستضيء بامرالله) فەرمانڕان بووە. ئەگەر راستی‌یەکەشی بخەینەروو دەبێت بلێین کە خەلیفەی عەبباسی (الناصر لدين الله) کە لە نێوان سالانی (٥٧٥ ـ ٦٢٢ك/ ١١٧٩ ـ ١٢٢٥)دا فەرمانڕان بووە، ئەو خۆی نازناوەکەی صەلاحەددینی لە خۆی ناوە نەك ئەم لەوی وەرگرتووە.

بە هەر حال، خیلافەتی عەبباسی بە هاواری صەلاحەددینەوە نەچوو، هیچ یارمەتی‌یەکیشی بۆ نەنارد، لەبەرئەوە «خیلافەت نە بە هیمەتی لەشکرگێری‌و نە بە قیمەتی سەرزاریش بۆ یاریی صەلاحەددین هیچ نەکەوتەخۆ»[١٧] کە عەکا لە تەنگانەدا بوو، تەنها ئەوە نەبێت لاوێکی بە دوو بار نەوت و پێنج نەوتچی‌یەوە بۆ ناردو کاغەزێکیش بە مۆری خۆی کە صەلاحەددین بیست هەزار دینار لە بازرگانەکانی شام بە قەرد، بۆ خەرجی جیهادو خەبات لەسەر حسابی خەلیفە وەربگرێت و ئاو بێنەو دەست بشۆ. صەلاحەددینیش نەیکردە نامەردی‌و نامەکەی بۆ ناردەوەو[١٨] بۆی نووسی: «من هەر رۆژە ئەمەندە پارەیەو بگرە چەند جارەی ئەم پارەیەش زیاتر خەرج دەکەم».[١٩] ئەمەبوو کۆمەکی خەلیفە. بەمەش «عبدالرحيم البيساني»ی راوێژکاری بەناوبانگی صەلاحەددین کە بە «القاضي الفاضل» دەناسرا لەم رووەوە دەردی دلی خۆی هەلدەرێژێت و دەلێت:

«نامەخوا نامەکەی بەغداد تا بلێی ساردوسرو لەروگەرو رەقووشکە، هیچ ئومێدێکی ئومێدخوازانی تێدا نی‌یەو بۆنی کەسایەتی‌و نازەوناخوونی لێ‌نایەت و، بێ‌فەرو بێ‌سوودە، ئیمە کە بە تەمای زێری گەرم بووین ئاسنی ساردیشمان پێ رەوا نەبینرا»[٢٠]

مێـژ وونـووسێکی نوێش دەڵێت: «هـەستی خەلافەتی عەبباسی بەرامبەر شەڕی خاچـدروشـمـان ئەوەنـد پووچـە پـیـاو بەزەیی پێـدادێتـەوە. . . چونکـە مەترسی خاچدروشمانی بۆ سەر ئەم وڵاتە چی‌یە هەڵی‌نەسەنگاندو، بەرەو یەکخستنی شەرت و مەرجی موسـولـمـانی ناوچـەکـەو پشت گرتنی هێـزی ئەیـوبیـان کە هەڵمـەتیـان بۆ سەر خاچـدروشـمـان دەبرد، هیچ هەنگاوێکی پیرۆزی نەنا»[21]

لەبەرئەوە، لێرەدا جێی خۆیەتی بڵێین کە مەسەلەی نازناوو دەربڕینی نازناو لەو سەردەمانەدا بە هەموو بۆنەیەکی دیبلۆماسی‌یەوە کارێکی چاك یان خراپی دەکـردە سەر جۆری پەیـوەنـدیی نێـوان پێشەواگەلی هێزەکانی موسوڵمانان و، شتێکی گرنــگ بووەو، بووەتــە هۆی دووبـەرەکی‌و یەکنـەگـرتنی ڕیـزەکـانی موسوڵمانان. ئەم لالووتی‌و پشت هەڵکردنەی خەلیفەی بەغدایەش هەر لەبەر ئەوەبوو کە صەلاحەددین نازناوی «الملك الناصر» بووە. ئەوەی ئەم قـسانە دەخوێنێتەوە ڕەنگە لای وابێت کە صەلاحەددین فەرماندەو فەرمانڕانێکی سەر بە خەلیفـە نەبـووە، بەڵام وەهـا نی‌یـە، چونکـە صەلاحـەددین شەرعی‌یەتی خیـلافـەتی عەبباسی یان هەر هیـچ نەبێت شەرعی‌یەتی فەرمانڕانیی ئاینیی خیـلافـەتی عەبـاسـی بە ڕاست دەزانی‌و ددانی پێـدا دەنـاو لە هەمـوو مزگـەوتـەکـانی وڵاتی میصـرو شام و جەزیـرەو یەمـەنیش دا کە لە ژێر ڕکێفی دەوڵـەتی ئەیـوبی‌دا بوون ناو هەر ناوی خەلیفـە بووەو، پێش نوێـژانی ئەو مزگەوتانە هەر شاباشخوان و دوعاخوازی ئەو بوون، نەك هەر ئەوەندە، بگرە بە هۆی ئەم لایـەنگـری‌یـەی خەلیفـەی عەبباسی‌یـەوە ـ وەك هەندێ شوێن دەنگـوبـاس کەوتـوانی ئەو سەدەیـە دەڵێن ـ کۆمـەکی (دولـة المـوحـدین)ی ڕۆژئاواشی لە کیس چەو، کە مەزنترین هێزی ئیسلامی ئەو سەردەمەبوو.

**(چۆن چۆنی پەیوەندی لەگەڵ خەلیفە المنصور «الملك الموحدي»دا کرا؟:)**

ئەوەی سەیرو سەرسوڕهێنە چاوگەو پەرتووکی ڕۆژهەڵاتی ئەو سەردەمەی صەلاحەددین دەربارەی ئەم پەیوەندی‌کردنە لاڵ و بێ‌دەنگەو وەکو نهێنی‌یەکی نەشیـاوی درکـانـدن بێت وایـە، کەچی ئەوەی لەگـەڵ خەلیفـەی عەبباسی‌دا ڕووی‌دا پێچەوانەیەو وەکو ئەم پەیوەندی‌یە نهێنی نی‌یە. مەسەلەیەکی وەهاش ـ بۆ کەسێـك دووی مێـژووی پەیوەندی‌کـاریی نێـوان هێزە ئیـسلامی‌یەکان کەوتبێت ـ بە سەیرێکی سەرپێی دڵی ئاو ناخواتەوەو نای‌بوێرێت.[22] بەڵام (شهـاب الـدین عبـدالرحمن کوڕی اسماعیل المقدسي)ی مێژوونووسی بە (ابـو شامـة) ناسـراوی کۆچکـردووی ساڵی (٦٦٥ك/ ١٢٦٦ز) کە کۆنترینی مێـژوونـووسـانی ناهـاوسـەردەمی وڵاتی ڕۆژهەڵاتە، باسی ئەم پەیوەندی‌یەی کردووە. ئەم مێـژوونـووسـە هەر بە کۆششی خۆی، لە چەنـد پیـرو قورئـان لەسنگـانی متمـانـە پێ‌کـراوەوە شێوەگەلێکی ئەو نامانەی دەست کەوت کە بۆ شای مەغریب نێردراوە کە خەتی (القاضي الفاضل)ە.

«ابو شامة» دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەڵێت: «ئەوەی بیـستبێتم کەوا سوڵتان صەلاحەددین کاتێك فەرەنگەکان دەستیان لە ناقڕای شاری عەکا توندکردبوو، هانـای هەنـاردە لای شـای مەغـریب، کە یاریی‌بـدات و ڕێـگـای خارویـاری دەریایان لێ‌بگرێت، منیش کەوتمە دووی ئەم دەنگوباسە، چونکە (العماد) واتـا(عمـادالـدین الاصفهـانی‌ی نووسـەر)و (القـاضي) واتـا (بهاءالدین ابن شداد)ی مێژوونووس لە کتێبەکانی خۆیان دا لێی نەدواون».[23]

بەوەدا وەها دەردەکەوێت کە ئەو دەنگوباسە (واتا پەیوەندیی نێوان هەردوو لا) لە ناو خەڵکی‌دا قاو بووە، هەر ئەو کاتەش ئەم مێژوونووسە دەستی بە نووسینەوەی مێژووی ئەم دوو دەوڵەتەی (النوریة والصلاحیة)یە کردووە. جا (ابـو شامـة) بە دووی سەرچـاوەکـانـدا عەوداڵ بوو، ئەمـە خوایـە بەڵگەیەك بدۆزێتەوەو ڕاستی ئەم قاوەی پێ ساغ بکاتەوە گەلێکیش پێوەی ماندوو بوو بەڵام بۆی سـەری‌نـەگـرت، چونکـە لە کتێبـەکـانی ئەو سەردەمـەدا ئەو باسـە نەکرابوو، بگرە لە کتێبەکانی (العماد الکاتب)و هینەکانی (ابن شداد)یشدا کە ئەمیـان لەو ڕۆژەوەی پای‌خسـتـووەتـە بارەگـای صەلاحـەددینـەوە تا کۆچی دوایی ئەم پێشـەوایـە بە بـسـت لێی جیـانـەبـۆتەوە.[24] ئەم دوو مێژوونووسە شەڕەکـانی صەلاحـەددینیـان ڕۆژ بـەڕۆژ دەنـووسی‌و، نووسینی ڕۆژانـەشیان ئەوەندە ووردو بە پێزە کە پیاو سەری لێی سوڕدەمێنی.

ئێمەش دەڵـێین؛ ڕەنگە نووسەرانی کتێبگەلە ڕۆژهەڵاتیەکانی‌تر ناوەڕۆکی ئەو نامـانـەی‌کـە صەلاحـەددین بۆ (المنصـور المـوحـدي)ی ناردووە لە (أبو شامة)وە بی‌گێڕنەوە، چونکە (ابو شامە) سەرەڕای ئەوەی کە لەو مێژوونووسانە کۆنتـرەو، یەکێکیشـە لە مێـژوونـووسانی یەکەم پێڕی پاش صەلاحەددین واتا هاوسەردەمی (ابن العدیم، ابن خلکان، ابن واصل وابن العبری و. . . . . هتـد) بووە، واتـا سـەرەڕای ئەوانـەشی، لە هەڵـومەرج و کاتی مقۆمقۆو قاوی نامەنووسینی صەلاحەددین بۆ (الخلیفة المنصور)دا ژیاوە.

هەرچـۆنێـك بوویێت ببێت، صەلاحـەددین ڕووی لە کەسێکی خراپ نەناوەو، داوای یاریدەی‌لە پیاوێکی چاك کردووەو لێی بە ئومێد بووە، دەنا ئەگەر متمانەی بەو شایە نەکردایەو، شایانی ئەو ڕووڵێنانەی لێ‌شك نەبردایە، دەستـەیـەکی وەهـا پایـەبـەرزو ناودارو شایـانی بە دیـاریی دەگمەن و نایاب و نامـەگـەلێکی پڕ لە ڕێـزو بەشـانـویـاڵدا خوانی ئەوتۆی نەدەنارده خزمەتی کە صەلاحەددین بە درێژایی ژیانی نامەی وەهای بۆ کەس نەناردووەو بەو ڕێزە بەرزەوە بۆ هیچ پێداویستێکی‌تر لەگەڵ هیچ کەسێکی‌تردا نەئاخافتووە.

ئایـا ڕاستـە ئێمـە بەو هۆیـە قایـل ببین کە ئەو مێـژوونووسانە دەڵێن گوایا لەبـەرئـەوە (الخلیفـة المـوحـدي) داخـوازی‌یـەکـەی «السلطان المشرقي»ی داوەتــەدواوە؟. بەڵێ ئێمــە دەزانین کە مەسـەلـەی نازنـاوی پێشـەوایـان لەو سەردەمانەدا دەبووە مایەی گیروگرفتی نێوان پێشەوایانی ئیسلام،[25] بەڵام بە ڕای ئێمە نازناو ئەوەنەبوو کە پیاوێکی وەکو (المجاهد المغربي) بیکات بە بیـانــووی ئەوەی پشت لە بەرژەوەنــدی موسـولـمـانـان بکـات و ڕوو لە تێکۆشەرێکی وەکو صەلاحەددین وەرگێرێت.[26] لەبەرئەوە ئێمە پێمان وایە کە بەدەنگەوەنەهاتنی (المجاهد المغربي) تا زۆر لە دوو هۆوە ئاودەخواتەوە؛

یەکەمیان ئەوەبو کە ئەو سەردارەی ڕۆژئاوا پێویستی بە خڕکردنەوەی هێز

هەبــووە بۆ ئەوەی بەرامبــەر بە دەست درێــژکــاریی سەرۆکگــەلی ئیسپــان و پورتوگال واتا بەرامبەر بە تاوانکاریی گاورانی ئەندەلوس کە (خاچدروشمانی بەرەی رۆژئاوابوون) بتوانێت بوەســتێت و وڵاتەکەی خۆی لە بەڵای ئەوان بپارێزێت.

هۆی دووەمیان ئەو ساردیی و نیگەرانیی و جاروبار پێکداهەڵپڕژانەش بوو کە لە نێوان دەوڵەتی ئەییوبیی و دەوڵەتی (الموحدیة)دا روویان دەدا. ئەوا باسی هەردوو هۆیەکانی دەکەین:

**(المهدي کوری تومرت)**

دەزانین کە «المهــدي کوری تومـرت» بنچینـەی لەسەربرواکاری دەوڵەتی (الـموحـدیـة)ی لێ‌دا. ئەم پیـاوە لە مەغـریب و قورتـوبـەو ئەسکـەندەریەیە خوێنــدیی و پاشــان هاتــە بەغـدادو لە خزمـەتی «حجـة الاسـلام» ئیمـامی «الغـزالی»و «علي کوری المبـارك»و «ابـو بکـر الشـاشي»و «الکیـاهراسي»دا خوێندنی تامەربرد، کە ئەوانە مامۆستاو زانای ئەو سەردەمەی بەغداد بوون. لە ساڵی (٥١٠ك/ ١١١٦ز)یش دا گەڕایەوە بۆ وڵاتی مەغریب.

(کوری تومرت) لە عەرەبیی و بەربەری‌دا زمانی رەوان و پاراو بووەو،[٢٧] لە باژێرە مەزنـەکـانی (تلمســان، فاس، مەکنـاس و پاشـانیش لە مەراکش)ی مەغریب دا، بانگی بیروڕای خۆی لێ‌هەڵداو کەوتە خرکردنەوەی خەڵك بۆ کوشتــاری «الـمـرابطین» کە هەتـا ئەو کاتـەش جڵەویـەدەست و فەرمـانـڕەوانی وڵاتی مەغـــریب بوون،[٢٨] تا توانیی بنـاغـەی بزووتنـەوەیـەکی رێکـوپێـك سازدات و لەشکرێکی دەهەزار کوشتارکاریشی پێکەوەناو لە ساڵی (٥١٧ك)دا بۆ خستنی دەوڵەتی (المرابطة) گەمارۆی شاری مەراکشی‌دا کە ئەو کاتە دوا شای مەزنی ئەم دەوڵەتە، واتا «علي کوری یوسف کوری تاشفین» (٥٠٠ - ٥٣٧ك) فەرمانرانی بوو.

«المهدي کوری تومرت» لە ساڵی (٥٢٤ك)دا ئەمری خوای بەجێ‌هێناو لە «تینملل» نێژرا.[٢٩]

کەواتــا، دەوڵـەتی «الـمـوحـدیـة» دەست نێــژی ئاین خوازو سوپـاســازی (المهــدي)یـە. پاش خۆیشی (عبـدالمؤمن کوری علي) کە یەکێـك بوو لە شاگــردان و هەڤــاڵانی خۆیو خەلیفــەشی بوو، تەواوکــردنی بانــگە نامـە (الـرسـالـة)کەی گرتە ئەستۆی خۆیو رامیارانە قۆڵی لێ‌هەڵماڵی و تێ‌کەوت. لەبەرئەوە ئەمیان بە دامەزرێنەری راستەقینەی دەوڵەتەکە دادەنرێت، ئەوەبوو شارەکانی مەغریبی یەك لە دوای یەك گرت و لە ساڵی (٥٤٦ك/ ١١٥١ز)دا مەغریبی ناوەراستی واتا (الجزائر)یشی نایە پاڵ، پاشان لە ساڵی (٥٤٦ك - ٥٥٥ك)دا ئەفـــریقــا (تـونس)یشی هاوردە ژێــر رکێف و پێش مردنیشی کە رێکـــەوتی ساڵی (٥٥٨ك)یـــە، وڵاتی ئەنــدەلوسیشی سەنــد. دەربــارەی زیادەگیریی (توسع) ئەم شانشینە کە لە سەردەمی ئەم پیاوە دامەزرێنەرەی‌دا بەرپــاکــرا (عبـدالـواحد)ی مەراکشی مێژوونووس دەڵێت: «ئەوەتی دەوڵەتی «کورانی ئومەییە» لێك ترازاوە ئەم بیستووە ئەم وڵاتە بەم شێوەیەی ئێستای بۆ[٣٠] کەس هاتبێتە ژێر رکێف و یەك خراو بێت».

دوای «عبـدالمؤمن» (یـوسف)ی کوری جێگـەی گرتـەوەو لە (٥٥٨ك تا ٥٨٠ك) واتــا تا ساڵــی (١١٨٤ز) فەرمــانــڕانــی وڵاتــەکــەی کردووە. مێژوونووسانیش بە مەزنترینی شای «الموحدین»ی دادەنێن. ئەم چوار ساڵ بەرلەوەش کە نازناوی «الخلیفة» بۆ خۆی دابنێت، نازناوی هەر میر (الامیر) بووە لە سەردەمی ئەم دا چەند خاوەن بیرو فەیلەسووفی مەغریبی وەکو «ابن رشد» و «ابن طفیل» هەڵکەوتبوون کە هاودەم و هاو سوحبەتی بوون.

ناوی یوسـف بە سەرکـپ کردنی شۆڕشــەکــانی گاورانی ئەنــدەلــوس دەنگی‌دایەوە، تا لە ساڵی (٥٨٠ك)دا بە لەشکرێکی قورسەوە لە گەرووی «جبل طارق» پەڕییەوەو بەرەو اشبیلیة شانی لێ توندکرد[٣١] بەڵام بەسەریاندا سەرنـەکـەوت و بە چەنـد زامێکی سەختـەوە مردو تەرمـەکـەیـان گەڕاندەوە بۆ (تیـنـمـلل)و لەوێ لە تەنشت باوکی‌یـەوە بە خاکیــان سپــارد.[٣٢] هەر ئەو یوسفەش شاری «الرباط»و مزگەوتەکەی ئشبیلیەی دروست کرد.

دوای یوسـف، یەعـقــوبـی کوری واتــا (ابــو یوسف) کە بە (الخلیفــة الـمـنـصــور) ناســراوە، لەجێـی دانـیـشـت. لە سـەردەمی ئەم دا کێشــەو گیروگرفتێکی زۆر رووی دا، بەڵام چ دەوڵەتەکەو چ خۆیشی ئەوەندە قایم و پێ‌داکوتاو بوون کە یەکلایی‌یان کردەوەو رەواندیانەوە.[٣٣]

لە قۆڵی ئەندەلوسەوە بیگری (المنصور) لە ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز)دا لە دەریــا پەڕیـــەوەو گەیشتــە ئەوێ‌و شاری «شلب»ی سەنـدەوە.[٣٤] هەرچی رۆژئــاوای ئەنـدەلـوسیشــە کە پورتـوگـالیـەکـان تێیدا بڵاوبوبونەوەو لە شەری «شنترین»دا بەســەر موسـوڵمـانـەکان دا سەرکەوتبوون،[٣٥] ئەوێشی بە نیازی تۆڵەسەندنەوەی تێکشکان و کوژرانی باوکی، دایە بەر هێرشی خۆی.

لە ساڵی (٥٩١ك/ ١١٩٥ز)یش دا کەڵکـەڵـەی کوشتــاری ئشتالی‌یەکانی کەوتەسەرو، بەو نیازە، گەیشتە بەرایی شاری ئشبیلیەو خەڵکەکە بە گەرمی پێشــوازییــان لێ‌کــرد. ئنجا روویکــردە قورتـوبـەو لەوێشـەوە بەرەو قەڵای قایمکــاری (ئـالارك) کشـاو لەوێ لووتیـان بوو بە لووتی کۆڕێ سوارچاکەوەو (الخلیفـة المنصـور) چنـگە لەسـەرشـان هەڵی‌بـرین و شکاندنی. (فۆنسـۆی هەشتـەم)ی شای ئشتـالـەش ئیتـر خۆی بۆ رانـەگیـراو بەرەو قەڵای ئالارك بە خۆیو لەشکـرەوە کەوتـەرێ‌و هەردوو لا گەیشتنـەیـەك و دەستـەویەخە بوون، (المنصور)یش ئەوە بە تەنها بە ناو لەشکردا دەهات و دەچوو، غیرەتی دەنایە بەر سەربـازەکـانی‌و بۆ پەلامـار گاڵی‌دەدان بەجـۆرێکی ئەوتـۆ کە جەنگاوەران سووربـــوونـــەوەو بەوپـــەڕی رق و دەمـــارتـونـدی‌یـەوە هەڵیـان کوتـایـە سەر ئشتـــالی‌یـەکـان و ووردەیـان پێ‌بـەردان و گەلێـك سەرکـردەیـان لێ‌کوشتن و راویـان نان، ئەوەش کە ما سەردەرکـەو ماڵ پرسیـار تێی‌ئـەقـان کە (فـۆنسـۆی هەشتەم) خۆیشی بەوەدا رانەدەگەیشت هەر ئاوریش بداتەوە تا خۆی گەیاندە «طلیطلة».

«الخلیفة المنصور» بۆ تێکشکاندنی هێزی گاورانی ئەندەلوس کۆششێکی زۆرو بەکوڵ و بە دڵی نواند.[٣٦] پاشان، لە یەکەم رۆژی «جمادی الآخرة»ی

ساڵی (٥٩٤ك/ ١١٩٨ز)دا گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی، ساڵێ دوای ئەوە ئەمری خوای بەجێهێناو لە تینملل گۆڕوکفن کرا[٣٧]

لە قۆڵێکی ترەوە کێشەی «ابن غانیة»و[٣٨] گێچەڵی دۆستان و لایەنگرانی ئەم کابرایە گوزەرانی بە (الموحدین) تاڵ کردبوو، ئەمانە دوورگەکانی بلیاریان، واتا «میورقة، منورقەو یابسە»ی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستیان لە ڕووی (الموحدین) داخست و ئاڵای سەربەخۆیی و جیابوونەوەیان لێ هەڵکرد[٣٩] - ئەم دوورگانە ئێستا هی ئیسپانیان - کوڕانی (غانیة) خزمی (بەنی تاشفین)ی میرگەلی (المرابطین)ن، ئەوانەی کە وەکو باسمان کرد (الموحدون) لێیان خستن و لەسەرتەخت لایان دان. لەبەرئەوە کە دەرفەتیان بۆ ڕەخسا ئاڵای یاخیبوونیان لێ‌هەڵکردو سەربەدەوڵەتی عەبباسی خۆیان ئاشکراکرد.[٤٠] ئنجا هاتن لەگەڵ کۆمەڵگەلی «بنو هلال و سلیم و ئەو هێزە میصری‌یە ئەیوبی‌یەی کە (شرف الدین قراقوش)ی مەملوکی «تقي الدین عمر»ی برازای صەلاحەددین، فەرمانداری بوو، کە هەمووشیان لە باکووری ئەفەریقا بوون و دوژمنی (الموحدین) بوون لەگەڵ ئەوانە هەموویاندا سوێندیان بۆ یەك خواردو بەرەیەکی بەرفراوانی دژ بە (الموحدین)یان سازکرد.

(علي کوڕی اسحق ی کوڕی محمد کوڕی غانیة) لە خاکی ژێرڕکێفی (الموحدین)دا کەوتە دابڕکردن و زیادەگیری تا ئەفەریقا واتا (تونس)ی داگیرکردو مەغریبی ناوەڕاستیشی لە جەزائیرەوە بیگرە تا (قسطنطینة) ماشی‌یەوەو خستی‌یە ژێرڕکێفی خۆیەوەو بۆشی لوا هێزەکانی (الموحدین)یش بشکێنێ و ڕاوەدووبنێت. پاشان خەلیفة «یعقوب المنصور» لە ساڵی (٥٨٢ك/ ١١٨٦ز)دا بە لەشکرێکەوە هێرشی بردە سەرو، خۆی و لەشکری شکاندو شارەکانی تونسیشی سەندەوەو بە جەزائیردا گەڕایەوە بۆ مەغریب.[٤١]

### لەشکرکێشی‌یەکەی (قراقوش) ):

ئەوانەی دووی دەنگوباسی ڕووداوو کارەساتی ئەو سەردەمە پڕ لە چەمەرەو ڕووداوی کوتوپڕو لەناکاوەی باکووری ئەفەریقا دەکەون، وای بە پێویست دەزانن بیانووی لەشکرکێشی و زیادەبگیریی ناوبراوی قراقوش بزانن و هۆی ڕاستەقینەی ئەم پێ لێ هەڵکێشانەی بدۆزنەوە، کە ئەوەبوو وەکو باسمان کرد لە میصرەوە دەستی پێ کرد.

تۆ بڵێی، تەنها بەو نیازە چووبێت کە هێزێکی نوێ لە باکووری شڵەژاوی ئەو سەردەمەی ئەفەریقادا بهێنێتەکایەوەو وڵاتەکەی بخاتە ژێرڕکێفەوە، کە ئەو شڵەژاوی‌یەی ئەوێی بە هەل زانیبێت و ئەم مارسە مەبەستی وەدی‌هێنانی ئاوات و ئامانجی ڕامیاریی خۆی بوویێت؟ یانەخۆ صەلاحەددین خۆی یان کەسێك لە بنەماڵەی صەلاحەددین گاڵی‌دابێت و ڕێگای بۆ خۆش کردبێت ئەمەخوایە شوێن پێی خۆیان لە باکووری ئەفەریقا بکەنەوە، تا ئەگەر هاتو لە دژایەتی «نورالدین محمود»ی گەورەیان دا کە فەرمانڕانی شام بوو ئەمان ژێرکەوتن ئەوسا پەنابەنە ئەوێ و دالدەی تێدابگرن؟[٤٢]

هی‌تریش وای بۆ دەچن کە صەلاحەددین ویستبێتی ئەو شوێن پێ‌یەی کە یەکێك لە یاریدەدەرانی برازاکەی لە باکووری ئەفەریقادا وەدەستی دەهێنێت بکات بە بنکەی جموجووڵی فراوانکاریی دەسەڵاتی دەوڵەتەکەی لە ئەفەریقا (تونس)و مەغریب دا، یان - هیچ نەبێت - بیکات بە بەربەستێك میصری لە باکووری ئەفەریقا پێ‌دابڕێت.[٤٣] چونکە قاو وا بوو کە گوایا (الموحدین) چاویان لە میصر بڕیوەو بە تەمان بی‌هێننە ژێر ئاڵای دەوڵەتەکەی خۆیانەوەو لەوێشەوە بە ئاسانی شام و وڵاتی ڕۆژهەڵاتیش داگیربکەن.

- بە بیانووی ئەوەی - کە گوایا میصر خراپەگەلێك و مۆدەگەلێکی ناشیرینی تێدا بڵاوبووەتەوە![٤٤] دووریش نی‌یە فەرمانڕانە ئەیوبی‌یەکانی میصر سووسەی ئەم نیازەی (الموحدین)یان کردبێت و ئاگاداری‌یەکیان لێوەی بوویێت، لەبەرئەوە دەست پێشخەری‌یان کردبێت و فەرماندارێکیان بەهێزەوە ئاراستەی ڕۆژئاوا کردبێت تا لەوێ جێی سەریان بێتەوەدو چەپەرگایەك لە ڕووی بزێویی (الموحدین)دا هەڵبەستن و سەنگەری ڕێ‌گرتنی لێ سازدەن، واتا ئەمەی قراقوش کردی هەر ئەم دەست پێشخەری‌یە بووەو لەوە بەولاوە هیچ نیازێکی‌تری نەبووە.[٤٥]

ڕای چوارەم دەربارەی ئەم مەسەلەی زیادەبگیری و دەست درێژکردنەی میری ئەیوبی‌یە، دەڵێت: کە ئەو لەشکردنەسەرە بە نیازی بەدەنگەوەچوون و یاریی بیابان گەڕانی «بنی هلال و بنی سلیم» کراوەو بۆ کۆمەك و پشتیوانی کوڕانی «غانیه» بووە تا بتوانن «المرابطین» بهێننەوە سەر حوکم، ئەم کارە نەخشەی صەلاحەددینەو دەستی ئەوی تێدایەو سەری کاریش خەلافەتی عەبباسی‌یەو بۆ فراوان کردنی ئاسۆی حوکمی ئەوە.[٤٦]

دەش زانین کە قراقوش لەو لەشکرڕانی‌یەدا ویلایەتی تەرابلوسی ڕۆژئاوای داگیرکردو چووە ناو «سنتریە»[٤٧]و «اوجلە»[٤٨]شەوە. پاشان بەرەو (فەززان)یش پێ‌لێ هەڵبری و ئەوێشی داگیرکردو دەوڵەتی هەوواری‌یەکانیشی تێکومەکان دا کە خاوەن فەرمانی ئەو وڵاتە بوون، لە (زویلە)ش کە کەوتووەتە ناوجەرگەی بیابانەوەو بارەگاو مۆڵگەی دەسەڵاتی دەوڵەتی هەواری‌یەکان بوو، وتاری بە شاباشی صەلاحەددین و (تقي الدین عمر)ی برازای صەلاحەددین خوێندەوە. دەسەڵاتی قراقوش ئەوەندە پترو بەهێزتر بوو تا کەڵکەڵەی داگیرکردنی باقیمەنی ئەفەریقای کەوتەسەرو مرخی لێ خۆش کرد.[٤٩]

جا هۆی ئەو لەشکرڕانی‌یەی (قراقوش)ە هەرچی‌یەك بێت ببێت، گرنگە ئەوەیە شتەکە قەوماو ڕوویدا. لەبەرئەوە ئێمە پێمان وایە، ئەگەر (المنصور الموحدي) ددانیشی بە خۆدا گرتبێت و چاوی لەم نەیاری‌یەی قراقوشە پۆشیبێت کە چۆن دوژمنانە کەوتە کۆمەکی کوڕانی (غانیة)ی حوکمڕانانی دوورگەکان کە دوژمنی (الموحدی) بوون و ئەفەریقای لە مەترسیان ڕزگارکردبوو، واتە ئەگەر (الموحدي) چاوی لەو دوژمنکاری‌یەش پۆشیبێت، بەڵام داخی ئەوەی لە دڵ دا هەر مابو، چونکە داخێك نەبوو لەبیربچێتەوە، هەر ئەوەش بوو کە بوو بە هۆی نیگەرانیی نێوان دەوڵەتی (الموحدیة)و

میصری ئەیوبی و[٥٠] پەیوەندی‌یەکی دۆستانە، یان پەیوەندی‌یەکی باشیان لە ێوان دا بۆ نەرەخساو نەبوو. ئەنجام لە ئەهامەتی‌یەکەی (عەکا)دا ەشکرەکەی صەلاحەددین هیچ یاریدەیەکی لە (الموحدي)یەوە بۆ نەهات و ێومێد بوون. ئەوەی قراقوش کردی با دەستی صەلاحەددینیشی تێدا بوویێت و بە پەنجەی ئەویش ئاراستە نەکرابێت، بەڵام بە ڕای هەندێك مێژوونووس بەشی ئەوەی پێوەیە کە (المنصور الموحدي) پشت لە ەرهەڵستکارێکی وەها بکات و هێزی کەشتیگەلی دەریای خۆی بۆ کۆمەك ێ‌ڕەوانەبینێت و فریای‌نەکەوێت.[٥١] ئەوەش لەو لاوە بوەستێت کە صەلاحەددین خەلافەتی عەبباسی بەغدای بە ڕەوا دەزانی و ددانی بە خەلافەتی «الموحدي»دا هەر نەدەنا.

**مەسەلەی وەفدەکەی صەلاحەددین:**

---

دیارە صەلاحەددین دەوڵەتی (الموحدیة)ی بە شایانی ئەوە زانیوە هانای بۆ ەرێت و، پێدا ڕاپەرموەوە ڕووی کۆمەکی لێ‌بنێت، بۆیە ئەو نامە بەناوبانگەی ـ لە ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز)دا ـ بۆ خەلیفە (المنصور) نارد کە خەتی (القاضي الفاضل)ە. لەو نامەیەدا صەلاحەددین هانای بۆ دەبات و هاواری بۆ دەهێنێ کە ئەویش بکەوێتە کوشتاری لێشاوی لەشکری فەلەستین داماشتووی فەرەنگە خاچدروشمەکان. لەو نامەیەدا میرزای (کاتب) صەلاحەددین بە شانوباڵی (المنصور)دا هەڵدەدات و پێدا هەڵدەڵێت و دەنووسێت: «میری ئیمانداری موسوڵمانان، سەرداری عالەمیان و میراتگری ئەم دنیاو ئەوە دنیاش. . . . »[٥٢] ئنجا باسی کۆشش و خەباتی سەروەری صەلاحەددینی بۆ دەکات کە چۆن لەگەڵ خاچدروشمان دا جەنگاوەو ڕاوەدووی ناون و چۆن ئەوانیش بۆ تۆڵەو داگیرکاری پتر شووڵیان لێ‌هەڵکێشاوەو دەوڵەتانی ڕۆژئاوا هەموو سوێندیان بۆ یەکتری خواردووەو هێرشی گەلەکۆمەی بێ‌ئامانیان هێناوەتە سەر شارە کەناراوی‌یەکانی شام و دەیانەوێت شوێنە ڕزگارکراوەکان و جێگە پێ‌چۆڵکراوەکانیان بگرنەوەو وڵاتی موسوڵمان خشت داگیربکەن.

ئنجا صەلاحەددین داوا لە شای مەغریب دەکات کە بەشێك لە کەشتیگەلە جەنگی‌یە سەرکەوتووەکەی بەدەنگەوە بنێرێت و بەشێکی‌تریشی .لێ‌بکاتە سەر دورگەی (صقلیە) تا ڕێگای هاوبەشبوونی ئەو گەلەکۆمەیە لە کاربەدەست و لەشکری ئەو دورگەیە بگرێت و وەهایان لێ‌بکات لە دورگەکەی خۆیان دا دەست بە کڵاوی خۆیان دا بگرن و نەتوانن ڕەگەڵ شایە گاورەکانی ئەوروپا بکەون و هێرش بۆ سەر میصر بهێنن. ئنجا صەلاحەددین لەو نامە دوورودرێژەی‌دا بە سەرداری مەغریب دەڵێت:

«بەو کۆمەکەش سەرداری گەورەو سەروەرمان کوڕاوکوڕ ناوی چاکەو شەرەفی بەرزی بۆدەمێنێتەوە، کە چاکەی هەموو دنیا بە تۆزی پاژنەی ناگات و، کفریشی بە جۆرێکی ئەوتۆ پێ‌گیرۆدە دەکات کە ڕۆژی سەرکەوتن لە ڕۆژئاواوە گزنگ پێ‌دەدات».[٥٣]

لە هەمان نامەدا کە قەلقەشەندی دەقەکەی نووسیوەتەوە ـ قەلقەشەندی نووسەرێکی گەورەی سەردەمی مەمالیکەکانی میصرە ـ صەلاحەددین ئەوەشی دەربڕیوە؛ کە نزیکەی بیست ساڵ لەوەوپێشیش واتا لەو کاتەوەی کە بانگی سەربەخۆیی میصری لە ژێر ئاڵای خۆی‌دا هەڵ دا، ویستوویەتی سەر لە (المنصور الموحدي) بدات و پەیوەندیی دۆستایەتیی لەگەڵ دا ببەستێت و دەڵێت

«کاتێك هاتینە وڵاتی میصر، نیازی یەکەم و تەگبیری بەجێمان ئەوەبو کە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی سەرداروگەورەی خۆمان دا بکەین (!)و نامەی بەرەکەت هێنی بکەینە خزمەت و بە وشەو وتەی گەوهەرڕێزی خۆمان بڕازێنینەوەو وەکو دۆستێکی چاك و دڵسۆز لە خزمەتی‌دا بوەستین و دەستەونەزەر بین».[٥٤]

جا دوای باسکردنێکی تەواوو دوورودرێژی دۆخی فەلەستین و شام، لە نامەکەی‌دا دێتە سەر ئەوەی کە پێویستی کەوتووەتە لای کەسێك بە دڵ و بە گیان پشتی‌بگرێت و کۆمەکی پێ‌بکات و دەڵێت: «بۆ ئەم هیممەتەش لە سەرداری بەڕێزمان بەولاوە بە کەسی‌تردا ڕانەپەرمووین(!)، خودا دڵ و دەروونی خێرخوازو دڵسۆزانەی لەوەی بە دوور بکات و هەر پایەداربێت، بەخشیشی لە قایل بوون وتوانای بێ‌پایانی دەست گرتن و هێزی بەدەنگەوەهاتنەوە هەڵدەقوڵێت ، سەرگەورەمانەو لەو گەورەیی و پێشەوایی‌یە لالووت نیەو، دەیەوێت دەست بەسەر موسوڵمانان دا بهێنێت و، سەرۆکی ئەمە دنیاو چاوساغی ئەوە دنیامان بێت و لە ژێر ئاڵای یەکگرتن خوازی خری (الموحدین)دا ڕقی خوداو ئاینی خودا بە سەر ناحەزان دا ببارێنێت.»[٥٥]

ئیتر نامەکەی بەوە کۆتایی پێ‌دێنێت کە داماوەو پێویستی بە هەندێ لە کەشتیگەلەکەی دەوڵەتی (الموحدیة) هەیە تا دەستەویەخەی دوژمنە خاچدروشمەکان ببێت و ڕێگەی هێرشیان پێ لێ‌بگرێت و دەڵێت: ئەم پیاوەشمان کە بەم نامەیەوە ناردووەتە ئاسانە (دەرەگا)ی گەورەماڵی سەرۆك و خزمەتی سەروەرمان (!) چونکە کەسێکی قایل کەرو زمان پاراوێکی ڕاست گەیینە. . .».[٥٦]

ئەوەبوو ئەو نامەیەی بە گەورەترین دەستەپیاوی دەوڵەتی ئەیوبیان دا نارد کە «شمس الدولة عبدالرحمن کوڕی محمد کوڕی مرشد کوڕی منقذ الکنانی»یەو،[٥٧] ئەوەی میرانی کوڕانی «منقذ»ە کە سەردارانی لەوەوبەری قەلاکاری ((شیزر)ی[٥٨] وڵاتی شام بوون. ئەو میرە جێگای متمانەو باوەڕپێ‌کراوی هەڵسوڕاندنی کاروباری ووردو گرنگی دەوڵەتی ئەیوبی بووە.

ئەوەی ڕاست بێت صەلاحەددین هیچ نەبێت ـ سێ نامەی بانەوبان یەکی بۆ شای مەغریب ناردووە. دوای نامەی باسکراو، نامەیەکی‌تری بە دوودا لە ٢٨ی شعبانی ساڵی ٥٨٦/ تشرینی یەکەمی ١١٩٠زدا بە هەمان ئەو بالیوزەی خۆی‌دا ڕەوانەکردو بە پێشەکی‌یەکی جوان و ناسکی ئەوتۆش دەستی‌پێ‌کرد کە سایەقەی ساماڵێکەو گەوهەری دانە وشەو وێژەی ئەوپەڕی ڕەوان بێژیی نامەکاریی عەربی تێدا دەدرەوشێتەوە. لەم نامەیەدا ئەوپەڕی

ناقـابیلی خۆی لە ڕەفتـاری‌نـاپـاکـانـەی یاخی‌بـووان و ئاژاوەچیانی نموونەی (قراقوش و بوزباو کەسانی‌تری وەکو ئەوان) نیشان دەدات، دەڵێت: «ئەوانە پیاوگەلێکی بێ‌فەڕو ناپیاون و دەستەپاچەی مەیدانی شەڕن و ترسنۆکن. . . . نە میـرن و نە لە مەملوکـەکـان، سەر بە «الطـواشیە»ش[٥٩] نین و ناش چنەوە سەر (الاولیـاء). . ». ئنجـا دێتـە سەر (خـراپـەی ئەو دوو سەرکـردەی لەشکـرانی‌یـەو دەڵێت: «ئـەوانـە هەرگیز لەوە نەبوون ئەگەر دیار نەبن بانگ بکـرێن، یان کە بزربـوون کەس بە دویـانـدا بگـەڕێت، واتـا چەپەرەشـرێك بوون چ بێوەبن چ لێوەبن. . » ئنجا داوای لێ‌بووردن دەکات کە بە خراپەی ئەوانـەوە گونـاهبـار نەکـرێت و دەڵێت: «گوێی شەیتان کەڕ بێ کە فەرمان بە ناپاکێك بدەین سەرپشك بێت خراپە بە دنیادا جاڕبدات و فوو لە دۆ نەکات. من تا بۆم بکرێت و لە توانام دا بێت لە چاکەو چاکەخوازی بەولاوە هیچم نەکـردووەو نایکـەم».[٦٠] بەم نامـەیـەدا وا دەردەکەوێت کەصەلاحەددین، بە هەر شێوەیەك بێت هەواڵی ئەوەی پێ‌گەیشتووە کە (الموحدي) کەشتیگەلی خۆی بۆیـەکـە بۆ نانێـرێت چونکـە کاتی خۆی لە سەرکێشی‌و لەشکـرانیی قارقـوش بێ‌دەنـگ بووەو دەسـتی نەخسـتـووەتـە ڕێگـەی. بەڵام ئەوەتـا صەلاحـەددین پاکـانـە دەکـات و دەڵێت کەسێکی سەر بە خۆی گاڵ نەداوەو ڕێگەی بۆ خۆش نەکردووە کە کارێکی دوژمنانە بەرامبەر بە موڵکی دەوڵەتی (الموحدین) بکات. هەر لەم نامەیەدا، لەسەر دامودەستوری نامەیەك کە بۆ خاوەن شکـۆو شانـان دەنێـررا، دەبـوو صەلاحـەددین چەنـد نازناوێکی پڕ لە شانـازی لە (الـمـوحـدی) بنێت، ئەوەشی لەبیـرنـەچـووەو، سەرەڕای دوپـاتکـردنـەوەی وشـەی «سـەردارمـان، گەورەمـان» کە لە نامەی یەکەمی‌دا وتـراوەتـەوە، ئەوەتـا لەم نامەیەی‌تردا بە («سوپاسالار»)ی[٦١] ڕەسەن، زانای بەڕێـز، تاجی دەوڵـەت، میـری میللەت، پوختەی شـاو سوڵتانان و شەرەف و ئابڕووی میران»[٦٢] ناوی دەبات. واتا صەلاحەددین تەواوێك بە ڕاستی بوو کە دەیویسـت پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵ لەگەڵ (الموحدین)دا بهێنێتەدی.

پاشان، سەرنووسەرانی دیوانی صەلاحەدیین، واتا (القاضي الفاضل) لە زمـان صەلاحـەددینـەوە باسی ڕەفتـارو کرداری چاکـەی ناو میصـرو شام و فەلـەستینی ئەم سەرکـردەیـە دەکـات کە شاکاری، بەزاندنی خاچدروشمان و سەنـدنـەوەی (بیت المقـدس)و گرتنـەوەی بەنـدەرەکـان و ناوچـەکـانی‌تـری ئەنجـام داوەو، دەوڵـەتـانی ئەوروپـا ـ دووبـارە ـ لێی بە ئاگـا هاتـوونەوەو بە هەڵەداوان و گەلەکۆمە بە دەنگ خاچدروشمە شپرزەو شکاوەکانەوە ملیان لە وڵاتی ڕۆژهـەلات ناوەو، بە کەشتیگـەل و لەشکـرو شاو قەشـەو کشیشـیـانەوە گەمارۆی شاری عەکایان داوەوو «ئێمەش لە پشتەوە گەمارۆی ئەوانمان داوە» وەکـو لە نامـەکـەدا دەڵێت، ئەوەش دەڵێت کە «شـەڕێـك لەو شـەڕانـە بیست هەزار کافـری تێـدا کوژراوەو. . . لەگـەڵ ئەوەش دا. . . مەتـرسیی دوژمن هەر هەیـەو بەردەوامـە، لە تاوان و تاوانـکـاری‌دا چاوی سووربـووەو پێی‌لێ‌هەڵکێشاوە، باربوو کۆمەکێشی سەرێکی لێرەیەو سەرێکی لە ئەوروپایەو لە بڕان نایـەت، یەکێـك لەو لێشـاوە شووڵ لێ هەڵکێشـاوە شای ئەڵەمانە بە خۆی‌و جەمـاوەری لەشکـرەوە سەرگـەرمی پڕمـەو سمکـۆڵن، بارو بارخـانـەو خارویـارو ئازووقـەو پارەو زێـریـان بە خەرمـانـە. . . بەڵام لە سایەی خوداوە پشتی ئەژدەهـاکی ئەڵـەمـان شکـاو خودا بە دەردەکـەی فیـرعـەونی بردو خنکا. . »[٦٣]

دوای ئەمانە نووسەری نامەکە دێتە سەر باسی مەبەستی صەلاحەددین لە ناردنی ئەو بالیۆزەی‌و دەڵێت؛

«ئـەگـەر ڕاست هات و کەشتیگـەلی مەغـریب حازربـە دەست بوو، جبەخانەو شمەکیشی زۆربوو. . . تۆش ئەی میر ناوی خودای لێ‌بێنەو شانی پێـوەبنێ. . چونکـە لەو زاتـە بەولاوە کەسێکی‌تـرمـان بەم نامـەیە ڕەوانەبینیوەو کەسێکی لێ‌وەشـاوەتـرمـان بۆ هانـا شك نەبردووەو، کەسێکی گوێ‌ڕایەڵترمان نەدۆزیوەتەوەو دڵسۆزێکی بەدەم هاوارەوە هاتووی ترمان نی‌یە. . . ، بۆیەکیشە ئەمەمان پێ‌سپاردووە چونکە فرمانی سەر شانێتی‌و تایبەتە بە خۆی‌و ئەو کارە هەر بەو کارزانـە دەکـرێت، بەتـامـای هیـمـەتێکی ئەوتـۆشی بووین ئاگر لە ڕۆژئاواوە بکاتەوەو بڵیسەی بگاتە ڕۆژهەلات».[٦٤]

ئەنجـامێکیـش «الخلیفـة المـوحدی» قایل نەبوو کە باربۆی صەلاحەددین بکـات، صەلاحـەددین بێ‌ئومێـد نەبـوو، دڵیشی بڕوایی نەهێنـا، لەبەرئەوە هەمـدیسـان داوای کۆمـەکی لێ‌کـردەوە چونکـە دەیـزانی کە لەوەدا بەهـەڵـە نەچووەو، خولیای خەبات لە دڵی خەلیفە (الموحدی)دا بە وێنەی خولیای دڵی خۆی لە کەفـوکـوڵـدایـە. ئەو خەبـاتە خوێناوی‌یەش کە «الموحدین» لە دژی ئسپـانیـا لە ڕۆژئـاوادا تێی‌کـەوتن، بەشێکـە لەو خەبـاتـە خوێنینەی کە صەلاحـەددین لە ڕۆژهـەلاتـەوە ئاڵاکـەی دەشـەکـانـدەوە، بۆیـە دیسـان تێ‌هەڵچووەوەو داوای کۆمەکی لە «الموحدی» کردەوەو، وەفدێکی تازەی بە چاوسـاغیی میـری ناوبـراوەوە واتـا «کـوڕی منقـذ»ەوە بە نامـەیـەك و دیاری‌و خەڵاتی بە نرخەوە کردەوە سەر «الموحدي».

لەم نامە تازەیەدا «القاضي الفاضل» باسی باری نالەباری کەناراوەکانی فەلـەستین دەکـات کە چۆن فەرەنگـە خاچـدروشمەکان سەروم‌ر لە دەریاو لە ووشکـانیشـەوە لە ژێـر فەرمـانـدەی شاکانیان دا ڕێچکەیان لە بڕانەوەنایەت و باسی کارەسـاتی شاری عەکا دەکات کە لەشکرو لەشکرگای دوژمن تا ئەو سـاتـەش لە دەریـاو لە وشکـانیشـەوە هەر گەمـارۆیـان داوەو، لەشکـری موسـوڵمـانـانیش بۆ ڕزگـارکـردنی ئەو شارە قارەمـانـە چ کۆشـش و خەباتێکی خوێنینیان کردووەو داوای یامەرت لە سەرداری مەغریب دەکات و دەڵێت:

«لەو دەوڵەتە گەورەو گرانە، خاوەن تواناو پاڵەوانە، لەو هیممەتە ڕێ‌نمایەی (المهـدي)یـە، وەهـا ڕادەپـەڕموویـن موسـوڵمانانی ڕۆژئاوا کۆمەکێکی ئەوتۆ بە موسوڵمانانی ڕۆژهەڵات بکەن کە گەلێك پتربێت لەو کۆمەکەی کە کافرانی ڕۆژئاوا بە کافرانی چنگ لەخوێنی ئێمەی موسوڵمانانی دەکەن، وەهاش بە تەمـا بووین کە کەشتیگـەلی ئیسـلام بە وێنـەی چیـای لووت لە ئاسـمـان دەریـاسـان بۆ پڕبکـات و دوژمنمـان بۆ زارەتـرەك بکـات». کاتێکیش وەڵام دواکەوت و نەهات «ئەم لای وابوو هاوارلێ‌کردنی دەوێت بۆیە ئەم هاوارەشی

..ۆ ..رد، لەوانەیە هەورەکەی رەحمەت ئاسۆش بتەنێت بەڵام تا با پێش خۆی ..ەت بارانی لێ نابارێت». (٦٥)

هەرچەندیشە نووسینی مێژووی گەیشتنی باڵیوزان ئەوە ناهێنێت ئەگەر ..ش نووسرێت، بەڵام دەربارەی مێژووی گەیشتنی باڵیوزەکەی صەلاحەددین بۆ مەغریب رای جیاوازجیاواز هەیە. جا با بزانین باڵیۆزەکەی صەلاحەددین چۆن و کەی چاوی بە (الموحدي) کەوت؟ لەم رووەوە وەکو لە رۆژهەڵات گێراویانەتەوە (واتا ئەوەی کە القاضي الفاضل دەیگێڕێتەوە) ئەوەیە کە (کوری منقذ) لە ١٣ی رەمەزانی ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز)دا لە ئەسکەندەرییەوە بە دەریادا بەرەو مەغریب کەوتەرێو لە مانگی «ذي الحجة»دا گەیشتە مەراکش و لە بیستی هەمان ئەو مانگەدا چووە خزمەتی (الموحدي) دیاریو خەڵاتی صەلاحەددینی پێشکەش کرد.

کاکی باڵیۆز کاتێ گەیشتە وڵاتی مەغریب دەمودەست چاوی بە (الملك المنصور) نەکەوت چونکە ئەو بە خۆیو لەشکرەوە لە ئەندەلوس سەرگەرمی کوشتاری گاوران بوو، تا شاری (شلب)ی لە دەست پورتوگالییەکان سەندەوەو داگیرکرد خۆیشی ئەو کاتە لە (ئشبیلیە) بارەگای لێ هەڵدابوو لەوێ گیرسابووەوە چاوەچاوی هێرش و پەلاماری بوو، ناچار باڵیۆزیش بە تەمای گەڕانەوەی (الملك المنصور) چاوەڕیی کردو پاڵی لێدایەوە.

وا دیارە سەرچاوە مێژووییەکانی وڵاتی رۆژهەڵات، کە وەکو باسمان کرد درەنگتر بەو دەنگوباسەدا گەیشتووەو گەرماوگەرم ئاگای لێ نەبووەو، لەبەر دووری، تەواوی رووداوو جموجوولی کاکی باڵیوزی نەزانیوەو شارەزای تەواوی کارەسات و دۆخی نەبەردی ئەندەلوس و باری مەغریب نەبووە. هەرچی ئەو سەرگوزەشتانەشە کە سەرچاوە هاوسەردەمە شارەزاکانی مەغریب دەیگێڕنەوە، گەلێک بەسەرنجترو راستترە، (٦٦) بە تایبەتیش ئەوەی مێژوونووسەکەی دانەری کتێبی «البیان المغرب» باسی دەکات کە وا پێدەچێت لە باسەکەی «کوری صاحب الصلاة»ی مێژوونووسەکەی کۆشکی (الموحدي)یەوە وەریگرتبێت. ئەمەیان باسێکی تەواوترو وردتری جموجوولی ئەو باڵیۆزە دەکات و لەگەڵ زنجیرەی رووداوەکانیش دا زیاتر دەگونجێت و پتر رێی تێدەچێت، ئەوەتا دەڵێت؛ دوای ئەوەی باڵیوز بەرەو رۆژئاوا کەوتە رێ لە بەندەری تونس دابەزیو لەوێ (السید ابو زید) کە والیی ئەفەریقا (تونس) بوو پێشوازیی لێکرد، پاشان چوو بۆ (بجایة)ی سەر کەناراوی جەزائیرو (ابو الحسن)ی والیی ئەوێ پێشوازییەکی زۆر گەرم و بەرێزی لێکرد، ئنجا بە هەردوو والی نامەیان بۆ (الموحدي) نووسی کە بارەگای لە (ئشبیلیە) بوو، لە هاتنی باڵیۆز ئاگاداریان کردو نامەکانیان لە مانگی رەجەبی ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩١ز)دا گەیشتە دەست (الموحدي). (الموحدي)ش بە سوپاسەوە وەڵامی دانەوەو نامەی بۆ ناردن کە میوانداریەکی گەرمی بکەن و رێزی لێبگرن و لە خزمەتیدا بەردەوام بن و ئامۆژگاریی بکەن کە هۆی ئەم سەردانەی بە نهێنی بگرێت و مەبەستی هاتنی لای کەس نەدرکێنێت تا چاوی بە خۆی (واتا بە الموحدي) دەکەوێت.

ئیتر باڵیۆز ئەفەریقا (تونس)ی بەجێهێشت و گەیشتە شاری (فاس)ی وڵاتی مەغریب و لەوێ ساڵێکی رەبەق چاوەڕوانی (شا)ی کرد. ئەو کاتە (الموحدي) سەرگەرمی جموجوولی سەربازیو لەشکرڕانی بوو کە هێرشێکی بێئامان و بەرفراوان بەرێتە سەر وڵاتی پورتوگال و داگیریبکات، ئەوەبوو بەندەری (الفتح)ی لە (جمادى الاولى)ی ساڵی (٥٨٧ك/ واتا حوزەیرانی ١١٩١)دا داگیرکردو ملینا بۆ شاری (شلب)و سەرکەوتووانە گەڕایەوە بۆ ئشبیلیەو لە رەمەزانی هەمان ئەو ساڵەش دا گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیو لە شاری (مەراکیش) سرەوت و دایکوتا، کە باڵیۆزەکەش گەیشتبووە ئەوێ. ئنجا (الموحدي) رێی پێ داو ئەمیش چووە خزمەتیو خەڵات و دیارییەکانی صەلاحەددینی پێشکەش کرد، کە بریتیبوون لە قورئانێکی بە مسك ئاودراوو سێ سەح مسقاڵ عەنبەرو دەملوانەی گەوهەری شەش سەد دانەییو سەد تیرو کەوان و گەلێك دەمە شمشێری هندیو شتیتر. (٦٧)

کتێب نووسی (مؤلف) کتێبی (لاستبصار) دەڵێت: «کوری منقذ»ی باڵیۆز لە شەشی موحەڕەمی ساڵی (٥٨٨ك/ ٢٣ی کانوونی دووەمی ١١٩٢ز)دا چاوی بە (الملك الموحدي) کەوت و نامەکەی صەلاحەددینی پێگەیاندو تێیگەیاند. دوای ئەوە بە پێنج رۆژ ئنجا لە کۆشکی شاهانە ماڵ ئاوایی کرد. کاکی باڵیۆز لەو ماوەیەدا کە لە خزمەتی «الموحدي»دا بوو، هۆنراوەیەکی چل بەیتی بە خەلیفە «المنصور»دا هەڵ داو، خەلیفەش پاداشتی هەر دێرەی بە هەزار دینار دایەوەو پێی گوت: ئەمە خەڵاتی چاکەی خۆت و هۆنراوەکەتە، واتا «لەبەر خاتری صەلاحەددین» نییە. (٦٨)

ئەمەش مانای بەشێك لەو بەیتانەی

دەریاری پڕ شەپۆل بەسوپاس شایان
رێگەی دەریاکەی بەخشش بێپایان
هێنامە خزمەت ئاین رەسەنان: (٦٩)
کابەی رۆشنایی ناوبانگ پەسەنان
دەك میری ئیسلام دەرگات هەر واز بێ
دالدەو پەناگەی ماندووی هەوراز بێ
وشکانیو دەریام تەیکرد بۆ لاتان
بێشك پێم ئەدەی باربۆو خەڵاتان
دڵم لە دووریی وشکان نەلەرزی
لە تەکانی ئاو، نشێویو، بەرزی
ئامانجی رێگەم بەزیی ئالابێ
دەبێت هەردوو پێم تێك نەئالابێ
ئومێدم پێنەو لێمان بڕوایە
لێشاوی خێرت پێمان رەوایە
چونکە پیرۆزی دەست نێژی خۆتە
مێژووش بە تەمای پێش نوێژیی خۆتە (٧٠)

به هەر حاڵ، ئەو کۆمەکە دەریایی‌یەی کە باڵیۆز (بە نیازی وەرگرتنی بۆ لەشکری صەلاحەددین) هاتبو دەستی‌بکەوێت، دەستی نەکەوت.[71]

جا لێرەدا، واتا لە هەلومەرجێکی رووداوگەلێکی وەهادا پرسیارێکی گرنگ بە خەیـاڵ دا دێـت و دەبێت بکـرێت کە: (بـۆچی صەلاحـەددین خۆی نەیـدەزانی کە «المنصـور المـوحـدي» لەبـەر پشێـویی ناوخـۆی ولاتـەکەی‌و نالـەبـاریی دۆخی دەرەوەی،[72] هەروەهـاش لەبـەر نیگـەرانیی کارەسـاتی رابـوردووی نێـوان هەردوو لایـان، پشتی‌نـاگـرێت و کۆمـەکی دەریـاییشی پێ‌ناکات؟.. کەواتە داوای یارمەتیی لەو دەوڵەتە بۆچی کرد؟

ئێمە هەرچەندیشە ناتوانین هیچ پاکانەیەك بۆ صەلاحەددین لەو رەفتارەی (قـراقـوش و بوروبـا)یـە بکـەین، بەڵام لاشمـان وایـە کە صەلاحـەددین ویستوویەتی لاپەڕەیەکی سپی‌و بێ‌گەردی نوێ بۆ پەیوەندی‌یەکی بێ‌خەوش و راست لە نێـوان هەردوو قۆڵی ئەو جیهـانی ئیسـلامـەدا بکـاتـەوە، کە تا ئەو کاتـەش هەر لەبـەر هێـرش و پەلامـاری رۆژئـاوادا بوون. دووریش نی‌یـە ویـستبێتی پابـەنـدیی ـ سەرزاری‌و ساردوسـری ـ خۆی کە بە خەلیفـەی بەغـدادەوە هەیبـوو، بپچـرێنێت و، دڵسـۆزانـە لەگـەڵ خەلیفـەی (الرباط)دا گرێی‌بـدات، چونکـە ـ وەکـو باسمـان کرد ـ لەگەڵ خەلیفەی عەبباسی‌دا لە پەیـوەنـدی‌یـەکی ساردوسـرو نائـومێـدی بەولاوە هیچی‌تـری ئەوتـۆی نەبوو. لەبـەرئـەوە ئەویتـر یانی بە باش زانی‌و، ئەوەبـوو رووی لە کەسێـك نا وەکـو خۆی، کە سەرگـەرمی کوشتـاری ئـیسپـانی‌و پورتـوگـالی‌یـەکـان بووەو هاوتای خەبات و جیهادی بێ‌وچانی بەرگرتنی هێرش و داگیرکاریی دوژمنانی خۆی بووە، بۆئەوەی (عەکا)ی قۆڵی رۆژهەڵاتی ئیسلام تێیدانەچێت و دووبارەش فەلـەستین بە تالان نەبـرێتـەوە، ئەنـدەلـوسیش لە قۆڵی رۆژئـاواوە لە دەست نەچێت. ئەو وەفـدە پایـەبـەرزەشی بۆ ئەوەنـدە نارده لای (المنصـور) تا دەمودووی تاقی‌بکاتەوەو بزانێت تا کوێ لەگەڵیدا دەبێت و پشتی‌دەگرێت و، یاریدەی دەدات یان نا.

لەم ئاخافتنە ئەمەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە:

یەکـەم: ئەو دووبـەرەکی‌و ناکـۆکی‌یـەی جیهـانی ئیسـلام پێـوەی دەینـاڵانـدو کشتەکی یەکێتی‌و هاوپشتیی نێوانیانی ـ لەبەر لاوازی‌و کزیی هەموو لایەکی ـ پچـڕانـدبـوو (کـە لێـرەدا جێگـای ئەو باسـە نابێتـەوە)، رێگـای بۆ هێزەکانی دەوروپشتی ئەو جیهـانـە خۆش کرد کە ددانی لێ تیـژ بکـەن و گەلـەکـۆمـەی لێ‌بکـەن. ئەوەبـوو لە ئەنـدەلـوس جمـوجـوڵ و بزووتنـەوەی «سەندنەوە»ی خاکی ئەنـدەلـوس، کە ئسپـانی‌و پورتـوگـالی‌یـەکـان هەڵیـان گیـرسـانـدو ـ هەمـوئـەوروپـاش پشتیـانی دەگـرت ـ دەستی‌پێ‌کردو تەشەنەی‌کرد تا بوو بە جەنگێکی بەرفـراوانی بە (شـەڕی خاچـدروشمـان) ناسراوی دژ بە ئیسـلام و ولاتی موسـوڵمـانـان مەغـۆلیش (تـەتـەر) ئەمـەیـان بە هەل زانی‌و لە قۆڵی رۆژهەڵاتەوە بە لێشـاو پەلاماری بەشی ئاسیای جیهانی ئیسـلامیان دا.

ئەوەتـا (کـوڕی الأثیـر)ی مێـژ وونـوسی گەورە (٦٣٠ك/ ١٢١٢ز) زۆر بە شارەزایی‌و وەستایانە دامێنی بەڵاو هۆکاری ئەو جموجوڵە کاولکارو دوژمنکارە

چنـگ هاوپشتـووانـە لێـك دەداتەوەو گەلەکۆمەیان ئاشکرا دەکات، کە هێشتا مەتـرسیی تەتـەر نەگـەیشتبـوو ئەو پلە کاولکـاری‌یـەی کە دوای مردنی ئەو مێـژ وونـوسـە بە چارەکـە سەدەیـەك تینی تەواوی سەنـد (سـەیـری الکـامل ١٠/١٤٢، ١٠/١٩٤، ١٠/٢٧٢ بکـە). (کـوڕی الأثـیـر) باسـی دەست درێـژکـاری‌و داگیـرکـاریی مەغـۆلیـان دەکات و دەڵێت: «ئەم دوژمنە مارس و کافـرە ولاتی (مـاوراء النهـر)یـان خـستـە ژێر پێ‌و شێلایان و وێرانیان کرد، فەرەنگی دوژمنیش لە خاکی خۆیـانـەوە، لەوپـەڕی ولاتی رۆمـەوە، لە نێوان رۆژئاواو باکوورەوە بە لێشاو هاتن و گەیشتنە ولاتی میصریش.... ئیتر (إنا لله وإنا اليه راجعون، ولا حول ولا قوة إلاّ بالله العلي العظيم!)

دووەم: لە دوای دابەش بوون و پچڕپچڕبوونی جیهانی ئیسلام ئیتر جارێك رووی‌نەدا کە رۆژهەڵاتی ئەم جیهانە بەدەنگ رۆژئاوایەوە، یان رۆژئاوای بە دەنـگ رۆژهـەڵاتی‌یـەوە هاتبن و چووبن، دۆخی قۆنـاغی جەنگی (زەوی سەنـدنـەوە)و هێـرش هێنـانی خاچـدروشمانیش لەوە نەبووە کە ئەم دوو قۆڵی ولاتی ئیسلامە بە شێوەی رەسمی کۆمەك بە یەکتری بکەن. نەك هەر ئەوە بگـرە بەشی رۆژهـەڵاتی ئیسـلام بەدەنـگ صەلاحـەددینیشـەوە نەچوو، وەکو باسیشمان کرد خۆی لە قەرەی ئەو کارەساتە پڕمەترسی‌یەش نەدا.

بەڵام ئەوەندە هەیە خەباتکارو لێ‌بوردەو موجاهدگەلی خەڵکوخوای ئیسـلام لە هەمـوو کەلـوقـوژ بنێکـەوە کەموزۆر بۆ پاراستنی خاکی ئیـسلام و بەربەستی هێـرشی دوژمنـان چاکی مەردانـەیـان لێ بە لادا کردو هاتنـە پاڵ سـەربازانی صەلاحـەددین، ئەوەتـا (کـوڕی جوبـەیـر/ لاپـەڕەی ٢٨٠) دەڵێت کە لەشکـرەکـەی صەلاحـەددین تێکـۆشـەرانی خەڵکی مەغـریبیشیـان لە ناودا هەبـووەو، (سـەیـرێکی کتێبی «الجیش الایـوبي» لاپـەڕەی ١٥٧ ـ ١٦٢ی خۆشـمـان بکـە)، جەمـاوەری خەڵـکـیش بەبـێ ئەوەی گوێ‌بـدەنـە دەست وەستاوی‌و کەمتەرخەمیی گەمحۆیی رەسمیی دەوڵەتەکەیان، دەیانزانی دنیا چ باسەو چ دەبێ بکەن.

سێهـەم: کۆششێکیش کە صەلاحـەددین بۆ گرتنـەوەی شانی لەجێ‌چـوو راستکـردنـەوەی تەرازووی لاسـەنگی ئەو بارە نالـەبـارە، لە رێی داواکـردنی کۆمەکی (الملك الموحدي)یەوە بەخەرجی‌دا، لەوەنەبو کە زووتر رێگای بۆ پاك کردبێتەوەو بە تەواوی هەمو درکوداڵی رەخنەو بیانووی لێ بژارکردبێ، تا سوودێکی ببێت و بۆی بچێتە سەر

بەڵێ صەلاحددین باڵیۆزی نارده لای (الموحدي)و بەخشش و خەڵات و دیاری‌یەکی زۆرو بەنرخی پێدا ناردو، نامەی لەبزی خۆش و وتەی شەکربارو وشـەی بەجـێ بۆ رازانـدەوەو نازنـاوی سەروەر، سەردار، گەورە، میـری موسوڵمانان و خاوەن شکۆی پێدا هەڵ دا. بەڵام ئەم وتی‌و ئەو نەیژنەفت و، وەکو گێرامانەوە، لەبەر چەند هۆیەك ئەو کۆششەی سەری‌نەگرت و هیچی بۆ نەهات.

یەکێك لەو هۆیانەش مەسەلەی نازناوو، رەفتاری ترسناکی (قراقوش)بوو. هۆیەکی‌تریش لە ئارادا هەیە ـ کە لەوە نی‌یە بە ئاسانی ساغ ببێتەوە ـ ئەوەیە

كە «المنصور الموحدي» ئەوەی بۆ دەست نەدەدا كە صەلاحەددین لەو تەگوچەڵەمەیە بە بێ ئارەق دەرچێت و بە سەر خاچدروشمان دا زاڵ بێت، چونكە بۆ (الموحدي) ئەوەیان لەبارتر بوو كە فەرمانڕانی میصر بێ‌هێز بێت نە بەهێز تا بە ئاسانی بتوانێت لووت لە میصر بژەنێت، ئەوەبو ئەوەشمان ووت كە بە بروبیانووی بڵاوبوونەوەی نەریت و مۆدەی خراپەوە كە گوایا لە میصردا پەیدابووە دەیویست میصر داگیربكات.

ئەم بێ‌دەنگی و بێ وەڵامی یەی (الموحدي) هۆیەكی تریشی هەیە كە نەشێت لێرەدا باسی ئەوەش بكەین، ئەوەیە كە بە چاوێكی تر سەیری صەلاحەددینی دەكرد چونكە ئەم وەچەی بنەماڵەیەكی فەرمانڕانی ڕەسەن نەبووە (!) بەڵێ ئەگەر وا نەبوایە خۆ دەبو هیچ نەبێت وەڵامێكی بەڕێزی بەهەی بدایەتەوە كە شایانی پلەو پایەی سەركردەیەكی وەكو صەلاحەددین بێت و ئەویش وەكو ئەم هەندێ دیاریو خەڵاتی بۆ ناردایەو داوای لێبوردنی نەتوانینی كۆمەكیشی لێ‌بكردایە، كەچی لەلایەكی‌ترەوە (المنصور) بە چل هەزار دینار شاباشی هۆنراوە چل بەیتیەكەی (كوڕی منقذ)ی باڵیۆزی صەلاحەددینی كردو پێی‌بەخشی‌و پێشی‌ووت: «ئەمە پاداشتی چاكیی خۆت و بەیتەكانتە، واتا لەبەر چاوی ڕەشی صەلاحەددین نی‌یە.». ئەمە وەنەبێ تەنیا مێژوونووسێك باسی كردبێت (الاستقصاء بەرگی/ ٢ لاپەڕەی ١٨٣ هەروەهاش (القري، نفح الطيب ١/٤٤٥)، چونكە (كوڕی منقذ) لە بنەماڵەیەكی فەرمانڕانی لێ‌كەوتوو بووە.

چوارەم: دەوڵەتی (الموحدية) خۆی زیاتر پێویستی بە هێزی دەریایی هەبووە چونكە بەردەوام خەریكی شەڕی ئسپانی‌و پورتوگالی‌یەكان بووە، ئەوەبو باسی ئەممان كردو گەلێ مێژوونووسی ـ كۆن و تازەش ـ وتویانەو لێی لاری نین. بەڵام حەزدەكەین ئەوەش بخەینە پێش چاو كە هەندێ مێژوونووس، بۆ نموونە، وەكو (احسان حقي) كە لە كتێبی (المغرب العربي)یەكەی خۆی‌دا باسی دەكات و وەختە سووربێت لەسەر ئەوەی كە (موحدی‌یەكان) لەوە دەترسان ـ ئەگەر بێتو ئەوروپی‌یەكان هەست بە لاوازیی خەڵكی مەغریب بكەن ـ شەڕی خاچدروشمان لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕوو وەرگێرێت و بەرۆكیان بگرێت و مەغریبیش بگرێتەوە. بەڵام ئێمە ئەم ڕایە بە ڕاست نازانین، چونكە شەڕی خاچدروشمانی ڕۆژئاوای دژ بە مەغریب، بەر لەوەش، لە ژێر ئاڵای «سەندنەوەی خاكی» ئیسپانیادا دەستی‌پێ‌كرد. كە (الخليفة المنصور)ی دوا شای بە هێزی (موحدی‌یەكان)یش مردو توانای بەرگریی مەغریب كەوتەكزی، شەڕی خاچدروشمان لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو مەغریب هەڵنەگەڕایەوە، بەڵكو هەر ئەو جموجوڵەی «سەندنەوەی خاكی ئیسپانیا»یە لە ئارادا هەبوو كە وازی نەهێناو ئسپانیای لە موسوڵمانان سەندەوە. هەرچی وڵاتی ڕۆژهەڵاتیشە ئەوە دوای مەرگی صەلاحەددینیش هەموو خاكی وڵاتی شامیان سەندەوەو خاچدروشم ئاواكانیان (المستوطنات الصليبية) پێ‌چۆڵ كردن و لە ژێر فەرمانەدەی (الملك الاشرف خليل كوڕی الملك المنصور «قلاوون» لە ساڵی ٦٩١ك /١٢٩١زدا دوا قایمەو قەڵاكاری فەلەستینیان لە دەست خاچدروشمان سەندەوەو عەكاشیان پێ چۆڵ كردن.

كۆتایی

---

لەوانەوەی كە باسمان كرد، دەردەكەوێت كە پەیوەندیی نادۆستانەی نێوان قوڵەكانی وڵاتی ئیسلام یان بێ‌پەروا بڵێین پەیوەندیی نادروستی نێوان هەر سێ پێشەوا ئیسلامەكانی ئەو سەردەمانە كە بریتی‌بوون لە (خلیفەی عەبباسی‌و صەلاحەددینی فەرمانەدەو الخليفة الموحدي) بوو بە هۆی نەهامەتی‌یە (كاتی‌یەكەی) كۆششی سەندنەوەی ئەو زەوی‌یە عەرەبی‌یانەی كە خاچدروشمان داگیریان كردبو، هەرچەندە ئۆباڵیشیان چونیەك ناكەوێتە سەر شان.

بەڵی صەلاحەددین بۆ ڕەواندنەوەی تەمی ناكۆكیی نێوان و، لە ڕێی ڕزگاركردن و سەندنەوەی خاكی موسوڵمانان دا ماندو بوو، بەڵام ڕەنجی ئەم و بردەی با بوو. واش پێ‌دەچێت ئەوەی ئەم بێ‌وچان داوای دەكرد لە كێشی ئەو دوو لایەنە ڕوو لێ‌نراوەدا نەبوو كە بیدەنێ‌و پێیان هەڵنەدەستا ئێمە ئەو كۆمەكەی كە صەلاحەددین سەرومر لە (الخليفة الموحدي) داوای‌دەكرد، بەوەمان دانا كە ڕەنگە ویستبێتی لەو لایەنگری‌یە سەرزاری‌و ڕواڵەتەی كە لەگەڵ خەلیفەی عەبباسی‌دا هەیبو، بە یەكجاری وازی لێ بهێنێت و بچێتە ژێر ئاڵای (الموحدي)یەوە، بەڵام (الموحدي) لووتی لێی نەدەخوراو نەیدەویست و قایل نەدەبو.

بەو جۆرە (الموحدي) هەلێكی گرنگی لە دەست چووان، كە ئەگەر بۆی‌بكرایەو سوودی لێ وەرگرتباو یاریدەی صەلاحەددینی دابا، لەوەبوو هەندێ لاپەڕەی مێژووی بگۆڕیبایەو، جێ‌دەستی هەتا هەتایە لە مێژوودا دیاربوایەو، باسی چاكەو بارباوی صەلاحەددین و كۆمەكی ڕزگاركردنی عەكاو، یەكخستنی پاكی سەنگەرگای موسوڵمانانی میصرو شام و ئەفەریقا (تونس)و تا ئەوپەڕی (مەغریب)ی لە لاپەڕەكانی مێژوودا بە شانازی‌یەوە بۆ بنوسرایە.

## پەراوێز:

(١) ابو شامة، الروضتين: ٢/٨٩

الذهبي، (تأريخ الاسلام)ی دەستنووس. پەڕەی ٩ لەبەر ئەوە خاچدروشمان كردیان بە پایتەختی شانشینە خاچدروشمەكەی (بيت المقدس) . (عەكا)ش ـ دوای ئەوەی خاچدروشمان داگیریان كردەوە ـ دوا قەڵاكارو قایمەی خاچدروشمان بوو كە موسوڵمانان سەندیانەوە، ئەوە بوو بە نوخشەی دواهاتنی شەڕەكانی خاچدروشمان (سەیرێكی ابو الفدا المختصر: ٢٥١٤ ـ ٢٦، المقريزى، السلوك: بەرگی ٢ق٣ لاپەڕەی ١٢٥ ـ ١٢٩)

(٢) د. عاشور. الحركة الصليبية، ٢/٨١٣

(٣) كوڕی (شداد) لە ژێر ناونیشانی «ذكر الحيلة التي عملها المركيس في

جمع الفرنج» واتـا ئەو فروفێڵەی کە (مـەرکیـز) لەوبـەری دەریـاوە کردی، دەڵێت: «ئەو فێڵبازە وێنەی شاری قودسی لە سەر کاغەزێکی گەورە کێشا، بەجۆرێك کە وێنەی کڵێسـەی ئەوەدنیایانی تێدا دیاربو کە حەجی لێ دەکەن و بە شکـۆداری دادەنێن، وێنــەی گۆڕەکــەی حەزرەتی عیـسـاشی لە ناو ئەو کڵێسەیەدا کێشا کە ـ وەکو دەڵێن دوای لەسێ دارەدانی ـ لەوێ نێژراوە، ئەو گۆڕەیـە کە ئەوان حەجی لێدەکـەن و لەو بڕوایـەدان کە هەمـو ساڵێـك لە جەژنێـك لە جەژنـەکـانیـان دا (نـووری) بەسـەردا دەبارێ. لە سەر گۆڕەکە وێنـەی سوارێکی موسـوڵمـانیشی کێشـا کە بە ئە سپـەکەیەوە لە سەر گۆڕەکە وەستاوەو ئەسپەکەی میزی بە سەر گۆڕەکەدا کردووە. ئەم وێنەیەیان لەوبەری دەریـاکـەدا واتـا (لـە ئەورووپـا)دا بە هەمـو بازاڕو کومـەڵگـەیـەك دا گێـڕاو کشیشـەکـان بە سەری قوتیی بەدەستیـانـەوە گرتبـوو، پڕ بە دەمیش هاواریـان دەکـردو هەرەشـەو گوڕەشـەیـان لە موسـوڵمـانـان دەکـرد، وێنـەگەلی وەهاش بێگومان کاری لە دڵیان کرد، چونکە ئاینەکەیان خۆی بریتی‌یە لەوە، بەو جۆرە گاوران خرۆشان و کەوتنەجۆش و خەڵکێکی بێشوماریان کەوتنە خۆ شای ئەڵـمـانیش بە خۆیو لەشکـرەوە هاتنە ئامادەبـوون...» [النـوادر السلطـانیـة ـ سیـرة صلاح الـدین، لاپـەڕەی ١٣٦ ـ ١٣٧] سەیـرێکی «الروضتین ٢/١٦٠»و «البدایة والنهایة ١٢/٣٣٥»ی ـ ابن کثیر ـ یش بکە.

(٤) دەیەکی صەلاحەددین SaLadin tax سەیری:
(Lane - Poole, SaLadin.., P.252) بکە

(٥) ابـن شداد، لاپـەڕەی ١١٥، کوڕی شداد خۆی ئەم فرمـانـەی هەڵسـووڕانـدو، دەڵێت: «صـەلاحـەددین فەرمـانی دا کە بچم بۆ بەغداد تا خەلیفەی زەمان ئاگادار بکەم و غیرەتی کۆمەکی بنێمەبەر».

(٦) الباز العرینی، الشرق الاوسط والحروب الصلیبیة، بەرگی/١ لاپەڕەی ٩٣

(٧) کتێبەکەی خۆشم: «الجیش الایوبي في عهد صلاح الدین».

(٨) ابن شداد، النوادر: ١٣٢

(٩) الکامل: ٣٦/١٢

الحنبلي: شفاء القلوب، لاپەڕەی ١٦١

ستیڤنسن: stevenson, the Crusades, pp.260 - 261

(١٠) الکامل: ٣٤/١٢

الروضتین ١٤٧/٢

البدایة والنهایة ٣٣/١٢

ابن الوردي ٤٤/٢

(١١) النوادر: ١٦٠

الکامل: ٦٦/١٢

الروضتین: ١٨٤/٢

(١٢) النوادر: ١٧٤

العماد الکاتب، الفتح القسي: ٥٢٨

الحموی، التأریخ المنصوري: ٢٠٠

سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان: ٤٠٨/٨

ابن واصل، مفرج الکروب: ٣٦٤/٢

ابن العبري، تأریخ مختصر الدول: ٢٢٢

(١٣) فیلیب حتی، تأریخ سوریة ولبنان وفلسطین: بەرگی/١ لاپەڕەی ٢٣٩

(١٤) هارۆڵد لامب، شعلة الاسلام، لاپەڕەی: ١٥٥

(١٥) رنسیمان، تأریخ الحروب الصلیبیة ٦٧٢/٢

(١٦) الروضتین: ١٢٢/٢

(١٧) درید عبدالقادر، سیاسة صلاح الدین: ٤٤

(١٨) النوادر: ١١٨ ـ ١١٩

الفتح القسي: ٣٦٥

مرآة الزمان: ٤٠١/٨

الروضتین: ١٥٢/٢

(١٩) مرآة الزمان: ٤٠١/٨

(٢٠) الروضتین: ١٧٦/٢

(٢١) القزاز، الحیاة السیاسیة في العراق: ١٠٠

(٢٢) ڕەنگـە بەنهێنی گـرتنی ئەم پەیـوەنـدی کردنـە لەبـەر ئەوە بووبێت کە صەلاحەددین نەیویستبێت خۆی وەها نیشان بدات کە ناتوانێت شاری عەکا بپـارێـزێت، نەوەکـا دوژمنی گەمـارۆدەری شارەکـە پێ‌بـزانێت و بەسـەریـەوە نەچێت. یان ڕەنگە ئەو پەیوەندی‌کردنەی بۆیە بە دزی‌یەوە کردووە تا خەلیفەی عەبباسی بەغداد پێ‌نەزانێت و تووڕەبێت و نێوانیان بە یەکجاری تێك بچێت.

هەرچی مێژوونووسەکانی خۆشێتی ئەوە، جگە لەو هۆیانەی‌تر کە باسمان کرد، نەیـانـویسـتـووە بڕینی بکـولێننـەوە، دووریش نی‌یـە کە هەر ئاگـاشیـان لێ‌نـەبـووبێت یان ئەوەنـدەیـان لەو پەیـوەنـدی‌یـە نەزانیبێت هەرچـەنـدیشـە هەنـدێکیـان تا بڵێی لێی نزیـك بوون، ئەوەتـا (العمـاد الکـاتب) نووسەری خۆی بووەو ئەوەتا (ابن شداد) قازیی لەشکرو پرسوراپێکەری بووە. دیارە ئەم دوانە سپڵە نەبوون و هەواڵی پەیوەندی‌یەکەیان دوای مردنی صەلاحەددینیش هەر ئاشکرا نەکردووە. بەڵام هەواڵەکەلە ناو خەڵکی‌دا بڵاوبووەوەو ئیتر ئەگەر کەسێکیش بینـوسیبـا ڕووزەردی‌یـەکی ئەوتـۆی تێدا نەمابوو. جا ئەو جا (ابو شامـە کە کۆنتـرین و گرنگتـرینی مێـژوونووسـانی ڕۆژهەڵاتە دەمیان لەم باسە دابێ) بە دووی ئەو نامانەی «القاضي الفاضل»دا کەوتەگەڕان. ئەوەش ووترا کە شا (الموحدي) داوای لە هەردوو والی‌یەکەی ئەفەریقا (تونس) کرد کە باسی هاتنی باڵیوزەکەی صەلاحەددین بە نهێنی بگرن و دەری‌نەبرن تا خۆی دەگەڕێتەوەو چاوی پێی دەکەوێت.

(٢٣) الروضتین

(٢٤) سەیری کتێبی (النوادر) لاپەڕەی ٢٤٣ ـ ٢٤٧ بکە. باسەکەی «ابن سـد في نوادره والايام الاخيرة. . .»ی خۆشمان کە لە گۆڤاری کاروان /٢ ژمارەی ١٤ی ١٩٨٣دا بڵاوکراوەتەوە.

(٢٥) عبدالعزیز سید الاهل، ایام صلاح الدین، لاپەڕەی: ٩٠

(٢٦) حسین مؤنس. نورالدین محمود، ص: ١٩٣ ـ ١٩٤

(٢٧) ابراهیم حرکات. المغرب عبرالتأریخ، لاپەڕەی ٢٦١

(٢٨) حکمت الدولة المرابطية بلاد المغرب بين ٤٣٠ ـ ٥٤١هـ /١٠٣٧ ـ ١١٤١م

٢٩) تینملل: دێهات و باخ وبێستانەو نشینەی بەربەرەو، لە مەڕاکیشەوە سێ فەرسەخ ڕێ دوورە.

یاقـوت الحمـوي، معجم البلدان: ٩١١/١، کە گۆڕی (عبـدالمؤمن کوڕی علي)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی (الموحدین)و گۆڕی کورەکانیشی تیدایە.

(٣٠) لە کتێبی (المعجب في تلخيص اخبار المغرب)، لاپەڕەی (١١)ەوە وەرگیراوە.

(٣١) اشبیلیـة: شارێکی گەورەو فراوانـە. لە ئەنـدەلـوس دا ئەمڕۆ لەم شـارە گەورەتری نی یە. لە دەریاشەوە نزیکەو کەوتووەتە دامێنی چیای (الشرف)ەوە کە چیایەکی پڕ دارستانەوە زەیتوون و میوەیتریشی زۆرە. . . . ئەم شارە لە ڕووبارێکی گەورەشەوە نزیکە کە ڕووبارێکە وەکو ڕووباری دیجلە یان وەکو ڕووباری نیل، پێی‌دەڵێن (الوادي الكبير).

معجم البلدان: ٣٧٥/١.

(٣٢) عبدالعزیز سالم، المغرب في العصر الاسلامي، لاپەڕەی ٧١٣

(٣٣) سەیـری تەرجـەمـەکـەی لە وفیـات الاعیـان: (٣/٧ ـ ١٩)و لە سەرچاوەگەلی تردا بکە.

(٣٤) شلب: شارێکی خۆرئاوای ئەندەلوسە، پێنج ڕۆژە ڕێ لە (شنترین)ەوە دوورە معجم البلدان: ٣١٢/٣. ئەم شارە ئێستا هی پرتوگالە.

(٣٥) شنـترین: شـارێکی خۆرئـاوای ئەنـدەلـوسـەو کەوتووەتە سەر ڕووباری (تاجە). ئەم ڕووبارە دەڕژێتە بەحری موحیتەوە واتا (زەریای ئەتڵەسی)یەوە. شارێـکـی قایـمـەو قەڵاکـارەو پـانـزە ڕۆژە ڕێ لە شاری قورتوبەوە دوورە. ئەمڕۆ ئەم شارە موڵکی فەرەنگەو لە ساڵی (٥٤٤ك)ەوە هی ئەوانە. یاقوت. معجم البلدان. ئێستاش شارێکە سەر بە دەوڵەتی پرتوگاڵ.

(٣٦) د. سالم: تأریخ المغرب، لاپەڕەی ٧٢٦ ـ ٧٢٩

ملین: عصر المنصور الموحدي: ١٣٣ ـ ١٤٢

(٣٧) عبدالواحد المراكشي. المعجب، لاپەڕەی: ١٨٢

ابن خلکان دەڵێت: لە مەڕاکیش ئەمری خودای کردووە، وتراویشە کە لە شاری (سلا)ی مەغریب مردووە. لە ساڵی (٦٨٠ك)دا گەلێ کەس باسیان بۆم کرد کە لە نزیك شاری (المجدل)ی ناوچەی (البقاع)دا گوندێك هەیە «حمّارە»ی پێ‌دەڵێن؛ لە نزیك ئەم گوندەوە ئاسەوارێك هەیە دەڵێن گۆڕی (الامیـر یعقـوب ملك المغـرب)ە. (وفیـات الاعیـان ١٠/٧). کوڕی (الأثیر)یش دەڵێت: (المنصور یعقوب بن یوسف) لە شاری «سلا» مردووەو کاتی خۆی لە مەڕاکیشـەوە هاتـووەتـە ئەم شارەوە لە تەنیشت ئەم شارەوە شارێکیتری دامەزراندووەو ناوی ناوە (المهدیة) کە لە هەموو تارێك باشترو پاکتربووە، جا ئەوجا خۆیشی سەری لە شارەکە داوە کە تەماشای بکات، کەچی لەوێ مردووە. (الکامل: ١٤٥/١٢)».

(٣٨) ئەگـەر دەتـەوێت زیـاتـر لەمەڕ (اولاد الغانیة)وە شت بزانیت سەیری: (عبدالواحد المراکشي، المعجب، لاپەڕەی ٦،٧و دوای ئەو لاپەڕانەش بکە).

د. سالم: تأریخ المغرب، لاپەڕەی ٧١٦

(مراجع عقیلة الفناوي) سقوط دولة الموحدین، لاپەڕەی ١٦٧ ـ ١٨٣

(٣٩) ملین، عصر المنصور، لاپەڕەی: ٢٥

(٤٠) ابن الأثیر، الکامل: ٥٢١/١١

القلقشندي، صبح الاعشى: ١٢٦/٥

عبدالواحد المراكشي

سەیری (عصر المرابطین والموحدین: ١٤٥/٢)ی محمد عبدالله عنان یش بکە. بەڵام (مراجع عقیلة الفناوي) ڕای وەها نی‌یەو پێچەوانەیە، لاپەڕەی: ١٧٣

(٤١) الکامل: ٥٠٧/١١ ـ ٥٠٨

(٤٢) الکامل: ٣٧٠/١١

عنان: عصر المرابطین والموحدین، لاپەڕەی ١٥٥

(٤٣) سەیری سەرچاوەکەی پێشو (مراجع عقیلة الفناوي)، لاپەڕەی ١٩٤ بکە.

(٤٤) ابن جبیر، رحلتـە، لاپـەڕەیـەکی زۆری ئەم کتێبە. هەروەها سەیری کتێبی (اعز مایطلب)ی (ابنة تومرت) بکە تحقیق لوسیانی، مطبعة لوسیانی، الجزائر ١٩٠٣، لاپەڕەی ٣٠٩، نقلاً عن الفناوي. لاپەڕەی: ١٩٥

(٤٥) الفناوي: ١٩٨ بۆ ئەوەش کە زیاتر بزانیت قەراقوش لەو هێرشانەیدا چیی‌کردووە سەیری ئەم کتێبە بکە، لاپەڕەی ١٩٩ ـ ٢٠٢

(٤٦) ابن الأثیر: ٥٢١/١١

(٤٧) سنتـریـة: شارۆچکـەی (واحـة)ی سێ‌هـەمـە، کەوتـووەتـەخۆرئـاوای (الغیوم)ەوە، کە دوا ویلایەتی سەر بە میصرەو دە قۆناغ بە ڕێگەی بیابانی ورماڵ دا لە شاری (اوجلە)وە دوورە. شارۆچکەیەکی کەم ئاوەو، خەڵکەکەی بەربەرن و عارەبیان لە ناودا نی‌یە.

معجم البلدان: ١٥٧/٣

(٤٨) اوجلة: شارێکە لە باشووری (برقة) بەرەوخۆرئاوای، لە دەشتایی‌یەکی بەرین دایەو ئاوەدانەو مێش هەنگی زۆرە

معجم البلدان: ٣٩٧/١

(٤٩) ابن خلدون ٦/١٩١، ١٩٢

(٥٠) (محمد الرشيد ملين) دەڵێت: «خەليفة الموحدي ئەوەی هەر لە دڵ دا بوو کە صەلاحەددین بووبوو بە رابەری نێوان خەلیفەی عەبباسی و کورانی (غانية)و لە رێگەی صەلاحەددینەوە (دیاری)و بەخششی خەلیفەی عەبباسی دەگەیشتە کوری غانیة»، عصر المنصور الموحدي، لاپەرەی: ١٤٤.

(٥١) سەیری سعد زغلول، العلاقة بين صلاح الدين لاپەرەی ٩٦

(٥٢) صبح الاعشى: ٥٢٧/٦

ابن منكلي، مخطوط (الاحكام الملوكية) پەرەی ٦٦أ

(٥٣) صبح الاعشى: ٥٢٩/٦

(٥٤) ن.م.ص: ٥٢٧

(٥٥) ص: ٥٣٠

(٥٦ ن.م.ص

ابن منكلي، پەرەی ٦٨أ

(٥٧) لە (شيزر)ی شام لە ساڵی (٥٢٣ك /١١٢٨ز)دا لەدایك بووە سەیری ابن خلكان: ١٢/٧ بکە.

(٥٨) شيزر: قەڵاکارێکە لە نزیك (معرّة)ی شامەوە، کورەیەکی تێدایە، رۆژمرێیەك لە حەماوە دوورەو رووباری (الأرند)ی بە ناودا دەروات و سەر بە (حمص)ە، کۆمەڵێك میرگەلی کورانی (منقذ) لەم جێگەیەدا هەڵکەوتوون معجم البلدان ٣٥٣/٣

(٥٩) الطواشية. روتبەیەکی بەرزی سەربازییە، سەیری پەراوێزی (١)ی لاپەرەی (١٠٣)ی کتێبەکەی (الجيش في عهد صلاح الدين)ی خۆیشم بکە.

(٦٠) الروضتين: ١٧١/٢

(٦١) الاسفهسلار: واتا سوپاسالار یان پێشەوای لەشکران. صبح الاعشى: ٧/١ - ٨.

(٦٢) الروضتين: ١٧٠/٢

(٦٣) ن.ص.

(٦٤) ن.م.ص ١٧١

(٦٥) ص: ظ١٧

(٦٦ سەیری لاپەرەی ١٨٣/ ١٨٤ی (عصر امرابطين والموحدين)ی محمد عبدالله عنان بکە. هەروەهاش (سعد زغلول)، لاپەرەی ٨٧.

(٦٧) الروضتين: ١٧٣/٢

ابن خلدون: ٢٤٦/٦

(النـاصـری)ش لە کتێبـەکـەی (الاستقصـاء ١٨٢/٢)ی خۆیدا باسێکی دوورودرێژی دیاریگەلی نایاب نایاب دەکات.

(٦٨) المقری، نفح الطيب، بەرگی (١) لاپەرەی ٤٤٤

النصری، الاستقصاء: ١٨٣/٢

(٦٩) (امير المؤمنين) لە (الاستقصاء)دا، ١٨٣/٢

هەروەها (نفح الطيب): ٤٤٤/١

الروضتين ١٧٤/٢

الناصري، الاستقصاء: ١٨٣/٢

(٧١) الروضتين: ن.ص

(٧٢) نفح الطيب: ٤٤٥/١

(٧٢) هەندێك رایان وایە کە ئەگەر خەلیفە (يعقوب الموحدى) کۆمەکی دەریایی بە صەلاحەددین نەکردبێ بە هەڵە نەچووە، چونکە خەلیفە مافی ئەوەی هەیە کە پێش ئەوەی پیر لە یاریدەی وڵاتێکی دوور بکاتەوە، هۆشی بە لای میللەتەکەی خۆیەوە بێت. سەیری لاپەرەی ١٤٤ی (عصر المنصور)ەکەی (محمد الرشيد ملين) بکە.

هەروەها لاپەرەی ٩٧ی لێکۆڵینەوەی «العلاقة بين صلاح الدين»ەکەی سعد زغلول یش بکە.

احسان حقي)یش دەنووسێت و، دەڵێت: (الموحدين) لەوە دەترسان کە ئەگەر ئەوروپاییەکان هەست بە لاوازی و بێدەسەڵاتی خەڵکی باکوری ئەفەریقا واتا (الموحدين) بکەن، شەرەکانی خاچدروشمان ئەوجا لە رۆژهەڵاتەوە بادەداتەوە بۆ رۆژئاواو بە یەخەی ئەوانەوە دەنووسێت و، دەڵێت بەڵگەی ئەمەش ئەو شۆرشە سەرومرەی وڵاتی ئەندەلوسە تا موسوڵمانان لە ئەندەلوس بەگیربێنن و بۆیان نەکرێت یاریدەی برا موسوڵمانەکانی میصرو سوریەی خۆیان بدەن. . . . رەنگە (المنصور الموحدی)ش ئەمەی زانیبێت و واشی بە باشتر زانیبێت کە کەشتیگەلەکەی لە رۆژئاوا بمێنێتەوە بۆئەوەی موسوڵمانانی رۆژهەڵات لە کۆنەکی خاچدروشمان بپارێزێت (!). (صلاح البیر)یش دەڵێت: موسوڵمانانی باکووری ئەفەریقاش (بەڵێ با وابێ). سەیری لاپەرە ٦٨/٦٧ی کتێبی (المغرب العربي)یەکەی بکە. بێگومان ئەم رایە هەڵەیەو دوای کەمێك بەربەرچی دەدەینەوە.

سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە:


١) ابن الاثير، عزالدين علي بن ابي الكرم الشيباني الجزري (ت ٦٣٠هـ /١٢٣٢م) الكامل في التأريخ، دار صادر. دار بيروت، بيروت ١٩٦٦.

٢) ابن جبير، ابو الحسن محمد بن احمد بن جبير (ت ٦١٤هـ /١٢١٧م) رحلة ابن جبير، دار صادر - دار بيروت، بيروت ١٩٦٤.

٣) ابن خلدون، ابو زيد عبدالرحمن بن محمد (ت٨٠٨هـ /١٤٠٥م) كتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر (تأريخ ابن خلدون). ط /القاهرة.

٤) ابن خلكان. شمس الدين احمد بن محمد بن ابي بكر (ت ٦٨١هـ /١٢٨٢م) وفيات الاعيان. تحقيق د. احسان عباس. ط /دار الثقافة، بيروت ١٩٧١/٦٨.

٥) ابن شداد، بهاءالدين يوسف بن رافع (ت٦٣٢هـ/ ١٢٤٣م) النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية (سيرة صلاح الدين).
تحقيق د. جمال الدين الشيال. ط/ الدار المصرية، القاهرة ١٩٦٤.

- ابن العبري، ابو الفرج غريغوريوس، هرون الملطي (ت ٦٨٥هـ/ ١٢٨٦م) تأريخ مختصر الدول. المطبعة الكاثوليكية. بيروت ١٩٥٨.

- ابن كثير، عماد الدين اسماعيل بن عمر الدمشقي (ت ٧٧٤هـ ١٣٦٠م) البداية والنهاية، مطبعة، القاهرة ١٩٣٢.

- ابن منكلي، محمد الناصر بن محمود بن منكلي المصري (ت ٧٧٨هـ ١٣٦٠م) عن مخطوط كتابة (الاحكام الملوكية والضوابط الناموسية) منشور في (المجلة العربية للعلوم الانسانية) التي تصدرها كلية الآداب، جامعة الكويت. عدد ربيع ١٩٨٤/ العدد (١٤) المجلد (٤) عرضه محمد حسين صالحية.

- ابن واصل، جمال الدين محمد بن سالم الحموي (ت ٦٩٧هـ ١٢٩٨م) مفرج الكروب في اخبار بنى ايوب، تحقيق د. جمال الدين الشيال. ط/القاهرة.

- ابن الوردي، ابو حفص زين الدين عمر (ت ٧٤٩هـ /١٣٤٨م) تاريخ ابن الوردي (ذيل المختصر في اخبار البشر). المطبعة الحيدرية، النجف الاشرف ١٩٦٩،

- ابو شامة، شهاب الدين عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي الدمشقي (ت ٦٦٥ هـ /١٢٦٦م) كتاب الروضتين في اخبار الدولتين، مطبعة وادي النيل. القاهرة ١٢٨٨هـ.

- ابو الفداء عمادالدين اسماعيل بن محمد بن تقي الدين عمر الايوبي، (ت ٧٣٢هـ /١٣٣٢م). المختصر في اخبار البشر مطبعة دار الكتاب اللبناني. بيروت.

١٣) الحموي، ابو الفضائل محمد بن علي (ت ٦٤٤هـ /١٢٤٦م) التاريخ المنصوري، تلخيص الكشف والبيان في حوادث الزمان. موسكو، دار النشر للآداب الشرقية. ١٩٦٠

١٤) الحموي، شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الرومي (ت ٦٢٦هـ ١٢٢٩م) معجم البلدان. ط طهران ١٩٦٥

١٥) الحنبلي، عزالدين احمد بن ابراهيم المصري (ت ٨٧٦هـ ١٤٧١م) شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، تحقيق د. ناظم رشيد. بغداد ١٩٧٨

١٦) الذهبي، شمس الدين محمد بن احمد الدمشقي (ت ٧٤٨هـ ١٣٤١م) مختصر تأريخ الاسلام. مخطوط مصور في مكتبة الدراسات العليا - كلية الآداب. بغداد.

١٧) سبط ابن الجوزي. شمس الدين قز او غلى التركي (ت ٦٥٤هـ/ ١٢٥٦م) مراة الزمان في تأريخ الاعيان. مطبعة مجلس دار المعارف العثمانية، حيدر اباد، الدكن الهند ١٩٥١

١٨) عماد الدين محمد بن محمد بن حامد الكاتب الاصفهاني (ت ٥٩١هـ /١٢٠٠م) الفتح القسى في الفتح القدسي. تحقيق محمد محمود صبح. الدار القومية للطباعة. القاهرة ١٩٦٥.

١٩) القلقشندي، احمد بن علي بن عبدالله (ت ٨٢١هـ /١٤١٨م) صبح الاعشى في صناعة الانشا، المطبعة الاميرية، القاهرة ١٩١٣ - ١٩١٧.

٢٠) المراكشي، عبدالواحد من كتاب المعجب في تلخيص اخبار المغرب ط. دمشق ١٩٧٨.

٢١) المقرّي، احمد بن محمد المقري التلمساني (ت ١٠٤١هـ /١٦٣٠م) نفح الطيب من غصن الاندلس الرطيب. تحقيق د. احسان عباس ط/ دار صادر - بيروت ١٩٦٨

٢٢) - المقريزى، تقي الدين احمد بن علي (ت ٨٤٥هـ /١٤٤٢م) السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق د. محمد مصطفى زيادة. مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة ١٩٣٤

٢٣) الناصري، ابو العباس احمد بن خالد كتاب الاستقصاء لاخبار دول المغرب الاقصى مطبعة دار الكتاب - الدار البيضاء ١٩٥٤..

مصادر حديثة:

---

٢٤) ابراهيم حركات. المغرب عبرالتأريخ. دار السلمى. ١٩٦٥.

٢٥) احسان حقي، المغرب العربي. دار اليقظة العربية للتأليف والترجمة والنشر/ بيروت/ بلا.

٢٦) د. الباز العريني، الشرق الاوسط والحروب الصليبية. دار النهضة العربية. القاهرة ١٩٦٣.

٢٧) د. حسين مؤنس. نورالدين محمود. مطبعة مصر /١٩٢٩

٢٨) د. دريد عبدالقادر نوري - سياسة صلاحالدين في بلاد مصر والشام والجزيرة، مطبعة الارشاد. بغداد/ ١٩٧٦

٢٩) د. سعد زغلول عبدالحميد.

بحث «العلاقة بين صلاح الدين وابي يوسف يعقوب» مجلة كلية الاداب/ جامعة الاسكندرية، المجلد ٦+٧ لسنة ١٩٥٢.

٣٠) د. سعيد عبدالفتاح عاشور الحركة الصليبية، مطبعة الانجلو مصرية. مطبعة البيان العربي. القاهرة ١٩٦٣

٣١) د. عبدالعزيز سالم تأريخ المغرب الكبير. مطبعة شباب الجامعة - الاسكندرية ١٩٨٢

٣٢) عبدالعزيز سيد الاهل، أيام صلاح الدين. المكتب التجاري للطباعة والتوزيع والنشر. بيروت ١٩٦١.

٣٣) د. فيليب حتى: تأريخ سورية ولبنان وفلسطين. ترجمة كمال اليازجي. دار الثقافة ومؤسسة فرانكلين، المطبعة البولسية، بيروت ١٩٥٩.

٣٤) د. محسن محمد حسين الجيش الايوبي في عهد صلاح الدين. ط مؤسسة الرسالة للطباعة والنشر والتوزيع. بيروت ١٩٨٦

٣٥) د. محسن محمد حسين مقال (ابن شداد في نوادره والايام الآخيرة من حياة صلاح الدين) في مجلة (كاروان - المسيرة) مجلة الامانة العامة لادارة الثقافة لمنطقة كردستان اربيل. العدد (١٤) ١٩٨٣

٣٦) محمد الرشيد الملين. عصر المنصور الموحدي. مطبعة الشمال الافريقية /بلا

٣٧) د. محمد صالح داود القزاز الحياة السياسية في العراق في العصر العباسي الاخير. مطبعة القضاء. النجف ١٩٧١

٣٨) د. محمد عبدالله عنان عصر المرابطين والموحدين في المغرب والاندلس. مطبعة لجنة التأليف القاهرة ١٩٦٤

٣٩) د. مراجع عقيلة الغناوي سقوط دولة الموحدين. منشورات جامعة بنغازى - ليبيا ١٩٧٥

٤٠) هارولد لامب. شعلة الاسلام (قصة الحروب الصليبية). ترجمة محمود عبدالله يعقوب. مطبعة الارشاد منشورات مؤسسة فرانكلين ودار المتنبي. بغداد ١٩٧٦

٣٣) د. فيليب حتى: تأريخ سورية ولبنان وفلسطين. ترجمة كمال اليازجي. دار الثقافة ومؤسسة فرانكلين، المطبعة البولسية، بيروت ١٩٥٩.

٣٤) د. محسن محمد حسين الجيش الايوبي في عهد صلاح الدين. ط مؤسسة الرسالة للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت ١٩٨٦

٣٥) د. محسن محمد حسين مقال (ابن شداد في نوادره والايام الاخيرة من حياة صلاح الدين) في مجلة (كاروان - المسيرة) مجلة الامانة العامة لادارة الثقافة لمنطقة كردستان اربيل. العدد (١٤) ١٩٨٣


٣٦) محمد الرشيد الملين. عصر المنصور الموحدي. مطبعة الشمال الافريقية /بلا

٣٧) د. محمد صالح داود القزاز الحياة السياسية في العراق في العصر العباسي الاخير. مطبعة القضاء. النجف ١٩٧١

٣٨) د. محمد عبدالله عنان عصر المرابطين والموحدين في المغرب والاندلس. مطبعة لجنة التأليف القاهرة ١٩٦٤

٣٩) د. مراجع عقيلة الغناوي سقوط دولة الموحدين. منشورات جامعة بنغازى - ليبيا ١٩٧٥

٤٠) هارولد لامب، شعلة الاسلام (قصة الحروب الصليبية). ترجمة محمود عبدالله يعقوب. مطبعة الارشاد منشورات مؤسسة فرانكلين ودار المتنبي. بغداد ١٩٧٦


41) Stevenson, W.B: The Crusaders in the East, Cambridge, 1907.

42) Lane - PooLe, StanLey: SaLadin And The Fall of The Kingdom of JerusaLem, Khay ats - Beirut, 1962.


## مسؤلية صلاح الدين في فشل حصار مدينة صور

**بەرپرسیاریتی «صلاح الدین» لە سەرنەکەوتن لە گەمارۆدانی شاری «صور»دا.**

**نشرنا البحث المعنون اعلاه في مجلتنا والذي كتبه الدكتور محسن محمد حسين وقد سقط من الطبع عنوانه الذي هو «قسم التاريخ في كلية التربية بجامعة بغداد» لذا اقتضى التنويه.**

**سكرتير مجلة روشنبيرى نوى**

ملخص البحث:

# طبيعة وأسباب اتصال صلاح الدين مع الخليفة المنصور الموحدي

د. محسن محمد حسين
الاستاذ المساعد في قسم التأريخ
كلية التربية ـ جامعة بغداد

من المواضيع الشائكة في تاريخ الحروب الصليبية، والعلاقات بين القوى الاسلامية، موضوع لتصال صلاح الدين الايوبي بالملك الموحدي «الخليفة المنصور» يعقوب بن يوسف بن عبدالمؤمن الذي حكم بلاد المغرب وبعض بلاد الاندلس في الفترة (٥٨٠ ـ ٥٩٥هـ ١١٨٤ ـ ١١٩٨م) فهذا الموضوع لم يعالج بمستوى يرقى الى مستوى خطورة الحدث إضافة الى ان المؤرخين المغاربة، المعاصرين لاحداث تلك الفترة، لم يلقوا الضوء الكافي عليه، او عالجوه من منظار ضيق. اما المؤرخون المعاصرون المشارقة فلم يذكروا عنه اي شيء وهذا ما دفعنا الى دراسة الموضوع على ضوء طبيعة العلاقات بين القوى الاسلامية، التي تتمثل في حاجة صلاح الدين الى دعم بحري اثناء حصار عكا الطويل، وذلك لخلق توازن مع بحرية العدو الذي حاول استعادة الاراضي التي فقدها اثر موقعة حطين مما أثار اوربا مجدداً ودفعها الى القيام بحملة صليبية جديدة هي الثالثة التي قادها اعظم ملوك اوربا عصر ئذ، والذين انصب اهتمامهم باستعادة «مملكة بيت المقدس» بادئين من عكا بتطويقها براً وبحراً، وحين عجزت بحرية صلاح الدين من الصمود اضطر هذا القائد الى طلب المعونة من الاطراف الاسلامية، ولاسيما من الملك الموحدي. وقد فشل في الحصول على شيء ما. وقد بحثنا اسباب لجوء صلاح الدين الى هذا الملك، واسباب رفض طلبه، وكانت النتيجة سقوط عكا المريع. رغم ان العدو لم يستطع احراز نصر كبير بعدها.

من كل هذا نرى ان العلاقات غير الودية بين الاطراف (بل الاقطاب) الاسلامية الثلاثة (الخليفة العباسي، القائد صلاح الدين، والخليفة الموحدي) كانت مسؤولة بشكل أو بآخر عن الانتكاسة (الموقتة) التي اصابت حركة إسترداد الارض العربية من الغزاة الصليبيين، رغم ان مسؤولية تردي العلاقات لاتتحملها الاطراف المذكورة بنفس الدرجة، وعلى الرغم من الجهود المضنية التي بذلها صلاح الدين لتنقية الجو والتفرغ لقضية تحرير الارض، الا ان جهوده ذهبت ادراج الرياح. ويبدو ان ما طلبه هذا القائد بمساعيه الحثيثة كان اكبر من قدرات كلا الطرفين اللذين التجأ اليهما. وقد اتخذنا من اصراره للحصول على مساعدة الخليفة الموحدي مؤشراً على احتمال تفكيره بتغيير ولائه، او تبعيته الشكلية، للخليفة العباسي، الى الانضمام الى طاعة الخليفة الموحدي. الا ان هذا الأخير لم يكن على استعداد لتلبية طلب القائد، وبذلك فوّت على نفسه فرصة هامة ربما كانت تغيّر بعض وجه التاريخ لو كان له القدرة على التجاوز والتعاون مع صلاح الدين، ولكان التاريخ يذكر له تلك المأثرة الى الأبد، كونه قد أسهم في انقاذ عكا، وتوحيد الجبهة الاسلامية بين مصر والشام مروراً بأفريقيا (تونس) والى المغرب الأقصى.

# لێکۆڵینەوەی شوێنە دیارەکانی هەولێر لە کتێبی ابن المستوفیدا
# «تاريخ أربل»

**نووسینی دکتۆر حسام الدین نەقشەبەندی**
**کۆلێجی ئەدەبیات: زانکۆی صلاح الدین**

**سەرەتا:**

ناوچەی هەولێر شوێنێکی نایابی هەیە، بە یەك گەیشتنی ڕێگەی کاروانە، نەخـوازەلا ئەو دوو ڕێگـایـەی لە ڕۆژهـەلات و باکـوورەوە دێـن، کە لە ئازەربیجـانـەوە دەست پێ دەکـەن و ڕاڕەوی سەخت دەبـڕن، یەکـەمیـان لە باکـووری ڕۆژهـەلاتـەوە بە ڕەوانـدوزدا تێ دەپـەڕێ، ئەوی‌تـریشیـان لە ڕۆژهـەلاتـەوە بە کۆیـەدا،[1] هەروەهـا خۆی بازاڕێـکـی گەورەیـە بۆ دەوروپشتەکەی، چونکە دەکەوێتە ناوەڕاستی هەرێمێکی دەوڵەمەندی بەپیت و بەرەکەتی بەرچاو، بریتی‌یە لە بانۆیەکی تەختایی بێ‌پەناو پێچ، وە لە سایەی ئەم شوێنەی‌و لە سایەی قەلاتە قایمەکەی هەولێر مانەوەی خۆی بێ لە هەموو شارەکـانی ئاشـوور، مانـەوەی ناوەکـۆنـەکـەی خۆی بە درێژایی ڕۆژگار هەتا ئەمڕۆمان پاراستووە.[2]

لە سەرەتـای ئیـسلام دا، هەولێـر بایـەخی دەرنـەکـەوت، «الطبـري» لە مێـژووەگـەورەکـەی‌دا ناوی نەهێنـاوە، شارنـاسـە سـەرەتایی‌یەکانی عەرەبیش ناویـان نەبـردووە، ابن خرداذبـە (و ٢٨٠ك/ ٨٩٧ز)و قدامـە بن جعفـر (و ٣٢٠ك/ ٩٣٢ز)ی نەبن،[3] کە ناوهێنانەکەی لە ابن خرداذبەوە وەردەگرێ بەو ناوەی کە طـوجێکە «ناحیە» سەربە کورە (پارێزگا)ی (حلوان)،[4] واتە ئەو حدلە ناحیەیەکی بچووکی بایەخداری سنووردراو بوو.

دوای ئەوە بایەخ پێ‌نەدانی بەردەوام بوو، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە هەتا نیـوەی یەکـەمی سـەدەی پێنجـەمی کۆچی بە شارێکی نەنـاسـراو مایـەوە، کە میرنشینی (هذبانی) سەری هەڵ دا، هەولێر بووە مەڵبەندەکەی‌و، کە هەتاکو دوای سالـی (٢٠٥ك/ ١١٢٦ز) بەردەوام بوو، دوای ئەوە بایـەخی هەولێـر پتـربـوو، نەخـوازەلا دوای ئەوەی زین الـدین علی کوچـك «واتـە بچـووك» بن بکتکین لە سـەرەتاکانی سالی ٥٦٣ك/ ١١٦٧ز دەوڵەتۆکەیەکی دامەزراندو هەولێری کردە ناوچەیەکی ئەو، بەڵام لەسـەردەمی میر مظفرالدین کوگبوری زاوای صلاح ـ الدینی ئەیووبی کە سالی ٦٣٠ی کۆچی وەفاتی کرد گەیشتە پۆپەی گەشانەوەی، تا ڕادەیەکی زۆر ئەو دەوڵەتۆکەی بەرفراوان کرد کە لە میر (زین الـدین)ی برایـەوە سالی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) بۆی بەجێ مابـوو، بەم

...ـجه پۆیەی گەشانەوەو دەرکەوتنی لە کۆتایی‌یەکانی سەدەی شەشەم و نیوەی ...ـمی سەدەی حەوتەمی کۆچی بوو.[5]

...ـرەدا دەبێ ـ بەر لە باس کردنی نەخشەکانی شاری إربل ـ پەنجە بۆ ئەوە ...ـێ بکەم کە دکتۆر محسن محمد حسین ـ ی هاوەڵم لە نامەکەی ...ـجـیـردا[6] بەشێکی بە نرخی دەربارەی نەخشەکانی شار نوسیوە، تێی‌دا ...ـی قەڵاتەکەو منارەی مظفریەو دەزگا دینی‌یەکان و زانستی‌یەکان دەکات، ...ـەی مزگەوت و خانەقاو دەزگای حەدیث و قوتابخانەکان، بەڵام دکتۆر محسن ...ـەکەی ساڵی ١٩٧٤ تەواوکردبوو و ساڵی ١٩٧٦ بە چاپی گەیاند، بەر ...ـەی بەرگی دووەمی کتێبی «تاریخ إربل»ی ابن المستوفي بێتە کایەوە، کە ...ـتۆر (سامی بن السیّد خماس الصقار) بەرگی ناوبراوی بە هەر دوو ...ـی‌یەوە ساغ کردەوەو ساڵی ١٩٨٠ بڵاوی‌کردنەوە،[7] ئەو حەلە دکتۆر ...ـسن ـ لە کاتی نوسینی نامەکەی‌دا ـ چاوی بە ساغ کراوەکەی کتێبی ابن ...ـستوفي نەکەوتبوو، لەبەر ئەوە پشت بەستنی سەرەکی‌و بنەچەییم لە ...ـی کردنی نەخشەکانی إربل دا بەم کتێبەیەو، بە شێوەیەکی لاوەکی بە ...ـەرچاوەی‌تره، نەخوازەلا (وفیات الاعیان)ی ابن خلکان، واتە ئەم ...ـکەیەوەی من پێ‌زانین و تەواو ـ کردنی باسە ناوبراوەکەی «دکتۆر محسن»ە،[8] بێ‌ئەوەی بچمە ناو ئەو باس کردنانەی مامۆستای بەرێز.

## ـ قەڵات (القلعة):

قەڵاتی هەولێر دەکەوێتە سەرگردێکی پان و بەرین، بەرزایی لە رووی ...ـیەوە نزیکەی ٢٦ مەترەو، روویەرێك داگیر دەکات کە دەگاتە نزیکەی ...٠٠) هەزار مەتری چوارگۆشە،[9] (یاقوت) بە قەڵاتی (حلب)ی ...ـوو، بەڵام پاشان پێی زانیوەو وتوویەتی: «قەڵاتی إربل لە قەڵاتی ...ـب) گەورەترو بەرین ترە».[10] شاری هەولێر خۆی وا دەنوێنێ کە لە ...ـەرەتای پەیدابوونی‌یەوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ هەر بریتی بووە لە ...ـلاتەکە، لە سەردەمی (یاقوت)دا (و ٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز) شارێکی تەواو ...ـوە. خانوو و بەرەو بازاری تێدا بووە، قەڵاتەکەی قایم بووەو خەندەکی ...ـووی دەورەی داوە،[11] بەڵام (یاقوت) بۆمان باس ناکات بۆچی قەڵاتەکە ...ـە بووە، تەنیا باسی خەندەکە قووڵەکەی دەکات، دەشێ تەشبیەکردنەکەی ... قەڵاتی (حلب) ئەوە دەرئەنجام بدەین کە قایمی‌یەکەی بۆ دەرگاکان و ...ـوویە تۆکمەکانی‌و کە ئەو دیوارانەی دەورەی قەڵاتیان داوە لووسن (لەسەر ...ـیوەی قەڵاتی حلب) بگەرێتەوە، کە هێرشبەران نەتوانن بەسەر قەڵاتەکەدا ...ـەڵ گەرێن، ئەگەر توانیان لە خەندەکە قووڵەکە بپەرنەوە.[12]

قەڵات چەندین دەرگای هەبوو، دەرگای سەرەکی کە هی باشوورە، ...ـیشوو و ئێستاش بە سەر ئەو مەیدانەدا دەروانێ کە قەڵات لە قەیسەری ...ـدەبرێ کە میر مظفرالدین کوگبوری دروستی کرد، مەیدانەکە لە سەردەمی ...ـو بەسەر قسەی ابن خلکان[13] «گەورە بوو و، تا بڵێی پان وبەرین بوو»، بەڵام دەرگای دووەم کە لە هی یەکەم گەورەترە ـ دەکەوێتە بەرانبەر دەرگای سەرەکیی باشوور کە رووی لە گوندی عەینکاوەیە، وە کە خاوەنی کتێبی (الحوادث الجامعة) لە سەدەی حەوتەمی کۆچی ناوی ناوە دەرگای عەمکا (باب عمکا)و، وەسفی کردووە کە مەزنترین دەرگایە.[14] بەم جۆرە بۆمان روون دەبێتەوە کە قەڵات دوو دەرگای زیاتر هەبووە، بەڵام لەم رووەوە بێ‌بایەخ تر بوون.

بارەگای میری (رەسمی)ی میر مظفرالدین لە قەڵات بووە، خاوەنی (الحوادث الجامعة) باس دەکات کە دەزگای میرنشینی ـ دار الامارة ـ ی تێدابووەو[15] ئەمەش لە دەرگای سەرەکی (باشوور)ی قەڵات نزیك بووە، هێشتاش ئەو گەرەکەی کەوتۆتە کن ئەم دەرگایە، پێی دەوترێ گەرەکی (سەرا). لەبەر ئەوە بارەگای رەسمیی میر لە قەڵات بووە، هەر دەبێ چەند دیوانێکی تێدابێ، ابن المستوفي باسی کردووە «دیوانی تێدابووە»[16] بەڵام دیاری نەکردووە، لەگەڵ ئەوەش دا ئێمە لە دانیشتنی ابن تیمیە[17] تیایاو ئامادەبوونی مظفرالدین کوگبوری لە ئەنجوومەنەکەی ئەوە دیاوی دەکەین کە دیوانێکی سەرەکی بنچینەیی بووە لە دەوڵەتی ئەتابەکی‌و ئەوەی کە بایەخ بە قەڵەم دەدا لە نووسەران و زانایان و فەقیهان رووی تێ‌دەکەن، زۆر رێی ـ تێ دەچێ کە دیوانی پەیام و دارشتن (الرسائل والانشاء) یاخود ناوی دیوانی (مکاتبات)بێت و، ئەرکەکەی لە نووسین و پێداچوونەی پەیامەکان و فرمانە رەسمی‌یەکان کە لە دیوانی میری‌یەوە بۆی دێن و بەرزو با لا بوو، لەبەر ئەوە نووسەر (الکاتب) یاخود میرزای دیوان (المنشیء) لەو کەسانە بوون کە جێی باوەری خاوەنی دیوان و ناودارەکان بوون لە دارشتنی نووسراوە رەسمی‌یەکان و لە زاناو فەقیهەکان بوون، لەبەر ئەوە ابن المستوفي خاوەنی کتێبی (تاریخ إربل) یەکێك بوو لەوانەی ئەو دیوانەیان پێ‌سپێردرا بوو،[18] لەبەر ئەوە رووتێ‌کردنی ابن تیمیەی: زاناو فەقیهـ و گرتنی کۆری خۆی تێی‌دا، کارێکە زۆر رێی تێ دەچێ‌و ما قووڵ نی‌یە کە لە دیوانی ـ بۆ نموونە (الارتفاع)ی ببەستێ، کە ئەرکەکانی سەرپەرشتی کردنی بەرهەمی زەوی‌وزارو نرخاندنی بەروبوومە،[19] یاخود دیوانی عەمار (الاهراء) کە بریتی‌یە لە «کۆگای دەغل و دان و ئەوەی لەسەری ئیمزا دەکات سەرفی دەکات»،[20] هەر دووکیان ئەو دوو دیوانەن کە لە رۆژانی مظفرالدین کوگبوری هاتنەکایەوەو، برای دیوانی پەیام و دارشتن (الرسائل والانشاء). لێرەدا ئەوەی شیاوی ناوهێنانە ئەوەیە کە بارەگای دیوانی (الارتفاع) ئەویش لەقەڵات بوو.[21]

لە قەڵات دا جامیعێك هەبوو پێی دەوترا جامیعی قەڵات (جامع القلعة)، بوونیشی تیای‌دا کارێکی سروشتی بوو، مادامەکی بارەگای رەسمیی میر بوو،[22] وە لەو شوێنە دیارانەی‌تر کە تیای‌دا باس کراون:ـ

گرتووخانەیە، ئەمیش بەندیخانەی قەڵاتە (حبس القلعة) لە سەردەمی ابن المستوفي (و ٦٣٧ك/ ١٢٣٩ز) ناونرابوو بەندیخانەی حەلەبی (حبس الحلبي)[23]

دیارە هەندێ داب و دەزگای رەسمی لە ناویان دا دەزگای میرنشین (دار الامـارة) کەوا لە قەلات بوو گوێـزرایـەوە بەشی خوارەوە (الـربض)و ناونـرا دەزگای سەڵتەنەت (دار السلطنة)، ابو الفداء (و ٧٣٢ك) باسی کردووە کە یەك لەو دوو جۆگانەی دێتە ناو شاری، بە (دار الـسلطنة)دا ڕوت دەبێ، [24]

ئەم گواستنەوەیش لە کۆتایی‌یەکانی سەردەمی مظفرالدین بووە، باسی کردووە کە وەفاتەکەی لە ساڵی ٦٣٠ك/ ١٢٣٣ز بووەو، لە خانووی خۆی بووە لە خوارەوە (الربض)، ئینجا گوێزراوەتەوە قەڵای هەولێرو لەوێ بە موەقەتی نێژراوە. [25]

وا باشە لێرەدا باسی بکەین، کە لەوانەیە قەلات تونێلی نهێنی هەبێ‌و، لە کاتی پێـویـسـت دا بەکـاربـهێنـرێن بۆ داواکـردنی یارمـەتی لـە کـاتـی ئـابـلـوقـەدان دا، یـاخـود ڕاکـردن لـە قـەلات. [26]

- بەر لە کۆتـایـی پێ‌هێنـانی باس کردنی نەخشـەکـانی قەلات - دەبێ باسی بکەین کە هێشتا بیرێکی تێ‌دایە کە زارکی بەرین و قووڵە، (قووڵایی‌یەکەی بە قەد بەرزایـی قەلاتـە، واتـە نزیـکـەی ٢٦ مەتـرە) ئاوی بە گەرمـاوی شوێنەواری قەلات دەبەخشێ، وازەن دەکرێ کە ئەو ئاوەی دێتە سەر بیرەکە لە ڕێگەی کارێزێکەوە دێ کە پەیوەندی پێوە هەیە. خۆ ئەگەر وانەبێ دەبوایە قووڵایی بیرەکە لەوە زیاتر بێ تا بگاتە ئاستی ئاوی ژێر زەوی ئەو زەوی‌یانەی دەورەی قەلاتیان داوە.

**٢ - بەشی خوارەوە (الربض):-**

---

کە قەلات جێگـەی خەڵکی تێـدانـەبـوّوە، هەنـدێـك گواستـیـانەوە بەشی خوارەوە (الـربض)ی شـار، وا دیـار بوو دەکـەوتـە بەرانبـەر دەرگـای سەرەکی قەلات بەلای باشوورەوە کەوا لە ڕۆژهەلاتی قەلاتەوە درێژ دەبوّوە هەتا بەشی ڕۆژ هەلاتی، ئەم گواستنەوەیەش لە سەردەمی میر زین الدین علي کوچك بووە، کە ساڵی (٥٦٣ك/ ١١٦٧ز) وەفاتی کردووە، یا پێشتر، وازانراوە کە ئەو میرە «لە خاکە ناسراوەکەی بە ناوی خۆیەوە لەتەك کۆنە جامیعی (الجامع العتیق) ناو شار نێژراوە»، [27] دکتۆر محسن محمد حسین چەند بەڵگەیەکی هێناوەتەوە کە فراوان کردنی بەشی خوارەوە بەلای باشوورو بەشی ڕۆژئاواوە بووە، لەوانە منارەی مظفریە کە بەشێکە لە جامیع - کە هێشتا شوێنی دیارەو - دوکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای شاری هەولێر - جامیع هەر دەبێ لە ناوەڕاستی بەشێکی ئاەدان بووبێ. [28]

ئەم بەرفـراوان کردنـەی میـر مظفرالدین، سەرەڕای ئەوەی هەندێ شوێنی نوێ کردەوەو بازارو قەیسەری دروست کردن، تەنانەت ئەم بەشەی خوارەوە لە سەردەمی (یاقوت الحموي)دا (و ٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز) «بووە شارێکی گەورەی پان و درێژ» [29]

**شوێنە دیارەکانی شار لە سەردەمی مظفرالدین کوگبۆری‌دا:**

**یەکەم:- شوورەی شارو دەرگاکانی‌و خەندەکەکەی:**

لە وەسف کردنی یاقـوت الحمـوي بۆ شوورەی شاری (إربـل) بۆمـان دەردەکەوێ کە لە هەموو لایێك دەورەی قەلاتی نەداوە، بەڵکو تەنیا دەورەی نیوەی دابوو و، وای باس کردووە کە «لە نیوەی ئەم قەلاتەوە دادەبڕێ» [30]

شوورەکە تەنیا دەورەی ئەو ناوچانەی دابوو کە خەڵکی تێدابوون لە شاری‌و، لە وەسفی ابن المستوفي بۆ چەند شوێنێ هەندێ شوێنە دیارەکانی إربل وەك بازارو مزگـەوت و قوتـابخـانـەو خانـەقـا، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو ناوچەیەی خەڵکی تێدایە لە بەشی خوارەوەی شار، دەکەوتە بەردەمی دەرگای سەرەکی قەلات، بەلای باشـوورەوە، لە ڕۆژهـەلاتـەوە بۆ ڕۆژئـاوا - وەك لەپێشـەوە ئەوەمان باس کر - درێژ دەبێتەوە.

بەلام دیوەکانی باکووری ڕۆژهەلات و ژووروی ڕۆژئاوای قەلات، واتە بەلای گونـدی عەنیکـاوەوە خەڵکیـان تێـدا نەبـوو، لە دەرەوەی شوورەکـە بوون. [31] پاشماوەکانی ئەم شوورەیەو خەندەکەکە لە کاتی سەردانی «ریچ» بۆ هەولێر ساڵی ١٨٢٠ز مابوون و، وتوویەتی:

ئەم پاشمـاوانـە مابـوون، نەخـوازەلا لەلای ئەو خیـوەتـەی کە (ریـچ) هەڵی‌دابوو، لەو - وێنەیە ی کە بۆ شارەکەی دروست کردبوو - وا دیار بوو کە خیـوەتـەکـەی بەرانبـەر بەشی باشووری ئاوەدانی شاربوو، واتە پاشماوەکانی شوورەو خەنـدەکـەکـە، دەورەی ئەو بەشـەی بەردەرگـای باشـووری قەلاتیان دابـوو، هەروەهـا باسی کردووە کە شوێنـەواری شوورەو خەندەکەکە بەڵگەی ئەوەن کە شـارە کۆنەکە فراوان تر بوو لە شاری‌هەولێری‌سەردەمی ئەو، [32] سترك باسی ئەوە دەکات کە بەرزایی شوورەکە (٤٨) پێ بوو، کون و قوڵڵەی تێدابوو، [33] پەنجە بۆ کتێبی (ریچ) درێژ دەکات، بەلام ئێمە ئەو وەسفەمان لە کتێبەکەی کە کراوەتە عەرەبی نەدۆزی‌یەوە.

وا دیارە شوورەکە چەندین دەرگای هەبووە، ابن المـستوفي باسی دەرگای کۆنـە شاری کردووە کە پێی دەوتـرا دەرگـای ڕەژ ووفـرۆشتن (باب القحامیة)و دەکەوێتە تەك مزگەوتی پەنجە - مشهد یاخود مسجد الکف - لە ڕۆژهەلاتی قەلاتەوە، لەناو قـەکانی‌دا باسی متصوفێك دەکات:-

**«لە باخچەیەکی نزیك - مشهد الکف - سلاو لە خاوەنەکەی بێ - کاری دەکـرد - دەرگـای شارەکـۆنـەکەی لێوە نزیك بوو پێی‌دەوترا (باب الفحامیة)،** دەرگـای ڕەژ ووفـرۆشـان بە کوردی [34] ». هەروەهـا ابن المـستـوفی باسی دەرگایەکی‌تر دەکات لە شوێنێکی تردا ناوی ناوە دەرگای ڕۆژهەلات - الباب الشـرقی - [35] ڕەنگـە هەر دەرگـای (الفحـامیـة) خۆی بێ. هەروەهـا ناوی دەرگایەکی‌تری هێناوە ناوی ناوە - باب الموصل - [36] وا دیارە دەکەوێتە ڕووی ڕێگای ڕێبواران لە هەولێرەوە بۆ موسـل - ڕۆژئاوای هەولێر بە زۆری دەرگای موسـل دەرگـای ڕۆژ ئاوای شارە، کە ابن المـستـوفی لە شوێنێکی‌تـردا بەم ناوەوە ناوی دەبات. [37]

جگـە لەوەش ناوی دەرگـایـەکی‌تـر دەبـات ناوی ناوە (بـاب الفـرج) کە خانەقا، یا رباطی سۆفیەکان دەکەوێتە. نزیکی. [38] شوێنی خانەقایەکەمان

ـو ـلس ناكات، لەبەر ئەوە نەمان توانی شوێنی دەرگای ناوبراو دیار بکەین،
ـ شێوە بۆمان دەردەکەوێ کە شوورەکە بەلایەنی کەمی‌یەوە سێ دەرگای
ـەبووە.

ـووەم ـ دەزگا ئایینیو خەیرییو کۆمەڵایەتیو تەندروستی‌یەکان:

ـ ـ جامیع و مزگەوت:

ـوونی مزگــەوتی جامیـــع لە شارێ، بەڵگـەی گرنگیو بەرفـراوانی‌یـەتی ـەرەکـەیـە، بەو ناوەی کە مەڵبـەنـدی میـرنشینـەو، میـر نوێـژی هەینیو دوو ـەزـەکـەی تێـدا دەکـات، لە سـەردەمـەکانی ئیـسلام دا وا باوبوو کە شاری ـیـسلامی تەنهـا یەك مزگـەوتێکی جامیعی تێـدابێ، گردبوونەوەی موسـڵمانان ـگەی یەکێتی‌یانە. بە دەگمەن لە مزگەوتێکی جامیعی زیاتر تێدابوو، ئەگەر ـەبـوایـە ئەوە نیشـانـەی ئەوە بوو کە شارەکـە گەیشـتۆتـە رادەیـەك فراوان و ـوربوونی خەڵك، بە جۆرێ ناکرێ نوێژکەران لەیەك جامیع دا کۆببنەوە، ـەمەش لە شاری إربـــل لە سەردەمی میـــرنشینی ئەتـــابــەکی (٥٢٢ك/ ١١٢٠ز، ٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز) پەیرەو دەکرێ، لە ئەنجامی خوێندنەوەمان هی ـەریـخ اربـل)ی ابن المســـتوفی دیمـان دوو مزگەوتی جامیع لە إربل باس ـەکـات، یەکێکیـان لە قەڵاتـەو دووەمیان لە بەشی خوارەوەیە (الربض)،[39]

ـەڵام جامیـــعی قەڵات (جـــامـــع القلعـــة) لە چەنـــدین شوێن دا لە بەشی ـ کراوەی کتێبـــەکـــەیدا باسی دەکـات، جارێـك ناوی دەنێ (المسجـد لجـــامـــع) لە قەڵات و جارێکی تـــر (جـامـع القلعـة)[40] ابن المـــتوفي لە ـ یـك بووی (٥٦٤ك/ ١١٦٩ز)و کۆچ کردووی سـاڵـــی ٦٣٧ك/ ١٢٣٩ز) ـووی تێدەکرد کە مێردمناڵە گوێ دەگرێتە زاناو فەقیهـ و قازیان،[41] بۆمان وەسف ناکات بەڵام باسی گۆشەی بەستی (زاویة البـــتي) دەکات (نیسبەتەن ـۆ أبو عبدالله البستي کە ساڵی ٥٨٤ك وەفاتی کردووە) دەکەوێتە لای ڕۆژ ئاواکەیەوە.

ئەو زانیـــاری‌یـانـەی کە دەتـوانین لە کتێبی ابن المـستوفیدا، دەربـارەی مزگەوتی جامیع لە بەشی خوارەوەی شاردا لێك جیابکەینەوە لە زانیاری‌یەکانی ئێمەی دەربارەی (جامع القلعة)ەوە زیاترە کە (المـسجد الجامع)ی پێ‌دەڵێو دوورە لە هەموو وەسف خستنە سەرێك، ئەوەش لە چەندین شوێن دا، بەڵام ـە شوێنێکی تـــردا ناوی دەنێ (مسجـد الجـامـع الـزيني)،[43] سەبـارەت بە زین الدين علي کوچکەوە خاوەنی إربل کە لە دوایی‌یەکانی ساڵی ٥٦٣ك/ ١١٦٨ز وەفاتی کردووە، ناونراوە)، لەگەڵ ئەوەش دا تێبینی دەکەین کە ابن خلکان ناوی جامیعێك دێنی ناوی ناوە: کۆنە جامیع (الجامع العتيق)[44]

لەناو شاردا نەك لە دەرەوەیدا، بەڵام ابن المـــتوفی ناوی دەنێ کۆنەمزگەوت (المـــجد العتيق)،[45] لە سەری دەرواو دەڵێ کە باوکی خۆی: ابو الفتح احمـد بن المبـارك گومـەزێکی بەرامبـەر ئەم مزگـەوتـە دروست کرد هەنـدێ زانین خواز لێی دادەبـەزین.[46] وا دیـارە مزگـەوت یاخـود کۆنـە جامیع خۆی هەمـــان جامیعی زەینی‌یـە، چونکـە ابن المســـتوفي لە شوێنێکی تـردا دەڵێ: گومـــەزی ناوبـراو کە باوکی دروستی کردووە دەکـەوێتـە باکـووری مزگـەوتی جامیع لە بەشی خوارەوە ـ الربض ـ یاخود زەینی.[47] میرزین الدين علي کوچك لە خاکەکەی نێژراوە کە بەو ناسراوەو لە نزیك کۆنە جامیعەوەیە، واتە لەتەك جامیعی زەینی‌یەوەیە کە دەکەوێتە ناو شوورەکە.

ابن المستوفي پەنجەی بۆ شوێنی ئەم مزگەوتەی جامیعە درێژ کردووەو، وتوویەتی دەکەوێتە دەستەچەپی ئەو گۆرستانەی کە لە بازاری بەیتاڵخانەی کۆنـە ـ سوق البيـاطـريـة القـديمـة ـ،[48] بەڵام ئێمـە ناتـوانین شوێنی کۆنـە گۆرستانەکە یاخود ئەو بازارە بەتەواوی دەست نیشان بکەین، لەوانەیە کۆنە جامیع، یاخود زەینی لە شوێنی منارەی مظفریە بێ کە تاکو ئێستا لەبەرچاوەو بە ناوی میـر مظفرالـدين کوگبـوری‌یـەوەیـەو، وازەن دەکرێ کە منارەکە لە سەردەمی ئەو دروست کراوەو، خراوەتە سەر جامیعێك کە پێشتر هەبووە، کەوا لەسەر بناخەی جامیعێکی کۆنتر لە منارەکە دۆزراوەتەوەو وازەن دەکرێ کە لە سـەردەمی ئومـەوی‌یـەکـان، یاخـود لە سەرەتـاکانی سەدەی عەباسی‌یەکان دا دروست کراوە، هەروەهـــا خشتی لێ‌دۆزراوەتـــەوە سەردەمـەکـەی بۆ سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی دەگەڕێتەوە،[49] لەبەر ئەوە زۆر ڕێی تێ دەچێ کە کۆنە جامیع بێ.

کە زین الـدين باوکی مظفـرالـدين کە لە خاکـەکـەی تەك کۆنە جامیعەوە نێـــژرابێ ـ واتــە شوێنـەواری جامیعی مظفـریـە ـ وێ ناچێ گۆڕەکـە بێ ـ هەروەك دکتۆر محسـن محمد حسين لەو باوەڕەدایە ـ لەو نزرگەی کە خەڵك بە هەڵە بۆ سوڵتان مظفرالدين کوگبوری دەگەڕێننەوە،[50] نەخوازەڵا نزرگەکە زۆر لە منارەی ئێستا دوورە، لەسەر ئەو بناخەیە نزرگەکە هی شەخسێکی‌ترە نەك هی زین الدين، یاخود مظفرالدين کوگبوری.

بۆمـان دەردەکـەوێ کە مزگـەوتی جامیـع لە شاردا لە گومـەزێك زیاترو لە دەرگـایـەك زیـاتـری هەبـوو، ابن المـستوفی باسی گومەزی باکووری ـ القبة الشمـاليـة ـ دەکـات کە دەکـەوێتـە دەستـەچـەپی دەرگـای باکووری ـ الباب الشمالي ـ[51] ئەوەی لای من پەسندە، ئەوەیە کە جامیعەکە دوو دەرگاو دوو گومـــەزی هەبـــووە، وا چاکــە لێـــرەدا باسی بکـــەین کە گەورەترین کۆنـە جامیعەکانی هەولێر کە هێشتا ماوە جامیعی حاجی داودی چەند گومەزە کە لە بازاری گەورە دایە.

لە بابـەت منـارەی مظفـری‌یـەوە زۆر نووسـراوە،[52] شتێکی نوێمان نی‌یە بشێ بیخەینەسـەر، بەڵام ئێمە چ ئیشارەتێکمان نەدی بۆ ئەو نووسینەی کە وەستای منارەکە نیشان دەدا، لە ژوور ئەو پەنجەرەی سەر دەرگای منارەکەیە بە دیـوی ڕۆژئـــاواوە (واتــە بە ڕووی ڕێـگـــای مووسڵەوە) نووسینێکم بینی هەنـدێکی کەوتبـوو، توانیم ئەوەنـدەی لێ‌بخوێنمەوە: عمل (پاشان وشەیەك روون نەبـــوو لەوانـــەیـــە: (اسطـــە) بێ پاشـــان وشـــەی: مـسعـود، ئینجـا دەستەواژەیەکی نادیار.

لە (إربـــل) لە سـەردەمی ئەتـــابـــەکی‌یـــەکـان مزگـەوت زۆر بوون، ابن

المستوفي هەندێکیان باس دەکات، زۆر بوونیشی نیشانەی پەرەسەندنی ژمارەی دانیشتوانی شارە لە ئەنجامی ئاسوودەیی رامیاریو چاك بوونی بارودۆخی ئابووری لە سەردەمی ئەتابەکیو سووربوونی خەڵك لەسەر پەیرەوکردنی ئایینی ئیسلامی پیرۆز بووە، میر ابو المنصور سرفتکين بن عبدالله الزيني، جێگری خاوەنی إربل و کۆچ کردووی ساڵی ٥٥٩ك/ ١١٦٣ز) لە إربل و گوندەکانی‌دا مزگەوتی زۆر دروست کردن، [٥٣] بەڵام ابن المستوفي تەنیا سێ مزگەوتی ناوشاری بۆ باس کردووین، لەوانە مزگەوتی پەنجە (مشهد ياخود مسجد الكف) وەك باسمان کرد لە دەرگای کۆنەشارەوە نزیك بوو کە پێی‌دەوترا دەرگای رەزووفرۆشان ـ باب الفحامية ـ [٥٤] ئەم دیاری کردنەی شوێنە دیارەکانی إربل و نەخشەکانی سەردەمی ئەتابەکیمان بۆ روون دەکاتەوە، مزگەوتەکە تا ئەمرۆش بەرچاوەو [٥٥] دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی قەڵات، دەستەچەپی دەرگای باشووری سەرەکی قەڵات و لە دووری نزیکەی ٥٠٠ مەترەو، خەڵکەکە پێی دەڵێن نزرگەی (پەنجەی عەلی) بە زمانی کوردی، کەچی لە ژوور دەرگای نزرگەکەوە نووسراوە «مەزارگەی أمام پەنج علي»و بە عەرەبی: مزار الامام علي الخامس (ع)، نازانین دەبێ ئەم ئیمامە کێ بێ؟ ئەگەر ئەم ناوەی نزرگەکە راست بێ. وە پێویستە لە سەرمان لێرەدا باسی بکەین کە مزگەوتی اسعد افندي ـ کە ئێستا وێرانە ـ دەکەوێتە نزیك دەرووی باشووری قەڵات لە دیوی دووەمی بەرامبەر بینای بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارو کەلەپوور ـ مديرية الآثار والتراث ـ ە هەمیان بە ناوی مزگەوتی پەنجەوە دەزانرێ، لە کۆنە مزگەوتەکانی قەڵاتە. [٥٦]

ابن المستوفي باسی مزگەوتی دووەم دەکات، ناوی ناوە مزگەوتی (عمر الدرزيجاني)، [٥٧] بەڵام ئیشارەتی بۆ شوێنەکەی نەکردووە، لەبەر ئەوە دیاری کردنی شوێنەکەی بە ئێمە ناکرێ.

جگە لەوە ابن المستوفي مزگەوتی سێیەم باس دەکات ناوی ناوە مزگەوتی (الخراطين)، دیارە بە ناوی ئەو بازارە ناونراوە کە تایبەتە بەوانەی دار پاك دەکەنەوە، واتە پەلکەکەی دادەرنن، [٥٩] وە لە بابەت شوێنەکەیەوە ابن المستوفي دەڵێ خۆی دەکەوێتە: دەستەچەپی ئەوەی بەرەو (مسجد الجامع)ی لە دارپاکژکەران (الخراطين) دەچێ. [٦٠] واتە دەکەوێتە: دەستەراستی ئەو کەسەی لە (المسجد الجامع)ەوە دێ ـ بە زۆریش پاشماوەکانی منارەی مظفریە وەك باسمان کرد ـ بۆ بازاری گەورە.

**٢ ـ خانەقاو ربط و زوايا:**

---

خانەقا لە رووی زمانەوە بە مانای شوێنی (خان)دێ، واتە کاروان سەرا، ئەو شوێنەی رێبواران لێی دادەبەزن. دەبینین ابن المستوفي شوێنێك ناو دەنێ خانەقاه لە شوێنێکی تر پێی دەڵێ (ربط)، واتە بە یەك مانا بەکاری هێناوە، هەروەك زانراوە (رباط) کۆیەکەی (ربط)ە، ئەو شوێنەیە کە سەربازانی فیداکار لێی دادەنیشن و دەکەوێتە دەورو بەری دەوڵەتی ئیسلامی، پاشان ماناکەی گۆرا، بووە ئەو شوێنەی کە وەعز دەرو زاهیدو متصوف و زانایان لێی دادەبەزین و تێی‌دا دادەنیشتن، خانەقاو ربط و زوايا لە إربل لە سەردەمی ئەتابەکی کە لێیان دەدوێن ببوونە شوێنی ئەوانەی دەهاتنە شار، نەك تەنیا بۆ لێ‌دانیشتن و خواپەرستی، بەڵکو هەمیسان بۆ دەرس گوتنەوەو بڵاوکردنەوەی زانین. [٦١]

ابن خلكان پەنجە بۆ چوار خانەقا رادەکێشێ کە مظفرالدين کوگبوری بۆ لە کارکەوتوو (الزمنى)و کوێران (العميان) بینای کردبوون و پری کردبوون لەو دوو جۆرە کەسانە، [٦٢] مانای ئەوەیە خانەقا لانەی بیانیو ئاوارە نەبووە لە زاناو سۆفیان و شوێنی وەعزو حەدیث باس کردن نەبووە، بەڵکو جگە لەو وێرای ئەوە، بووە لانەی دەستەپاچەو بێ‌کارو کوێر، واتە وەك ئەو ئامۆژگایانەی کە ئێستا هەن بۆ حەواندنەوەو سەرپەرشت کردنی کەرو لال و پەك کەوتوو و کوێر.

ابن المستوفي ناوی ئەو دوو خانەقایەی هێناوە کە مظفرالدين کوگبوری بۆ حەواندنەوەی سۆفی‌یەکان دروستی کردبوو، [٦٣] یەکەمیان (خانقاه الجنينة) یاخود هەندێجار ناوی دەنا (رباط الجنينة)، [٦٤] ئەم خانەقایە دەرامەتی هەبوو بۆی دەهات، شێخی خانەقا یاخود رباط، کارگەرەکانی لە سەیرکردنی ئەو مایەو دەرامەتانەی لە موڵکانەو زەوی کشتوکاڵی‌یە وەقف کراوەکانەوە دەس دەکەوتن یارمەتیان دەدا، [٦٥] بەڵام شوێنی خانەقا ابن المستوفي باسی ئەوەی کردووە کە (المدرسة الفقيرة)یەو هەمیسان بە (مدرسة الطين)یش ناسراوە ـ بە سەر (رباط الجنينة) لەلای رۆژهەڵاتی‌یەوە وا دەروانێ. [٦٦]

بەڵام خانەقای دووەم کە مظفرالدين کوگبوری دروستی کرد، (خانقاه الصوفية)ی پێ‌دەوترا، کە لە وێ‌دا جێگای بۆ کردبوونەوە. وە یەکەم کەس کە کاری شێخایەتی لە خانەقەکەدا گرتە دەست ابو الحسن البغدادي (٥٥٩/ ٦١٨ك) بوو، ابن المستوفي شوێنەکەی دیاری کردووەو ئیشارەتی بۆ ئەوە داوە کەوا دەکەوێتە نزیك (باب الفرح) کە یەك لە دەرگاکانی شوورەی إربلە، شێخی ناوبراو لە وەقفی خانەقاکەدا ماوەیەك رەفتاری کرد هەتاکو ویران بوو و سۆفی‌یەکان لە وێوە گواستیانەوە بۆ خانەقا یا (رباط الجنينة)، [٦٧] ابن خلكان پەنجەی بۆ «خانەقای تەنیشت مەیدان» [٦٨] درێژ کردووە، مەیدانێکی پان و بەرین بووەو دەکەوێتە خوار قەڵات بەرامبەر دەرگای سەرەکی باشوور، رەنگە مەبەستی لە خانەقاکە (خانقاه الصوفيه)ی ناوبراو بێ‌و، دەشێ لە شوێنی خانەقای ئێستاکە زۆر دوور نی‌یە لە (باب الفرح)، یاخود (الباب الشرقي) دوور نی‌یە دەست نیشانی بکەین.

ابن المستوفي باسی شوێنی خانەقایەکی‌تری نەکردوە کە ناوی ناوە (خانقاه المجاهدية)، بە ناوی مجاهدالدين قايمازەوە جێگری زين الدين علي حاکمی إربل، وا دیارە ئەو بووە دروستی کردووە، لەناو هاتنی زیاتر لە دەقێك ئەوە دەسەلمێنین کە دەڵێ: «لە إربل خانەقای دروست کرد و وقفێکی زۆری بۆدانا»، [٦٩] تێبینی دەکرێ کە ابن المستوفي (خانقاه المجاهدية)ی لە شوێنی تردا بە ناوی (رباط المجاهدي) ناو دەبات. وا دیارە کە ئەو خانەقایە

حەمەنی‌یەکان لێی دادەنیشتن، بەلگەش بۆ ئەوە شێخەکەیەتی که الشریف حەسی‌یەو لەسەر ئەم ڕێبازە بوو.[70]

ـ المستوفي شوێنی خانەقایەکی دەست نیشان کردبوو ناوی نابوو ـط الزاهد)و وتوویەتی: «لەژێر قەلات لەپێشەوەی‌دا بووە»[71] واته ...بەرووی دەرگای باشووره (الباب الجنوبی) که دەروانێته خوارەوەی شار ـربض).

ـو سعید کوگبوریی ناسراو به خواناسی‌و دینداری سوور بوو لەسەر ـحەبوونی ئەو ئەنجوومەنانەی وەعزکه له خانەقاو رباط و زوایا (گۆشەکان) ـەستران، له ئەنجوومەنەکانی وەعز له (رباط المنظرة) ئامادە دەبوو که ابن ـعـنیانی (و ٦٢٨ك/ ١٢٣١ز) تیادا دادەنیشت لەگەل زانایانی‌تر بۆ وەعز

ابن المستوفی زیاتر لەوەی لێی‌دواین لەمەر (رباط)ەکانەوە بۆی ڕوون ـکردوونەتەوە. بەلام (الزاویة) تاکی (زوایا)یە به قورنەیەك، گوشەیەك له مزگەوت، یا جامیع، یا (رباط) یا قوتابخانەیەك دەوترا، بەلام له ناو هاتنی هەندێکیان دا بێ‌بەستنەوەی به ناوی هیچ دەزگایەك لەو دەزگایانەوە ئەژنەکەوێ، که به شێوەیەکی تاك و سەربەخۆ بیناکراوە، لەوانە گۆشە (زاویە)ی احمد بن مظفر الخراط به جۆری ابو سعید کوگبوری سووربوو لەسەر هاتوچۆکردنی،[73] هەروەها گۆشەیەکی‌تر ابن المستوفي باسی کردووە که ناسراو بوو به لانەی ابو بکر الأوانی،[74] هەروەها گۆشەیەك (زاویە) مظفرالدین کوگبوری بینای کردووە، هەر کەسێ داوای چاکەی له مظفرالدین بکردبایە لێی‌دادەبەزی، ئەم گۆشەیە ـ وەك ابن المستوفی باسی دەکات ناو ...وە (زاویة الشیخ ابو بکر محمد بن حسین الکُریدي)، که تێی‌دا دادەنیشت و، شوێنەکەی دیار کردووە که دەکەوێتە سەر ڕێگای مناره،[75] ئێمه لەگەل بۆچوونەکەی (دکتۆر محسن محمد حسین)ین که شێخ محمد الکریدی ڕەنگە خۆی ئیمام (محمد) بێ که نزرگەکەی چەند هەنگاوێك له منارەی مظفری‌یەوە دوورە، دکتۆر محسن ئەوە پەسندتر دەکات که ئەو ڕێگایە ڕێگای منارەی (مظفریە)دایە، ڕەنگە شێخ محمد الکریدي له گۆشەی ناوبراودا نێژرابێ، ئەو حەلە نزرگەکە دەبێتە هی شێخ محمد، بەلام مێژووی مردنی ئەم شێخەو لەپاشان بیناکردنی ئەو نزرگەیە نازانێ.[76] ئێمه دەلێین که شێخ محمد الکریدي هاوچەرخی قضیب البان (٤٧١ - ٥٧٣ك/ ١٠٧٨ - ١١٧٨ز) بووە، که له پیاوه تەمەن درێژەکان بووەو، له موسل بێ‌گەیشتووە.[77] وە که الکریدی لەو گۆشەیەی مظفرالدین کوگبوری بینای کردووە (کە له سالی ٥٦٣ تا سالی ٦٣٠ك حوکمرانی کردووە، دانیشتبێ، ئێمه لەوەدا ئەوە دەرئەنجام دەدەین که شێخ محمد الکریدی له سالانی ٥٦٣ - ٥٧٣ك/ ١١٦٨ - ١١٧٨ز) له ژیان دابووەو گۆشەکەش پاش سالی ٥٦٣ك بیناکراوە.

**پەناگاو دەزگای چاودێری کردن:**

---

سەرەرای ئەوەی که له بابەت مظفرالدین کوگبوری‌یەوە زانراوە له بایەخدانی به دروست کردنی شوێنی خواپەرستی لەوانە خانەقاو گۆشه که کرانە جێگای دابەزین و دانیشتنی ئەوانەی بۆ إربل دێن، هەندێ له خانەقاکانی کردە شوێنی چاودێرکردنی کوێران و له کارکەوتوان ـ وەك لەپێشەوە له خانەقاکان دواین ـ واته بایەخێکی زۆری به چاودێری کۆمەلایەتی دا، هەروەها میهرەبانی‌یەکەی گەیشته ڕادەی بیناکردنی خانوێك بۆ حەوانەوەی بێوەژنان و پێشکەش کردنی ئەو خزمەتگوزارانەی که پێویستیان پێی هەبوو،[78] هەروەها خانوێکی بۆ منالی هەتیو دروست کرد، خانوێکی‌تر بۆ منالی هەلگیراوەو، ژمارەیەك دایەنی بۆ دامەزراندن، جگه لەوەی دیوەخانی دروست کرد.[79] که هەموو کەسێك ڕووی تێ‌دەکەن و هەر کەسه به قەد حالی خۆی پێ‌دەبەخشرێ‌و، کردیە چواربەش، شوێنێك بۆ باوەڕپێ‌کراوان (الأمناء)و دووەمیان بۆ کوێران و سێیەم بۆ هەتیوان و چوارەم بۆ نەداران، (المساکین) مووچەی نەختینە (الجرایات)و مایەی عەینی (الجوامك) جلوبەرگیان (الکواسي) بۆ تەرخان کرا، ابن ملاعب (و ٦٠٤ك/ ١٢٠٨ز) بووە بەڕێوەبەری ئەم دەزگایە،[80] دەتوانین مظفرالدین بەرابەرێکی کۆمەلایەتی له بواری پێشکەش کردنی چاوەدێر کردنی کۆمەلایەتی‌و خێرومەندی‌دا بچوێنین.

**٤ ـ مارستان:**

---

واته دەزگای چاك بوونەوە، یاخود که ئێستا پێی‌دەلێن تیمارگە، یاخود نەخۆشخانه، له إربل یەك مارستان هەبوو، مظفرالدین بینای کردبوو، ابن المستوفي له دوو شوێن له کاتی باس کردنی هەر دوو ڕووداوی وەفات له سالی (٦١٦و ٦١٩ك)دا پەنجەی بۆ درێژ دەکات و شوێنەکه دەست نیشان نەکردووە، بەلام نەخۆشخانەکه گۆڕستانێکی تایبەت به خۆی هەبووە.[81]

**سێیەم: گەرەك و بازاڕ:** ابن المستوفي تەنیا باسی گەرەکێکی کردووە، که له فەقیهێك دەدوێ وتوویەتی: له ڕێگای مناره دابەزیبوو.

وا دیاره گەرەکێك بووە له گەرەکەکانی إربل، گۆشەی (زاویة) شێخ ابن الکریدی[82] له وێ‌دا بووە، ئەم گەرەکه دەکەوێته ئەو ڕێگەیەی بۆ کۆنه مناره دەچێ ـ زۆر ڕێی‌تێ‌دەچێ ـ منارەی مظفری‌یە بێ که ئێستا دەکەوێته ڕۆژئاوای شار، دەشێ گەرەکی ناوبراو بێ، (گەرەکی عەرەب)ی ئێستا دەگرێتەوە که دەکەوێته نێوان قەلات و مناره، ابن خلکان باس دەکات که له إربل گەرەکێك هەیه پێی دەوترێ (قریة جبریل) و أبو البرکات ابن المستوفي له مێژووەکەی‌دا باسی کردووە که دەدرێتەپال جبریل ـ ی باپیرێ شاعیر عیسی بن سنجر بن بهرام بن جبریل الحاجري،[83] له بەرگە ساغ کراوەکەی «تاریخ ابن المستوفي» باس کردنی ئەو گەرەکەم بەرچاو نەکەوت، تەنیا گوندێك نەبێ سەر به (إربل)ە پێی دەوترێ «جبریلاباذ».[84]

بەلام له بابەت بازارەوە له قەلات دا هەبوون بەر لەوەی جێی دانیشتوانی پێ‌تەنگەبەربێ، پاشان له بەشی خوارەوە دروست کران، پاش ئەوەی بەشێك

لە دانیشتوان گواستیانەوە ئەوێ، ابن المستوفي هەموو بازارەكانی شاری باس نەكردووە، ئیشارەتی بۆ قەیسەرییەكە نەبێ كە ابو سعید كوكبوری بینای كردبوو، وە یەكێكی كردە چاودێری بینایەكە، واتە لەسەر بەردەوام بوونی چاككردنەوەی، ئەویش لە ساڵی ٥٩٥ك/ ١١٩٩زدا، [٨٥] ئەم قەیسەرییە دەكەوتە بەردەمی دەروازەی سەرەكی (باشوور) ـ البوابة الرئیسة (الجنوبیة) واتە لە شوێنی هەمان قەیسەری ئێستا بوو، ـ یاقوت الحموي ـ ئیشارەتی بۆ نوێ كردنەوەی بازارو قەیسەرییەكانی إربل لەلایەن مظفرالدین وە كردووە. [٨٦] كەچی ابن المستوفي تەنیا ئیشارەتی بۆ یەك قەیسەری كردووە.

ابن المستوفي ـ جگە لە قەیسەری ـ ناوی سێ بازاڕی بردووە، بازاڕی مزگەران (الصفارین)و بازاڕی كۆنەبەیتاڵخانە (سوق البیاطرة القدیمة)و بازاڕی (الخراطین)و لەو بازاڕەدا مزگەوتێ بیناكرا، وە ناونراوە (مسجد الخراطین)، [٨٧] وەك باسمان كرد لە كاتی باس كردنی مزگەوتەكان، لە نوسایشی ناوی ئەم بازاڕانە بۆمان دەردەكەوێ كە بازاڕی تایبەت بوون بە پیشەیەكی دیاركراو.

چوارەم: گۆڕستانەكان:

لە إربل ـ لە سەردەمی ابن المستوفیدا ـ تاكە گۆڕستانێكی گشتی هەبوو، دەكەوتە ڕۆژهەڵات و، دەرەوەی شوورەكەو هەندێ جار بە گۆڕستانەكەی ڕۆژهەڵات (المقبرة الشرقیة) ناوی بردووە، ابن المستوفي لە چەندین شوێن دا پەنجەی بۆ درێژكردووە. [٨٨] لە وێدا گۆڕستانی تریش هەبووە، لەوانە گۆڕستانێك لە ڕۆژهەڵاتی إربل، ناونراوە: (مقبرة مشهد الكف) گۆڕستانی مزگەوتی پەنجە ـ [٨٩] لە كاتی باس‌كردنی مزگەوتەكان دا لێی دواین ـ وا دیارە كە ئەم گۆڕستانە بەشێكە لە گۆڕستانی گشتی لە ڕۆژهەڵاتی شار، چونكە إبن الشعار ئیشارەتی بۆ ناشتنی فەقیهێك كردووە لە گۆڕستانی «مسجد الكف»، [٩٠] وە ابن المستوفي باسی ناشتنی ئەم فەقیهەی كردووە لە گۆڕستانی گشتی لە ڕۆژئاوای إربل دا. [٩١]

هەروەها باسی گۆڕستانێك كرا ناوی «مقبرة الزاهد احمد الكردي الزرزاري» بوو كە لە گۆڕستانی گشتی دەرەوەی شاربوو لە ڕۆژهەڵاتەوە، [٩٢] ئەم زاهیدە لە گۆڕستانی گشتی نێژرا، پاشان ـ وەك دیارە ـ لە دەرەوەی گۆڕەكە خەڵكێكی زۆر نێژراون ـ د.ك دكتۆر محسن دەڵێ و شوێنەكەی بووە گۆڕستانێك و بە ناوی ئەم زاهیدەوە ناسراوە.

ابن المستوفي پەنجەی بۆ گۆڕستانێكی دیكە درێژ كردووە وتوویەتی لە مەیدانەوە نزیكە، لە إربل بە گردی زلطي (تل زلطي) ناسراوە، ڕەنگە خۆی هەر گۆڕستانی دەرگای مەیدان بێ ـ مقبرة باب المیدان ـ كە ابن خلكان ئیشارەتی بۆ كردووە، [٩٣] ڕەنگە ئەم گۆڕستانە شوێنی گۆڕستانی گەورەی ئێستا بێ كە دەكەوێتە پشت بەڕێوەبەرایەتی ئاووكارەبای ئێستاو نزیك ئەو مەیدانەی دەكەوێتە خوار دەرگای باشووری قەڵات، ئەوەی لێرەدا شیاوی ئیشارەت پێدانە ئەوەیە كە ابن خلكان گۆڕستانێكی باس كردووە دەكەوێتە سەر بەستەكە كە هێشتاش بەو ناوەوە ناسراوەو تا ئێستا بە ناو شاریدا دادەڕوا، دكتۆر محسن لەو باوەڕەدایە كە ئەم گۆڕستانە، یا دەبێ گۆڕستانی (ئیمام تعجیل) بێ كە بەسەر دۆڵەكەدا دەڕوانێ و دەكەوێتە باشووری ڕۆژئاوای شار، یاخود گۆڕستانی گەورەی ئێستا بێ كە دەكەوێتە باشووری قەڵات. [٩٤]

ابن المستوفي جگە لەو گۆڕستانانە پەنجە بۆ گۆڕستانێ درێژ دەكات و ووتوویەتی دەكەوێتە ناو بازاڕی كۆنە بەیتاڵخانەو نزیكی مزگەوتی جامیعی زەینییە، [٩٥] هەروەها بۆ گۆڕستانی یەك كەوتوو و كوێران (الزمنی والعمیان) كە نزیكە لەو خانەقایەكی بە ناوی ئەوەوە ناسراوەو، هەروەها بۆ گۆڕستانی نەخۆشخانەكان لە إربل، [٩٦] وا دیارە ئەوی لە نەخۆشخانە بمردبایە لەوێ دەنێژرا، لە كۆتاییدا ابن المستوفي لەناو قسەكانیدا باسی گۆڕستانی صوفی دەكات كە لە پیاوانی سەدەی شەشەمی كۆچیدا سۆفییەكی لێ نێژرابوو. [٩٧]

پێنجەم: دەزگا فێركارییەكان:

دەزگا ئایینییەكان وەك جامیع و مزگەوت و خانەقاو رباط و زاویەكان تەنیا شوێنی خواپەرستیو ڕەفتاركردنی كاروباری ئایینی نەبوون، بەڵكو سەرەڕای ئەوە، وەك ـ بینیمان كاتێ لێیان دواین ـ شوێنی دەرس وتنەوەو وەرگرتنی زانستی هەموو جۆر بوون، واتە لە هەمان كات دا دەزگای ئایینیو فێركاری بوون، وە كە ئێمە لەو دەزگایانە دواین، ئێمە تەنیا (شوێنە دیارەكان)ی إربل لەو دەزگا فێركارییانەی تر نیشان دەدەین وەك دەزگای حەدیث و قوتابخانەكان:

١ ـ دەزگای حەدیث (دار الحدیث):

ابن المستوفي یەك (دار الحدیث)ی لە إربل باس كردووە ئەویش: (دار الحدیث المظفریة)یە لە چەندین شوێن دا لە كتێبەكەیدا. [٩٨] مظفرالدین كوكبوری دروستی كردووەو ساڵی (٥٩٤ك/ ١١٩٨ز) كراوەتەوەو، بۆتە لانەی ئەو فەقیهـ و زانایانەی هاتوونەتە إربل، قورئانی پیرۆزی تێدادەخوێنن و گوێ دەگرنە فەرموودە پیرۆزەكانی پێغەمبەر، جگە لە وەعزو ڕێنوێنی كردن لەلایەن شێخەكانی دەزگاكەوە، هەروەها بووە شوێنێك بۆ دەرس وتنەوەی زانیاری هەمەجۆر لەوانە ڕێزمان. [٩٩] سوڵتان أبو سعید كوكبوریو ماقووڵانی شار بەردەوام لەم دەزگایەدا ئامادە دەبوون. [١٠٠]

دكتۆر بشار عواد معروف ئەم دەزگایەو دەزگای (الحدیث المظفریة) لە موسڵ بە كۆنترین دەزگای حەدیث لە جیهانی ئیسلامیدا لە قەڵەم دەدا، [١٠١] كەچی سعید الدیوەچي ڕای ئەوەیە كە یەكەم دەزگای حەدیث لە ئیسلام دا ئەوەیە كە نورالدین محمود بن عماد الدین زنگی لە موسڵ دروستی كردووە، [١٠٢] ئێمە لەگەڵ بۆچوونەكەی (الدیوەچي)ین، چونكە ئاشكرایە كە موسڵ لە ساڵی ٥٦٦ ـ ٥٦٩ك/ ١١٧٠ ـ ١١٧٣ز سەر بە نورالدین بووە، كەواتە دەبێ دەزگاكە لەو ماوەیەدا دروست كرابێ، كەچی

يمنا بردني مظفرالدين كوگبوري بۆ مووسڵ پاش مردني نورالدين محمود كه
ـه ساڵی (٥٦٩ك) دابوو، [١٠٣] واتـه (دار الحـديث المظفـريـة) له مووسڵ
دوای ئەم ساڵه دروست كراوه، هەروەها (دار الحديث المظفرية) له إربل
ساڵی (٥٩٤ك/ ١١٩٨ز) ـ وەك لەپێشـەوە باسمـان كرد ـ دروست كراوه.
ـەوەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوه كه ئەو (دار الحديث)ەی نورالدين له مووسڵ
ينای‌كرد له (دار الحديث المظفرية)ی هەر يەك له مووسڵ و إربل كۆنتره،
ـن المستوفي چ ئیشارەتێكی نەداوه كه شوێنی (دار الحديث المظفرية)مان
ـیشان بدات.

٢ ـ قوتابخانەكان:

قوتـابخـانـەی بە جيـا له جامێـع و مزگـەوت له إربـل، له سەردەمی مير مظفـرالـدين دا سەريـان هەڵ داوه، ابن المستوفي باسی كردووه كه چەنـد قوتابخانەی تێدابووه لەوانه:

١ ـ قوتـابخـانـەی قەڵات (مـدرسـة القلعـة): پێی دەوترێ (المـدرسـة العقيلية) به ناوی الخضر بن نصر بن عقيل الاربلي، الفقيه الشافعي‌يەوه، ئەو يەكەم كەسی بووه له إربل دەرسی وتووەتەوه، له وێدا ساڵی ٥٦٧ك/ ١١٧٢ز وەفاتی كردووه، [١٠٤] مير ابـو منصـور سرفكتين بن عبـدالله الزينی جێگری خاوەنی إربل ساڵی (٥٣٣ك/ ١١٣٨ز) بۆی دروست كردووه، لەبەر ئەوه يەكـەم قوتـابخـانـەيـه له إربـل دروست كرابێ. [١٠٥] زبيـر بلال دەڵێ: قوتابخانەی قەڵات (مدرسة القلعة) كه ابو بكر افندي ناسراو به مەلاقەنەدی تێدا دەرسی وتوتەوه، پاشماوەی ئەو قوتابخانەيه. [١٠٦]

٢ ـ مدرسـة الخضـر بن نصـر بن عقيـل: [١٠٧] پێشی وتـراوه (مـدرسـة الربض)، ابن المستوفي ناوی ئەو زانـاو فەقێهـانـەی هێنـاوه كه له هەردوو قوتابخانه (القلعة والربض)دا خوێندوويانه.

٣ ـ (المـدرسـة المجـاهـديـة): به ناوی مجـاهـدالـدين بن قايماز جێگری زين الدين علي كوچك حاكيمی إربل ناونراوه، ابن خلكان باسی كردووه كه مجاهدالدين قوتابخانەيەك و خانەقايەكی له إربل دروست كردووەو وەقفی زيادكردوون. [١٠٨]

٤ ـ مدرسة الطين ياخود (المدرسة الفقيرة):

وا ديـاره ئەمـە خۆی (المـدرسـة المظفـريـة)يـه كه ابن المستوفي له ڕووداوەكانی ساڵی (٦١٥ك)دا ئيشارەتی بۆ كردووه، دەرس گوتنەوه تێدابووه لەسـەر ڕێبـازی شافيعی‌و حەنـەفی بوو، بەڵگـەش بۆ ئەمـە ئەوەيه كه كوردو توركمـان لێی ئامـادەبـوون، خاوەنی إربـل بۆ خۆی سەرپـەرشتی دەكـردو جاروبـار سەری لێ‌دەدا. ـ كاتێ باسی خانـەقـاو (ربـاط الجنينـة)مان كرد ـ وتمان كه ابن المستوفي كاتێ له (المدرسة الفقيرة) دواوه، وتوويەتی بەسەر (رباط الجنينة)دا بەلای ڕۆژ ئاواوه دەڕوانێ.

**پەراوێزەكانی لێكۆڵینەوەكە:**

(١) دائرة المعارف الاسلامية چاپی (عەرەبی‌یە نوێیەكەی) ١٩٦٩ هاوڕەمان ٢/٥١٦، سترك ٢/٥٢١.

(٢) هەمان سەرچاوه، وتارێكی سترك ٢/٥٢٢، د. محسن محمد حسين: أربيل في العهد الاتابكي: ل٢٢١ ـ ٢٢٢.

(٣) ابن خرداذبه: المسالك والممالك ل/٦ قدامة بن جعفر: الخراج وصنعة الكتابة شرح وتعليق الدكتور محمد حسين الزبيدي، ل/١٥٩.

(٤) كورة (به پێی زاراوەكار پێ‌كراوەكانی سەردەمی ئیسلامی) بۆ الرساتيق دابەش دەكرێ، رستاق بۆ طساسيج و، طسوج بۆ ژمارەيەك گوند.
بروانـه: (المقـدسي: احسن التقـاسيم في معـرفة الاقاليم ياقوت الحموي معجم البلدان، ١/ ٣٩ ـ ٤٠ كورة له جێی پارێـزگـايـەو، رستـاق: قەزاو، طسوج: ناحيه، له زاراوەكانی بەڕێوەبردن دا كه ئێستا له عيراق كاريان پێ‌دەكرێ.

(٥) دائرة المعارف، سترك ٢/٥١٧ أربيل في العهد الاتابكي ل/٢٩ ـ ٣٣

(٦) به ناوی (أربيل في العهد الاتابكي)ه، بەغدا ١٩٧٦.

(٧) كتێبـەكـه به هەردوو بەشی‌يـەوه له بڵاوكـراوەكـانی وەزارەتی ڕۆشنبيـری‌و ڕاگـەيـانـدنـه، بريتی‌يه له ژينـامـەی ئەو شەخسيـاتـانـەی هاتوونەته إربل و إربلی‌يەكان كه له زانسـت و خواناسی‌دا ناويان دەركرد، ياخود پايەی گرنگيان وەرگـرت، لەسـەر شێوەی كتێبی (تـاريـخ بغـداد)ی ابن الخطيب و (تاريخ دمشق)ی ابن عسـاكره، دەستنووسه ساغ كراوەكه ٢٣١ پەڕەو مێژووەكەی له شوالی ساڵی ٦٤١ی كۆچی بەرامبەر مانگی ئاداری ١٢٤٤ی زايينی‌يە، واته چوار ساڵ پاش وەفاتی مێژوونووسی (تاريخ اربل). (بەشی يەكەم ل/١٠ ـ ١١)، كتێبه ئەسڵی‌يەكه چوار جلد بوو، تەنيا بەرگی دووەمی لێ‌ماوەتەوه (اربيل في العهد الاتابكي) ل٢٧٧ ـ ٢٧٨).

(٨) بروانه: بەندی يەكەم له (باب)ی دووەم به ناوی (خطط مدينة اربل) ل/٢٢١ ـ ٢٣٧و بەندی دووەم: الحياة الثقافية ل/٢٤٥ ـ ٢٥٤.

(٩) شيـرين شێـرزاد، بەشی سێ‌يـەم له أوتـروحـەی (تطـويـر قلعـة أربيل) گۆڕينی: عرفان سعيد ل/٣

(١٠) معجم البلدان ١/١٢٣

(١١) هەمان سەرچاوه

(١٢) دەربـارەی قەڵاتی حەلـەب و وەسف كردنی، بروانـه وتـارەكـەی دكتور محسن محمد حسين به ناوی: قلعتان عظيمتان گۆڤاری كاروان ژمارە (١١) ئابی ١٩٨٣ ل/١٤٨ ـ ١٥٢

(١٣) وفيات الاعيان. تحقيق الدكتور احسان عباس. بەرگی ١١٨/٤

(١٤) كتێبەكه به هەڵه خراوەته پاڵ ابن الفوطي، تحقيق د. مصطفى جواد ل/٤٦

(١٥) ئەوەی لێرەدا پێويستی به باس كردنه ئەوەيه كه قەڵات دەرگـايـەكی بەرامبـەر قەيسـەری هەيه بەلای باشـوورەوه، ساڵی ١٩٦٠ تێـك درا وه كه ساڵی ١٨٦٠ی زايـيـنی بينـا كرابـوو، له جيـاتی ئەو دەرگـايـەكی نوێ

**دروست کرا، بەتەواوەتی لە شێوەی دەرگا کۆنەکە جیایە، باشتر وا بوو کە لە سەر هەمان شێوەی دەرگا کۆنەکە بوایە، وە لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی لەلای رۆژئاواوە دەرگایەکی تر کرایەوە، بەڵام دەرگای سێیەمی ژووروویی روو لە عەینکاوە لە سەرەتاکانی ناونراو بە حوکمی نیشتمانی لە سەردەمی متصرفی هەولێر احمد عثمان کرایەوەو بە ناوی ئەو ناونرا ئەحمەدیە.**

**هادي رشید الجاوشلي:** تراث أربیل التاریخي ل/٤٥

**(١٥) (١٥) الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة ل/٤٨**

**(١٦) تاریخ أربل** بەشی ل/٩٦، ابن الشعار: عقود الجمان بەرگی ٩ **پەڕی: ١٢٢ (بروانە:** اربیل في العهد الاتابكي) ل٣١١

**(١٧) عبدالسلام، مجدالدین ابن تیمیه (٥٤٢ ـ ٦٢٢ك) فەقیهـ و زانایەکی** حەنبەلییە، باپیری ئیمام ابن تیمیەی (تقي الدین احمد)ی ناودارە.

**(١٨) اربیل في العهد الاتابكي ل/٣١٦ لە لە ابن الشعارەوە وەرگیراوە،** **عقود الجمان بەرگی /٦ گوڕینی المبارك** بن ابي البركات

**(١٩) أربیل في العهد الاتابكي ل/٣٢٣**

**(٢٠)** سەرچاوەی پێشوو ل/٣٢٢

**(٢١) هەمان** سەرچاوە ل/٢٢٩ لە عقود الجمان ـ ەوە وەرگیراوە ١٢٢/٩

**(٢٢) تاریخ** اربل بەشی ١ ل/٤٢، ٨٩، ٢٥١، ٢٥٢، ٣٣٢.

**(٢٣) هەمان سەرچاوەی** پێشوو بەش ١ ل/١٥٥ بەندیخانە لە سەردەمی عوسمانی و سەرەتاکانی حوکمی نیشتمانی دەکەوتە لای ڕاستی دەرگای سەرەکی قەڵات (باشوور) بۆ ئەو کەسەی لە خوار قەڵاتەوە بۆی دەچێ و، بەندیخانەکە بەشێك بوو لە سەرا.

(٢٤) تقویم البلدان چاپی پاریس ١٨٤٠، ل/٤١٣.

(٢٥) ابن خلکان وفیات الاعیان، چاپی ١٩٤٨ بەرگی ٣ ل/٢٧٦

(٢٦) خەڵکی شار باسی دەکەن کە لە کاتی تێك دانی ئەو دوکانانەی دەورەی قەڵاتیان دابوو تونێلێکیان دۆزیەوە مندالان پێی دەچوونە بەشی سەرەوەی قەڵات، هادي چاوشلي باسی دەکات کە نزیکەی بەر لە پەنجا ساڵ لە کاتی ئەو هەڵکەندنەی بۆ دروست کردنی هەندێ دوکان کرا کتێبەکەی ساڵی ١٩٨٥ بلاوکردۆتەوە. بروانە: تراث اربیل التاریخي ل/٤٥

**(٢٧) وفیات الاعیان ٣/٢٧٠**

(٢٨) بروانە: أربیل في العهد الاتابكي ل/٢٢٣ ـ ٢٢٨.

(٢٩) معجم البلدان چاپی دستفلد ١٨٦٦/ جلدی یەکەم ل/١٨٦

(٣٠) معجم البلدان ١٣٨/١

(٣١) بروانە: أربیل في العهد الاتابكي ل/٢٢١ ـ ٢٢٣

(٣٢) (رحلة ریج في العراق) تعریب: بهاءالدین نوري ل/٢٤٤ ـ ٢٤٥

(٣٣) دائرة المعارف الاسلامیة. چاپی ١٩٦٩، بەرگی ٢ل/٥٢

(٣٤) تاریخ إربل بەشی١ ل/١٩٢ ـ ١٩٣

(٣٥) تاریخ اربل بەشی١ ل/١١٥

(٣٦) هەمان سەرچاوە بەشی١ ل/٣٧٤

(٣٧) هەمان سەرچاوە بەرگی١ ل/١١٥

(٣٨) هەمان سەرچاوە بەشی١ ل/٢١٤

(٣٩) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٤٢، ٨٦، ١٢، ٢٥١، ٢٥٢، ٣٣٨، ١١٢

(٤٠) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/٤٢، ٨٦، ٢٥١، ٢٥٢، ٣٣٨

(٤١) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/٨٦

(٤٢) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/١١٢ ئەوەی شیاوی باسە ئەوەیە کە چاککردنەوەو بیناکردنی جامیعی قەڵات لە سەدەکانی داهاتوودا لە هەمان شوێن دا کران کە پێشتر لە ناوەراستی قەڵات دا دروست کرابوو، ئێستا پێیدەوترێ جامیعی گەورە یاخود جامیعی مەلاقەندی.

(٤٣) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/١٢١، ٢٢١، ٢٣٢، ٣٠٤، ٣٧٠

(٤٤) وفیات الاعیان ٣/٢٧٠

(٤٥) تاریخ اربل بەشی ١ل/١١٧

(٤٦) هەمان سەرچاوە

(٤٧) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/١١٢

(٤٨) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٢٢١ ڕەنگە سوودبەخش بێ لێرەدا باسی ئەوە بکەم کە مرۆڤێکی چاکی شار کە ناوی کاك (عساف حسین)ەو ساڵی ١٩٠٣ لەدایك بووە، لە دیدارێك دا لەگەڵیدا رۆژی ١٩٨٧/٨/١١ پێی راگەیاندم کە مەیدانی بەیتاڵخانە لە نزیك منارەی مظفریە بووە.

(٤٩) گۆڤاری سومر، جلدی ١٨ ساڵی ١٩٦٢، وتارێکی کامل حسین: التنقیب حول المئذنة المظفریة في أربیل ل٢٠٦/ ٢٠٧، أربیل في العهد الاتاربکي ل/٢٣٢، ٢٣٣

(٥٠) أربیل في العهد الاتابكي بەرگی ١ل/٢٠٨

(٥١) تاریخ إربل بەشی ١ل/٣٧٠

(٥٢) بۆ نموونە بروانە گۆڤاری سومر جلدی شانزەم ١٣٨٠ك/ ١٩٦٠ز وتارەکەی وداد علی القزاز: **المنارة المظفریة في أربیل تاریخها ووصفهاو،** جلدی ١٨ ساڵی ١٩٨٢و، وتارەکەی **کامل حسین: التنقیب حول المئذنة** في أربیل، زبیر بلال: أربیل في داوارها التاریخیة، **د. محسن محمد** حسین: أربیل في العهد الاتابكي.

(٥٣) وفیات الأعیان ٢/٢٣٩

(٥٤) تاریخ اربل بەشی یەکەم ل/٢١٣، ٢٢٣، ٢٦٤ **القزویني:** آثار البلاد ل/٩٢ ـ ١٩٣

(٥٥) أربیل في العهد الأتابكي ٢٢٣ ـ ٢٢٤، پەراوێزی ٥ل/٢٢٣

(٥٦) زبیر بلال اسماعیل: علماء ومدارس في أربیل، ل/٢١

(٥٧) تاریخ اربل بەشی یەکەم ل٣٦٧

(٥٨) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/١٧٠

(٥٩) الرازي: مختار الصحاح، ل/١٧٢

(٦٠) تاريخ اربل بەشی ١ل/٧٠

(٦١) سعيد الديوەچی/ التربية والتعليم في الاسلام جامعة الموصل ل/٦٨

(٦٢) ٤/١١٧، ابن المستوفي بەشی ١ل/١٨٥، ٢٤١

(٦٣) تاريخ اربل /٣١٧

(٦٤) هەمان سەرچاوە بەشی ١ ل/٢٥٢، ٢٦٠، ٢٦١، ٢٦٩، ٢٨٦، ٢٩٩، ٣٠٤، ٣٢٧، ٣٥٠، ٣٨٧

(٦٥) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/٣٠٤

(٦٦) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/١٥٩

(٦٧) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٣١٤، ٣١٧

(٦٨) وفيات الاعيان (چاپی ١٩٤٨): ٣/ ٢٧٤

(٦٩) سەرچاوەی پێشوو /٢٤٦ طبقات الاسنوي ١/ ٤٩٥

(٧٠) تاريخ اربل بەشی ١ل/٩٤، ١٦٩، ٣٢٨، ٣٨٧، ٢٥٠

(٧١) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٢٣٩

(٧٢) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٢٤٢، ٣٠٧

(٧٣) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/١٧٩

(٧٤) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٥٥

(٧٥) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٣٥٧، ٣٧١، ٤١٢

(٧٦) أربيل في العهد الأتابكي ل/٢٢٦ پەراوێزی ١

(٧٧) تاريخ اربل بەشی ١ل/٣٧١

(٧٨) ابن خلكان ٣/٢٧٢ (چاپی ١٩٤٨) ابن ابي عذيبة: انسان العيون ل/٢٩٦

بروانە: أربيل في العهد الاتابكي ل/٢٣٧

(٧٩) ابن خلكان ٤/١١٨ (چاپی احسان عباس ١٩٦٩، ابن المستوفي بەشی ١ل/١٥٧، ٣٨١، أربيل في العهد الاتابكي ل/٢٣٧

(٨٠) ابن المستوفي: بەشی یەکەم ١ل/١٥٧، بەشی دووەم ل/٢٥٥

(٨١) تاريخ إربل بەشی ١ل/٢٤١، ٢٤٥ بۆ زیاتر زانیاری سەیری (أربيل في العهد الاتابكى) بكە، ل٢٣٦

(٨٢) تاريخ اربل بەشی ١ ل/٤١٢

(٨٣) ابن خلكان ٣ل/١٧٢ (چاپی ١٩٤٨)

(٨٤) تاريخ إربل بەشی ١ل/٣٦٣

(٨٥) تاريخ إربل بەشی ١ل/١٧٩

(٨٦) معجم البلدان بەرگی ١ل/١٨٦

(٨٧) تاريخ اربل بەشی یەکەم ١ل/١٣٥، ٢٢١، ٢٤٨، ١٧٠

(٨٨) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٣٨، ٤٦، ٥٣، ٨٣، ١٨٥، ٢٢٣، ٣٣٢

(٨٩) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٢١٣

(٩٠) أربيل في العهد الاتابكي ل/٢٤ لە دەستنووسی (عقود الجمان)ەوە ٤/ ١٩

(٩١) تاريخ إربل بەشی یەکەم ل/٥٣

(٩٢) هەمان سەرچاوە بەشی ١ل/٣٨، ٣٩، ٤٦

(٩٣) أربيل في العهد الاتابكي ل/٢٨٩

(٩٤) تاريخ إربل بەشی ١ل/٢٣٩

(٩٥) وفيات الاعيان ٣/٥٣ (چاپی احسان عباس ١٩٧٠)

(٩٦) هەمان سەرچاوە ٤/١٠٤ چاپی ١٩٣٨

(٩٧) أربيل في العهد الاتابكي پەراوێز ٣ل/٢٢٨

(٩٨) تاريخ اربل بەشی ١ل/٢٢١

(٩٩) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/١٨٥، ٢٤١

(١٠٠) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/٢٤١، ٢٤٥

(١٠١) هەمان سەرچاوە بەشی یەکەم ل/٢٢٢ و بروانە پەراوێزی ٣ل/٢٢٨ لە کتێبی: أربيل في العهد الأتابكي

(١٠٢) تاريخ اربل بەشی یەکەم ل/١٧٥، ١٨٧، ٢٣٥، ٢٧٩، ٣٠٠، ٣١١، ٣١٣، ٣٥٠

(١٠٣) أربيل في العهد الأتابكي ل/٢٥٣ لە ابن قاضي شهبەوە: طبقات النحاة واللغويين (دەستنووس) بەشی ١ پەری (١٢١)

(١٠٤) ابن المستوفي بەشی ١ل/١٧٥

(١٠٥) المنذري ل/٢١٢، ابن المستوفي بەشی ٢ل/١٩٦ تێبینی ژمارە (٣)

(١٠٦) التربية والتعليم في الاسلام ل/٦٧

(١٠٧) أربيل في العهد الأتاربكي ل/٦٦ ـ ٦٧

(١٠٨) ابن المستوفي بەشی ٢ل/٥٦٧

(١٠٩) ابن خلكان ٢/٢٣٧ ـ ٢٣٩، طبقات الاسنوي ١/١١٨، ١١٩

(١١٠) علماء ومدارس في اربيل ل/١٧

(١١١) ابن المستوفي بەشی ١ل/٣٢٦

(١١٢) ابن خلكان ٢/٢٣٨ (چاپی احسان عباس)

(١١٣) هەمان سەرچاوە ٣/٢٤٦

(١١٤) تاريخ اربل بەشی ١ل/١٥٩

## سەرچاوەو ژێدەرەکانی لێکۆڵینەوەکە:

**یەکەم: سەرچاوەکان:**

الاسنوي، ابو محمد جمال الدين بن الحسن بن علي الاموي القرشى (و ٧٧٢ك/ ١٣٧١ز)

١ ـ طبقات الشافعية، تحقيق عبدالله الجبوري، چاپخانەی (الارشاد) بەغدا ١٣٩٠ ـ ١٣٩١ك/ ١٩٧٠ ـ ١٩٦٧١ز)

٢ ـ الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة، بەهەڵە خراوەتە پاڵ ابن الفوطي تحقيق د. مصطفى جواد، چاپخانەی الفرات بەغدا

١٣٥١ك/ ١٩٣٢ز ابن خرداذبه، ابو القاسم بن عبيدالله بن عبدالله (و ٢٨٠ك/ ٨٩٧ز)

٣ ـ المسالك والممالك، چاپی بريل ١٨٨٩ز. ابن خلكان، ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد بن ابي بكر بن خلكان (و ٦٨١ك/ ١٢٨٢ز)

٤ ـ وفيات الاعيان وأنباء أبناء الزمان، تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد، چاپخانەی (السعادة) لەمیسر (١٩٤٨ز)و، چاپی بەیرووت، تحقيق د. احسان عباس، دەزگای (الثقافة) (١٩٦٨ ـ ١٩٧١ز).

أبو الفداء الملك المؤيد اسماعيل بن علي عماد الدين الايوبي الشافعي صاحب حماه (و ٧٣٢ك/ ١٣٣٦ز)

٥ ـ تقويم البلدان، دەزگای (الطباعة السلطانية)، پاریس ١٨٤٠ی زایینی:

قدامة بن جعفر، ابو الفرج الكاتب البغدادي (و ٣٢٠ك/ ٣٩٢ز).

٦ ـ الخراج وصنعة الكتابة، شرح وتعليق د.محمد حسين الزبيدي، دار الرشيد للنشر، سلسلة كتب التراث، بەغدا ١٩٨١.

القزويني، ابو عبدالله زكريا بن محمد بن محمود (و ٦٨٢ك/ ١٢٣٨ز)

٧ ـ آثار البلاد واخبار العباد، دار صادر ودار بيروت ١٩٨٠ز

ابن المستوفي، شرف الدين ابي البركات المبارك بن احمد اللخمي الاربلي (و ٦٣٧ك/ ١٢٣٦ز)

٨ ـ (تاريخ إربل)ی ناونراو (نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل، حققه وعلق عليه سامي بن السيد خماس الصفار، بەرگی دووەم: دوو بەشە لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندنی عیراقە، دەزگای (الرشيد) للنشر، زنجیرەی (كتب التراث) ٩٩، ١٠٠ بەیرووت ١٩٨٠.

المقدسي، البشاري، ابو عبدالله شمس الدين محمد بن احمد (و ٣٨٧ك/ ٩٩٧ز).

٩ ـ احسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، ليدن چاپی بريل ١٩٠٦ز، کتێبخانەی (المثنى) لە بەغدا بە ئۆفسێت چاپی کردۆتەوە.

المنذري، ابو محمد زكي الدين عبدالعظيم بن عبدالقوي (و ٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز).

١٠ ـ التكملة لوفيات النقلة، دراسة وتحقيق بشار عواد الاعظمي، نامەی ماجستیر لەزانکۆی بەغدا ١٩٦٧ز ياقوت الحموي، ابو عبدالله شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الحموي الرومي (و ٦٢٦ك/ ١٢٢٨ز)

١١ ـ معجم البلدان (چاپی وستنفلد)، لايبزگ ١٨٦٦ز

**دووەم: ژێدەرەکان:**

الچاوشلي: هادي رشيد

١٢ ـ (تراث أربيل التاريخي) لە چاپ کراوەکانی ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری لاوانە، هەولێر چاپی مطبعة جامعة الموصل.

١٣ ـ دائرة المعارف الاسلامية، چاپی نوێی عەرەبی ١٩٦٩.

الديوەچي، سعيد

١٤ ـ التربية والتعليم في الاسلام، مطابع جامعة الموصل ١٩٨٢.

ريچ، كلوديوس جيمس...

١٥ ـ رحلة ريج في العراق ١٨٢٠، بهاءالدين نوري كردوويەتی بە عەرەبی، چاپخانەی السكك الحديدية ـ بەغداد ١٩٥١

زبير بلال اسماعيل

١٦ ـ أربيل في ادوارها التاريخية. چاپخانەی النعمان، النجف الاشرف ١٩٧١.

١٧ ـ علماء ومدارس في أربيل.

١٨ ـ شيرين شيرزاد

تطور قلعة اربيل (ئوتروحە) بەشی: سێیەم، گوڕینی: عرفان سعيد (دانەیەکی وێنە وەرگیراو)

١٩ ـ گۆڤاری سومر، جلدی ١٦ ساڵی ١٩٦٠ و جلدی ١٨ ساڵی ١٩٦٢.

٢٠ ـ گۆڤاری کاروان ژمارە (١١) ئاب/ ١٩٨٢ محسن محمد حسين (دكتۆر)

٢١ ـ اربيل في العهد الأتابكي. چاپخانەی (اسعد) بەغداد ١٩٧٦.

٢٢ ـ موضوعان في التاريخ الكردي. کتێبی شمس کردستان چاپخانەی (الحوادث) بەغداد ١٩٧٦،

# خطط أربل في كتاب: تاريخ اربل
# والمسمىٰ: نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل

للدكتور حسام الدين النقشبندي
كلية الاداب/ جامعة صلاح الدين

**اصبحت اربل موكزاً للامارة الهذبانية التي ظهرت في النصف الاول من القرن الخامس الهجري واستمرت الى ما بعد سنة**

٥٢٠هـ /١١٢٦م، وكذلك قصبة للدويلة التي اقامها زين الدين علي كوجك بن بكتكين في أوائل عام ٥٦٣هـ /١١٦٧م. الا أنها بلغت أوج ازدهارها وبروزها في أواخر القرن السادس والنصف الاول من القرن السابع الهجري في عهد أميرها مظفرالدين كوكبوری (المتوفى سنة ٦٣٠هـ) وهو صهر صلاح الدين الايوبي.

اعتمد البحث بصورة رئيسة على كتاب المؤرخ ابن المستوفي الاربلي: تاريخ اربل والمسمى: نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل وبصورة ثانوية على مصادر أخرى. وكتاب ابن المستوفي عبارة عن تراجم لشخصيات وردت الى اربل وعن الارابلة الذين برزوا في العلم والتقى ويقع الكتاب الاصلي في اربع مجلدات لم يبق منه الا الجزء الثاني واللذي نشر في قسمين عام١٩٨٠.

وتناول البحث خطط (معالم) مدينة اربل أيام ابن المستوفي (المتوفي سنة ٦٣٧هـ /١٢٣٩م) في جزئي المدينة: القلعة والربض (أسفل القلعة) ومحاولة تعيين أماكنها طبقاً لما ورد عن مواضعها في النصوص التاريخية المتوفرة.

وكانت القلعة آنذاك حصينة يحيط بها خندق عميق وكان لها اكثر من بابين: الباب الرئيس الجنوبي المشرف على الميدان الواسع الواقع أمام القيسرية والثاني المواجه لقرية عينكاوه الحالية، والمسمى آنذاك بـ (باب عمكا). وكانت دار الامارة - وهي المقر الرسمي للأمير - في القلعة وكذلك كانت القلعة مقرا لدواوين الامارة كديوان الرسائل والانشاء أو ما يسمى بديوان المكاتبات وكذلك ديوان الارتفاع وغيرهما من الدواوين.

وكان فيها جامعاً موضعه في نفس موقع الجامع الكبير أو جامع ملا أفندي الحالي. اضافة الى وجود السجن فيها والذي كان يطلق عليه (حبس الحلبي).

وتناول البحث ايضاً الخطط (المعالم) في الربض (المحيط بالقلعة من ثلاث جوانب - عدا الجانب الشمالي المواجه لعينكاوه) كسور المدينة وأبوابها وخندقها ومؤسساتها الدينية والخيرية والاجتماعية والصحية: كالجوامع والمساجد والخانقاهات والربط والزوايا والملاجيء ودور الرعاية والمارستان (دار الشفاء) والمحلات والاسواق والمقابر والمؤسسات التعليمية (عدا الجوامع والمساجد والمؤسسات الدينية الاخرى التي اصبحت اماكن للتعليم والتدريس اضافة الى كونها اماكن للعبادة واقامة شعائر الدين الحنيف) كدار الحديث والمدارس ومنها: مدرسة القلعة ومدرسة الخضر بن نصر بن عقيل والمدرسة المجاهدية ومدرسة الطين أو المدرسة الفقيرة وحاول الباحث تعيين اماكن تلك المؤسسات.

# سەرنجێک لە گەرەکانی بناغەی ژیان و ڕەچەڵەکە ئەندازە

## Genetic Engineering

د. علي عبدالرحمن عسكري
مامۆستای یاریدەر لە کۆلیجی کشتوکاڵ/ زانکۆی بەغداد

لە سەرەتای ژیانەوە مرۆڤ هەمیشە سەرنجی لە دەوروبەری خۆی داوەو تەقەلای ناسین و جیاوازکردنەوەی زیندەوەکانی داوە کە لە دەوروبەریدا دەژین. مەرجەکانی کە ئەم جیاوازیانەی پێ ڕەچاوکراون هەمیشە هەر لە گۆڕان دا بوون لەگەڵ گۆڕانی دۆخی زانستی و پێویستەکانی ژیانەوە. زیندەوزانی BioLogy وەك کەلەپوورێکی ئادەمیزاد بەهۆی ئەوەی پێویستی پەیوەوای لە ئادەمیزاد کردووە کە قووڵتر بێت لە فێربوونیاو بەشێك لە کۆمەڵ خۆی تەرخان بکات بۆ ئەم کارە کە ئێستا پێیان دەوترێت زانایانی زیندەوزانی BioLogists لە بناغەوە زانایان هەستەکانی خۆیان ـ وەك بینایی و بیستن و بۆن و تام و دەست لێدان ـ بەکار هیناوە بۆ وەصف و جودا کردنەوەی زیندەوەکان ئەمەش لەبەر نەبوونی کەرەسەو ئامێری وەها کە بەهۆیانەوە بەقووڵی تەماشای بناغەی ژیان بکەن و میکانیزمی ئەوجۆرە کارانە ڕوون بکەنەوە، کە لە ئەندامی تەنی

...ـیوکـن دا روودەدەن وەك چونێتی و بۆچێتی كرژ بوونـەوەی ماسولكەو ...ی گوێ و دروسـت بوونی بەرو . . . . هتـد لەگـەڵ دۆزینـەوەی ...ـوسكـوب، زانـایـان هەنگاویكی گەورەیان بەرەوپێش هاویشت لە ...ـوەوەی بنـاغـەی ژیـان و دۆزینـەوەی شانـە (خلیـة) كە خشتی ...ی ئەـە . لەگەڵ دۆزینەوەی مایكرۆسكۆبی ئەلكترۆنی هەنگاویكی ...ـتر هەویـژرا بۆزانینی كۆئەنـدامـەكـانی شانـەوپێكهـاتنی لە چەند ...ـمۆنكـەیـەكی organiLLe وردتـر كە هەریەكە بە بەشێك لە كارەكانی ...ـە هەڵدەستێت . بەڵام بۆزانـایـانی ئەمـڕۆ دەركەوتووە كە میكانیزمی ...ـیەكـنی ژیان كاتێك دەر دەبڕێت كە بتوانرێت پێكهاتووەكانی ژیان ...ـەوە لەسـەر شێـوەی گەردیدا moLecuLar دا بمـەزرێت . بە هۆی ...ـوەی زانستی زیندووە كیمیا Biochemistry لە پەنجاكان دا، زانستیكی ...ـەكـراوی نوێ دامـەزرا لەنێـوان زانستی كیمیـای زینـدویی و ...ـی . كە پێی دەوتـرێت گەردە زینـدووزانی MoLecuLar BioLogy ...ـەو گەردانـەی تەنی لێ پێـك دێت نەبینـراون، بەڵام زانایان ...ـن ڕووداوەكـانی ژیـان شی بكـەنـەوەو میكـانیـزمی ڕووداوەكـان ...ـن . ئەمـەش ئەوە رادەگەیەنێت كە زانایان ئەمڕۆ دەتوانن بەرەو دوا ...ـەی ژیانی رابووردو دابڕۆن و گەلێك لە ڕووداوەكانی كۆنی دوو ...ـلـە ڕوون بكـەنـەوە و لە هەمان كات دا بتوانن نەخشەی بناغەی ...ـگـۆڕن بەشێـوەیـەك شتی وەهـا دروست بكرێت كە لەمەوپێش دا ...ـون و نەبیستراون .

هەرچـەند گەردەكانی ژیان هەمە جۆرن، بەڵام سێ جۆری سەرەكی ... كە فرەتر سەرنجی زانایانیان ڕاكێشاوە، ئەمانەش پرۆتین و DNA، RNA ... بریـتـیـن لە گەردی گەورەو MacromoLecuLe لە چەنـد گەردیـگـی ...ـر پێك هاتوون لەسەر شێوەی زنجیرە . لەمانەش دا پرۆتین زووتر ...ـت كرا بە لێكـۆڵینـەوەی، بەهۆی ئاسانیی جودا كردنەوەو پاكژ كردنی ...ـەش هەن لە لەش دا كە بریتین لە جۆرە پرۆتینێكی تایبـەبـەتی و ڕێژە ... وەك بوونی هیمـۆگلۆبین لە خڕۆكـە سوورەكـان داو كۆلاجین لە ...ـراگـەدا cartiLage و كیـراتین لە موودا . لەگـەڵ پێشكـەوتنی تكنیكی ...ـی وردا زانایان توانیان ئەو جۆرە پرۆتینانە پاكژ بكەن و جودا بكەنەوە ... ڕێژەیـان زۆر كەمـە لە شلاوی شانەكان دا وەك جۆرەكانی ئەنزیم كە ...ـەنەوە چەند هەزار لێكدانی زیندووە كیمیایی لەناو شانەكان دا ...ـوودەدەن .

...ـە چارەكی یەكەمی ئەم سەدەیە، زانایان دەستیان كرد بە لێكۆڵینـەوەی ... جۆرەكـەی تری گەردە گەورەكـان DNA، RNA، چـونكـە بۆزانـایـان ...ـركـەوت كە هەرچـەنـد دەریایەك لە زانیاری لە بابەت هەزاران پرۆتین و ...ـكدانە كیمیاییەكانیانەوە كۆ بۆتەوە، بەڵام بێ سوودە بۆ وەڵام دانەوەی ئەو ...ـیارە كە ئایا لە ڕێكخستن و دامەزراندنی ئەم جۆرە كردارە بناغەییانەدا ... پرسـراوچییـە؟ وەڵامی ئەم جۆرە پرسیـارمـە لەمـڵ پرۆتین نییـە .

ترشـە لـوكی ناوكی Nucleic كە گەردی DNA لێ پێـك دێت معلومـاتی رەچـەڵەكیانە هەڵ دەگرێت لە شێوەی جفرەی رەچەڵەكیانە Genetic coding زانـایـان ماوەیـەك بە بێچـاری مانـەوە بێ ئەوەی بتوانن میكانیزمی كاری گەردی DNA دەربخـەن، هەتـا زانایان : كرك و واتسون لە ساڵی ١٩٥٣دا توانیـان گەردی DNA بەشێـوەیـەكی فرەوان دابمەزرێنن و شێوەی بوونی لە بەتاڵی دا دەربخەن ومیكانیزمی كاری جفرەی رەچەڵەكی ڕوون بكەنەوە. بەم شێـوەیـە دەركـەوت كە گەردی DNA بریتیـە لە دووزنجیـرەی جیاوازی بەرانبـەر یەك وەستـاوی بەیەكەوە بەند بوو، هەر یەكە لەم دووتاكە زنجیرەیە بریتیـە لە سەدان گەردی سـەرەكی بە ناوی نیـوكلوتیـد كە لەسێ گەردی جیـاواز دروست بوە، گەردیكی بنكـەیی و شەكـری Deoxyribose و ترشی فوسفـوریـك دوو گەردەكەی دوایی بربڕاگەی زنجیرەكە دروست دەكەن و گەردی بنكـەیـەكـانیش كە چوار جۆرن بە برگـەكـانـەوە هەڵـواسـراون .

ئەمـانـەش : بنـكـەی ئەدەنیـن و Adenine (A) گوانیـن و Guanine (G) سایتۆسین و Cytosine (C) ثایمیـن . Thymine (T). ئەگەر زنجیرەی یەكەم بە A دەست پێ بكـات ئەوا بەرامبـەرەكـەی T دەبێت لە زنجیرەی دووەم و G یش بەرامبـەر C دەبێت . بەنـدبـوونی هەردوو تاكـەی زنجیـرەكە لەم شوێنانەوە دەبێت، بە هۆی بەنـدی هایـدروجین Hydrogene bonding. لەبـەر دووررو درێـژیی، گەردی DNA لە بەتـاڵی دا دەقیكی . configuration تایـبـەتی[٣] دەگـرێت لە شێوەی جووتە لوولەپێچی DoubLe HeLicaL Strncture لە سێ بەرایی دا Three Dimenstionaly بەم شێـوەیـە دەبێت كە لەخـوارەوەدا دیـاری كراوە . هەر ئەم شێوەیەشە میكانیزمی ڕووداوە زیندوییە سەرەكیەكانمان بۆ ڕوون دەكاتەوە، كە وا لە خوارەوەدا باسیان دەكەین :






١ ـ DNA تواناى خۆدروستكردنى هەيە RepLIcation

بەشێـوەيـەك هەر يەكـە لە دووتاڵى strand گەردى DNA يەكێكى هاولقى خۆى دروسـت دەكات و تاڵە تازەكان گەرديكێ تازەى DNA دروست دەكەن كاتيـك كە جودا دەبنـەوە لە تاڵـە دايكـانـەكـان. ئەومادانـەى پێويـستن بۆ دروست كردنى گەردى DNA ى نـوێ، لە ناو شلاوى شانـەكـەدا دروست دەبن و هەموو جۆرە پێويـستيكى ئەنزيميش ئامادەيە بۆ ئەم كارە.

٢ ـ گۆڕانـــى جفـــرەى ڕەچـــەڵـــەكـــى لە گەردى DNA بۆ گەردى Transeription RNA بە ميكـانيـزمى دروستكـردنى RNA. گەردى DNA بەم كارە هەڵ دەستێت يەكێك لە دوو تاڵەكەى DNA, گەردى RNA دروست دەكـات هەر وەك باسمـان كرد لەسـەرەوە، بەلاّم جيـاوازيـەكـان بەم شێوەيەن؛ گەردى RNA يەك تاڵى يەو سێ جۆرى هەيە ,mRNA, tRNA ( RNA ). و بنكـەكـانيش گۆڕانى تێـدايـە، لە جياتى ثايمين Thymine (T) يوارسيل UraciL (U) و لە جياتى شەكردى Deoxyribose رايبوز Ribose دێتە جێگەيان.

ئێـستا بابێينە سەر باسى DNA بۆ ئەوەى بزانين چۆن بەكارى خۆى هەڵ دەستيت؟. دەبێ بزانين چۆن بەشـــە كارســـازەكـاتى FunctionaL units تێك هەڵدەچن لە ناو ماددە ڕەچەڵەكى يەكانى زيندوودا كە پێى دەوترێت گينۆم Genome ?.

لە سەرەتاوە شى كردنەوەو ناسينى گينۆمى زيندووە نزمەكان Lower organisms [وەك باكتـريـاو كەڕوو] زۆر كۆسپ بوو لەبـەر گەورەيـيـان. گينۆمى زيندووە بالاّكانيش Higher organisms [وەك ڕووەكە سەوزەكان و ئاژەڵ] گەورەترن و شى كردنەوەيان گرانترە. گينۆمى شيردارەكان نزيك بە ٢,٥ بليون جووتە بنكەى تێدايە [ G /c , A /T ]. ئەم جووتە بنكانە بە شێـوەى پارچـەى جيـاوازى ڕەچـەڵـەك زانى Genetic information وێـك




هاتوون و گيريان خواردووە بە درێژايى كرۆمۆسەمەكان chromosomes. هەر يەكە لەم پارچانەى لە سەرەوە باسمان كردن پێى دەوترێت جين Gene. لە گينۆمى شيردارەكاندا لە ٥٠،٠٠٠ هەتا ١٥٠,٠٠٠ جين هەن كە هەر يەكە لێپرسراوى بەرهەمێكن لە شێوەى جۆرە گەرديكى پرۆتين. هەروەك لەسەرەوە باسمان كرد، بەشێك لە جۆرەكانى پرۆتين پێى دەوترێت ئەنزيم.

هەروەك لە سەرەوە باسمان كرد، وردە وردە تواناى زانايان پەرەى سەنـدو توانـدرا لەم دواييـەدا فكـرەى جين لە شێوەيەكى وتەوە بگەيێنە جودا كردنـــەوەو شى كـــردنـــەوە. بۆ ئەم مەبـــەستـــە دەستيـــان كرد بە لێكـۆڵينـەوەى ڤايـرۆسـەكـان چونكـە گينۆميان زۆر بچووكتر ن لە هى شانـەى زينـدووەكـان، بەلاّم جينـەكانيان وەك هى ئەو شانانە وان كە تووشيـان دەبن. ڤايـرۆسْ بە تەنيـا نازيت وپـەرە ناسينێت لە خۆيـەوە بەڵكو دەبێ بۆ پەرەسـەندنى تووشى شانەى زيندوويەك بێت و DNA ى گينـــۆمى بگـــوڕێتـــە سەر خۆى. DNA ى گينـــۆمى ڤايـروسى 5V40 ى مەيموون، هەر ٥٢٤٣ جووتە بنكەى تێدايە وبريتيە لە ٥ جين (واتا ٥ كۆمەڵى بنكەى جياوان). بەم شێوەيە، توانـدرا لە ساڵى ١٩٧٨دا بە ئاسـانى DNA پاكـژ بكـرێت و جودا بكـرێتـەوەو شێـوازەكەى بزانرێت هەروەهـا بتـوانـرێت ئەو پرۆتينـانەى كە گينۆمى ئەو ڤايرۆسە دروستيان دەكات بدۆززرێنەوە.

هەتـا ناوەڕاستى هەفتـاكـانيش، زۆرگران بوو كە بتوانرێ زنجيرەى ئەم چەنـد ٥٠٠٠ بنكـەيـە يەك بە دواى يەكـدا بزانـدرێت. بەلاّم بە دۆزينەوەى كۆمەڵە ئەنزيمێك كە لە باكترياداا هەن و زنجيرەى بنكەكان هەڵـدەبـڕن وەك ئەنـزيمى EcoRI كە زنجيـرەى GAATTC هەڵـدەبڕيت، توانـدرا زنجيـرە دوورو درێـژەكـانى DNA بكـرێتـە چەنـد پارچـەيەكى

بچـووكتـر. ئەم زنجیـرە بچـووك و كورتـانـەش لیكۆڵینەوەیان ئاسانترە بەهۆی ئەو ئامێرو ڕێگایانەی كە لە ژێر دەستی زانایان دا هەن.

لەبـەر ئەوەی شێـوازی DNA هەمـوو وەك یەكن چ لە باكتـریـاداو لە شیـــردارەكـان و چ لە گژوگیـایـان دا، دەتـوانـدرێ پارچـەی DNA لە زینـدوویـەكـەوە بۆ زینـدوویـەكی تر بچێت. بۆ نمـوونە (باكتریا فاج) Bactriophaqe [ڤـایـروسیكـە تووشی باكتـریـا دەبێت]و پلازمیـد [DNA pLasmid هێلیـەكـە تووشی باكتـریـا دەبێت و تێدا دەژیت] DNA خۆیان دەخـەنـە ناو گینـۆمی باكتـریـاوەو تێـدا پەرە دەستێنن. بەم شێوەیە ئەم فاج و پلازمیدانە جینی تازە دەخەنە ناو گینۆمی باكتر یاوەو دەبنە هۆی دروستبونی جۆری تازەی، كە بەربەرەكانی تیدا دروست دەبێت دژی ئەنتیـا یۆتیكـەكـان، لە گەلێـك لەو میكـرۆبـانـەی كە هۆی نەخۆشی زینـــدووەكـانن. كاتێ كە باكتـریـا تووشی فاج دەبیت DNA فاجـەكـە پەرەدەستێنێت و ئەم (DNA) ەتازانە لەناو پرۆتینی توێكڵی فاجەكاندا گیر دەخـۆن و باكتـریـاكـە دەفەوتێت. بەچكە فاجەتازەكان دەتوانن تووشی زیندوویەكی تر ببن. پلازمید لە فاج ساكار ترەو هاوژیانی symbiotic پترە لەگەڵ باكتریاداو دەتوانێ جینی وەها بخاتە ناو شانەی باكتریاوە كە سوود بەخش بێت، وەك بەربەرەكانی ئەنتیبایۆتیك كە باسمان كرد. شانـەی باكتـریـاكـەش یارمـەتی پلازمیـد دەدات بۆ پەرەسەندنی DNA یەكانی. هەندێك فاج و پلازمید هەن كە بچووكن لە قەبارەداو لەچەند هەزار هەتـا ٥٠,٠٠٠ بنـكـەیـەك پێـك هاتـوون و دەتـوانـرێ هەڵبـەنگینـرێن ManipuLated و سەرلـەنـوێ دابرێژرێن، هەر وەك لە سەرەوە باسمـان كرد، بۆ دروستكـردنی DNA ی خۆیـان، یان DNA ی موتوربەكراو. موتوربەكردن و سەر لەنوێ دارشتنەوەی گەردی DNA ش بە هۆی جۆرە ئەنزیمێكەوە دێتەكایەوە كە لە باكتریاوە وەردەگیرێو پێی دەڵێن DNA Ligase. DNA موتـوربـەكـراوی پلازمیـد لەگـەل ڕەچـەڵـەكە ماددەی Genetic material یا بلێین شیردارەكان دا، دەتوانێ پەرەبستێنێت كە چووە ناو شانەی باكتریاوە. ئەمەش وادەگەینێت كە گینۆمی پلازمید دەبێتە هەڵگرێ vector بۆ دامەزراندنی DNA ی سەرچاوەیەكی تر source لەنـاو گینـۆمی باكتـریـادا. فاجی هەڵگـر بە هەمـان شێوە كاردەكات و دەتوانێ DNA باكتر ییایەك بۆ باكترییایەكی تر بەرێت و پەرەسەندنی DNA بەكۆن و نوێ بێ جیاوازی بەرپا دەبێت. دروست كردنی كۆمەڵە DNA ی موتـوربـەكـراو cloning ، بـەم شێـوەیـە دەست پێ دەكات لە پێش دا گەردی DNA پارچە پارچە دەكرێت بۆ پارچەی ١,٠٠٠ ـ ٣٠,٠٠٠ بنكەیی بەپێی توانای هەڵگر چ فاج بیت چ پلازمید. ئەم پارچە DNA یانـە، كە خزێنـراویـان Inserted پێ دەڵین، بەتیكـەڵاوی لەگـەڵ DNA هەڵگـــردا تیكـەڵ دەكــرێن و ئەنـــزیمی DNA Ligase دەخـــرێتـــە ناو تیكەڵەكەوەو لە ئەنجام دا گەردی موتوربەكراوی DNA دروســت دەبێت،

• بەشێـك هەڵگـرو Vector بەشیـك خزێنـراو Inserted وەك تیكەڵ كردنی DNA ی فاج و شیردارێك. ئەم پارچە DNA ی موتوربەكراوانە دەخرێنە ناو شانەی بەكتریاوەو پەرەدەستێنن و هەر یەكە كۆمەڵێك دروست دەكات لە هەزارەها گەردی موتوربەكراوی وەك یەك. هەر یەكە لەم كۆمەڵانە پێی دەوترێت كلۆن cLone . كلۆن بەو پـارچە DNA یەش دەڵێن كە نامۆیەو خـراوەتـە ناو DNA كۆمـەلـەكـەوە. لە ئەنجام دا هەزاران كلۆن دەبن و جیا دەكرێنەوە. بەم شێوەیە ئێستا دەتوانرێ هەر جینیك پێویست بێت كلۆن بكرێت، بە مەبەستی دروست كردنی ئەو پرۆتینانەی ئەم جینانە لێپرسروبانن لە ناو شانەیەكی بیگانەدا. نموونەی ئەم جۆرە پرۆتینانەی كە ئێستـا دەتـوانـرێت باكتـریـا دروستیـان بكـات بەهـۆی كلۆنـەوە، ئەنـــرین InsuLine [هـورمـۆنی لێپـرسـراوی سووتـانـدنی شەكـر لە شانـەكـان دا] ئینتـرفیـرۆن Interferone [بۆ چارە سـەركردنی هەندێك لە نەخۆشییەكانی شیرپەنجە] مەیێنەری خوێن .BLood cLoting factor [بۆ چارەســەركـردنی نەخۆشی هیموفیلیا]و رنین Renine [ئەنزیمی هەرسی پرۆتین]و كورمـز ەكـەری شێـرپـەنجـە Tumor necrosis factor وگـەلێك پرۆتینی كەی زۆر بەسـوود بۆ تەنـدروستیی باشتـرو ژیانیكی خۆشتر. زانایان ئێستا لە توانایان دا هەیە جینی كلۆن كراو بخەنە ناو گینۆمی زیندەی ئاژەڵیو ڕوەكییەوە، بۆ گۆڕانی سیفەتە نالەبارەكانی بۆ بەرەو باشتر چ بۆ بەرهەم زۆر بوون چ بۆ بەربەرەكانیی نەخۆشی... هتد. هەرچـەنـدە ئەم جۆرە سەركـەوتنـانـە هەر لە سەرەتـادایە بەڵام توانراوە جینی موتـوربـەكـراو بخـەنـە گینۆمی مشك و مانگاو میشەرەشكەو یان موتـوربـەكـردنی گینـۆمی ڕووەك بەجینی بەربـەرەكـانی Resistance بۆ مادەی گیا كوژەكان. ئەم جۆرە كەرەستەیە كە ئێستا مرۆڤ تێیدا بەرەو قووڵتـــر دەچێـت، كاریـكی گەورە دەكــاتـــە سەر ژیــانی مرۆڤ و دەورووبەری. ئەو جۆرە كارانەی كە هەتا ئێستا مرۆڤ كردوویەتە سەر دەورویەری بۆ گۆڕاتی، بەهیچ شێوەیەك بەراورد ناكرێت لەگەڵ ئەو جۆرە كارانەی مرۆڤ بەرپایان دەكات لەدوا ڕۆژدا بەدەستكاری كردنی مادەی زینـدە ڕەچـەڵـەكییـەكـان ئەمـەش دەبیتـە هۆی خێـرابوون لە گۆڕینی زینـــدووەكـــان بەپێی خواستی مرۆڤ. ڕووداوەكـــانی تەنی زیندوەكـان هەمـوو لە بنـەڕەتـدا دەگـەڕێتـەوە بۆ كاری گەردی ژیانی تایـــەبـــەتی كە ئەنـــزیمن. هەر وەك باسمـــان كرد گەردی ئەنـزیمیش دەگۆڕێت بەگۆڕانی گەردی DNA ،واتا دەتوانین بڵێین بەراوردێك هەیە لە نێـوان ئەنـدازەی میكـانیكی مەكینەك و ئەندازەی میكانیكی گەردی ژیانی دوا ڕۆژدا كە ناومان نا ڕەچەڵەكە ئەندازە.

كلۆن كردنی جین، قوژبنێكی تری زیندووزانی ڕووناك دەكاتەوە، ئەویش مێژووی گۆڕانی مرۆڤە كە بەم شێوەی ئێستا دەركەوتووە چەند سەد هەزار ساڵێك لەمەوبەر. ئەم شێوەی مرۆڤە هەمیشە لەژێر كاری ئەو ڕووداوانـــەدایـــە كە نزیـــك بەیـەك دوو بلیـۆن ساڵ لەمـەو پێش شێـوەكـانی ژیـانی هەموو زیندووەكانیان دارشتووە. ڕەنگە بێ هەرگیز

ئەو هەنگاوە سەرەکیانە نەزانـدرێن کە دروست کەری ژیانی شانەی سەرەکی بووبێتـن، بەڵام گەلێـك لەو گۆڕانــانــە changes کە لە گەردەکــانی DNA دا خۆیــان گیــرسـانـدۆتـەوە، ئێستـا دەتـوانـرێت دەربخـرێن، بە هۆی کلۆن کردنی جینـەوە. خزمـایـەتی زینـدووەکان باشتر دەردەکەوێت بەشیکردنەوەی پارچەی کلۆن کراوی DNA بۆ ئەم مەبەستە کۆمپیوتر بەکار دەهێنرێت.

ئەوەی توانــای دامــەزرانـدنی چینـزانی GeneaLogy دەردەخـات، پاراستنی Conservation دوا بەدوای پشتاو پشتی بەرەچەڵەکەدا چونی ئەو ماوە دوورو درێژەی گۆڕانە. ئەم پاراستنی پشتاو پشتە توانای زانایانی ئاسان کردووە چونکە دەتوانرێ ئەو جینانەی لێکۆڵینەوەیان گران بێت لە جۆرە زیندوویەك دا، لە زیندوویەکی ئاسانتر شیبکرێتەوە. بۆ نموونە ئەو ئۆنکوجینانەی oncogenes [جینەکانی دەبنە هۆی جۆرە شێرپەنجە] کە لە مرۆڤدا شیکردنیان گرانە، ئێستا دەتوانرێت ئەو جینە نزیکانەی کە لە شانــەی هەویــرتـرشـە yeast هەن شیبکـرێنـەوە. ئەمـەش وا دەگـەیێنێت کە جینـەکـان دەورێکی باڵایـان هەبووە لە سەر فـیسولوجی شانـە، زۆر پێش دەرکـەوتنی زینـدە هەمەشانەیی‌یەکان MuLticeLLuLur organisms ئەم جۆرە دۆزینەوەیە، کاری گەورە دەکاتە سەر خێرابوون لە دۆزینـەوەی بناغـەی گەردیی نەخـۆشی شێرپەنجە. هەر وەها ئەم جۆرە تەکنیکــانــەدەبنــە هۆی تێگـەیشتنی قووڵتـر لە بابـەت گۆڕانی مرۆڤـەوە. جۆری مرۆڤ Human Species لەلایـەنی رەچەڵەکناسی‌یەوە بریتیە لە هەرەمەیەکی چەند رەگەزێك. لێکۆڵینەوەی ئەم هەرەمەیی‌یە رەچەڵەکە Heterogenous دەبێتە بناغەی گۆڕانی دوا رۆژ و جۆرەجینی تایەبەتی کە لای هەندیك کەس یان رەگەز هەڵگیراوە، دەبێتە سوود بەخش بۆ دوا رۆژ لە رێـی هەڵبــژاردنـی جینــە باشــەکــان و دوور خستنەوەی جینە خراپەکان. نموونە زۆرن بۆ ئەو جینە زیان بەخشانە، وەك جینی نەخۆشی‌یەکانی خڕۆکە سووری داسولکەیی sickle - ceLL تەنگ بوونی دەماری خوێن AThero scLerosis وشێرپەنجە cancer خوێن بەربـوون HemophiLia وگـەلیکی تر لەو میتـابـولیـزمـە نالـەبـاریـانـە Metabolic disorder. وردە وردە ئەو جینانەی‌دەبنە هۆی ئەم نەخۆشیانە، دەدۆزرێنەوەو کلۆن دەکرێن و ئەو چەوتیانە راست دەکرێنەوە، ئێستا لە توانــای مرۆڤ دایــە کە جینی کلۆن کراو بخــرێتـە ناو تەونی تەنـەوە وەك مۆخـی ئێــســقــان و شانــەکــانی پێست بۆ چارە somatic tissues سەرکــردنی ئەو جۆرە نەخـۆشییـانـەی بە هۆی جینی خراپـەوە مرۆڤ تووشیان دەبێت. خزاندنی جینی کلۆن کراو بۆ ناو گینۆمی مرۆڤ، لە چەند ساڵی وادی‌دا دەردەکەوێت.

ئەم جۆرە کارەســاتــانــە لای گەلێــك کەس جێی گــومـان نین و هەڵـوێستیـان لێ‌دەکـرێت و مەتـرسییـان لێـوە دیاردە، بەڵێ هەتا ئێستا گینۆمی باکتریاو میشەرەشکەو گیاو جۆرەها شیردار دەستکاری کراون. ئایـا ئەم جۆرە زینـدووانــە هەڵســورانیــان چۆن دەبێت لەگــەڵ دەوروبـەریـان دا؟ ئەوەی هەتـا ئێستـا دەرکەوتووە ئەوەیە کە ئەم جۆرە زینـدە گۆڕاوانـە کەمتـر دەژین لە ژینـدە ساکارەکانی هاو جۆریان ئایا ئەگــەر بێت و بەرەڵا بکــرێن نابنــە هوی مەتــرسی؟ ئایـا ئەم جۆرە کارەساتانە پەردەی خەڵوەتی مرۆڤ نادرن و جوانیی سروشت ناشیرین ناکەن؟. ئایا مرۆڤ لە سامناکیی بۆمبای ئەتۆم رزگاری بووەو ترازاوە هەتا بگاتە کارەساتیکی سامناکتر؟. لە لایەکی‌تریشەوە گەلێك هەن دەڵێن کە ئایا لەوە جوانتر هەیە کە مرۆڤ بزانێت خۆین و دەروبەری لە چی پێك هاتووە هەتا دەگاتە پلەی گەردیش؟!!.

## سەرچاوە سەرەکی‌یەکان


1 - R.F. DooLittLe, proteins. scientific American 1985. No4, voL 253 page 74 - 92.

2 - G. FelsenField. DNA. scientific American 1985 No4, voL 253 page 44 - 74.

3 - R. A. weinberg, The molecules of life. scientific American 1985. No4 voL 253. page 34 - 43

4 - Genetic engineering is sheer genins in The Bayer scientific magazine 1986.


# گەشتی ژیانم

**تا ئەڵقەی نۆیەمی گەشتەکەی ژیانی مامۆستا مسعود محمد لەم گۆڤارەدا بڵاوکرایەوە، لە بەر ئەوەی بریاردرا پاشماوەکەی لە کتێبێکی سەربــەخـۆدا بڵاوبکـرێتـەوە ئێمـە لە بڵاوکـردنـەوەی ئەلقەکانی تری‌دا وەستاین. تکایە ئاگاداربن.**

# لمحة عن جزيئات الحياة والهندسة الوراثية

الدكتور علي عبدالرحمن العسكري
كلية الزراعة - جامعة بغداد

مع تطـور علوم الحيـاة خلال خمسين سنـة الأخيـرة، تراكمت المعلومـات عن الخليـة ومكـونـاتهـا. وان أختـراع وأكتشاف الأجهزة والطـرق العلميـة السليمـة أمكن البـاحثين من سبـر أغـوار الخليـة والوصول الى الجزيئات الأولية التي تتكون منها مادة الحياة وأصبح تخصصاً قائماً بحد ذاته وهو علم الحياة الجزيئية MolecuLar BioLogy. ومنهـا بدأت المعلومـات تزداد بهـدف الـوصول إلى التعرف على ميكانيكية تنـاقـل المعلومـات الـوراثيـة. وفي الـوقت الحاضر ونتيجة تزاوج أتجاهات علمية من حياتية وكيميائية أصبح بالأمكان فرز توجهٍ جديد ومهم قائم بحد ذاته وهو علم الهندسة الوراثية Genetic engineering.

إن أساس هذا العلم قد بدأ عندما تمكن العالمان كرك وواتسـون من التـوصـل الى البنـاء الثـلاثي الأبعـاد لجزيئة الحامض النووي DNA. حينئذٍ أصبح بأمكان العلماء إيجاد ميكانيكية نقل المعلومات الوراثية على ضوء الحقائق الآتية:

أولاً: إن جزيئـة الـ DNA لهـا أمكـانيـة مضـاعفة نفسهـا بنفسهـا Replication ، بحيث أن كل من الـسلسلتين اللتين تكونان جزيئة الـ DNA تنفصل وتكون سلسلة مماثلة لنفسها. حينئذٍ تتكون جزيئة جديدة من الـ DNA.

ثانيـاً: إن لجـزيئـة الـ DNA قابليـة تكـوين جزيئـة الـ RNA [النســخ] Transcription والأخيرة تحدد تكوين البروتينات ومنها الأنزيمات التي تحدد نوعية التفاعلات الكيمائية ومجمل التفاعلات الكيميائية يؤدي إلى الفعل الحياتي فالكائن الحي.

في البـدايـة كانت هنـاك مشـاكل جمة في تحليل جينوم [المجموع الجيني للفـرد] الكـائنـات الـراقيـة بالأخص. حيث إن جينـوم النـوع البشـري يحوي مايقـارب ٢٠٥ بليـون زوج قاعـدة نوويـة تتـرتب على شكـل مجـاميع لتكوين ٥٠,٠٠٠ - ١٠٠,٠٠٠ من الجينات الوراثية على طول شريط الكروموسومات.

وقـد تمكن العلمـاء من تحليـل جينـوم الفـايـروسات نظراً لصغر حجمه وبساطته. وأظهرت الدراسات بان فايروس SV40 للقرد يحوي على ٥٢٤٣ زوج من القواعد النووية مقسمة بين خمس جينات. وبذلك تمكن العلماء من عزل الجينات والتعرف على البروتينات التي تكون هذه الجينات مسؤلة عن تخليقهـا. وقـد تمكن العلمـاء من التعـرف على الأنـزيمـات القـاطعة وتحويل السـلاسل الطويلة لجزيئة الـ DNA إلى سلاسل صغيرة ونظراً لكون تركيب الـ DNA متشـابهـاً في جميـع الكـائنـات الحية فأنه أصبح بالأمكان إدخال هذه القطع الصغيرة من كائن حي إلى جينوم كائن حي آخر بهدف تطعيمها. لقد أستعمل العلماء الفاج والبلازميد للقيام بعملية ادخال جينات حسب الطلب الى جينوم البكتريا، وتسمى هذه العملية بالكلونة cLoning. هذه العملية معقدة تتم بخطوات عديدة. فإذا أردنا إدخال جين من اللبائن الى البكتريا تتم العملية بصورتها المبسطة بتحليل DNA المصدر الى قطع بواسطة أنزيمات القطع وتخلط مع جينوم الحامل Victor كأن يكون البلازميد أو الفـاج ومن ثم يضـاف أنـزيم الـربـط وتتكـون جزيئات جديدة من DNA المطعم جزءاً من الفـاج وجـزءاً من المصـدر ومن ثم يضـاف الى الـوسـط البكتري لأصابته بالفاج أو البلازميد وتكوين كلونات متباينة من البكتريا. يتم إنتخاب البكتريا الحامل للجينات المرغوبة في جينومها.

بهـذه الطـريقـة أمكن إدخـال العـديد من الجينات الى الكائنات الراقية والواطئة بهدف الحصول على الصفات المرغوبة. ولقد تم لحد الآن على سبيل المثال كلونة البكتريا لأنتاج الأنسولين والدراسات مستمرة في مختلف مجـالات علوم الحيـاة من طبيـة وزراعيـة بهـدف أدخال الجينات الصالحة وأبعـاد الجينـات الطـالحـة خاصـة في مجـالات الأمراض المستعصية مثل السرطان والهيموفيليا وفقر الدم وغيرها من الأمراض.

# تەندروستیی منداڵان

## لە شاری هەولێر

جلال صديق صالح

### پوختەی لێکوڵینەوەکە :ـ

ئەم لێکوڵینەوەم لە دوو قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان لە شاری هەولێر ئەنجام دا، ژمارەی قوتابی یەکان (٣٣٣) قوتابی بوو، بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی لایەنی تەندروستی ئەم قوتابیانە، تەمەنی قوتابی یەکانیش لەنێوان ٦ ـ ١٥ساڵی دا بوو. بێگومان ئەم لێکوڵینەوەیە بە کلیلێك دادەنرێت بۆ کردنەوەی هەموو جۆرە دەرگایەك لەم بارەیەوە، چونکە تاکو ئێستا لە وڵاتی ئێمەدا لێکوڵینەوەی زانستی بەم شێوە بەرفراوانە ئەنجام نەدراوە. . .

لێکوڵینەوەکە دوو لایەنی گرتۆتە خۆ:

یەکەمیان؛ چەند پشکنینێکی فیزیایی وەکو کێشانی قوتابی یەکان و بەراوردکردنی کێشیان لەگەڵ تەمەن و درێژیی بەژنیان دا هەروەها پێوانی چێوەی سنگ لەگەڵ بەراوردکردنی چێوەی کەللەسەر چونکە ئەمەیان ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە هەڵسەنگاندنی باری گەشەکردنەوە هەیە لە ئادەمیزادا. .

هەڵسەنگاندنی هێزی بینین لە نێوان قوتابی یەکان دا لەگەڵ پەیوەندیی تەمەنەوە بە ڕادەی بینین.

دووەمیان؛ چەند پشکنینێکی ئەزمونگەیی (لابۆری) وەکو: وەرگرتنی ئێکسە تیشکی سنگ بە مەبەستی دەرخستنی هەر نەخۆشی یەك کە لە سی یەکان دا هەبێت، بەتایبەتی نەخۆشی سیل، هەروەها پشکنینی پیسایی و میزی قوتابی یەکان لە ئەزمونگەدا لە کۆلیژی پزیشکی سەر بە زانکۆی سەلاحەددین دا لە ئەنجام دا بە ڕێژەی جیاجیا چەند نارێکی یەکمان تێدا بەدیکرد هەموو ئەو ئەنجامانەش کە بۆمان دەرکەوتن لەگەڵ لێکوڵینەوە جیهانی یەکانی وەکو بەریتانیاو وڵاتی هندستان دا بەراوردکرد بۆئەوەی باری تەندروستی منداڵانی ئێمە لەگەڵ ئەوان دا لەتای تەرازوودا بزانین چۆنە؟. . .

### * پێشەکی:

بێگومان جگەرگۆشەکانمان نەوەی دوارۆژن، جا بۆ ئەوەی دوارۆژێکی پرشنگداریان بۆ دابین بکەین، پێویستە گەشە بە باری تەندروستی یان بدرێت و، هەموو کۆسپ و تەگەرەیەکیان لەرێی تەندروستی لا ببردرێت، چونکە مرۆڤ لە تەمەنی نێوان (٦ ـ ١٥) ساڵانەدا زیاتر ڕووبەڕووی ناهەمواری دەوروبەر دەبێتەوە لەوانەیە ئەمەش هۆیەکی سەرەکی بێت بۆ پەیداکردنی ناهەمواریی تەندروستیی بەدخۆراکی، جیهانی منداڵان، جیهانێکی ناسك و بەرفراوانەو ئەگەر بەتەنگی یەوە نەبین. لەوانەیە تەڵخ بێت. . چەند خاڵێك هەن دەبنە هۆی ڕێکی و نارێکیی باری تەندروستی کە ئەمانەن :ـ

**١ ـ ڕەچەڵەك. . . . .**

ڕەچەڵەك بەرپرسیارە لەچەند لایەنێکەوە بۆنموونە ئەگەر دایك و باوك هەردووکیان قەڵەو بن ئەوا (٨٠٪)ی منداڵەکانیان قەڵەو دەبن، بەڵام ئەگەر تەنها یەکێکیان قەڵەو بێت ئەوا (٥٠٪)ی منداڵەکانیان قەڵەو دەبن، جا هەروەها لەبارەی درێژیی منداڵەوە ئەگەر دایك و باوك باڵایان درێژ بێت ئەوا منداڵەکانیان درێژە باڵا دەبن.

**٢ ـ خۆراك. . .**

بێگومان خۆراکی تەواو واتە لەشی تەواو، چونکە بوونی مەرجە خۆراکی یەکان واتە بوونی بەرگریی تەواو دژی زۆربەی نەخۆشی یەکان.

### ٣ - سێکس - توخم:

چەند نەخۆشی‌یەك هەیە تایبەتن بە مێینەو هەندێکیان بە نێرینە ئەمەش بەهۆی چەند هۆکارێکی کارئەندام زانی‌یەوە.

### ٤ - تەمەن:

دوو تەمەن هەیە کە زیاتر تووشی ناهەمواریی تەندروستی دەبن ئەمانیش تەمەنی منداڵی و پیری‌یە، چونکە بۆ رووبەڕوو بوونەوەی گشت نارێکی‌یەکانی دەوروبەر بەرگری‌یەکی تەواویان نی‌یە.

### ٥ - دەوروبەر:

شتێکی روون و ئاشکرایە منداڵ تاکو زیاتر رووبەرووی دەوروبەری ناهەموار بێتەوە زیاتر تووشی نەخۆشی دەبێت.

### ٦ - هۆیە دەروونی‌یەکان:

دڵەراوکێ، دوودڵی و شێوانی دەروونی لە منداڵان دا بۆ پەیدا کردنی نەخۆشیی ئەندامی بە هۆیە بنەڕەتی‌یەکان لەقەڵەم دەدرێن.

### ٧ - هۆی ئابووری:

کەرەستەکانی لێکۆڵینەوەو تەکنیکی بەکارهێنراو:

قوتابی‌یەکان کە ژمارەیان (٣٣٣) قوتابی بوو بە پێوانەی (سم) درێژیمان پێوان لە تۆقی سەریانەوە تا بن پێیان هەر بەو جۆرەش چێوەی سەرو سنگیان، بەڵام کێشیان بە تەرازووی تایبەتی دیاری‌کرا، بینینی چاویشیان بەهۆی دەزگایەك کراکە ناسراوە بە جۆری سنیلین (sneLLen Type) لە دووریی شەش مەترەوە...

پشکنینی پیسایی و میزی قوتابی‌یەکان لە تاقیگەی مشەخۆرزانی (parasitology) کرا بەهۆی دەزگاو مایکرۆسکۆپی تایبەتی‌یەوە، تیشکە تیشکی سنگی قوتابی‌یەکان لە بنکەی نەخۆشیی سیل لە شاری هەولێر گیرا.

### ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە:-

خشتەی ژمارە (١) دابەش بوونی قوتابی‌یەکان بە پێی پۆلی خوێندن و تەمەنیان روون دەکاتەوە، بۆ نموونە ئەو قوتابی‌یانەی کە تەمەنیان شەش ساڵان بوو ژمارەیان (٣٠) قوتابی بوو هەموویان لە پۆلی یەکەم بوون. هەروەها ژمارەی ئەو قوتابی‌یانەی کە تەمەنیان حەوت ساڵە بوو (٣٥) قوتابی بوون لەمانەش نۆیان لە پۆلی یەکەم بوون و (٢٦)یان لە پۆلی دووەم بوون، هەروەها ئەو قوتابی‌یانەی کە تەمەنیان (١٤) ساڵە بوو، دووانیان پۆلی چوارەم، (١١)یان پۆلی پێنجەم و (٦)یان پۆلی شەشەم سەرجەمیان (١٩) قوتابی بوون و هتد...

دابەشبوونی قوتابی‌یەکان بەپێی پۆل و تەمەن
خشتەی ژمارە (١)

| تەمەن بە ساڵ | پۆلی یەکەم | پۆلی دووەم | پۆلی سێیەم | پۆلی چوارەم | پۆلی پێنجەم | پۆلی شەشەم | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦ | ٣٠ | -- | -- | -- | -- | -- | ٣٠ |
| ٧ | ٩ | ٢٦ | -- | -- | -- | -- | ٣٥ |
| ٨ | ٤ | ١١ | ٣٢ | ٢ | -- | -- | ٥٠ |
| ٩ | ٣ | ٣ | ١٠ | ٢٧ | ٢ | -- | ٤٥ |
| ١٠ | -- | ١٧ | ٩ | ١٧ | ٢١ | ٢ | ٦٠ |
| ١١ | — | ٣ | — | ٧ | ١٧ | ٢٧ | ٥٤ |
| ١٢ | — | — | ٢ | ١ | ١٠ | ١٤ | ٢٧ |
| ١٣ | — | — | — | ٢ | ١١ | ٨ | ٢٦ |
| ١٤ | — | — | — | ٢ | ١١ | ١ | ١٩ |
| ١٥ | — | — | — | ١ | ١ | ٣ | ٥ |
| سەرجەم | ٤٦ | ٤٥ | ٥٤ | ٥٩ | ٧٨ | ٥١ | ٣٣٣ |

هێڵی روونکـردنـەوەیی ژمـارە (١)، درێـژیو کێشی قوتـابی یەکـان نیشـان دەدات بەپێی تەمـەنیـان، بۆ نمـوونـە ئەگـەر قوتابی یەکان تەمەنیان ٦ساڵی بێت ئەوا کێشیـان نزیکـەی (١٥ ـ ١٧ کیلۆگـرام) دەبێت، هەروەها درێژیـان (١١٠سم) دەبێت. بەڵام ئەگـەر تەمـەنیـان ١٠ ساڵان بێت ئەوا کێشـەکـەیـان (٢٦ ـ ٢٧ کگم) دەبێت لە هەمـان کات دا درێـژی بالآیـان (١٣٠سم)ە هتد. . . واتە هەرچەندە بەرەو تەمەن بچین کێش و بالآیان بەرەو زیادبوون دەچێت.

هێڵی ڕوونکردنەوەیی ژمارە ٢ چێوەی سەرو سنگ بەگوێرەی تەمەن نیشان دەدات، بۆ نموونە، ئەگەر قوتابی یەکان (٦) ساڵە بن ئەوا چێوەی سنگیان نزیکەی (٥٤ سم)و چێوەی سەریان ٥٠سم دەبێت. ئەمەش بە راستەوانەیی (طـردیـاً) لەگـەڵ تەمـەنـدا دەگۆڕێت تادەگەینە تەمەنە دوای ناوەراستی یەکان پاشان لە گەشە دەکەویت.

هێڵی بەیانی ژمارە (١)




هێڵی بەیانی ژمارە (٢)




ئەنجامی بینین لە خشتەی ژمارە دوودا دەبینرێت ، ئەمەش بە رێگای سینلین پێوراوە. . بینین کاتێك (٦ / ٦) بوو بۆ هەر - ێك ئەوا دەڵێین ئەم

چاوە تەواوە بەڵام ئەگەر ئەم ڕێژەیە تێک چوو ئەوا کردارەکە بە پێچەوانە دەبێت. بۆنموونە منداڵانی تەمەنی (٦) ساڵی لە پۆلی یەکەم دا چاویان (١٠٠٪) (٦ / ٦) بوو بەڵام لە پۆلی دووەم دا (٩٩٪)یان (٦/٦) بوو، (١٪)یان (١٢/٦، ٢٤/٦) بوو، بەڵام لە پۆلی شەشەم دا (٩٤ ٪) ئاسایی‌بوون (٦ ٪)ی قوتابی‌یەکان چاویان نائاسایی بوو هەروەکو لە خشتەکە نیشان دراوە. پشکنینی ئەزمونگەری ئیکسە تیشکی سنگ نیشانی‌دا (١٠٠٪)ی منداڵەکان نەخۆشیی سنگیان نەبوو بە تایبەتیش نەخۆشیی سیل...

خشتەی ژمارە ٣ سەرجەمی هیمۆگلۆبین نیشان دەدات لە خوێن، بۆ نموونە ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان (٦) ساڵان بوو، هیمۆگلۆبینی خوێنیان نزیکەی ١٥گم بوو، بەڵام بە زیاد بوونی تەمەنیان بەرەبەرە هیمۆگلۆبینەکە هاتەخوارەوە تاکو گەیشتە بارێکی ئاسایی (١٣گم).

- پشکنینی خوێن بۆ هیمۆگلۆبین : -

خشتەی ژمارە (٣)




ئەنجامی بینینی چاو بە رێگای سنێلین (SNELLEN)

| | پ ٦/٦ | چ ٦/٦ | پ ٦/٦ | چ ٦/٩ | پ ٦/٩ | چ ٦/٩ | پ ٦/١٢ | چ ٦/١٢ | پ ٦/٢٤ | چ ٦/١٢ | پ ٦/٩ | چ ٦/١٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پۆلی یەکەم | ٪١٠٠ | | — | | — | | — | | — | | — | |
| پۆلی دووەم | ٪٩٩ | | — | | — | | — | | ٪١ | | — | |
| پۆلی سێیەم | ٪٩٧ | | ٪١ | | [illegible] | | [illegible] | | — | | — | |
| پۆلی چوارەم | ٪٩٥ | | ٪٢ | | ٪١ | | ٪١ | | ٪١ | | — | |
| پۆلی پێنجەم | ٪٩٥ | | ٪١ | | — | | — | | ٪٢ | | ٪٢ | |
| پۆلی شەشەم | ٪٩٤ | | ٪٢ | | ٪١ | | ٪١ | | ٪٢ | | — | |

پ = راست

چ = چەپ

خشتەی ژمارە (٢)

خشتەی ژمارە (٤) ئەنجامی ئەزمونگەیی پیسایی قوتابی‌یەکان نیشان دەدات کە ئەمانیش: خڕۆکە سوورەکانی خوێن لە پیسایی‌کەیان دا،

خانە هەوکردووەکان، چەند مشەخۆرێك (طفیلیات) وەکو جایردیا لەمبلیا، ئینتەمیبیا هستۆلاتیکە، ئنترۆبیەس ڤیرمیکولاریس، هەروەها خۆراکی هەرس نەکراو بە رێژەی جیاجیا کە چۆن لە خشتەکە نیشان دراوە، بۆنموونە (٤٦٪)ی منداڵەکان لە پیسایی‌یەکەیان خرۆکەی سووری خوێن نەبینرا، بەڵام (٥٤٪)یان خرۆکەی سووری خوێن لە پیسایی‌یەکانیان دا بە رێژەی جیاجیا بینرا، هەروەها جایردیا لەمبلیا کە جۆرێکە لە مشەخۆرەکانی کۆئەندامی هەرس تووشی (٣٠٪) قوتابی‌یەکان بوو بوو. خشتەی ژمارە (٥)، ئەنجامی ئەزمونگەیی پشکنینی میز نیشان دەدات کە ئەمانەی گرتەوە: رەنگی میزەکە، کارلێکردنی میزەکە، خرۆکە سوورەکانی خوێن، خانە هەوکردووەکان، هەروەها کریستاڵ لە ناو میزەکەدا. بۆنموونە تەنها (٦٥٪)ی قوتابی‌یەکان میزەکەیان رەنگی ئاسایی بوو واتە زەرد بوو بەڵام (٣٥٪)یان نائاسایی بوو واتە زەردێکی شێلوو، زەردێکی تۆخ، سپی، پرتەقاڵی کە ئەمانەش بەباری نائاسایی دادەنرێت، هەروەها (٨٧,٥ ٪)ی قوتابی‌یەکانیش میزەکەیان ترش بوو کە ئەمەش بە بارێکی ئاسایی دادەنرێت بەڵام (١٢,٥ ٪)یان میزەکەیان تفت بوو کە ئەمە بەبارێکی نائاسایی دادەنرێت...






### دەستکەوتەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە :

لێکۆڵینەوەکە لە ئەنجام دا ئەم راستی‌یانەی خوارەوەی پێ‌بەخشین.

١ ـ کاتێك ئەنجامەکانی قوتابیانی خۆمان لەگەڵ قوتابیانی وڵاتانی ئدنبرەو هندستان بەراوردکرد بۆمان دەرکەوت کە لە درێژی‌و کێشی قوتابی‌یەکان دا هیچ جیاوازییکی ئەوتۆ نی‌یە واتە ئەنجامەکانی ئێمە لە هی ئەوان کەمتر نەبوو، ئەمەش شتێکی زۆر باشە چونکە ئەمە راستی دەسەلمێنێت ئەویش ئەوەیە؛ کە گەشەو باری تەندروستی‌و خۆراك لە وڵاتی ئێمەدا هیچ جیاوازیکی نی‌یە لەگەڵ منداڵانی هەندەران. هەروەکو لە هێڵکاری ژمارە (٣)دا نیشان دراوە.

٢ ـ بینین لەو منداڵانەی کە دەچن بۆ قوتابخانە بەپێی تێپەڕبوونی تەمەن و ساڵی خوێندن بەرەبەرە کەم دەبێتەوە. هەروەکو لە هێڵی روونکردنەوەی ژمارە (٤)دا نیشان دراوە.

٣ ـ تووش بوون بە نەخۆشی‌یەکانی مشەخۆری (طفیلیات)و پەیدابوونی ماددەی کریستالی لە میزدا بەرەبەرە بە گوێرەی تەمەن زیاد دەبێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆری خۆراکی منداڵەکان و رووبەڕوو بوونەوەیان لەگەڵ دەوروبەردا. هەروەکو لە هێڵی روونکردنەوەی ژمارە (٤)دا نیشان دراوە.






٤ - نەبوونی نەخۆشیی سیل لەناو منداڵانی ئێمەدا، ئەویش لەبەرئەوەی، هەر پاش لەدایك بوون بە (BCG) دەکوترێن کە جۆرە کوتانیکە دژی میکرۆبی نەخۆشیی سیل.

سەرچاوەکان: . . .


1 - clinical Nutrition ,SeymourL ,Halpern 1979.

2 - the facts of food ,Arnolde .Bender 19975. oxford..

3 - Asyno psis of Hygiene ,LLywlyn R. llth Edition, 1958.

4 - Modern in Nutri tion in hnd diseas 16 th Edition 1978.

5 - Ashort Text book of preven tive Medicine of the Tropics ,A.o. Lucas, 1978.

6 - uscs of cpidemiology, J.N. Morris Third edition. 1975.

7 - epidemiology in medical practiu D,J.P. Barker, Third Edition 1984.

8 - clinical epidemioLogy, DAvid L. Sack ETT, 1984.

9 - public health and pmvetiw medicinc JOHN M. Last, eleventh Edition, 1975.

10 - EN viron m.ənt and hea lth, Norman m. Trieff, 1980.

11 - envin mental health and safety, harman koren..

12 - Harisons principus of in tema mcdicim, Isselbacher, Adoms, Braur wald, pcters dorf, and wilson nin th Edition, 1980.

13 - vlinical axaminato, JOHN Macleod JOHN MUNRO, seven th Edition, 1980

14 - Hutchi soni clini cal Methoa, stuart Mason and Michael Swash

15 - disease of children, HucoH J.lly, fourth Edition, 1983.


# صحة أطفال مدينة أربيل


## جلال صديق صالح


اجـرى البـاحث الفحص العـام على ٣٣٣ طالبـاً في المـدارس الابتدائية والمتوسطة في اربيل ممن يتراوح أعمارهم بين ٦ - ١٥ سنة وبحث عن نتائجها استناداً على مصادر علمية.

وقد اشتمل البحث على جانبين:

الاول: قيـاس أوزان الطـلاب ومقـارنـة وزن كل منهم مع عمـره وطول قامته ومحيط صدره ومحيط جمجمته، لما لذلك من علاقة مبـاشـرة بتقـويم حالـة النمـو لدى الانسـان، وكـذلك تقويم البصر - والعلاقة بينه وبين العمر.

والثـاني: إستحصـال الأشعـة السينيـة للصدر وذلك للكشف عن امراض الرئة ومنها السل، وفحص البراز والبول في مختبر كلية الطب بجامعة صلاح الدين.

علماً فان هناك عدة عوامل تؤثر على الخط البياني لنمو الطفل في هذا العمر - الصحي وهي الوراثة والتغذية والجنس والبيئة والعوامل النفسية والاقتصادية.

وظهر من البحث مايلي:

١ - لدى مقارنة نتائج البحث عن طلابنا مع نتائج أمثالهم من طلاب أدنبرة والهند، لم يجد الباحث اي فرق في الطول والوزن.

٢ - ظهر ان النظر يضعف بتقادم سني الدراسة والعمر.

٣ - وان الاصابة الموجودة بأمراض الطفيليات ووجود البلورات في البـول تزداد مع ازديـاد العمـر ويعـود سببهـا الى نوع الغـذاء ونـوع المواجهة مع البيئة.

٤ - سلامة الأطفال بالنسبة لمرض السل نظراً لتلقيحهم بلقاح بى سي جي بعد الولادة وقد قدم الباحث عدداً من الجداول والخطوط البيانية الموضحة للبحث.

# قــــۆڕی ـ فــتــق

# HERNIA

دکتور عبدالرحمن عبدالله

**قۆڕی لە کوردەواری‌دا بۆ شتی ناقۆلاو نارێکوپێك وەیا بۆ پڕوپوچ بەکار دەهێنرێت وەکو دەڵێن قسەی قۆڕ، یاکردەوەی قۆڕ، لەلایێکی‌ترەوە لە پزیشکایەتی‌دا بۆ ئەو دەردە بەکار دەهێندرێت کە پارچەیێك لە هەناو، لە درزێکەوە، یا لە دراوی‌یەکەوە، یا لە یەکێ لەوکونانەی لە لەش دا هەن بێتەدەرێ‌و دەرپۆقیت وەکو قۆڕی‌گون، یا قوڕی ناوك، یا قۆڕی پەناران. . . . هتد.**

قۆڕی لە سێ چین پێك دیت!

١ ـ تورەکە THE SAC

٢ ـ داپۆشەر یا کیف COVERiNCS

٣ ـ ناوەرۆکی تورەکە THE CONTENTS

تورەکە بریتی‌یە لە پیریتونیوم[1] کە ئەوپارچە هەناوەی لەناودایە، لەسەرەوە (لە ملەکەیەوە) تەنگە، هەتا زیاتر شۆڕبێتە وە گەورەترو دەلْپ تر دەبێت.

داپۆشەر، یا کیفی ئەم تورەکەیە بریتی‌یە لە چینەکانی دیواری زگ کە ئەو قۆڕی‌یە پێی‌دا تێپەڕ دەکات، ئەمەش بەپێی جێگەی قۆڕی‌یەکە دەگۆڕرێت.

ناوەرۆکی توورەکەکەش بریتی‌یە لە پارچەیێك هەناوی ناوزگ، ئەمەش بەپێی جێگەی قۆڕی‌یەکە دەگۆڕرێت، بەلام بە زۆری بریتی‌یە لە پێچێکی ڕێخۆڵە، یا پارچەیێك لە ئومێنتەمی گەورە[٢] CREAT OMENTUM

هۆی قۆڕبوون زۆرە، لەوانە بێ‌هێزیی دیواری زگە کە هەر لە سەرەتای ژیانەوە ناقۆلایی‌یێك لە چینەکانی دیواری زگ دا هەبێت وەکو لە ئەشکەنج ناوك وپەناران دا، یا دیواری زگ بێ‌هێز بوو‌بێت لە ئەنجامی گۆشت پارەیەك دا CiCATRiX کە لە نەشتەرسازی‌یەوە یا زەبرێکەوە دروست بووبێت، ئەوجا کە بەم هۆیانەوە، یا بە هۆی شتی‌ترەوە جێ‌یێك لە دیواری زگ بێ‌هێز بوو، ئیتر بە هۆی پتربوونی تەوژمی ناوزگەوە لە ئەنجامی کۆکەیێکی توندوقایم، یا شتی قورس

هەڵ گرتن . . . هتــد ، ئەو گۆشت پارەیــە ، یا ئەو ماســولکــە بێ هێـزانــە هێـدی‌هێدی دەکشێن هەتا لێك جیا دەبنەوە ئەوسا پـیـریتـۆنیـوم لەو درزەوە یا لەو کونــەوە دێتــە دەرێ و تورەکــەیێك دروست دەکات ، کە پارچەیێك هەناوی دێتەناو.

هەنــدێ جار لە کۆرپــەدا تورەکــەیێکی زگمـاك دروست دەبێت نەختێك پیریتۆنیوم لە ملەکەی‌دا هەیەو بەتەواوی دەرنــەپـۆقیـوەو نەچـۆتە ناوگونەوە ، ئەم جۆرە قۆڕی‌یە ئەگەر کونەکەی بە هۆی پشتێنەوە یا شتێکی‌ترەوە بگیررێت بەتەواوی چاك دەبێتــەوە ، ئەم جۆرە قۆڕی‌یــە زگمــاکــە هەندێ جار هەتا منداڵەکە گەورە دەبێت دەرناکەوێ .

لەپــاشی تەمــەنی هەرزەکـاریش کە ماسـولکـەکـانی زگ بەرەبــەرە دەکــەونە بێ هێزی‌و تەوژمی ناوزگ بەهۆی پتربوونی بەزی ناوزگەوە زیاد دەکات ، قۆڕبوون ئاسان تر پەیدا دەبێ .

**چوار جۆر قۆڕی هەیە !**

**١ ـ دەگەڕێتەوە ناوەوە . REDUCIBLE HERNIA**

**٢ ـ ناگەڕێتەوە ناوەوە . IRREDUCIBLE HERNIA**

**٣ ـ بەرگیراو OBSTRUCTED OR INCARCERATED**

**٤ ـ خنکاو . STRANGULATED**

**ئەو قۆڕی‌یــەی دەگــەڕێتــەوە ناوەوە REDUCIBLE ئەوەیــە ناوەرۆکی کیســەی قۆڕی‌یــەکــە بە ئاســانی دەچێتەوە ناوزگ ، گەڕانــە ناوەوە کاتێــك دەبێت نەخــۆشــەکــە پاڵ کەوێت ، یا بەدەستکاری نەخۆشەکە خۆی بەدەستی خۆی یا دوکتورەکە دەی‌گێڕنەناوەوە .**

نەخــۆشـــەکــە ڕادەکشێت ، خۆی شل دەکـات ، خۆی یا دوکـتــورێــك بە دەستێــك ملی قۆڕی‌یــەکــە دەگــرێت ، بەدەستــەکــەی‌تری بە هێواش دەست دەهێنێت بە قۆڕی‌یەکەدا هەتــا ناوەڕۆکــەکــەی دەگــەڕێتــەوە ناوزگ ، نابێ بە تونـدی دەستکـاری بکـرێت ، ئەگـەر هاتـوو نەگـەڕایەوە دەبێت وازی لێ بهێنـرێت و زۆری لێ نــەکـرێت ، کە قۆڕی‌یــەکــە گەڕایەوە ناوزگ بۆ ئەوەی دڵنیــابیت پەنجــەیێــك دەکــەیت بەو کونــەدا قۆڕی‌یەکەی لێ دێتەدەرێ .

ئەگەر قۆڕی‌یەکە ریخۆڵە بێت هاتبێتە خوارێ ، کە گەڕایەوە ناوزگ قۆڕەیێکی لێ دێت ، ئەگەر ئۆمنیتۆم بێت OMENTUM ئەو قۆڕەیەی نایەت .

لە گەلێـك قۆڕی‌دا هەر دوو ئۆمێنتـوم و ریخـۆڵـەش دێنەناو تورەکــەکــەوە . . زۆر قۆڕ هەن ئەوەنـــدە بێ ئێش و ئازارن لەبیـریان‌دەچێتەوە کە قۆڕن ، لە لایێکی‌ترەوەی هەندێ لاوی بە هێزو توانا هەن لە جێی قۆڕی‌یەکەدا هەست بە ژان دەکەن پێش ئەوەی هیـــچ ئاوسـانێــك دەرکــەوتبێت ، ئەمــانــە دەبێت نەهێڵرێ ئیش قورس ، یا وەرزش بکەن .

قۆڕی ئەگــەر چار نەکرێت (بە نەشتەرسازی) لەوانەیە گەورەتر بێت و ڕەنگە توشی خنکان بێت .

ئەو قۆڕی‌یـــەی ناگــەڕێتــەوە ناوەوە IRREDUCIBLE HERNIA بریـتـی‌یــە لەو جۆرەی ناوەرۆکی تورەکــەکــەی بەتــەواوی ناگـــەڕێتــەوە ناوزگ . هۆی زۆری ئەمــەش ئەوەیــە ناوەرۆکی تورەکەکە بە تورەکەکەوە دەنوسێت ، جاری واش لەبەر ئەوەیە بارستــی ئۆمێنتــوم بەزی لەســەر دەنیشێت و گەورە دەبێت ، هی‌واش هەیــە قۆڕی‌یــەکــە ئەوەنــدە گەورە دەبێت ناتــوانرێت بەتــەواوی بگــەڕێنرێتەوە چونکە لەناو زگ دا جێگەی نابێتەوە .

جگــە لە نیشــانەکانی‌تری قۆڕی نەخۆشەکە هەندێ جار توش ژانــەزگ ، یا پێــچ بەزگ دا هاتن دەبێت وە توش تێــك چوونی هەزمیش دەبێت جگە لە هەستی قورسایی پێ‌کردن .

ئەم جۆرە قۆڕی‌یــە هەمیشــە جێی تەهلوکــەیــە ، چونکــە لەوانــەیــە هەر بەرەو گەورەبــوون بڕوات و لە ئەنجـام دا توشی خنکان بێت .

چاری ئەم قۆڕی‌یــەش هەر بە نەشتــەرسـازی دەکـرێت ، ناوەرۆکی قۆڕەیــەکــە بگــەڕێنــرێتــەوە ناوزگ ، ملی تورەکــەکە بەسترێت و کونەکەی کوێر بکرێتەوە .

قۆڕی بەرگـــیــراو OBSTRUCTED OR INCARCERATED بە زۆری لەو ژنــە قەڵــەوانەدا ڕوودەدا کە توشی قۆڕی ناوك دەبن

ئەو جۆرەی ناگەڕێتەوە ناوزگ، لەو بابەتە ژنانەدا کە هەمیشە ڕیخۆڵەکانیان پردەکەن و خواردەمەنی تێ دەچەسپێنن: ئەو پێچە ڕیخۆڵەیەی هاتوتە ناو کیسەی قۆرییەکە ئەوەندە پڕ دەبێت دەئاوسێت، پیسایی بە زەحمەت پێی دا تێپەر ئەکات، ئازاری دەبیت، تونـد دەبێت، نەخۆشەکە توشی پێچی زگ دەبێت و دەرشێتەوە.

ئەم جۆرە قۆرییە بە ئاسانی دەکاتە ئەوەی بخنکێت.

چاری ئەوەیە بە زووترین کات نەشتەرسازی بۆ بکرێت.

**قۆریی خنکاو** STRANGULATED HERNiA

قۆری خنکاو جگە لە ڕێگەگرتنی پسیایی لەو پارچە ڕیخۆڵەیەدا لەناو تورەکەی قۆریەکەدایە، سوڕانەوەی خوێنیش لەناو کیسەکەدا بەربەست دەکات بە جۆرێك ژینانی ئەو کەسە دەکەوێتە تەهلوکەوە. خنکانی قۆری لەوانەیە لە هەموو کاتێك دا پەیدا ببێ هەر لە سەرەتای ئەوەوە کە ڕیخۆڵە دەردەپـۆقـێـتـە تورەکەکەوە، بەڵام لە قۆری گەورەدا کەمترە چونکە ئەو ئەلقەیەی RiNG کیسەکەی لێ دەچێتە دەرێ فراوانترە وەك لە قۆری پچوك دا. خنکانی قۆری کاتێك دەبێت کە ئەو ڕیخۆڵە، یا ئومینتومەی چوتەناو تورەکەی قۆرییەکەوە گەورەتر بێت لە ملی تورەکەکە، بە جۆرێك ملی تورەکەکە ئەو ناوەڕۆکە دەگوشێت و وای ـ لێ دەکات پیسایی بە ئاسانی پێدا نەڕوات و خوێنیش بە باشی پێدا نەسوڕێتەوە یاخود بەتەواوی بەریان گیرابێت. ئەم خنکانە هەندێ جار لەوەوە پەیدادەبێت نەخۆشەکە لەپڕ ئیشێکی قورس بکات لە ئەنجام دا پێچێکی تری ڕیخۆڵە یا پارچەیێك ئومینتومی تر بچێتە تورەکەکەوە، ئەنجامی ئەمەش بەندە بە تەسکی، یا فراوانی ملی کیسەکەو درێژەکێشانی، ئەگەر ملی کیسەکە تەنگ بێت ئەوا ناوەڕۆکەکەی دەگوشێت و دەبێتە هۆی کەم خوێنی، ئەوسا میکرۆبیش دەکەونە چالاکی و پەلاماری ئەو پارچە کەم خوێنە دەدەن و دەبنە هۆی سوتانەوەی.

لەپێشا شینەخوێن لەناوەڕۆکی کیسەکەدا پەنگ دەخواتەوەو ڕیخۆڵەکە شین هەڵ دەگەڕێت و دەئاوسێت و ڕەق دەبێت، بەرەبەرە ڕەنگەکەی لە شین باوەوە دەگۆڕێتە سەر ڕەشی، ڕیخۆڵە خنکاوەکە پڕ دەبێت لە باوبڕەو دەکشێت و ئەستور دەبێ و هەموو قۆرییەکە خوێنی تێ‌دەزێت.

پاشی ئەوەی باکتریا کەوتە چالاکی ڕیخۆڵەکە نیشانەی سوتانەوە یا گانگرین (لاڕەشە) یا هەردووکیانی پێکەوە لێ دەردەکەوێت.

ئەو گۆڕینەی لەسەرو پێچی ڕیخۆڵەی ناو قۆرییەکەو لە خوارویدا پەیدا دەبێت لەو گۆڕینانە دەچێت لە ڕیخۆڵە گیرانەوە (بەربەست) OBSTRUCTiON پەیدا دەبێت، ئەمانەش بریتین لەوەی ئەو بەشەی کەوتوتەخوار قۆرییەکە بۆش دەبێت و دێتەوەیەك، ئەو بەشە ڕیخۆڵەیەشی لەسەرو قۆرییەکەوەیە دەئاوسێت و پڕ دەبێت لەباوبڕە، خوێن دەپژێتە دیوارەکەیەوە، باکتریا دەست دەکاتە هەڵوەشانی ئەو شتانەی لەناو یایەتی (خواردەمەنی هەزم کراو)، لە ئەنجام دا ژەهر دروست دەبێت، ژەهرەکەش دەمژرێتە ناو خوێنەوە دەبێتە هۆی نیشانەی ژەهراوی بوون..

بە زۆری ئەوانەی توش خنکانی قۆری دەبن ئەگەر بەگورجی چارنەکرێن، لە ئەنجامی مژینی ئەو ژەهرانەوە دەمرن.

نیشانەکانی خنکانی قۆری بەتەواوی لە نیشانەکانی بەربەست بوونی ڕیخۆڵە ئەچن iNTESTiNAL OBSTRUCTiON، ئەم نیشانانە بەپێی ئەوەی ڕیخۆڵە چوتە ناو قۆرییەکەوە یا ئومینتوم دەگۆڕێن، نەخۆشەکە هەست بە هەندێ گۆڕین دەکات لە قۆریەکەیدا وەکو ئەگەر لە پڕ ئیشێکی قورسی کرد هەست دەکات قۆرییەکەی گەورەتر دەبێت. خستنەوە ناوەوەی یا زەحمەت تر دەبێت، یا هەر ناگەڕێتەوە ناوزگ: قۆرییەکە توندترو ڕەق تر دەبێ، ئازار پەیدا دەکات، لەگەڵ ئەمانەش دا ژانەزگ پەیدا دەبێ، ئەم ژانە بەرەو ناوك دەڕوات، لە هەندێ خنکانا ئەم ئازارە یەکەم نیشانەیە، ئازارەکە زۆر تیژە، پێچ بەزگ دا دێت بە

جورێـك نەخـۆشـەکـە وەهـا لێ‌دەکـات بچـەمێتـەوە، یا دانیشێت و ئەژنـۆکـانی بخـاتـەژێـر چەنـاگـەیـەوە، عەرەق کردنـەوە، موچـورکی ساردی، دڵ تێکەڵهاتن لەگەڵ ڕشانەوە دەست پێ‌دەکەن.

ئازار وەستان نیشانەی ئەوەیە گانگرین دەستی‌پێ‌کردوە. ڕشـانـەوە یەکێکـە لەو نیشـانانەی درێژە دەکێشێت، لەپێشا ڕشـانـەوەکـە ئەو خواردەمـەنی‌یـەیـە لە گەدەدا هێشتـا هەزم نەبووە، لەپاشا ئەو شتانەی لە سەرەتای ریخۆڵە باریکەدایە وەکـو زەرداو BiLE پاش ئەوە ئەو پیـسـایـی‌یـەی لە ریخۆڵەباریکەدا، سەرو ئەو پێچەی لە تورەکەی قۆڕیەکەدا خنکاوە.

خنکان هەتا دوورتر لە بەشی سەرەوەی ریخۆڵە باریکەدا بێت ڕشانەوە زورترو قورستر دەبێ، هەتا زیاتر لە خوارەوە بێ وەکـو نزیکی ریخـۆڵـە ئەستـورە، یا ریخـۆڵـە ئەستـورە خۆی، ڕشـانـەوە درەنگتـرو کەمتـر دەبێ، ڕشـانـەوەکـەش بێ‌هـێـلـنـج و بێ‌تـیـن دانـەخـۆ دەبـێـت. لە خوار پیچـەخنکـاوەکـەوە هیـچ نایەتە دەرێ هەر چەند بە دەستور نەختێ پیسـایی دێتـەدەرێ. خنکـانی ریخـۆڵـە هەتـا لە خوارترەوە بێ (خواروی ریخۆڵە) زگ پتر دەئاوسێت و ژانی دەبێت.

گەرمی لەش کەم دەکـات، پرتـەی دڵ PULSE پچـوك و خێرا دەبێ، ڕەنگە نەخۆشەکە زەرد هەڵ گەڕێت، تینوێتی، زمان بەلغ دەگرێت و وشك دەبێ، میز کەم دەبێت و ڕەنگی تێر دەبێت و ئەلبوٚمینی تێدا دەبێت.

خنکـانی ئومینتـوم بە تەنیـا هەمان نیشانەی دەبێت وەکو خنکانی ریخۆڵە بەڵام وەکو ئەو کوشندە نی‌یە.

## جێگەکانی قۆڕی لە لەش دا

### قۆڕی ئەشکنج iNGUiNAL HERNiA

لە هەر دولای خوارووی زگ لە هەر لایێـك ئەلقـەیێـك لەنـاو ماسـولکەو پێ‌بەندو پێ‌بەستەرەکان دا دروست بوە پێ دەڵێن ئەلقـەی ناوەوەی زگ iNTERAL ABDOMiNAL RiNG کە ٥و١سم سەروی ناوەڕاستی پێ‌بـەستی ئەشکنـج دەکەوێت iNGUiNAL LiGAMENT لێـرەوە کەنـالیك CANAL (بوریە) هەیە iNG'liNAL CANAL نزیکـەی چوار سم درێـژ دەبێتـەوە هەتـا دەگـاتـە ئەلقـەیێکی‌تر لە دەری ئەو ماسولکانەی زگ دا پێی دەڵێن ئەلقەی دەرەوەی زگ EXTERNA ABDOMiNAL RiMG ئە قەناله بە خواریەکی کەم بۆ پێشەوەو بەرەوخوار دەڕوات هەتا دەگاتە هێڵی ناوەڕاست MiDDLE LiNE لەبەر ئەوەی بە خواری دەڕوات پێـی دەڵـێـن بۆریـەی خوار OBLiQUE CANAL و بە قۆڕی‌یـەکـەش دەڵێن قۆڕی خواری ئەشکنـج OBLiQUE iNGUiAL HERNiA ئەم جۆرە قۆڕی‌یـە لە هەمـوو قۆڕی‌یـەکـانی‌تـر بە ناوبـانگتـرو ناسـراوتـرە، لە هەمـوو جۆرەکـانی‌تـر پتـر پەیـدا دەبێت (لـە ولاتی خۆمان هەر ئەم جۆرە بە قۆڕی دەزانن)، قوڕی لەنـاو زگـەوە بە ئەلقـەی ناوەوەدا دێتـە ناو قەنـالـەوە، هەمـو قەنـالـەکـە دەبڕیت و لە ئەلقـەی دەرەوەدا سەر دەردەهێنێ، ئەگـەر هاتـو لە ئەلقـەی دەرەوەدا تەواو تێپـەڕ بوو هاتـە ناو گونـەوە پێی دەڵێن قۆڕی گون SCROTAL HERNiA لە ئافـرەت دا دێتـەخـواری بۆ ناو لوێچی‌زێ پێی دەڵێن قۆڕی لوێچی‌زێ LABiAL HERNiA. لە نێرینەدا تورەکەی قۆڕی لە ئەلقەی دەرەوە کە تێپەڕی کرد دێتە خوارەوە بۆ ناوگون.

لەسـەرەتـادا کە هێشتـا هەر لە قەنـالـەکـەدایـە نەختێك هەڵ دەتوقێت و لە کاتی کۆکین دا ئیتر گەورە دەبێت، ملی تورەکـەکـە، یا سەرە تەنگـەکـەی لە قەناڵ دایە، ئەوی‌تری لەناو گون دا، یا لە سەرو هێلکەی گونەوە یا لە پێشەوەی‌دا دەبێت.

قۆڕی ئەشکنج کە درێژەی کێشاو کۆن بوۆ ئیتر ئەلقەی ناوەوەوئـەلقـەی دەرەوە تەواو نزیـك یەك دەبنـەوە، تا وایـان لێ‌دێت بەرامبـەر یەك دەبن لە ئەنجـام دا قەنـالـەکـە تەواو کورت دەبێتەوە.

لە قۆڕی زۆر گەورەدا قەنـالـەکـە بە چەشنێـك فراوان دەبێت لەوانەیە ئەگەر پەنجە بخرێتە ناو ئەلقەی دەرەوە هەتا ئەلقەی ناوەوە بە قەنالەکەدا بڕوات.

لە ئافرەت دا ئەم قۆڕی‌یە دەچێتە لوێچی زێ‌یەوە LABiA

### قۆڕیی زگماك CONGENTAL HERNiA

لە کاتی گەورە بوونی ئاولەمەدا FAETUS هێلکەی گون لەناو زگەوە بەرەوخوار دەبێتەوە بۆ ناو گون، ئەم هێلکەیە چمکیکی پیریتونیوم لەگەڵ خۆیدا رادەکێشێت کە پێی دەڵێن PROCESSUS VAGiNALiS بەشی خوارووی ئەم چمکە پیریتونیوم دەبێتە TUNiC VAGiNALiS بەشی سەروی کوێر دەبێتەوە لە پێش، یا لەدوای لەدایك بوون، ئەم تونیکا ڤاجینالیسە تورەکەیێك دروست دەکات کە رەنگە لەناو زگەوە ریخۆڵە یا ئومینتوم، یا هەردوکیان بێنە ناویەوەو قۆڕی پەیدابکەن، لەناو تورەکەکەدا ناوەرۆکەکەی بە هێلکەی گونەوە دەنووسێت، یا دەوری دەگرێت، ئەم قۆڕی زگماکە بە زۆری لەلای راست دا دەبێت چونکە هێلکەی لای راست درەنگتر دێتە خواری بۆ ناو گون.

بوونی ئەم تورەکە زگماکە هاتنە خوارەوەی ناوەرۆکی قۆڕییەکە زۆر ئاسان دەکات، وە قۆڕییەکە لەپڕ دەر دەکەوێت بۆیە پێی دەڵێن قۆڕی زگماك.

لەبەر ئەوە ئەم ناوەی لێنەنراوە چونکە قۆڕییەکە لە کاتی لەدایك بوون دا دەردەکەوێت، ئەم ناوەی لێنراوە تەنیا لە بەربوونی ئەو تورەکەیەیە هاتنە خوارەوەی ناوەرۆکی قۆڕییەکە ئاسان دەکات.

### قۆڕیو هێلکەی گون قەتیس بوون لە ناو زگ دا.

HERNiA WiTH RETENTiON OF THE TESTiS

ئەم جۆرە قۆڕییە لەگەڵ نەهاتنە خوارەوەی هێلکەی گون کارێکی دەگمەن نییە بەتایبەتی لە منداڵان دا، هێلکەی گون هەندێ جار لەناو زگ دا قەتیس دەبێت، یا بە زۆری لە قەنالی ئەشکنج دا دەمێنێتەوە، ئەم هێلکە قەتیس بووە بەتەواوی پێنەگەیشتوە، زۆر ناسك و بەهەست دەبێ، گەلێ جار لەپێش دا قۆڕییەکە پەیدا دەبێ، یا هەردووکیان پێکەوە دێنە خواری، بەدەگمەن لەپێشا هێلکەی گون بێتە خوارێ ئینجا پاش ماوەیێك ناوەرۆکی قۆڕییەکە بێتە خوارێ.

### چارەی قۆڕی ئەشکنج (قۆڕی گون).

چاری قۆڕی پزیشکی پسپور بریاری دەدا، بەپێی قۆڕییەکە، یا بە پشتێنی تایبەتی TRUSS، یا بە نەشتەرسازی، بەڵام زۆری ئەم قۆڕییانە بە نەشتەرسازی چار دەکرێت.

### قۆڕی ئەشکنج لە منداڵ دا.

iNGUiNAL HERNiA iN CHiLDREN.

ئەم قۆڕییە لە منداڵی نێرو مێدا زۆرە، لە منداڵی نێرینەدا ئەو قۆڕییەی توش دەبن بریتییە لەوەی پروسیسەس ڤاجینالیس VAGINALIS PROCESSUS بەچالاکی POTENT دەمێنێتەوە، لای راست زۆرترە وەك لای چەپ چونکە هێلکەی گونی لایراست درەنگتر دێتە خوارەوە بۆ ناوگون لەبەر ئەوە پروسیسەس ڤاجینالیس درەنگتر کوێر دەبێتەوە، بە چالاکی دەمینێتەوە بێئەوەی قۆڕی دەرکەوێت هەتا هۆیێك پەیدا دەبێ وەکو بەلەفیرە DiARRHOAE فراوان بوونی ریخۆڵەکان بەباوبژە، گریان وزریکەی زۆر و زرشانەوەو کۆکەرەشە.... هتد، یەکێك لەمانە دەبێتە هۆی ئەوەی ریخۆڵە یا ئومینتوم بێتەناو تورەکەکەوە.

ئەگەر ئەم هۆیانەی لەسەرەوە ناوبران زوو چاربکرێن لەوانەیە قۆڕییەکە لە خۆیەوە چاك بێتەوە.

نەچونەناوەوەو خنکان لەم جۆرە قۆڕییانەدا زۆر کەمن.

**چارەکردنی TREATMENT**

لە منداڵی ساوادا لە سێ مانگ تەمەنی کەمتر بێت دەبێ قۆڕییەکە بگێڕرێتەوە ناوزگ، پارچەیێك خوری نەرمی بۆ تۆپەڵە بکرێت و بخرێتەسەریو بەبەسترێت.

لە منداڵی لە سێ مانگ گەورەتر یا بە پشتێن TRUSS ،یا بە نەشتەرسازی چاردەکرێت ئەگەر منداڵەکە بەرگەی بگرێت، بەڵام پشتێن بەدەگمەن چاری دەکات و دەبێت هەر نەشتەر سازی بۆ بکرێت.

### قۆڕی پەناران

FEMORAL HERNiA

وشەی FEMUR بە لاتینی رانە، FEMORAL مانای هەر

شتێ پەیوەندی بەرانەوە هەبێت.

ئەم قۆرییە لە بەشی هەرە سەروی ران دا نزیکی ئەشکنج پەیدادەبێت، لیرەش دا ئەلقەی ران FEMORAL RiNG کە سەرەتای قەنالی رانە FEMORAL CANAL لە نزیکی ئەشکنجەوە لە نشێویەکدایە، ئەم قەنالە نزیکەی ٣و١سم درێژە: قۆری ران لەناو زگەوە بە ناو ئەم قەنالەدا دێتەخواری هەتا دەگاتە FOSSA OVALiS کە بریتییە لەنشێوێکی هێلکەیی، لەو نشێویەدا دەردەپۆقێت، ئەم جۆرە قۆرییە پاش قۆری ئەشکنج لە هەموو جۆرەکانی تر بلاوترو زیاترە، ئەم جۆرە لەو ئافرەت دا زۆرترە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەلقەی ران گەورەترەو لەگەنەش PELViS پانترو فراوانترە بەتایبەتی لەو ژنانەدا منداڵیان بووە.

ئەم قۆرییە ئەگەر پچوك بێت بەئاسانی بەدەست دەخرێتەوە ناوزگ، ئەگەر زۆر گەورەبێت شۆر دەبێتەوەو بە ران دا دێتە خواری. ئەم قۆرییە هێواش هێواش بێئازار پەیدا دەبێت، ئەگەر ژنەکە بەهێزو چالاك بێت هەتا چەند ساڵێك پێی نازانێ، قۆرییەکە پچوکە بەزۆری بە بارستایی هێلکە کۆترێکە، لەوانەیە تەنیا پارچەیێکی پچوك ئومینتومی تێدابێت، یا بەشێك لە پێچێکی ریخۆڵە.

لە قۆری گەورەدا لەوانەیە چەند پێچێکی ریخۆڵەی تێدا بێت.

لەگەڵ قۆری ئەشکنج دا بە زەحمەت جیادەکرێتەوە بەتایبەتی لە ژنی قەڵەودا، تەنیا بەوەدا جیادەکرێنەوە ملی قۆری ئەشکنج لەسەروو نوکی ئێسکی بەرەوەیە SPiNE OF PUBiS بەلام ملی قۆری ران لەخواروو ئەو نوکەوەیە.

چاری ئەم قۆرییە، یا بە پشتێن، یا بە نەشتەرسازی دەکرێت، ئەوەش پزیشکی نەشتەرساز بریاری دەدا.

ترسی خنکان لەم قۆرییەدا زیاترە وەك لە هی ئەشکنج، گانگرین زووتر دەست پێدەکات. هەندێ جار خنکان دەخرێتە پشت گوێ چونکە قۆرییەکە ئەوەندە پچوکە خۆی نازانێ قۆرە، لەبەر ئەوە لە هەر نەخۆشێك دا نیشانەکانی ریخۆلە گیران (بەربەست بوون) پەیدابوو پێویستە پزیشکەکە سەیری قەنالی ران بکات.

## قۆری ناوك

UNBiLiCAL HERNiA

سێ جۆرە قۆری ناوك هەیە:

١ - قۆری پەتی ناوك. HERNiA OF UMBiLiCAL CORD

٢ - قۆریی ناوکی منداڵ UMBiLiCAL HERNiA OF iNFANTS

٣ - قۆری ناوك لە گەورەدا UMBiLiCAL HERNiA OF ADULTS

١ - قۆری پەتی ناوك لە ئەنجامی تەواو یەك نەگرتنی هەردوو لای دیواری زگەوە پەیدا دەبێت، ئەگەر ئەو دەلاقەیەی پەیدا دەبێت پچوك بێت، ئەوا بە دوشەکۆڵەیێکی زۆر پچوکی نەرم بخرێتە سەر ناوك و بە پشتێنێك ببەسترێت چاك دەبێتەوە.

ئەگەر دەلاقەکە گەورە بێت قۆرییەکە دەبێتە کیسەو لەسەر کیسەکەوە چینەکانی پەتی ناوك، پان دەبێتەوە. ئەگەر ئەم جۆرەیان چارکردنی دوابخرێت کوشندەیە، لەبەر ئەوە ئەگەر حاڵەتی منداڵەکە باش بوو دەبێ بەگورجی نەشتەرسازی بۆ بکرێت.

٢ - قۆری ناوك لە منداڵ دا.

ئەم قۆرییە پاش لەدایك بوون بە چەند هەفتەیێکی، یا بەچەند مانگێك دەردەکەوێت، ریخۆڵە لەو کونەوە دەمارەکانی ئاولەمەی پێدا تێپەر دەبێت دێتەدەرێ، ئەمە لە ئەنجامی ساریژ نەبوونی پیریتونیوم لەو جێگەیەدا روودەدا، قۆرییەکە بە ئاسانی دەخرێتەوە ناوزگ و بەئاسایی پێش پێگەیشتن PUBERTY نامێنێ.

٣ - قۆری ناوك لە مروڤی گەورەدا.

ئەم جۆرە قۆرییە لەو ژنە قەڵەوانەدا پەیدا دەبێت تەمەنیان لە ٣٥ ساڵان تێپەر بووە بەتایبەت ئەوانەی منداڵیان بووە، ئەم قۆرییە لە ژنی لەرو لاوزو نێرینەدا پەیدانابێت.

لەبەر کۆبوونەوەی چەوری‌و بەز لە ئومینتوم دا تەوژمی ناوزگ پتر دەبێت و ئەو چەوری‌یەی لە دیواری زگ دا کۆدەبێتەوە دەبێتە هۆی کشان و لێك دورخستنەوەی دەزولکەکانی چنراوە، پێ‌بەندەکانی ماسولکەکانی دیواری زگ، بەتایبەتی لە گۆشت پارەی ناوك دا UMBiLiCAL CiCATRX . لەبەر ئەم هۆیانە ئەگەر ئەو ژنە ئیشێکی گرانی کرد، یا بەحجەمت بزوتەوە نەختێك لە پیریتونیومی دیواری زگ دەردەپۆقێتە دەرێ‌و کیسەی قۆری دروست دەکات.

دەری ئەم کیسەیە (کێلانەی قۆری) لە پێ‌بەندو ماسولکەکانی دیواری زگ پێك دێت.

پەیدابوونی ئەم قۆری‌یە هەمیشە لەوانەدا دەبێت کە زۆر قەڵەون و ماسولکەکانی زگیان بێ‌هێزو شل و خاو دەبن.

ناوەرۆکی ئەم قۆری‌یە بە زوری ئومینتومە بەڵام هەندێکیان بەشێك لە کولونیان تێدایە (رێخۆڵە ئەستورە)، کەمیان رێخۆڵە باریکەیان تیدایە. ئەم قۆری‌یە هێواش هێواش گەورە دەبێت، بریتی‌یە لەئاوسانێکی خری لووسی بێ‌ئازار، هەندێ جار ئەوەندە زل دەبێت شۆر دەبێتەوە هەتا دەگاتە ناولنگ.

ئەم قۆری‌یە کە زۆر گەورە بوو، ئیتر ناگەرێتەوە ناوزگ چونکە تورەکەی قۆری‌یەکە لەگەڵ ناوەرۆکەکەی‌دا پێکەوە دەلکێن، نەخۆشەکە هەست بە قورسی دەکات، هەندێ جاریش ئازاری دەبێ.

گیرانی (بەربەست کردنی) پیسایی DBSTRUCTiON لەو پێچە ریخۆڵەیەدا چۆتە ناو تورەکەکەوە لەم جۆرە قۆری‌یەدا لە هەموو جۆرەکانی‌تر پترترە ئەمەش دەبێتەهوی رشانەوە، باوبژە، گیراوی CONSTiPATiOn لە ئەنجام دا لەوانەیە ببێتە هۆی خنکانی قۆری‌یەکە.

چارەی ئەم قۆری‌یەش، یا بە پشتێن، یا بە نەشتەرسازی دەکرێت، ئەوەش پزیشکی پسپور بریاری دەدا بەپێی حاڵەتی نەخۆشەکە.

## قۆری ناو پەنچك

DiAPHRAGMATiC HERNiA.

ئەم قۆری‌یە بریتی‌یە لە دەرچونی هەندێ لە هەناو لەناو پەنجکەوە بۆ ناوسنگ، ئەم قۆری‌یە کیسەی پریتونیومی نی‌یە، لەبەر ئەوە لەگەڵ قۆری‌یەکانی‌تر جیاوازە.

لەبەر ئەوەی جگەر لای راستەوە ناوپەنچکی راگرتوە، ئەم قۆری‌یە تەنیا لای چەپەوە روودەدات کە گەدەو ریخۆڵەو کولون دەچنە ناو سنگی چەپەوە. دەرپۆقینی ئەم قۆری‌یە بۆ ناوسنگ لە یەکێ کونەکانی ناو پەنچکەوە دەبێت وەکو ئەو کونەی سورێنچکی ESOPHAGUS لێوە دەچێتە خوارێ، یا لە ناتەواوی‌یێکی زگماکەوە، یا لە دران و برینداری ناوپەنچکەوە.

گەورەیی ئەم کونە لە درزێکەوە هەتا دەگاتە نیوەی ماسولکەی ناوپەنچك. لەبەر ئەوەی گەدە هەمیشە لەم قۆری‌یەدایە، نیشانەکانی بریتین لە نیشانەکانی گەدە تێك چوون. . . . سەردڵ دەنیشێت، لای خواروی کەلەکەی چەپ بەرز دەبێتەوە، نیشانەی وەکو ئەو نیشانانەی با دەچێتە سنگەوە پەیدا دەبێت، قرەقر لە گەدەو ریخۆڵە پەیدا دەبێت، دڵ لە جێی خوی دەترازێت و دەبێتە هۆی دڵەکوتێ PALPiTATiON ، هەناسەسواری‌و نەتوانین لەسەر لای چەپ پاڵ کەوتن.

بەتیشکی رونتگەن گەدە، یا ریخۆڵە، یا هەردوکیان لەناوسنگ دا دەبینرێن.

ئەگەر ئەم قۆری‌یە لە پر پەیدابێت لەئەنجامی درانی ناوپەنچك دا بە هەر هۆیێکەوە بێت هەناسەسواری‌یێکی BREATHLESSNESS تەواو نەخۆشەکە دەگرێت، شین هەڵ دەگەرێت لەگەڵ ئازارو قورسایی‌یێك لەسەر دڵ. . . . ئەمانە لەوانەن نەخۆشەکە بە زوویی بکوژن.

خنکانی ئەم قۆری‌یە نیشانەکانی وەکو هینەکانی بەربەست بوونی ریخۆڵە وان. چارەکردنی ئەم قۆری‌یە بە نەشتەرسازی نەبێ ناکرێت.

## قۆری ورگ VENTRAL HERNiA

بریتی‌یە لە هەر قۆری‌یێك لە دیواری پێشەوەی زگ دا پەیدابێت جگە لە قۆری ئەشکنج و پەناران و ناوك.

گەلێك جۆرە قۆری ورگ هەیە، لەمانە

جیابوونەوەی راستەماسولکە

DIVARICATION OF RECTI

راستە ماسولکەکان RECTI MUSCLES دوو ماسو لکەن لە ئێسکی سنگەوە بەرەوخوار دەبنەوە هەتا دەگەنە ئێسکی بەر PUBIC BONE لە ناوەراستی زگ دان، پێکەوە نوساون، تەنیا کونی ناوك دەلاقەیەکە لەناویان دا کە ئەویش کوێر دەبێتەوە، هەندێ جار لە مەیانی ئەم دوو ماسولکەیەدا لەسەروو ناوکەوە دەلاقەیێك پەیدا دەبێ لە ئەنجامی باش یەك نەگرتنیان دا، ئەمەش بە زۆری لەمنداڵ دا دەردەکەوێت، لەم دەلاقەیەوە قۆری دروست دەبێ بە هاتنە دەرەوەی پیریتونیوم پێچێك لە ریخۆڵە. کە منداڵەکە گەورەبوو دەلاقەکە کوێردەبێتەوەو قۆرییەکە نامێنی. لە گەورەدا بە تایبەتی لەو ژنانەدا منداڵیان زۆر بووە، جیا بوونەوەی ئەم دوو ماسولکەیە دەلاقەیێك دروست دەکەن لە خوار ناوکەوە، لە جولانەوەدا، یا لە کۆکەیەکەوە لەم دەلاقەیەوە قۆری دەردەپۆقێت کە بە ئاسانی بە دەست دەخرێتەوە ناوەوە.

ئەم جۆرە قۆرییە نەخۆشەکە بێزار دەکات، لەبەر ئەوەدەبێ بە پشتێن بەربەست بکرێ، ئەگەر ئازاری هەبوو پێویستە بە نەشتەرسازی چاربکرێت.

**قۆری لە هێڵی سپیدا**

HERNIA IN THE LINEA ALBA.

ئەم قۆرییە بە گشتی لە یەکەم سێ ئینچی سەروو ناوك دا دەبێت لەبەر ئەوە پێی دەڵێن قۆری سەردڵ EPIGASTRIC HERNIA بەزۆری لەو نێرینانەدا روودەدا، تەمەنیان لە ٣٥ ساڵ زیاترەو پیشەی گرانیان هەیە (ئیشەکانیان قورسە). ئەم جۆرە پچوك دەبێت و هیچ نیشانەیێکی تری نابێ بەڵام لە هەندێ کەس دا نەختێ ئازاری دەبێ، ئەم ئازارەش بە نەخۆشی گەدە دەزانرێت.

خنکانی قۆرییەکە لەوانەیە لەپڕ پەیدابێت و بەگورجی بێ بە هۆی گانگرینی ئەو پیچە ریخۆڵەیەی لەناویایەتی.

ئەمەش دەبێ بە نەشتەرسازی چاربکرێت.

**قۆری لە گۆشت پارەی دیواری زگ دا**

HERNIA IN RELATION TO CICATRIX OF ABDOMINAL WALL

لە هەر جێیێکی دیواری زگ دا گۆشت پارەیێك SCAR هەبێت لە ئەنجامی دومەڵ و کێم کردنی دیواری زگ SUPPURATION وەیا برینێك، یا هەندێ جار لە گۆشت پارەی نەشتەرسازیدا وەکو زگ هەڵ درین بۆ ریخۆڵە کوێرە APPENDICITIS . . . . . هتد.

ئەم قۆرییە پەیدادەبێت بەزۆری لە خوارناوکەوە روودەدا. ئەم جۆرە قۆرییە لە کاتێك دا نەخۆشەکە هەستا، یا کۆکی، یا ئیشێکی قورسی کرد دەردەپۆقێت. . . . لەوانەیە زۆر گەورەبێ و نیشانەی بێهێزی و لاوازی و گەدەو ریخۆڵە تێك چوون دەرکەوێت. لە پاڵ کەوتن دا قۆرییەکە دەگەرێتەوە ناوزگ، لەبەر ئەوەی کونی ئەم قۆرییە گەورەیە خنکان روونادا. چارەشی بە نەشتەرسازی دەکرێت.

**قۆری لە کەمەردا**

LUMBER HERNIA

لە دوا پەراسوی سنگەوە هەتا دەگاتە قەراغی ئێسکی لەگەنە CREST OF ILIUM ، لەم لاو ئەو لای زگ قۆری کەمەرە پەیدا دەبێت، لە نێرینەدا زیاترە وەك لە مێینە، بە زۆری لای چەپەوە دەردەکەوێت، دەرپۆقینەکە نەرم و خزە، بە ئاسانی دەچێتە ناوەوە، زۆر کەم لەم قۆرییە لەوانەیە ناچێتە ناوەوە، هەندێ جار تووشی خنکان دەبێت.

قۆری کەمەر بەدەگمەن دەبێتە هۆی نارەحەتی، چاریشی یا بە پشتێن، یا بە نەشتەرسازی دەکرێت.

**قۆری سەرەتای ریخۆڵە ئەستورکە (کولون).**

HERNIA OF THE CAECUM.

ئەم قۆرییە بە زۆری دەچێتە گونەوە، لە جیاتی ریخۆڵە باریکە نەختێك لە سەرەتای ریخۆڵەگەورە دەچێتە تورەکەی قۆرییەکەوە، گەلێکی لای راستەوە پەیدا دەبێ هەرچەندە هەندێ جاریش لای چەپەوە روودەدا، جاری واش هەیە لە پەناران دا دەبێت بە تایبەتی لە ژنان دا.

نیشانەکانی وەکو نیشانەکانی قۆڕیتری گون وایە، هەندێ جار ئەم قۆڕی‌یە ناگەڕێتەوە ناوەوە بەڵام خنکان دەگەنە، چاری ئەم قۆڕی‌یەش، دەبێت هەر بە نەشتەرسازی بکرێت.

## قۆڕی گەرادان HERNiA OF THE OVARy

لەم جۆرە قۆڕی‌یەدا جگە لە گەرادان گەلێ جار بۆری‌یەی فالوپی تێدایە FALLOPiAN TUBE هەندێ جاریش ریخۆڵە یائومینتومیشی لەگەڵدایە.

لە منداڵ دا لە قەنالی ئەشکنج دا iNCUiNAL CANAL یا لە ئەڵقەی دەرەوەی‌دا هەست بە گەرادان دەکرێت وەکو ئاوسانێکی پچوکی، لووسی درێژکۆڵەی رەق، کە دەستی پێدا بنرێت لەژێر دەست دادە خلیسکێت، وە هەست دەکرێت بە پەتێکەوە نوساوە (بۆری‌یەی فالوپ)، ئەم قۆڕی‌یە لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکەدا نامێنێ لە گەورەدا بە زەحمەت گەرادان بناسرێتەوە، چونکە تۆپەڵێك دروست دەکات وەکو ئومینتومی پێوەلکاو وایە، لەوانەیە بئاوسێت و ئازاری بیێ بەتایبەتی لە کاتی بێنوێژی‌دا (عوزر) MENSTRUAL PERiOD ئەم قۆڕی‌یە بە نەشتەرسازی چار دەکرێت، ئەگەر گەرادان ساغ و ئاسایی بوو دەخرێتەوە جێی خۆی (ناوزگ) خۆ ئەگەر نەخۆش بوو، وە نەتوانرا بخرێتەوە ناوزگ ئەوا دەبررێت.

## قۆڕی میزڵدان

HERNiA OF URiNARy BLADDER - CySTOCELE

ئەم قۆڕی‌یە هەرچەندە زۆر کەمە بەڵام لە گەورەو پچوك دا روودەدا، وە بە زۆری لەگەڵ قۆڕی ئەشکنج دا دەبێت. سێ جۆرە قۆڕی میزڵدان هەیە بەپێی پەیوەندی میزڵدانەکە لەگەڵ پیریتونیوم دا.

١ ـ لە دەری پیریتونیوم دا EXTRA PERiTONiAL میزلدانەکە دەکەوێتە تەنیشت تورەکەی قۆڕی‌یەکە.

٢ ـ لەناو پیریتونیوم دا iNTRA PERiTONAL ئەو بەشە میزڵدانەی دەچێتە ناو کیسەی قۆڕی‌یەکەوە بە تەواوی بەپیرتیونیوم داپۆشراوە.

٣ ـ لە تەنیشت پیرتیونیوم PARA PERiTONiAL لەمەدا دیواری ناوەوەی تورەکەی قۆڕی‌یەکە بریتی‌یە لەو پیریتونیومەی بەشی پشت و تەنیشتی میزڵدانی داپۆشیوە.

ئەم جۆرە قۆڕی‌یە لە ئەنجامی میزگیران دا پەیدادەبێت، کە میز گیرا، میزڵدان دەکشێت و فراوان دەبێت، یاخود لەوانەیە لە میزڵدان تورەکەی پچوك دروست ببن، ئەم تورەکەیە شان بەشانی تورەکەی قۆڕی دەردەپۆقێت.

هەندی جار لە ئەنجامی نەشتەرسازی قۆڕی‌یەوە پەیدادەبێت بەوەی پارچەیێك لە میزڵدان بە هەڵە رادەکێشرێتە قەنالی ئەشکنجەوە.

ئەم جۆرە قۆڕی‌یە لەپێش نەشتەرسازی‌دا زۆر بەزەحمەت دەناسرێت بەڵام هەندێ جار دەبێ شکی لێبکرێت ئەگەر هەر نیشانەیێکی نەخۆشی میزڵدان دەرکەوت وەکو لە کاتی میزکردن دا نەخۆشەکە گونی خۆی دەگوشێت، یاخود کە گونی خۆی گوشی ئارەزوی میزکردنی دەبێت.

هەندێ جار کە نەخۆشەکە میز تاوی دەدا قۆڕی‌یەکە گەورەتر دەبێ، پاش میزکردن پچوك دەبێتەوە.

لەو ژنانەدا منداڵیان زۆر دەبێت هەندێ جار قۆڕی میزڵدان دەردەپوقێتە ناو بۆری زێ VACiNAL CySTOCELE هەمان جۆرە قۆڕی لەوانەیە لە کۆم دا پەیدابێت RECTAL CySTOCELE گەلێك جۆرە قوری‌تر هەیە وەکو قۆڕی مێشك. کە مێشك لە کەللەی سەرەوە دەردەپۆقێت، قۆڕی دوانزە گرێ، قۆڕی بەز کە بەزی پشت دیواری زگ دێتە دەرێو گەلێ جۆرە قۆڕی‌تر بەپێویست نەزانرا باس بکرێن.

د. ئەورەحمان

(١) پیریتونیوم PERiTONEUM پەردەیێکی قایمی، بێرەنگی لوسە، دیواری زگ لەناوەوە دادەپۆشیت و گەلێك لە ئەندامەکانی هەناویش دادەپۆشیت.

(٢) GRET OMENTUM ئومینتومی گەورە. ئومینتوم بریتی‌یە لە قەدبوونی FOLO پیریتونیوم، لە گەدەوە دەروات بۆ ئەندامەکانی‌تر. ئومینتومی گەورە، قەدیکی ئومێنیتومە بە گەدەوە نوساوەو بەرەوخوار دەبێتەوە کولونی پانەکی TRANSVERSE COLON دادەپۆشێت.

سەرچاوە:

ئەم باسە لە کتێبی MANUAL OF MiLES AND WiLKiE AURGERy By THOMAS بە دەست کاری‌و کورت کردنەوەوە وەرگیراوە.

# حول مرض الفتق

الدكتور عبدالرحمن عبدالله

ورد في الكنايات باللغة الكردية وصف بعض الأحاديث المملة أو التافهة بالفتق وكأنَّ حالة الحديث تشبه حالة المريض الذي يعاني من هذا المرض الذي كان خفياً في الماضي أو يخفيه المريض عن الناس.

والفتق هو خروج الأحشاء من خلال شق أو فتحة أو تمزق وتجمعها بصورة واضحة ويتكون من ثلاث طبقات هي: ١ - الكيس ٢ - الغطاء ٣ محتويات الكيس، وله أنواع أربعة هي ١ - المرجع الى الداخل ٢- غير المرجّع الى الداخل ٣ - المحصور ٤ - الخانق. ولايقتصر الفتق على منطقة واحدة من الجسم فهناك الذي يصيب الطرفين السفليين من البطن Ingtinal Hernia وهناك الفتق الموروث Con gental Hernia والفتق الذي هو الخصيتين في داخل البطن Hern:ia with retenti o of the testi والفتق الذي يصيب خلف الفخذ fomoral Hern ia والسرّة unleilical Hern ia والفتق الذي يصيب الحجاب الحاجز D iaphra gmatic Hern ia والفتق الذي يصيب المعدة V entral Hern ia والخاصرة والخط الأبيض والكولون والمبيض والمثانة وغير ذلك من مناطق الجسم.

ويصيب المرض الرجال والنساء والأطفال. وفي هذا المقال شرح لهذه الحالات والأشكال من المرض مع بيان أسباب حدوثها وفي المقال تنوير ببعض خفايا المرض وطرق محافظة الجسم من شروره. علماً بان محتوى المقال العلمي ملخص عن كتاب Miles and wiLkie M amual of Aur gery لمؤلفه (Tho mas)

# بواری دەروونناسی

- مستەفا پەژار -

## پێشەکی

لەبەر گرنگیی لایەنی مرۆڤایەتی لە کردەی پەرەسەندنی شارستانەتی دا؛ بابەتەکانی «دەروونناسی» کەوتوونەتە ریزی پێشەوەی بابەتەکانی هەر زانستێکی دیکە. هەرچەند بنچینەی پێشکەوتنی شارستانەتی هەر تەنیا مرۆڤ نی یە، ئابووریشە، بەڵام هەر مرۆڤە کە سەرچاوەکانی ئەم ئابووری یە دەخاتە گەڕو دەیانکاتە مایەی ژیان و گوزەرانەکەی خۆی.

مرۆڤ کۆڵەگەی کارکردن... بەرهەم هێنان... ئابووری... کارگێری... رامیاری... زانست... هونەرە؛ بۆیە یاساو سەرەتاکانی دەروونناسی، بە ڕاشکاوی، هەنگاو بەرەو لایەنە جۆربە جۆرەکانی ژیانی ئەمرۆی بەرەبەری کۆتایی سەدەی بیستەم دەهاوێن.

دەروونناسی زانستێکە، روونکردنەوەو چارەسەر کردنی گیروگرفتە زۆرو زەوەندەکانی مرۆڤی بە خۆیەوە گرتووەو کۆمەڵگا پێشکەوتوەکان بایەخێکی زۆر بەم زانستە دەدەن و لەم بوارەدا زۆر پێشکەوتوون.

مخابن، تا ئێستا، هیچ لایەنێکی بابەتەکانی ئەم زانستە روون نەکراوەتەوەو بە تێروتەسەلی لە بارەیەوە بە زمانی کوردی نە نووسراوە.

رەنگە هۆی ئەم دیاردەیە نەبوونی زاراوی دەروونناسی بەکوردی‌و نەخوێندرانی ئەم زانستە بە کوردی‌و هەڵنەکەوتنی زاناو پسپۆری کوردی‌زان بێت. بە هەر حاڵ، بواری نووسینی دەروونناسی بە کوردی هێشتا بەیارەو ئەم بەیاری یە بارێکی قورس و ماندووبوونێکی زۆرو بەرپرسیاری یەکی مێژوویی دژوار دەخاتە ئەستۆو سەرشانی هەر نووسەرێکی بەکوردی نووسی، هەر بابەتێکی ئەم زانستە...

ئێمە، لێرەدا، لە پێناو بناخە بۆ دانانێکی ئەم زانستە بەرفراوانە گرنگەدا بەکوردی، هەوڵ دەدەین بوارو ئامانج و بەشەکانی دەست نیشان بکەین و روونیان بکەینەوە.

### بواری دەروونناسی

مەبەست لە بواری هەر زانستێك ئەو گۆرە پانەیە کە تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانا پسپۆڕەکانی سەر بەم زانستەی ئاراستە دەکرێت.

فیزیا لە گۆڕانە سروشتی یەکانی مادی یان (مایەکیەتی)و گۆڕانی وزە دەکۆڵێتەوەو کیمیا لە تێك چرژانی توخمەکان و دروست بوونی توخمی نوێ بە هۆی ئەم تێك چرژانەوە دەکۆڵێتەوە..

دەروونناسی لە رەوشت دەکۆڵێتەوە. کە رەوشت بوتە بواری دەروونناسی مانای ئەوە نی یە، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم زانستەوە وا بووە؛ نەخێر، دەست نیشانکردنی ئەم بوارە هەر وا سووك و ئاسان نەبووە، بەڵکوو بینە و بەردەو مشت ومرێکی زۆری لەسەر کراوە. بەر لە ساڵی ١٩٠٥دا، هۆش، یان رووداوە. هۆشی یەکان، یان هەست، یان شارەزایی بە بواری لێکۆڵینەوەی دەروونناسی دادەنرا، بەر لەویش گیان، یان رەوان بە سەرباسی دەروونناسی دانرابوو. لە ساڵی ١٩٠٥ دا ویلیەم ماکدوگل بۆ جاری یەکەم لە مێژووی ئەم زانستە دا (رەوشت)ی بە بواری دەروونناسی بە خەڵك ناساند کە گوتی: (رەوشت زانستێکی بابەتیانەی زیندەوەرانە».

پاش ئەمش (پللسبوری)، لە ساڵی ١٩١١دا، کە کتێبی (بنچینەکانی دروونناسی: Essentials of psych) خۆی بڵاوکردەوەو لە ئەمەریکادا وەك سەرچاوەیەکی پشت پێ بەستراو قوستراوەیەوە گوتی:

«وەسا پێناسەی دەروونناسی کراوە کە زانستی هەستە، یان زانستی شارەزایی کەسایەتی یانەیە. ئەم دوو پێناسەیە هەرچەند هەندێ سوود دەبەخشن، بەڵام لە لایەکی ترەوە کەم وکووریان گەلێك زۆرە.. و دەروونناسی - باشترین پێناسەکردنی - ئەوەیە کە زانستی رەوشتی مرۆڤە» بەکورتی، لەوەودوا، زۆربەی زانا دەروونناسی یەکان لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە (رەوشت بواری دەروونناسی)[1]

### مانای وشەی رەوشت

أ - رەوشت لە زمان دا: رەوشت وشەیەکی لێك دراوە؛ لە وشەی (رەو)و پاشگری (شت) پێکهاتووە.

(رەو)[2] رەگی فرمانی (ڕۆیی، دەروات، برۆ)یە، (رۆیین یان رۆیشتن) چاوگیەتی‌و (رەوت یان رەوشت) کە بە لکاندنی (ت،شت) بە رەگەکەوە (رەو) پێکهێنراون، ناوی (کردە)ن.

لەسەر بناخەی ئەم بۆچوونەدا «رەوت»و «رەوشت» یەکن و ناوی کردەی رەو - کە جوولانەوەی بەرەو پێشەوە دەگەیەنێت - بە خۆیانەوە دەگرن، واتا رەوکردن یان رۆیین یان رۆیشتن.

کە وابێت، رەوشت؛ کردەی یان کردەوەی بەرەو پێشەوەی زیندەوەرانە.[3]

لە عەرەبیش دا، (السلوك) کە بۆ بواری دەروونناسی دانراوە لە فرمانی (سلك)ەوە کە مانای (رۆیشتن بە...) دە گرێتەوە، (سلك طریقا) واتا رێگایەکی گرت بۆ پێدا رۆیشتن، بەو پێ یە (السلوك) گرتنی رێگەیەك بۆ پێدا رۆیشتن دەگرێتەوە. لە ئینگلیسیش دا، behaviour لە فرمانی (behave) ەوە هاتووە و واتا هەڵسوکەوتی کرد یان بە شێوەیەکی تایبەتی جولایەوە.

ب - مانای رەوشت لە دەروونناسی دا.

رەوشت، لە (دەروونناسی)دا واتا هەر کردەوە یان جم وجوول و یان هەر چالاکی یەکی زیندەوەر.

رەوشت، زاراوێکی واتا بە قەد واتای ژیان فرەوانەو بۆ ئەوەی بە چاکی

تێی بگەین پێویستە لەو پەیوەندییە دینامیکییەی نێوان زیندەوەرو شوێنەوارەکەی بگەین.

شوێنەواری زیندەوەر سەرجەمی ئەو بارودۆخانەیە کە زیندەوەرەکەی تێدا دەژێت:

١ - بارودۆخی سروشتی وەك: شوێنی جوگرافیو گەرمیو شێو ڕووناکیی ئەم شوێنە.

٢ - بارو دۆخی کۆمەلایەتی وەك یاساو نەریت و خوەکانی ئەم کۆمەڵەو بارودۆخی ئابووریو، ڕۆشنبیریو، رامیاری... بەشەکانی ئەم لایەنەن. مرۆڤ، هەر لە کاتی پەیدابوونییەوە، لەگەڵ شوێنەوارەکەی تێك دەئاڵێن و هەریەکەیان کار لەویدی دەکات.

مرۆڤ، لە پێناو ژیانەکەیدا، کە بۆ وەدەست هێنانی خواردەمەنی، جل وبەرگ، جێگەیەك بۆ حەسانەوەی خەبات دەکات و بۆ قایل کردنی حەزو ئارەزووە جۆر بەجۆرەکانی تێدەکۆشێت گەلێك کۆسپ و تەگەرەو گیروگرفتی سروشتیو کۆمەلایەتیی ڕووبەڕوو دەبێت و ناچار دەبێت کالای ویست و داخوازییەکانی بە بالای ناو شوێنەوارەکەیدا بگرێت و هەندێکیان لێ کەم کاتەوە و بەم بارودۆخانەی شوێنەوارەکەی خۆی، خۆی رابهێنێت، یان شێوازی لەبار و بە کەڵك بدۆزێتەوە بۆ گۆڕینی لایەنە ناهەموار و نالەبار و ناخۆشەکانیو دەبێت فێری ئەوە بێت کە بە بێ گوێدانە نەریتی کۆمەڵەکەی نابێت حەزو ئارەزووەکانی تێر بکات.

بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکانەش پێویستی بە بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندن و خستنەکاری ژیرییەکەیەتی. مرۆڤ، لەو ململانییە بێوچانەدا، تووشی جۆرەها بینەوبەردەو، سستیو چالاکی و، قایل بوون و نارازیبوون، ترس و تووڕەیی، خۆشەویستی و ڕك لێبوونەوە، پێیەك لەپێش و پێیەك لەپاش، سەرکەوتن و ژێرکەوتن دەبێت و وای لێدێت ئەم جۆرە رەوشتە پەسند بکات و لەسەری بڕوات و جۆرە رەوشتێکی دیکە ڕەت بکاتەوەو وازی لێبهێنێت.

لەم کارەشیدا، تووشی جۆرەها وروژان و ویستن و بیرکردنەوەو هەلگێر و وەرگێرکردن و نەخشەدانان دەبێت و فێر دەبێت ئەوەی لە دەروونیدایە یان ئەوەی هەستی پێ دەکات بە وشە یان جوولە یان ئاماژەکردن دەربرێت. هەموو ئەم چالاکی و جم وجوول و کردەوانە لە سنووری واتای رەوشت دا خۆیان دەگرنەوە.

بەشێوە دەربڕینێکی دیکە، گۆڕانە فیزیاییو کیمیاییەکانی شوێنەوار کار لە زیندەوەر دەکەن و هانی دەدەن بۆ بەرپاکردنی جۆرە کردەوەیەك، جا ئەم کردەوەیە چ لە ناوەوەی زیندەوەرەکەوە بێت و دیار نەبێت و چ لە دەرەوەی بکەوێتە بەرچاوان؛ بە رەوشت دەناسرێت.

مەبەست لە رەوشتی نادیاری زیندەوەر ئەو کردانەی ناوەوەیەتی کە بە چاو لە دەرەوە نابینرێن و لە کەسەکە بەولاوە کەسێکی دیکە پێی نازانێت، وەك: وروژان، بیرکردنەوە، بیرکەوتنەوە، بیناندن...

رەوشتی دیاریش ئەو کرد "ەن، کە بێجگە لە خاوەن رەوشتەکە، کەسانی دیکەش لە دەرەوە دەتوانن ئەم جۆرە رەوشتانە چاوەدێری بکەن وەك: رۆیشتن، پێکەنین، گریان، قسەکردن، نووسین، یاریکردن...

دەکرێت بە شێوەیەکی دیکەش، رەوشت بکەینە دووجۆر، ویستە رەشت و نەویستە رەوشت. ویستە رەوشت ئەوکردەوانەیە کە مرۆڤ هەوەستی خۆی بەرپایان دەکات و خۆی ئاگایلێیانە وەك: خوێندنەوە، نووسین، رۆیشتن، گوێگرتن (بیستن)....

نەویستە رەوشتیش ئەو چالاکییانەیە کە بە بێ ئەوەی خۆی ویستبێتیو ئاگای لێیانەوە بێت روو دەدەن وەك سورانەوەی خوێن و ڕژاندنی هۆرمۆن لە لایەن لوەکانەوە...

## لایەنەکانی رەوشت

وەك بۆمان روون بووەوە کردەوە جۆر بەجۆرەکانی مرۆڤ بەرانبەر بە دنەدەرە جۆربەجۆرەکانی شوێنەوار رەوشت پێك دەهێنن.

هەرچەند رەوشت یەکەیەکی یەکگرتووی نەپچراوە بەلام بۆمان هەیە سێ لایەنی لە یەك جیاوازی لێ دەستنیشان بکەین و هەرسێکیان لە هەر وەلامدانەوەیەك یان کاردانەوەیەك دا کە لە لایەن مرۆڤەوە بەرامبەر دنەدەرەکان بەرپا دەبێت هەن.

ئەم سێ لایەنەش ئەمانەن:

١ - لایەنی زاناندن. ٢ - لایەنی وروژان. ٣ - لایەنی جوولاندن.

بۆئەوەی بە ئاسانی لەم سێلایەی رەوشت بگەین؛ با لەم هەڵوێستە وردبینەوە:- ئازاد و نەوزادو شێرکۆ لە شوێنێك دا دانیشتبوون لە پڕێکا ئازاد چاوی بە مارێکی گەورە کەوت و ترساو بەدەم راکردنەوە هاواریکرد: کورە هەڵسن مارە!

نەوزادو شێرکۆش یەکسەر هەڵسان و بە ڕاکردن لە شوێنەکە دوور کەوتنەوە. دەوجا با هەر لایەنێکی رەوشت بخەینە ناو خانەیەکەوە:

١ - لایەنی زاناندن: دیتن و ناسین و زانینی زیانی مارەکە لە لایەن ئازادەوەو تێگەیشتنی مانای «کورە هەڵسن مارە» لەلایەن نەوزادو شێرکۆوە دەخرێتە ناو ئەم خانەیەوە.

٢ - لایەنی وروژان: ترسانی ئازاد، بە هۆی دیتن و ناسینەوە و بیرکەوتنەوەی زیانی مارەکەو ترسانی دوو برادەرەکەی بە هۆی تێگەیشتنی (کورە، هەڵسن مارە) دەخرێتە ئەم خانەیەوە.

٣ - لایەنی جوولان: راپەڕین و راکردن و هاوار کردنی ئازادو هەلسان و بە راکردن دوور کەوتنەوەی نەوزادو شێرکۆ لە شوێنەکە شیاوی ئەم خانەیە.

وەك ئاشکرایە هەرسێ لایەنەکەی رەوشت پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە هێزیان بە یەکترەوە هەیە، ئەگەر بهاتایە، ئازاد هیچ جۆرە شارەزاییەکی لە بارەی مارو زیانی مارەوە نەبوایە ئەوا لە مارەکە نە دەترسا و را نە دەپەڕی و رای نەدەکردو هاواری نە دەکرد.

دوو برادەرەکەشی، ئەگەر بهاتایە، کورد نەبوونایەو لە واتای هاوارەکەی نە

گەیشتنایە ئەوا ئەوانیش نە دەترسان و هەڵنەدەستان و رایان نە دەکرد.

بە کورتی لایەنی زانادن لە رەوشتدا، کردە بیریی‌یەکانی وەك: بیرکردنەوە و ناسینەوە و بیرکەوتنەوەو ئەندیشەو بیناندن دەگرێتەوەو لایەنی وروژانیش، گۆڕانە جۆر بە جۆرەکانی بارودۆخە دەروونی‌یەکانی وەك ترس و توورەیی و شادی وخەمگینی، دڵتەنگی، پەستی کە هاوشان لەگەڵ کردەوەیەك دا روو دەدەن دەگرێتەوە.

لایەنی جولاندنیش: جولاندنی هەموو لەش یان ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئەم لەشە دەگرێتەوە وەك راکردن، قسەکردن، پایسکل لێخورین، نووسین...

**دەروونناسی وەك لێکۆڵینەوەی زانستیانەی رەوشت**

لەمەوبەر گوتمان رەوشت ئەو بوارەیە کە لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەی زانا پسپۆرەکانی (دەروونناسی) ئاراستە دەکرێت. لێرەیش دا بە پێویستی دەزانین - زۆر بە کورتی - پەنجە بۆ ئەوە درێژ بکەین کە هەنگاوەکانی لێکۆڵینەوەی ئەم زانستە هەمان هەنگاوەکانی زانستیانەی زانستەکانی دیکەیە؛

١ - هەستکردن بە گیروگرفتێك و دەستنیشانکردنی.
٢ - کۆ کردنەوەی زانیاری بە گەران و سوراخ کردن.
٣ - گریمانە دانان و هەڵسەنگاندنی ئەم گریمانانە و هەلبژاردنی گریمانەی لەبار
٤ - لێکدانەوەی زانیاری‌یە کۆکراوەکان و گەیشتنە ئەنجام و چارەسەرکردنێکی گیروگرفتەکە.
٥ - رانانی ئەنجامەکان لە هەڵوێستی دیکەدا.

لە لایەکی دیکەوە، دەروونناسی رێگەو شێوازی تایبەتی‌ی فرەچەشن و جۆربەجۆری خۆی هەیە کە لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا لەسەریان دەروات یان دەیانگرێت وەك:

١ -. سەرنجدانی زانستیانەی رێك وپێك.
٢ - وتوویژ ی رووبەرو.
٣ - راوەرگرتن.
٤ - بەکارهێنانی پێوانە یان پێوەرە دەروونناسی‌یەکان.
٥ - ئەزموون و تاقی کردنەوە.

ئەم رێگەو شێوازانەی سەرەوە بۆ کۆ کرد نەوەی زانیاری بەکار دەهێنرین و هەریەکە یان چەند جۆرو بەشێك و مەرجی پیرۆکردنیان هەیەو لێرەدا ناتوانین بە دلۆر و درێژی باسیان بکەین و بە وەندە واز دەهێنین.

گیروگرفتەکانی دەروونناسی یان بابەتەکانی رەوشتیش فرەچەشن و جۆربەجۆرن وەك: رەوشتی خۆرسك و رەوشتی وەدەست هێنراو، رەوشتی زیرەك و رەوشتی دەبەنگ، رەوشتی ئاسایی و رەوشتی نائاسایی رەوشتی ئاسایی و رەوشتی نائاسایی رەوشتی ناکۆمەلایەتی، رەوشتی تاك و رەوشتی گەلەو رەوشتی کارامەو رەوشتی کەودەنی، رەوشتی بەردەوام و رەوشتی گۆراو.

بۆ ئەوەی پتر ئەم گیروگرفتانەشمان بۆ روون بێتەوە با بزانین پسپۆرانی دەروونناسی چ پرسیارێك دەکەن:-

ئەرێ بیرکردنەوە چی‌یە؟ مرۆڤ چۆن بیردەکاتەوە؟ ئایا شوێنی تایبەتی بیر کردنەوە هەیە لە مێشك دا؟ بۆ بیردەکەینەوە؟ تا چ رادەیەك وروژانێکی بە تەوژم کار لە بیرکردنەوە دەکات؟

کردەی فێربوون چی‌یە؟ چۆن روو دەدات؟ بۆ فێردەبین؟ ئەو هۆکارانەی کردەی فێربوون ئاسان دەکەن یان پەك دەخەن کامانەن؟ ئایا راستە فێربوون لە منالیدا خێراتر و باشترە لە کاتێکی دیکەدا؟

چۆن رابردوومان بیردەکەوێتەوە؟ بۆچی هەندێ شت لەبیردەکەین و هەندێکی دیکەیان نا؟ ئایا دەتوانرێت کار لە بیرکەوتنەوە بکرێت؟ چۆن دیاردەکان دەبینین و دەبیستین و دەناسینەوە؟ ئەو هۆکارانەی کار دەکەنە سەر هۆش چین؟ بۆ خەڵك لەبارەی زانادنەوە لە یەك جیاوازن؟

مەبەست لە ئاگالی‌بوون یان ئاگالێ نەبوون چی‌یە؟

ویستە چی‌یە؟ چۆن ویستەکار بەرپا دەبێت؟ بۆ هەندێ کەس راران لە کاتی بریار دانیان دا؟ مرۆڤ بۆ دەوروژێت؟ چ پەیوەندی‌یەك لە نێوان ئاژۆ دەروونی‌یەکان و وروژانی مرۆڤ دا هەیە؟

زیانی وروژانی بە تەوژمی وەك ترس و توورەیی چی‌یە؟ ئایا تا چ رادەیەك کار لە جەستە دەکات؟

ئایا دەتوانین گەمارۆی وروژان بدەین؟ خەون چی‌یە؟ بۆ روو دەدات؟

ئاژۆو هۆیەکانی چین؟

ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە دەروونناسی هەوڵ دەدات وەلامیان بداتەوە.

**ئامانجەکانی دەروونناسی**

هەر زانستێك، بە هۆی پێرۆ یان شێوازە زانستیانەکەیەوە - کە لە لێکۆڵینەوەدا رەچاویان دەکات - زانستە.

ئەو شێوازو پێرویانەی دەروونناسی لە لێکۆڵینەوەکانی‌دا رەچاوی دەکات، لە بنەرەت دا لەگەڵ ئەو پێرۆو شێوازانەی کە زانستەکانی دیکە بۆ وەدەست هێنانی زانیاری بەکاریان دەهێنن یەك دەگرێتەوە. ئەم شێوازو پێرۆیانەش چەند پێوانە یان پێوەریکیان هەیە کە دەسنیشانی سوودو بایەخەکانیان، لەبارەی کۆ کردنەوەو رێکخستنی زانیاری‌یە دەروونناسی یەکانەوە دەکات و ئەوانیش ئەمانەن:

١ - لێکدانەوە یان تێ‌گەیشتن.
٢ - پێشبینی.
٣ - گەمارۆدان control

١ - لێکدانەوە یان تێ‌گەیشتن: ئامانجی هەر زانستێك، لەوانەش دەروونناسی، دۆزینەوەی پێوەندی‌یەکانی نێوان دیاردە جۆر بەجۆرەکانە. لە راستیش دا، دۆزینەوەی پێوەندی‌یەکان و تێ‌گەیشتن و لێکدانەوە یەك کردەوەیە. تێ‌گەیشتنی دیاردەیەك، واتای ئەوەیە ئێمە جۆرە پێوەندی‌یەکی ئەم دیاردەیە و دیاردەکانی دیکەمان دۆزیوەتەوە یان لێکمان داوەتەوە.

نەبوونی یان نەدۆزرانەوەی پەیوەندیی دیاردەك بە دیاردەكانی دیكەوە تێ نەگەیشتنی ئەم دیاردە دەچەسپێنێت.

كە وابێت، زانین و تێگەیشتن بە دۆزینەوەی پەیوەندییە جۆر بە جۆرەكانی نێوان دیاردەكانەوە نەبێت نابێت.

ئیمە، لەبەر رۆشنایی رووداوە پێشینییەكانەوەو ئەو بارودۆخانەی لە دیاردەیەك ئالاون لە دیاردەیەك دەگەین، بۆ نموونە:

ئەگەر ئێوارەیەك گەڕایتەوەو دیت شتو مەكەكانی ماڵەكەت لەم لاو لەولادا بلاو بۆتەوە وای بۆ دەچیت كە رەنگبێت كەسانێك بۆ دزی یان بۆ هەر مەبەستێكی دیكە هاتۆتە ناو ماڵەكەت و وای كردوە.

٢ ـ پێشبینی: واتای ئەوەیە؛ بە گشتی بتوانرێت یاسایەك یان جۆرە لێكدانەوەیەك، لە ئایندەدا، بەسەر هەلویستی دیكەدا رابنرێت. بۆ نموونە: یاسای پەیوەندیی نێوان گەرمی و تەنە رەقەكان ئەوەمان بۆ دەردەخسێنیت كە پێشبینی شەت بوونەوەی سكەی شەمەندەفەر بكەین ئەگەر هیچ بۆشاییەك لە نێوان بەشەكانیدا نەبێت، كاتێ كە شەمەندەفەر بەسەریدا بڕوات و گەرمی بكات.

٣ ـ گەمارۆدان control ئەمەش گەمارۆدانی ئەو بارودۆخانە دەگرێتەوە كە دەبنە هۆی رووداانی دیاردەكە؛ بۆ وێنە: دەتوانرێت گەمارۆی مەرجەكانی دەرچوون یان دەرنەچوونی قوتابیان بدرێت و بە زانینی ئەم مەرجانەوە، رێنومایی قوتابیان بكرێت و دەرچوون یان سەركەوتن وەدەست بهێنرێت.

بە هەمان شێوە، بە گەمارۆدانی هۆیەكانی خواربوونەوەی سكەی شەمەندەفەر دەتوانین بارودۆخی خوار نەبوونەی ئەم سكەیە برەخسێنین. ئەویش بە بەجێ هێشتنی ماوەیەك لە نێوان بەشەكانی ئەم سكەیەدا.

**تایبەتییەكانی لێكۆڵینەوەی بواری دەروونناسی**

١ ـ لێكۆڵینەوەیەكی زانستیانەی رەوشتە.

٢ ـ بایەخ بە مانـاو بوون و ئاكـامی دەروون نادات هەروەك چۆن زیندەوەرزانی (بایۆلۆژیا) لە لێكۆڵینەوەكانیدا بایەخ بە مانای ژیان نادات و لە چۆنایەتیی پێكهاتنی لەش و جم وجوول و گەشەكردنی زیندەوەران دەكۆڵێتەوە؛ ئەئاواش، دەروونناسی لە دەروون ناكۆڵێتەوە بەڵكو لە رەوشت دەكۆڵێتەوە.

٣ ـ خۆی خەریك ناكات بەو كارانەی كە بە لێكۆڵینەوە رەوانییەكان یان گیانییەكان ناو دەبرێن؛ وەك بانگهێشتنی گیانان و دواندنی مردووان.

هەر وەها زۆربەی زانایانی دەروونناسی بایەخێكی ئەوتۆ بە لێكدانەوەی دیاردەی بیرەبازی، telepathy ، نادەن.

بیرەبازی واتا تێپەڕبوونی بیر لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی دیكە بە بێ بەشداربوونی هەستكارەكان لەم دیاردەیەدا.

٤ ـ هەروەها دەروونناسی لافی زانینی خوو و نهێنییەكانی خەڵك لێنادات، بە پێی شێوەی نیوچەوانیان، یان شێوەی چەناگەیان یان بریسكانەوەی چاوەكانی ئەم خەڵكەوە. هەروەها بە بێ لێكۆلینەوەو بەلگەی زانستی لافی زانینی ئایندەی هیچ كەسێك لێنادات.

**لكەكانی دەروونناسی**

لەبەر ئەوەی، وەك بۆمان دەركەوت، رەوشت گەلێ بەربلاو و فرەچەشنەو پەل وپۆی بۆ هەر لایەنێكی ژیان هاویشتوە، كە مرۆڤ چالاكییەكانی خۆی تێدا نواندبێت یان دەر خستبێت؛ دەروونناسی بە پێی ئەم بەشە تایبەتییانەی رەوشت بۆ چەند لكێك دابەش كراوە؛ بۆ ئەوەی هەر لكەو لایەنێكی رەوشتی تایبەت بە بەشێكی ژیانی مرۆڤ بەخۆیەوە بگرێت و بە دوایدا بچێت و لێی بكۆلێتەوە. هەر چەند ئەم لكانە هەر هەموویان لە چوارچێوەی دەروونناسی دان و لێی ناچنە دەرەوەو هەر هەموویان لە رەوشت دەكۆلنەوە بەلام هەر یەكەیان، جۆرە جیاوازییەكی لەگەڵ ئەوی دیكەیاندا هەیە؛ ئەویش هەر لەبەر لایەنە تایبەتییەكەی رەوشت.

ئەو لكانەی كە لێرەدا، تەنیا پێناسەیان دەكەین، رەنگە هیچ كتێبێكی لەمەڕ دەروونناسی گشت زۆربەیانی فەرامۆش نەكردبن، بەلام ئیمە هەوڵمان داوە، پەنجە بۆ هەموویان درێژ بكەین و لەم باسەدا شوێنیان بۆ بكەینەوە، لەبەر ئەوە، لكە دەروونناسییەكانی ناو ئەم باسە ژمارەیان لە ژمارەی لكەكانی ئەم زانستەی ناو هەر كتێبێكی لەمەڕ دەروونناسی گشت پترە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، كە ئیمە لە خۆمانەوە چەند لكێكمان خستبێتە سەر لكەكانی دیكە؛ بەڵكوو ئەوە دەگەیەنێت، رەنگە لە كاتی دانانی كتێبەكاندا، هێشتا نەگەیشتبنە ئەو رادەیەی كە بە لكی سەر بە خۆ دابنرێن:ـ

١ ـ دەروونناسی گشت: بە دەروازەی هەموو لكەكانی دیكەی دەروونناسی داندراوە. لە چالاكییە گشتییەكانی مرۆڤ دەكۆڵێتەوە؛ واتا بۆ وەدەست هێنانی ئەو سەرەتاو یاسایانەی كە بەسەر رەوشتی هەر مرۆڤێكی پێگەیشتووی ئاسایی رابنرێت هەوڵ دەدات، بۆ نموونە:

یاسا گشتییەكانی فێربوون، كە بەسەر هەر چەشنە فێربوونێك دا رادەنرێت، فێربوونی خوێندنەوە، فێربوونی نووسین، فێربوونی پیشەیەك، فێربوونی بەكار هێنانی چەك. . . لە بابەتە سەرەكییەكانی ئەم لكە: ئاژۆكان، ورووژان، فێربوون، زانین، بیركردنەوە، بیركەوتنەوە، ژیری و كەسایەتییە.

٢ ـ دەروونناسی ئەندامناسی (فیزیۆلۆژی): ئەم لكە ئەو لایەنانە بە خۆیەوە دەگرێت كە پەیوەندییەكی بە هێزیان بە كردەكانی هۆشەوە هەیە؛ وەك كاری مێشك، كاری كۆ ئەندامی دەمار، كاری مێشك، كاری كۆ ئەندامی دەمار، كاری ئەندامەكانی هەست كردن؛ چاو، گوێ، لووت، زمان، پێستەو كاری لوە یەكسەر رژێنەكان (Ductless glands).

٣ ـ دەروونناسی ناسین: لەو لایەنانەی رەوشتی مرۆڤ دەكۆلێتەوە كە تایبەتن بە: زانین (كردەی زانین)، وریایی، فێربوون بیرەوەری، ناسینەوە. ئەم لكە، لێكۆلینەوەیەكی لەمەڕ زانینی جیاواز لە ورووژان و ئارەزوە:

٤ ـ دەروونناسی جیاكاری: لە جیاوازییەكانی تاكەكەسان، گرویان،

نەتەوان Nations رەسەنان Races هۆی ئەم جیاوازیانەو چۆنایەتی روودانی ئەم جیاوازیانە دەکۆڵێتەوە. زانایانی ئەم لکە، پشت بە پێوەرە سایکۆ لوژی‌یەکان دەبەستن، لە لێکۆڵینەوەکانیاندا.

٥ ـ دەروونناسی گەشەکردن: لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی گەورەبوون یان هەراش بوونی مرۆڤ دەکۆڵێتەوەو هەوڵ دەدات تایبەتمەندی‌یەکانی هەر قوناغێك روون بکاتەوە. بەم پێ‌یە ئەم لکە ئەم بەشانەی لێ دەکەوێتەوە:

أ ـ دەروونناسی ساوایی. ب ـ دەروونناسی منداڵی حـ ـ دەروونناسی تازەپێگەیشتوان، دەروونناسی لاوی. د ـ دەروونناسی پیری.

٦ ـ دەروونناسی بەراوردکاری: رەوشتی مرۆڤ و ئاژەڵ، منداڵ و پی‌گەیشتوو مرۆڤی سەرەتایی و مرۆڤی شارستان، رەوشتی ئاسایی و رەوشتی نائاسایی لەگەڵ یەکدی بەراورد دەکات.

٧ ـ دەروونناسی کۆمەلآیەتی:ـ ئەم لکە لە رەوشتی کۆ یان رەوشتی گەل (بە واتای چەند کەسانێکی پێکەوە) دەکۆڵێتەوە. هەر وەسا لە کردەی تیکچڕژانی کۆمەلآیەتی و ئاشنابوونی منداڵ بە کەلتووری کۆمەڵەکەی و زاخاودرانی بەم کەلتوورەوە دەکۆڵێتەوە وێڕای دەستنیشانکردنی ئەو کاریگەری‌یەی کە گەل لە کردەی گەشەکردنی کەسایەتی‌دا هەیەتی.

هەر وەها هەوڵ دەدات لەو بارودۆخانەی کە دەبنە هۆی پەرەسەندنی گەلە کۆمەلآیەتی‌یەکان و گەشەکردنی کردەکانی هۆش بگات.

هەر وەها لە رەوشتی تاکەکەسی ناو کۆمەڵێك و هەر رەوشتێکی دەکەوێتە نێوان تاکەکەس و کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە.

٨ ـ دەروونناسی نەسازاوان: بە گشتی لە رەوشتی نەسازاوان دەکۆڵێتەوەو بەتایبەتیش لە نەساخی‌یە هۆشی‌یەکان (شێتی) و هۆش کزی (دەبەنگی) و تاوان دەکۆڵێتەوە.

٩ ـ دەروونناسی ئاژەڵ: لە بنچینە گشتی‌یەکانی رەوشتی ئاژەڵە جۆربەجۆرەکان دەکۆڵێتەوە. بایەخ و گرنگی‌ی ئەم لکەی دەروونناسی لەوەدایە کە ئەزموون و تاقیکردنەوەی زانستانە لە بارەی رەوشتی ئاژەڵەوە گەلێ ئاسانترە لە ئەزموون و تاقیکردنەوەی رەوشتی مرۆڤەوە، کە لە هەندێ باردا هەر نالوێت بکرێت.

بە هۆی ئەو ئەزموونانەی لەبارەی رەوشتی ئاژەڵەوە، زانایان توانیان لە کردەکانی مێشك بگەن و شوێنە تایبەتی‌یەکانی جوولەکردە، هەستەکردە دیاری بکەن هەر وەها لەبارەی کردەی فێربوونەوە سوودێکی زۆر لەم ئەزموونانەوە، وەدەست هێنراوە.

١٠ ـ دەروونناسی کەسایەتی: ئەم لکە بە دەروونناسی (دینامیکی)یش ناو دەبرێت و لە ئاژۆو بزوێنە خورسك و وەدەست هێنراوەکان دەکۆڵێتەوە.

١١ ـ دەروونناسی پەروەردەیی: یاساو بنچینە دۆزراوەکانی دەروونناسی بەسەر لایەنەکانی پەروەردەو فێرکردندا رادەنێت و چارەسەری گیروگرفتەکانی بواری پەروەردە دەکات وەك: دەبەنگی و پاشکەوتنی قوتابیان لە خوێندنداو گوێ نەدانیان بە یاساو پێکارەکانی قوتابخانەو هەر وەها دۆزینەوەی باشترین رێگەی فێرکردن و رەخساندنی گونجاوترین بارودۆخی فێربوون و راهێنانی قوتابیان لەسەر خوو و رەوشتی پەسندو بە کەلك و دانان و ئامادەکردنی بەرنامەو کتێبەکانی پۆلە جۆر بەجۆرەکانی خوێندن لەبەر رۆشنایی توانست و بنچینەکانی گەشەکردنی فێرخوازان و دۆزینەوەی باشترین رێگەی فێرکردنی بابەتە جۆربەجۆرەکانی خوێندنی وەك: بیرکاری، خوێندنەوە، زمان، مێژوو، جوگرافیا...

١٢ ـ دەروونناسی چارەسەرکاری: لە رێگەو شێوازی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان دەکۆڵێتەوەو ئەم لکە بۆ چەند بەشێك، بە پێی گیروفتەکان دابەش کراوە، لە چارەسەر کردنێکی بارێکی سووکی گیروگرفتی دەروونی‌یەوە تا دەگاتە دژوارترین نەخۆشی دەروونی هۆشی؟

أ ـ دەروونناسی رابەریی counseling psychology: ئەم بەشە بایەخ بە چارەسەرکردنی هەندێ گیروگرفتی نەسازان دەدات؛ وەك: نەسازانی کۆمەلآیەتی، نەسازانی پیشەیی، نەسازانی پەروەردەیی....

ب ـ دەروونناسی کلینیکی: لە شلەژانەکانی کەسایەتی دەکۆڵێتەوەو هەوڵ دەدات ئەم شلەژانانە دەست نیشان بکات و بەشێوازی گونجاو چارەسەریان بکات.

حـ ـ دەروونناسی پزیشکایەتی: ئەم بەشەیان بایەخ بە نەخۆشی‌یە هۆشی‌یەکان دەدات و هەوڵ دەدات چارەسەریان بکات.

جاران پزیشکەکانی سەر بەم لکە لە جۆرەکانی (شێتی، insanity) یان دەکۆڵی‌یەوە بەلآم لە مەودوا خویان بۆ نەساخی‌یەکانی دەروونی ـ دەماری، Psycho neurosis تەرخان کرد، ئەم نەساخی‌یە جۆر بەجۆرا نەش لە بنچینەدا دەروونین و تووشی ئەو کەسانە دەبن کە هەرگیز شێت نین.

١٣ ـ دەروونناسی تاوانکاری: ئەم لکە بەشێکە لە سایکۆلۆژیای نەسازاوان؛ لە هۆکارەکانی ئاژۆو بزوێنەکانی رەوشتی تاوانبار کە دەبنە هۆی تاوانێك دەکۆڵێتەوە، پێشنیازی گونجاوترین جۆری سزای تاوانبارو چارە سەرکردنی دەکات.

١٤ ـ دەروونناسی سەربازی یان جەنگی: یاساو سەرەتاکانی دەروونناسی، لەناو سوپادا بەکار دەهێنێت لەپێناو بەرز کردنەوەی توانستەکانی جەنگاوەران و پێوەرە دەروونناسی‌یەکان بۆ دەستنیشانکردنی ئەفسەرو سەربازی توانا بەکار دەهێنێت و لەبەر رۆشنایی توانست و ئامادەگی‌یە دەستنیشانکراوەکان بەسەر لایەنە جۆربەجۆرەکانی سوپا دابەشیان دەکات.

هەروەها سوود لە یاساکانی فێربوون دەبینێت بۆ مەشق پێکردنی سەربازی و بایەخێکی زۆریش بە هۆکارە دەروونناسی بەکانی باش بەکارهێنانی هەستکارەکان لە پانەگۆرەکانی کوشتار دا دەدات.

هەروەها لە بنچینە دەروونناسی‌یەکانی جەنگی دەروونی دەکۆڵێتەوە.

١٥ ـ دەروونناسی دادگایی: لەو هۆکارە هەست پێ‌کراو و هەست پێ نەکراوە دەروونی و هۆشیانەی کە رەنگە کار لە؛ دادوەر، تاوانبارکراو، پارێزەر، تاوان لێ‌کراو، ئاگادارکار، بینندە [٤] جەماوەر بکات لە کاتی بریاردانێکی دادگایی‌دا دەکۆڵێتەوە.

لەو بارودۆخ و هۆکارانەش دەکۆڵێتەوە کە کار لە دادوەر دەکات کاتێ کە بەڵگەو نیشانەکان هەڵدەسەنگێنێت و بڕیارێك دەدات و سزایەك دادەنێت.

هەر وەها لەو هۆکارانەش دەکۆڵێتەوە کەوا لە تاوانبارکراو و پارێزەر دەکات راستیی رووداو بشارنەوە.

هەر وەها لەو هۆکارانەی کار لە بینندە دەکەن دەکۆڵێتەوە؟ وەك بارودۆخە دەروونی‌یەکەی، هەستکارەکانی، بیرەوەریی، کە رەنگە، بێ ئەوەی خۆی بیەوێت، وای لێ بکەن لە راستی دوور بکەوێتەوە.

١٦ ـ دەروونناسیی پیشەیی یان پیشەسازی:ـ هەوڵی زیاد کردنی بەرهەمی کارگەکان یان کارگەران دەدات، کاتێ کە زانستیانە چارەسەری گیروگرفتەکانی بواری کردەی بەرهەم هێنانی پیشەسازی دەکات.

لەم ئەرکەیشی‌دا، رەچاوی پاراستنی تەندروستی، کارگەران و رێزلێنانیان دەکات. لەو بارودۆخانە دەکۆڵێتەوە کە دەبنە هۆی زۆرترین بەرهەم و چاکترین جۆر لە کەمترین کاتداو بە کەمترین ماندووبوون. ئەم لکەی سایکۆلۆژیا لە (نومایی پیشەیی، هەڵبژاردنی پیشەیی، مەشق پێکردنی پیشەیی، شیکردنەوەی کارە جۆر بە جۆرەکانی پیشەسازی دەکۆڵێتەوە. وێرای ئەمانەش، بایەخێکی زۆر بە پەیوەندی‌یە مرۆڤایەتی‌یەکانی نێوان کارگەرو هاوکارەکانی‌و کارگەرو خاوەن کار گەکان دەدات.

١٧ ـ پێوانە یان پێوەرە دەروونناسی یەکان. زانستێکە هەوڵی پێوانی توانستە کەسایەتی‌یەکان و نیشانەکانی مرۆڤایەتی دەدات. بۆ ئەم مەبەستەش پێوەری جۆر بەجۆر دەدات.

پێشکەوتووترین جۆری پێوەرەکانیش پێوەرەکانی هۆشە؛ کە توانستەکانی هۆش دەپێوێت، وەك توانستە زمان، توانستە مۆزیقە، توانستە میکانیك، توانستە بیرکاری کە بە توانستە تایبەتەکان ناو دەبرێن. هەر وەها پێوانی بروا و نیشانەکانی کەسایەتیش بەرەو پێش هاتووە.

١٨ ـ دەروونناسیی بازرگانی: ئەم لکە بایەخ بە بزوێن و ویستەمەنی‌یەکانی کریاران دەدات و برواو رێبازە بیریی‌یەکانیان لەبارەی شتومەکەکانی ناو بازاڕەوە هەڵدەسەنگێنێت... هەر وەها لە بنەرەتە سایکۆلۆژی‌یەکانی کردەی فرۆشتن دەکۆڵێتەوەو گرنگی بە هەڵبژاردنی فرۆشیاری لێهاتووو چۆنایەتیی کارتێکردنی فرۆشیاران لە کریاران بۆ فرۆشتنی شتێك دەدات. سەرباری ئەمانەش، لە کاریگەریی پروپاگەندەو جۆرو رەنگ و قەوارە و جێگاو دوپات کردنەوەو کلێشەی ئەم پروپاگەندەیە دەتوژێتەوە.

١٩ ـ دەروونناسیی زمان:ـ لە پەیوەندیی نێوان دیاردەی زمان و دیاردە هۆشی‌یەکانی وەك: بیرکردنەوە، ئەندێشە، بیرکەوتنە، وروژان دەکۆڵێتەوە. ئەم لکە سێ لایەنی هەیە:ـ

أ ـ لایەنی سەرهەڵدانی دیاردەی زمان: لەو کردە ئەندامی‌و هۆشی‌و کۆمەڵایەتی‌یانە دەبنە هۆی گۆ کردن و پێکهێنانی مانا زمانی‌یە جۆربەجۆرەکان دەکۆڵێتەوە.

ب ـ لایەنی کردەی لە زمان گەیشتن: ئەم لایەنەش لە چۆنایەتیی کردەی قوستنەوەی واتای زمانی دەکۆڵێتەوە.

حـ ـ لایەنی زمانی فێربوون: جاران، ئەم لایەنە بەشێك بوو لە دەروونناسیی مندالی؛ لە چۆنایەتی و بنەرەتەکانی زمانی فێربوونی منداڵان دەکۆڵێتەوەو یەکە یەکە ئەو قۆناغانەی کە ئەم جۆرە فێربوونەی پێدا دەڕوات شی دەکاتەوەو لێکیان دەداتەوە و پەرەسەندنی زمان فێربوون و گەشە کردنی هۆش و کارتێکەرە رۆشبیری‌و کۆمەڵایەتی‌یەکان بە یەکدی دەبەستێتەوە. ئەوەی شایانی وەبیر خستنەوەیە، ئەوەیە کە دیاردەی زمان سەرەرای ئەوەی بابەتی (زانستی زمان)ە، جگە لە دەروونناسی زانستی دیکەش لێی دەکۆڵنەوە، وەك: کۆمەڵناسی، مرۆڤناسی (ئەنتروپۆلۆژیا) فیزیا... کە هەر یەکەیان لکیکی زانستەکەی بۆ تەرخان کردووە وەك: سۆشیوزمانناسی، ئەنتروزمانناسی...

٢٠ ـ دەروونناسی جوانکاری: پێشی دەگوترێ (دەروونناسی هونەری). ئەم لکە شیکردنەوەی کردەی داهێنانە هونەری‌یەکان بەخۆیەوە دەگرێت و لە کاریگەری‌یەکانی بەرهەمە هونەری‌یەکان دەکۆڵێتەوەو بایەخ بە بنچینە دەروونی‌یەکانی جوانکاری‌و چەشەوەرگرتن دەدات لە بەرهەمە هونەری‌یەکاندا.

## دەروونناسی و زانستەکانی‌تر

دەروونناسی یەکێکە لەو زانستانەی کە بە زانستەکانی رەوشت ناسراون؛ وەك فیزیولۆژیای مێشك، مرۆڤناسی (علم الانسان، Anthropology)، میللەتناسی یان نەتەوەناسی (علم الأمم Ethnology)، کۆمەڵناسی‌و پزیشکایەتیی هۆش.

ئەم زانستانەش پەیوەندی‌یەکی بە هێزیان بە یەکدی‌یەوە هەیە.

خۆ لێك جوداکردنەوەی بواری دەروونناسی‌و بواری فیزیولۆژیا، لە هەندی باردا، وەختە، هەر نەکرێت.

بەڵگەی ئەم قسەیەیش؛ هەبوونی زانستێکی نێوان ئەم دوو زانستەیە کە بە سایکۆفیزیۆلۆژیا (Psychophysiology) ناسراوە.

جیاوازیی نێوان دەروونناسی‌و فیزیۆلۆژیا بە دانانی پلە بۆ بواری هەر یەك لەم دوو زانستە دەردەکەوێت، بواری لێکۆڵینەوەی زانای دەروونناسی. لەوەوە دەست پێ‌دەکات کە زیندەوەر بە گشتی دەکەوێتە بەر کاریگەریی شوێنەوارەوە، فرمانی کۆ ئەندامی دەماریش - کە بواری لێکۆڵینەوەی فیزیۆلۆژیایە - دەقاودەق دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان کاردانەوەو ئەو دنەدەرانەیە کە کار لەم کۆ ئەندامە دەکەن، لەمەدا، دەر دەکەوێت چۆن زانای فیزیۆلۆژیا - کە لە فرمانی کۆ ئەندامی دەمار دەکۆڵێتەوە روو بە رووی ئەو گیروگرفتانە دەبێت کە زانای دەروونناس بایەخیان پێ دەدات و لێیان دەکۆڵێتەوە... بە هەر حاڵ، ئێمە خۆمان بەوە قایل دەکەین کە دەروونناسی لەرەوشتی یەکگرتوی زیندەوەر بەگشتی دەکۆڵێتەوەو فیزیۆلۆژیاش لە فرمانی کۆئەندامی دەمار دەکۆڵێتەوە بە تەنیاو بێ ئەوەی گوێ بداتە زیندەوەرەکە بەگشتی‌و

شوێنەوارەکەی ئەم زیندەوەرە . . .

هەروەها دەروونناسی پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ زیندەوەرزانی و کۆمەڵناسیدا هەیە. ئەو مرۆڤەی کە سایکۆلۆژیا لە رەوشتەکەی دەکۆڵێتەوە بوونەوەرێکی زیندووەو رەوشتەکەی بەندە بە پێکهێنەرە بایۆلۆژییەکانییەوە: لەشی، لوەکانی، مێشکی و ئەندامە جۆربەجۆرەکانی دیکەی؛ ئەمەش لە پەیوەندیی نێوان زیرەکی و بەهرە تایبەتەکان و جوولە کارامەییەکان بە کۆئەندامی دەمارەوە بە روونی دەردەکەوێت. هەروەها تێکچوونی لوەکان، یان پووکانەوەی بەشێکی مێشك کارێکی زۆر لە کەسایەتی و هۆشدروستیی مرۆڤ دەکات.

لە لایەکی دیکەوە، دەبێت ئەوە فەرامۆش نەکەین کە کۆمەڵ بە خوو رەوشت و نەریتەکانییەوە کارێکی زۆر لە مرۆڤ دەکات، خۆ ئەگەر بهاتایەو ئێمە لەم کۆمەڵەی خۆماندا پەروەردەو گەورە نەبووینایەو لە کۆمەڵێکی دیکە بووینایە ئەوا خوو رەوشت و برواو ریبازو ئایین و جل وبەرگ و زمانمان وەکوو هی ئێستامان نەدەبوو.

رەوشتی مرۆڤ، رەوشتێکە، لە زیندەوەرێکەوە دەردەچێت کە لە ناو کۆمەڵێکدا دەژیت، لەبەر ئەوە، لەپێناو لێکدانەوەی رەوشتەکەیدا دەبێت لایەنە ئۆرگانییەکەی و لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی رەچاو بکرێت؛ بۆ ئەمەش زیندەوەرزانی و فیزیۆلۆژیا رێی زانینی لایەنە ئۆرگانییەکەیمان بۆ دەست نیشان دەکەن و کۆمەڵناسی و مرۆڤناسی و نەتەوەناسی لایەنە کۆمەڵایەتییەکەیمان بۆ روون دەکەنەوە.

**پەراویز**

١ ـ بروانە: مستەفا پەژار، بەرەوسایکۆلۆژیا. گۆڤاری کاروان. ژمارە (٣٦)، ١٩٨٥ ـ ل٧٥ ـ.

٢ ـ رەنگە هەندێکەس بڵێن (رۆ) نەك (رەو) رەگی فرمانی (رۆیی، دەروا، برۆ)یە بەڵام تێرامانێکی ورد دەریدەخات کە (رۆ) هەر (رەو)ەکەیەو هەردوو فۆنیمی (ە)و (و) گۆڕاون بووین بە (ۆ).

٣ ـ هەندێ نووسەر لەباتی وشەی (رەوشت) وشەی (رەفتار) بۆ بواری سایکۆلۆژیا بەکار دەهێنن بەکارهێنانی وشەی (رەفتار) بۆ ئەم مەبەستە راست نییە؛ چونکە وشەکە لە وشەی (رەفت)و پاشگری (ار)ەوە پێکهێنراوە؛ رەفت لە شێوەی فرمانی یان کرداری رابردوو دایەو لە کوردیدا، فرمانی رابردوو کە پاشگری (ار)ی پێوە لکێنرا دەبێتە ناوی بکەر بۆ نموونە وەك: کری ـ کریار.

دزی ـ دزیار. زانی ـ زانیار. . . . نەك ناوی (کردەوە). پاشگری (ار)ی کوردی هەروەك پاشگری er) ئینگلیسی وایە کە ئەویش فرمان دەکات بە ناوی بکەر:_ buyer - buy.

learner - learn. reader - read. writer - write .... teacher - teach.

لەبەر ئەوە بەکارهێنانی وشەی (رەفتار) بە مانای (رەوشت، السلوك، behaviour) راست نییە.

٤ ـ بیرەبازی: لەسەر شێوەی یەك بازی، سێ‌بازی دارشتراوە. (باز) وەك پاشگر لە هەندێ وشەی دیکەی کوردیدا. هەیە وەك: بەردەباز، دارەبازە، رێباز، چاوباز، شاباز، ئێمە کە لە مانای ئەم پاشگرە ورد دەبینەوە بۆمان دەر دەکەوێت کە مانای جۆرە تێپەڕبوونێك بەخۆیەوە دەگرێت، چونکە بەردەباز، ئەو بەردەیە کە خەڵك بە سەریدا دەپەڕێتەوە یان باز دەدا. دارەبازەش: واتا ئەو دارەی مردووی پێ تێدەپەڕێندرێت. . . .

رێباز: واتا ئەو رێیەی خەڵکی پێدا تێدەبەرێت.

دەمێنێتەوە (بازدان)و (شاباز)و (چاوباز). (بازدان)یش مانای جۆرە هەنگاو نانێك بەخۆیەوە دەگرێت ئەویش هەر مانای تێپەڕبوونە.

شاباز: واتا بازی گەورەو وئەمەش هەروەسا مانای تێپەڕبوون بە خۆیەوە دەگرێت. وشەی (چاوباز)یش مانای ئەو کەسەیە کە چاوی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە بازدەدا. ئەمەش هەر واتای تێپەڕبوونە.

ئەم بۆ چوونە وا لە پیاو دەکات کە وشەی (باز)ی زمانی کوردیو وشەی (پاس)؛ (pass) یان (pas) ی زمانی ئینگلیسی ـ کەهەردووکیان مانای تێپەڕبوون بەخۆیانەوە دەگرن ـ بەراورد دەکات بۆ ئەوە بچێت کە لە بنەرەت دا یەك بن یان بنەرەتێکی هاوبەشیان بووبێ.

بەهەرحال وشەکانی: pass و pas و path ی زمانی ئینگلیسی جۆرەلێك نزیکییەکیان چ لەماندا و چ لەدەنگ دا هەیە و رەنگە ئەوانیش لە بنەرەت دا هەر یەك بووبن و لە سەر بناخەی ئەم بۆچوونەماندا وشەی (بیرەبازی) مان بە مانای telepathy کە واتا تێپەڕبوونی بیر لە یەکێکەوە بۆ یەکێکیتر کردە زاراو

٥ ـ بینندە: بۆ وەدەستەوەدانی واتای (ئەو کەسەی رووداوێکی بینیوە) داندراوە کە بە عارەبی (الشاهد) ی پێ دەڵێن؛

ئەم وشەییە لە رەگی فرمانی (بینین)ەوە کە (بین)ەو پاشگری (ندە)ی کوردیدا رشتراوە، کە دەبێتە (بینندە) وەك گەلێ وشەی دیکەی کوردی؛ فرندە، باڵندە، درندە، گۆیندە. . .

لیستەی زاراوەکانی ئەم باسە

| کوردی | عارەبی | ئینگلیسی |
|---|---|---|
| بوار | میدان، مجال | Field |
| دەروونناسی (سایکۆلۆژیا) | علم النفس | Psychology |
| کردە | عملیة | Process |
| شارستانەتی | الحضارة، المدنیة | Civilization |
| بابەت | موضوع | Object |
| بنچینە | أساس | Base |
| بەرهەم هێنان | إنتاج | Production |
| رەوشت | السلوك | Behaviour |
| زیندەوەر | الکائن الحي | Organism |
| شوێنەوار، ژینگە | بیئة، محیط | Environment |

| | | |
|---|---|---|
| هۆش | العقل، ذهن | Mind |
| مێشك | مخ، دماغ | Brain |
| شارەزایی | الخبرة | Experience |
| ئاسایی | العادي، السوي | Normal |
| نائاسایی | غير عادي، غير سوي | Abnormal |
| جم وجوول | حركة، تصرف | Manner |
| چالاكی | نشاط، فعالية | Activity |
| سەرجەم، كۆ | مجموع | total |
| ویستەمەنی | حاجة | Need |
| نەریت | عرف، تقاليد | Tradition |
| ململانێ | صراع | Inflect |
| وروژان | إثارة، إنفعال | Emotion |
| بیركردنەوە | التفكير | Thinking |
| بیناندن | تصوّر، تخيّل | Imagination |
| بیرەوەری | ذاكرة | Memory |
| ویستە | ارادي | Will |
| زاناندن | ادراك | Perception |
| لایەن | جانب | Aspect |
| دەروونناسی گشت | علم النفس العام | General Psychology |
| دەروونناسی فیزیۆلۆژی | علم النفس الفسلجي | Psyiological Psychology |
| سەرنجدان | ملاحظة | Observation |
| گفتوگۆی رووبەروو | المقابلة | Interviwing |
| راوەرگرتن | الاستفتاء، الاستبيان | Questionaire |
| پیوانە، پیوەر | اختبار (قياس) | Test |
| ئەزموون، تاقیكردنەوە | اختبار (تجربة) | Experiment |
| ریگە، شێواز | طريقة، اسلوب | Method |
| گیروگرفت | مشكلة | Problem |
| خۆرسك | فطري | Inborn, Innate |
| وەدەست هێنراو | مكتسب | Acquired |
| هۆكار | عامل | Factor |
| دیاردە | ظاهرة | Phenomenon |
| گەمارۆ | ضبط، حصر | Control |
| خەون | الحلم | Dream |
| بیرەبازی | تخاطر الأفكار | Telepathy |
| لك، لق | فرع | Branch |
| لوویەكسەر رژێنەكان | الغدد الصم | Ductless Glands |
| دەروونناسی ناسین | سيكولوجية التعرف | Cognitive Psychology |
| دەروونناسی جیاكاری | علم النفس الفارقي | Differential psychology |

| | | |
|---|---|---|
| دەروونناسی گەشەكردن | سيكولوجية النمو | Develop mental psychology |
| دەروونناسی ساوایی | سيكولوجية الرضّع | Infant psy chology |
| دەروونناسی تازە پێ گەیشتوان | سيكولوجية المراهقة | Adolescent Psychology |
| دەروونناسی لاوی | سيكولوجية الشباب | Adult psychology |
| دەروونناسی پیری | سيكولوجية الشيخوخة | Gerontology |
| دەروونناسی بەراوردكاری | علم النفس المقارن | Comparative psychology |
| دەروونناسی كۆمەلایەتی | علم النفس الاجتماعي | Social psychology |
| دەروونناسی نەسازاوان | علم النفس الشواذ | Abnormal psychology |
| دەروونناسی ئاژەل | علم نفس الحيوان | Animal psychology |
| دەروونناسی كەسایەتی | سيكولوجية الشخصية | Personalistic psychology |
| دەروونناسی پەروەردەیی | علم النفس التربوي | Educatinal psychology |
| دەروونناسی چارەسەركاری | علم النفس العلاجي | Clinical psychology |
| دەروونناسی رابەریی | علم النفس الارشادي | Counseling psychology |
| دەروونناسی سوپایی | علم النفس الحربي او العسكري | Militery psychology |
| دەروونناسی تاوانكاری | علم النفس الجنائي | Criminal psychology |
| دەروونناسی دادگایی | علم النفس القضائي | Forensic psychology? |
| دەروونناسی پیشەسازی | علم النفس الصناعي | Indu strial psychology |
| پیوانە یان پیوەرەدەروونناسییەكان | القياسات اوالمقاييس العقلية | Psychometry |
| دەروونناسی بازرگانی | علم النفس التجاري | Commercial psychology |
| دەروونناسی زمان | علم النفس اللغوي | Psycho linguistic |
| دەروونناسی جوانكاری | علم النفس الجمالي | Aesthetical psychology |
| مرۆڤناسی | علم الانسان | Anthropology |
| نەتەوەناسی | اثنولوجي (علم الامم) | Ethnology |
| زیندەوەرزانی | علم الأحياء (الحياة) | Biology |
| كۆمەلناسی | علم الاجتماع | Sociology |
| كۆئەندامی دەمار | الجهاز العصبي | Nervous System |
| رانان | تطبيق | Application |
| پەروەردە | التربية | Education |
| زیری، زیرەكی | الذكاء | Intellig ence |
| مرۆڤی سەرەتایی | الانسان البدائي | Primitive society man |
| رەسەن | عنصر، عرق | Race |
| گریمانە | فرض، فروض | Hypothesis |
| كاردانەوە، وەلامدانەوە | رجع، إرجاع إستجابة | Reaction Response |
| خوو | عادة | Habit |
| ئامارە | إشارة | sign |
| ترس | الخوف | fear |
| هەلوێست | الموقف | Situation |

سەرچاوەكان

- صعت مصور واخرون: أسس علم النفس العام القاهرة: مكتبة
.لكنو المصرية، ١٩٧٨.
٢ - حمد عزت راجح: أصول علم النفس ط٧. القاهرة: دار الكتاب
عربي لطباعة والنشر، ١٩٦٨.
٣ - وربر. هنرى. سپاركس: علم النفس العام. ط٣. ترجمة الدكتور
رهيم يوسف المصور. بغداد: مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨١.
٤ - ركس نايت ومارجريت نايت: المدخل الى علم النفس الحديث.
ط٣ تعريب الدكتور عبد علي الجسماني. بغداد: مكتبة افاق عربية
بمكتبة الفكر العربي، ١٩٨٤.
٥ - ج ك. فلوجل: علم النفس في مائة عام. ترجمة لطفي فطيم.
بيروت. دار الطليعة لطباعة والنشر، ١٩٧٣.
٦ - موريس روكلان: تاريخ علم النفس. ترجمة علي زيعور وعلي مقلد.
بيروت: منشورات عويدات، ١٩٧٢.
٧ - جابر عبدالحميد جابر واحمد خيري كاظم: مناهج البحث في التربية
وعلم النفس. القاهرة: دار النهضة العربية، ١٩٧٣.
٨ - مستەفا پەژار: بەرەو سایكۆلۆژیا. گۆڤاری كاروان. ژمارە ٣٦. مطبعة
افاق عربية، ١٩٨٥.
٩ - موفق الحمداني: اللغة وعلم النفس. الموصل: مطابع مديرية دار
الكتب للنشر. جامعة الموصل، ١٩٨٢
١٠ - فاخر عاقل: مدارس علم النفس. بيروت: دار العلم للملايين،
١٩٦٨
١١ - اسعد رزوق: موسوعة علم النفس. بيروت: المؤسسة العربية
للدراسات والنشر، ١٩٧٧.
12 - Crow, Lester. D.and Crow. Alic Educational Psychology 3rd Indian Reprint
Delhe: Eurasia Publishing Hous. 1973.

# ميدان علم النفس

●مصطفى ابراهيم محمد /أربيل

## ملخص البحث:

يستهدف الباحث بحثه تبيين اهمية الجانب الأنساني في عملية التطور
الحضاري التي تؤدي بقضايا علم النفس الى ان تحتل المركز الاول من
بين قضايا العلوم الاخرى.

وبالرغم من ان عملية التطور الحضاري لايستند على الجانب الانساني وحده، بل كذلك يستند على البعد المادي الاقتصادي، الا أن الانسان هو الذي يقوم باستخدام الموارد الاقتصادية ويجعل منها وسائل ومصادر لحياته ولان الأنسان هو محور العلم والفن والعمل والانتاج والاقتصاد والسياسة، نرى ان قوانين علم النفس انسابت وتنساب الى كافة نواحي الحياة. لان هذا العلم يقوم بتفسير ومعالجة المشاكل المختلفة للانسان.

لا ان مما يؤسف له، إنه لم يكتب حول اي قضية من قضايا هذا العلم باللغة الكردية لحد الآن كتابة وافية.

وحسب راي الباحث فقد يكون مرد ذلك:-

١ - عدم توفر مصطلحات كردية لهذا العلم.

٢ - عدم دراسة هذا العلم باللغة الكردية.

٣ - عدم ظهور المتخصص الملم باللغة الكردية.

على اية حال، ان حقل علم النفس باللغة الكردية أرض بور، وان هذا الواقع يحمل البحث السيكولوجي باللغة الكردية عبءا ثقيلا ومشقة كبيرة ومسؤولية تاريخية جسيمة. ومحاولة من الباحث لوضع اللبنة الأولى لأساسيات هذا العلم اختار موضوع ميدان علم النفس للتعريف بهذا العلم المهم والمتشعب والمتعدد الجوانب.

ومعلوم ان ميدان دراسة علم النفس هو السلوك ومن هذا المنطلق سار الباحث في بحثه موضحا السلوك لغويا وعلميا وجوانب هذا السلوك وانواع السلوك والعلم الذي يقوم بدراسة هذا السلوك: اهدافه وخصائصه وفروعه.

كان ميدان علم النفس سابقا: العقل او الظواهر العقلية او الشعور او الخبرة لا انه لم يستقر على اي من هذه الظواهر... واحتدمت المناقشات بين المهتمين به حول ميدان دراستهم، ردحا من الزمن.

ونتيجة لهذه الجهود استقر رأي معظم علماء النفس حول السلوك كمجال لعلمهم.

ففي سنة ١٩٠٥ تقدم العالم النفسي وليم مكدوگل، ولاول مرة في تاريخ هذا العلم بتعريف علم النفس كعلم للسلوك عندما قال: «ان علم النفس هو العلم الموضوعي لسلوك الكائنات الحية.».

ومن بعده قال (بللسبوري)، عند نشره كتابه (أساسيات علم النفس: Essentials of psychology - الذي سرعان ما اصبح مصدرا معتمدا لعلم النفس في امريكا سنة ١٩٠١١ - (عرف علم النفس بأنه علم الشعور او علم الخبرة الشخصية. رغم ان لهذين التعريفين بعض المزايا، فإن عليهما كثيرا من المآخذ... النفس تعرف من خلال فعليات الانسان. وعلم النفس - بحسب خير تعريف له - هو علم السلوك البشري) يسترسل الباحث بعد هذا بأسهاب حول توضيح معنى السلوك اللغوي في اللغة الكردية والعربية والانگليزية.

وعند تصديه لمعنى كلمة (روشت: السلوك) علميا فأنه يقول: ان (روشت: السلوك) في علم النفس تعني كل مايصدر عن الكائنات الحية.

ولايضاح اكثر يتطرق الباحث الى ايضاح العلاقة الديناميكية القائمة بين الكائن الحي وبيئته... بفعاليات ونشاطات كثيرة ومتنوعة لأرضاء متطلبات حياته واشباع حاجاته ورغباته النفسية وان هذه النشاطات والفعاليات هي مانسميها (السلوك) وهناك السلوك الضمني والسلوك الظاهر والسلوك الارادي وغير الارادي... ولكل سلوك جوانب ثلاث: الجانب المعرفي والجانب الانفعالي والجانب الحركي.

هذا ويختتم الباحث بحثه بالتطرق الى علاقة علم النفس بعلم الفسيولوجيا وعلم الحياة وعلم الاجتماع وعلم الانسان وعلم الامم (Ethnology) بعد ان يستعرض الفروع المختلفة لعلم النفس ويقوم بتعريف هذه الفروع فرعا فرعا...

# دوو مەولەوی

دوکتۆر امین علی موتابچی
زانکۆی بەغداد

لە باسەکانی پێشوودا هۆی کاریگەریی زمان و ئەدەبیاتی دراوسێکانمان لەسەر زمان و ئەدەبیاتی کوردی بەپێی توانست و بۆچوونی خۆمان خستەبەرچاو لەبەر ئەوە بە پێویستی نازانم کە لێرەدا دووبارەی بکەمەوە[1] ئەم باسەی ئێستاش کە بریتی یە لە ئەڵقەیەك لە ئەڵقە کانی زنجیرەی باسەکانی پێشوو کە تێی دا دەربارەی بەراوردکاری و کاریگەریی و ڕەنگ دانەوەی مەولەوی « جلال الدین رۆمی بەلخی » لەسەر « مەولەوی عبدالرحیم ی تاوگۆزی کورد» بەشێوەیەکی کورت و پوختەو سەرپێیی دەخەمەبەرچاو، چونکە ئەگەر بمانەوێ بە دوورو درێژی باسی بکەین لە وزەی گۆڤارێکا نی یەو دەبێ بخرێتە دووتوێی کتێبێکەوە.

بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز باسەکەی زیاتر لاڕوون و ئاشکرابێت، بێ سود نی یە کە لەپێشەوە بە چەند دێڕێك مەولەوی ڕۆمی و مەولەوی کورد بە خوێنەرانیان بناسم ئەگەرچی زووربەیان ئەم دوو زاتە بلیمەتە باش دەناسن ئنجا دوای ئەوە بە شێوەیەکی کورت و تا ڕادەیەك عیلمی باسەکە پێشکەش بکەم.

**(جلال الدین رومی) - مولوی -**[2]

ناوی (محمد) و لەقەبی (جلال الدین)ە لە شاری بەلخ لە ساڵی ٦٠٤ کۆچی دا لەدایك بووە، چونکە لە شاری «قونیە»ی «ئاسیا صغیر» تورکیای ئێستا جێگیر بووەو ماوەتەوەو هەر لەوێش دا کۆچی دوایی کردووە، بە خاك سپێراوە، بە ڕۆمی ناوبانگی دەرکردووە.

هەروەکو دەڵێن لە باوکەوە نەسەبی دەگاتەوە سەر «ابو بکر صدیق» خوالێیان ڕازی بێ.

باوکی مەولانا «مەولەوی» ناوی (محمد کوری حسینی خطیبی»یە کە بە (بهاء الدین ولد) بەناوبانگەو لەقەبی (سلطان العلماء) یان داوەتێ بەپێی گێڕانەوەو قسەوباسی تەزکەرە نووسان) دەڵێن کە کاتێ «بهاء ولد»ی باوکی مەولەوی لە خوارزمشا عاجز دەبێ ئیتر ناچار دەبێ کە کۆچ بکات و بەرەو حەج لەگەڵ ماڵ و منداڵی دا کەوتەڕێ. هێندێ دەڵێن هۆی ئەم کۆچە ئەوەبووە گوایا هەستی بە نزیك بوونەوەی هێرشی مغول کردووە. دەڵێن کاتێ دێتە بەغداد خەڵکی دەپرسن ئەمانە چ تایەفەیەکن و لەکوێوە هاتوون و بۆ کوێ دەچن. دەڵێن «بهاء ولد» فەرموویەتی « من الله والی الله ولا قوة الا بالله ». کاتێ ئەم قسەیە بە شێخ « شهاب الدین» ( ابو حفص عمر بن محمد بن عبدالله السهروردی) ٥٣٩ - ٦٣١ دەگە یەنن کە ئەم زاتە لە سۆفی یە پایە بەرزەکانی ئەو زەمانە بووە، دەڵێ هەبێ و نەبێ ئەمە «بهاء الدین ی بەلخی یە» ئەمە بە ناوبانگی و پایەی «بهاء الدین» دەردەخا لەناو پیاوەکانی ئەو سەردەمەدا.

دوای سێ ڕۆژ لە بەغداوە بەرەو حەج دەکەوێتەڕێ دوای ئەوەی کە لە حەج دەبنەوە، بەرەو شام و لە وێوە، بەرەو ڕۆم « تورکیا»ی ئێستاو لە قونیە جێ گیر دەبێ و خەریکی وەعزو ئامۆژگاری و تەریقەت دەبێ.

مەولەوی سەرەتای زانستی ئەو سەردەمەی لای باوکی و لە دوایی دا لای « سید برهان الدین محقق» تەواوکردوە. ئەوە بوو دوای مردنی باوکی، تەمەنی «٢٥» ساڵ بووە، لە بۆ خوێندن چووە بۆ حەلەب و شام دوای ئەوەی «برهان الدین» نامەیەکی بۆ دەنووسێ لە شامەوە دەگەڕێتەوە بۆ «قونیە»و « برهان الدین » پێی دەڵێ: تۆ زانستی (علومی ظاهری) یت وەرگرتووە. دەبێ زانستی «علومی باطنی» یش وەرگری مولانا بەپێی دەستووری ئەو دەچێتە ڕیزی تەریقەتەوەو نۆ ساڵ خەریکی «سەیرو سلوك» دەبێ و پێنج ساڵیش دوای مردنی (برهان الدین)ی مامۆستای خەریکی ڕیازەت دەبێ تا دەگاتە پلەی باڵا لە عیرفان دا.

**مەولاناو «شمس» ی تەبریزی:**

ئەم زاتــە ( «شـمـس»ی تبــریــزی) ، دوای ئەوەی کەمێ لە زانــستی «عنومی رسمی» لە تەوریز وەردەگرێ دەچێتە سلکی « ریزی» تەر یقەتەوە لە یەکەم جاردا لە خزمەتی «شێخ ابوبکر زمبیل باف» و دوایی لای « بابا کمال حـــدی» دەبێ بە زۆری لە دەرەوەی شار، لە دێهــات و چۆڵــەوانی دوور لە شاردا، خەڵوەتی گرتــووە. دەتـوانین بڵێین وەکـو بابـا تایـەری خۆمـان ، کە هەمیشە بە کێوو کەژو دەشت و دەرەوە بووە ئەمیش ئەئاوا قەلەندەر بووە بابا تایەر زۆر جوان دەڵێ!

مو آن رندم که نامم بی‌قلندر
نەخون دیرم نەمون دیرم نەلنگر
چو روز آیە بگردم گرد گیتی
چو شو کردە بخشتی وانهم سەر

**(دیوانی بابا تایەر)**

یان کە دەفەرموێ!

مو کە سەر دربیابونوم شوو روز
سرشك از دیدە بارانوم شوو روز

**(دیوانی بابا تایەر)**

شمس» بەم جۆرە دەبێ تا دەگاتە پایەی «کەمال» و هەمیشە داوای لە خوای خۆی کردووە کە بە کەسێکی شایستــەو لێ هاتــووی بگــەیــەنێو بیکا بە دۆستی. خوای گەورە دوعاکەی قوبوڵ دەکات و بەرەو ڕۆم دەکەوێتەرێو لە بازاری برنج فرۆشان وەیا لە خانی شەکرفرۆشان «قونیە» دا دەبەزێ کە مولانا پێ دەزانێ. بە یەك دەگەن.[5]

لە یەکــەم بە یەك گەیـشــتــن دا کە « شمس» چاوی بە مولانــا دەکــەوێ، تێ دەگات کە ئەمە هەمان کەسێکە کە بەشارەتیان پێ دەدا.

شەش مانگ لە ژوورەکەی «صلاح الدین زرکوب» کە ئەمیش یەکێك بوو لە هۆرێ گیــانی بە گیــانی‌یــەکـانی مەولـەوی دا خەریکی عیبــادەت دەبن. مریـدەکــانی مەولـەوی زۆریــان پێ ناخـۆش دەبێ کەوا بەهۆی ئەم کابرایەوە مولانایان «مەولەویان» لە کیس چووەو خەریك دەبن شت دروست بکەن، کە شمس پێ دەزانێ لە ترسی ئەوەی ئاشــوب و ناخــۆشی نەقــەومێ ، سەری خۆی هەڵ دەگـرێو بەرەو شام دەکـەوێتـەرێ. مەولانـا زۆر بۆی بێ تاقـەت دەبێ (شارەزایان لەسەر ئەمە پێك هاتوون کەرۆمی دوای چاوپێ‌کەوتنی بە شمس گۆڕاو بووە بە ئینســانێکی دی) نامــەیــەکی بە کورەکــەیدا دەنێـرێو شمس[6] دەگــەڕێنــەوەلای، بۆ جاری دووەم هێنــدێ دەڵێن لەپـر گوم بووەو نەهــاتــەوە. هێـندێکیش دەڵێن گوایـە مریـدەکـانی مولانـا کوشتـوویـانە. مولانا لە ساڵی ٦٧٢ کۆچی‌دا گیانی پاکی بە یەزدانی یەکتا دەسپێرێو لە هەمان شوێن دا « لە خانەقاکەی» لە قونیە بە خاك دەسپێرێت.

**بەر هەمەکانی مەولەوی ڕۆمی[6] :**

بەرهەمەکانی مولانا دەکرێن بە دوو بەشەوە:

١ - هۆنراو.

٢ - پەخشان.

**هۆنراوەکانی:**

١ - غەزەلیات

ئەم بەشــە لە بەرهــەمــ کـانی «مـەولـەوی» کە بە کلیـات یا دیـوان شـمس بەناوبانگە جگە لەو سەد غەزەلەی کە بە ناوی « صلاح الدین زرکوب»ەوە یا «حسام الدین چلبی» یەوە گوتویەتی. هەمووی لە باتی «تخلص» خۆی بە ناوی شمس تبریزی» یەوەیە بەم جۆرە.

ژمــارەی بەیتــەکـانی بە پەێی ڕای کۆنـەکـان (٣٠٠٠٠) بەیتـەو لە نوسخـە دەستنوسەکان دا لە « ٥٠٠٠ تا ٤٠٠٠٠» ە بەڵام لە دیوانە چاپ کراوەکەی‌دا «٥٠٠٠٠» بەیتە.

بە فارسی‌و عەرەبی‌و «ملمعات» تورکی‌و عەرەبی‌و یۆنانی‌و قەسایدی فارسی‌و ترجیعات .

٢ - مثنـوی : خۆی زاراوەی «مثنـوی» یەو شیعـرانـە دەگـوتـرێ کە هەر دوو بەشی بەیتـەکـە یەك قافیـە بێ دەڵێن مولانـا «مثنـوی» یەکـەی لەســەر داوای «حسام الدین» چلبی» کە بە مەولەوی گوتووە کە لەسەر وەزنی « حدیقەی سنـائی» و «منطق الطیـر»ی عطار کتێبێ کە لە دووتـوێی‌دا تەریقـەتی دین و اسراری عرفانی بێ، بهۆ نێتەوە. ئەویش لە ساڵی ٦٥٧ - ٦٦٠ دەفتەری یەکەمی تەواوکردووە. کە خۆی بریتی‌یە لە شەش دەفتەر بەم جۆرە:

یەکــەم دەفتــەری ٤٠٠٣ بەیتـە دووەم ٣٨١٠ بەیتـە سێ‌یـەم ٤٨١٠ بەیتـە چوارەم ٣٨٥٥ بەیتــە پێنجــەم ٤٢٣٨ بەیتـە، شەشـەم ٤٩١١ بەیتـە، کە هەمووی دەگاتە ٢٥٦٣٢ بەیت هێندی دەگەیەنە ٢٦٦٦٠ بەیت.

٣ - ڕوباعیات: کە ١٦٥٩ ڕوباعی‌یە، کە هەمووی ٣٣١٨ بەیتە

**پەخشانەکانی:**

١ - فیەمافیە:

بریتی‌یـە لە تقـریـراتی مولانـا کە لە مەجلیســی خۆی‌دا گوتـویەتی و «سلطان ولدی» کوری یا یەکێك لە مریدەکانی کۆیان کردۆتەوە.

بابــەتــەکــانی بە گشتی دەربــارەی خوورەوشت « اخــلاق»و تەریقــەت و سۆفی‌گـەری‌و عیـرفـان و لێکـدانەوەی ئایاتی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرو ئیسلام و قسەی پیاوچاکانە.

٢ - مکاتیـب : « نووسراوەکان».

بریتی‌یە لە کۆمەڵێ لە نووسراو نامەی مەولانا کە بۆ هاوچەرخان و دۆستانی نووسیونی.

٣ - مەجالیسی - سبعە:

ئەو کۆمـەڵـە وەعـزو ئامـۆژگـاری‌یـە کە لە دانیشتن دا لەگەڵ خەڵك دا لەسەر مینبەر فەرموویەتی.

**مەولەویی خۆمان**[٧]

ناوی عبدالرحیم کوری مەلا سعیدی تاوگۆزی‌یە، لە نەوەی مەلا «یوسف جانی» کوری مەلا «ابوبکر»ی چۆری‌یە کە بە «ابوبکر»ی «مصنف» بەناوبانگە.

لە سالی ١٢٢١ کۆچی‌دا لە دێی سەرشاتەی ناوچەی تاوگۆزی هاتۆتە دنیاوە لای باوکی قورئان و کتێبە وردەکانی خوێندووە. دوای ئەوە هەروەکو هەموو قوتابی‌یەکی عیلم بە دوای دەرس و مەلای باش دا بە کوردستان دا گەراوە. لە هەنەبجەوە بیگرە، تا خورمال و تەوێلە، چوە سنەو بانە، سولەیمانی قەلای جوانرۆ تا لە دوایی‌دا لە مزگەوتی مەلکەندی لە سولەیمانی، لەسەر دەستی مەلا «عبدالرحمان»ی نۆدشە یی‌دا إجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.

لەدێی چروستانە، هەروەها لەو گوندەو کانی‌کەوەدا بە مەلایەتی‌و دەرس گوتنەوە خەریك بووە لە دوایدا گەراوەتەوە بۆ سەرشاتەی ناوچەی تاوەگۆزی‌و تێی‌دا ماوتەوە تا لە سالی ١٣٠٠ کۆچی‌دا گیانی پاکی بە خوای گەورە سپاردووە.[٨] :

**مەولەوی‌و شێخ سراج الدین**:[٩]

مەولەوی ئێمەش هەروەکو مەولەوی رۆمی پەیوەندی رۆحیی‌و عیشقی بێ‌پایانی بەرامبەر شمسی‌تەبریزی بووە، مەولەی ئێمەش پەیوەندی رۆحیی‌و عیشقی بێ‌پایانی بەرامبەر شێخ ی. بێ‌هاوتاو سەرکردەی تەریقەتی نەقشبەندی دوای مەولانا خالد شێخ عوثمان سیراج الدین بووە دوای کۆچی دوایی ئەم زاتە بووە بە مەنسوبی شێخ «محمد بهاء الدین» کوری هەروەکو مامۆستا مدرس دەفەرموێ « زۆر باوەری پێ‌بووەو بە آیینە کامل» واتە ئاوێنەی تەواو و پێ گەیشتوو ناوی بردووە...»

هەروەکو چۆن مەولەوی رۆمی جگە لە « شمس» لەژێر کاری‌گەری سۆزی مامۆستاکەی‌دا « برهان الدین محقق»و دوای گوم بوونی شمس ئەو هەموو عیشق و سۆزو پەرێشانی‌یەی کە بۆ شمس هەی‌بوو دای بە « صلاح الدین زرکوب» هەروەها بە هۆی ئەمەوە ئاگرو سۆزی دەرونی بەرامبەر شمس کەمێ خامۆش بووەوە.

دوای ئەمیش ئەوە بوو رووی کردە حسام الدین حسن چلبی کە لە سەرتای «مثنوی» یەکەی‌دا بە کلیلی خزێنەی عەرش و ئەمینی ئەختینەی فەرش و (زەمین)وە.بایەزیدی « وەقت و جنیدی» زەمان ناوی دەبا «سەیری زندگانی جلال الدین محمد مشهور بە مولوی بدیع الزمان بکە بۆ ناسینی ئەم زاتانە».

مەولەوی ئێمەش هەروەکو گوتمان دوای شێخ سراج الدین مەیل و عیشقی دەدا بە «شێخ بهاء الدین » جگە لەوەی لەگەل چەند زاتیکی خاوەن فەیض، سۆزی هەبوو، سەیری یادی مەردان مدرس بکە»

ئەم چەند بەیتە نمونەیەکە لەو هەستە پاك و خاوێنەی مەولەوی بەرامبەر بەم زاتە کە بە بۆنەی گەرانەوەی «شێخ بهاء الدین» ەوە گوتویەتی[٩]

ئاینەی کامل ! ئازیزەکەی فەرد!
فیدای ئامات بم صەفاییت ئاوەرد
خەیلێن گەردپات نەدیدەم دووربی
یانەی چەم ویران تەمام خاپووربی
خاس بی تەشریفت هەم ئاوەردەوە
گەردپات وەتەن ئاواکەردەوە
ساقی، ئینە بەزم وەصل یارانەن
چەرخیچ هەر ئەو چەرخ هەردەجارانەن
دەوری دەر وە بەزم وە پیالەوە
ژەنگ دل وە زاخ مەی بمالەوە
جامێمان جەدەس تۆ هەم سەندە بۆ

وەیا ئەم قەسیدەیەی کە هەر بۆ جناب «شێخ بهاء الدین»ی نووسیوە[١٠]

ساقی ئینە بەزم وەصلی یارانەن
چەرخیچ هەر ئەو چەرخ هەر دەجارانەن
دەوری دەروە بەزم وە پیالەوە
ژەنگی دل وەزاخ مەی بمالەوە
جامێ مان جەدەس تۆ هەم سەندەبۆ
فرصەتەن ئەصیو ئەك ئەمەندە بۆ

ئەمانەش نموونەی ئەو هەستە پر سۆزەی مەولەوی رۆمی‌یە بەرامبەر بە شمس کە هەموو دیوانی شمسی بریتی‌یە لەم رەنگە. لێرە بە شێوەیێکی کورت چەند بەیتێك لە چەند غەزەلیك دا دەخەمە بەرچاو چونکە ئەگەر هەمووی بنووسری سە دها لاپەرەی دەوێ.

**لە غەزەلی ژمارە ٢٦١٨**[١١]

ای روز چە خوش روزی شمع طرب افروزی
اورا برسان روژی جانرا پذیرایی
صبحا نفسی‌داری سرمایهٔ بیداری
برخفتەدلان بردم انفاس مسیحایی
شمس الحق تبریزی! خورشید چواستار
درنور تو گم گردد چون شرق برآرایی

**غەزەلی ژمارە ٢٦٣٣**[١٢]

گوشی بنەو نعرهٔ مستانە شنوتو
از قامت چون چنگ من الحان اغانی
هم آتش و هم بادە خرگاه چونقدست
پیران طریقت بپذیرند جوانی
در آینهٔ شمس حق ودین شەتبریز
هم صورت کل شهرەو هم بحرو معانی

عەزەلی ژمارە ۳۱٤۱ [۱۳]

حىـ خليفه بكوفت طبل بقا
كرد خالق اساس ايجادى
ـت وجودى بزرگ ظاهرشد
همه شادیو عشرت و رادى
ـمـس تبريزا چهرهٔ بنما
تا نمايم سخن بعبادى

ـر هەمەكانی مەولەوی خۆمان! [١٤]

- هۆنراوە:

- ديوانى شيعرى مەولەوى كە لە سالى ١٩٣٥دا لە دوو بەرگ داو لەگەل تـبـوەى كرمـانـجـى خواروودا بە ناوى «رۆح و ئەصـل»ەوە لەلايـەن حو ىخـوش بوو پيـرەميـردە وە بلاوكـراوەتـەوە. هەروەهـا لە سالى ١٩٦١ ـەلايـەن مامـۆسـتـا (مـەلا عبـدالكـريم)ى مدرسەوە ديوانى شيعرى مەولەوى ـگەـ شەرح و ليكدانەوەدا چاپ كراوە.

٢ - كتيبكى كوردى بە شيعر لە بارەى عەقيـدەو بيـرو باوەرى ئيسـلامـەوە هيـشـتـا چـاپ نەكراوە

٣ - ـعقيدة المرضية: بە شيعر لە بارەى عەقيدەى فيرقەى ئەشعەرىيەوە لە ـەو هەزار بەيت زياترە.

٤ - ـعقيـدة الفـارسيـة: مامـۆسـتـا مەلا عبدالكريم دەفەرموێ « كتيبكى بە ـرسى بە شيعـر لە بارەى عەقيـدە و بيـرو باوەرى موسـولمـانانەوە كە ناوى « ـعونج »ە .. لە هەزار بەيت زياترە «العقيدە المرضية و العقيدة الفارسية» ـەلايـەن مامـۆسـتـاى خوالىخـوش بوو « محى الـدين صبرى النعيمي كانى مـنكـى » يەوە لە مصر چاپ كراوە لە چاپخانەى الـسعادة بجوار محافظة مصر «لە سالى ١٣٥٢هـ »دا.

٥ - الـفضيله كتيبكى شيعـرە بە عەرەبى «٢٠٣١» بەيتـە لە بارەى زانـسـتى ئوسـوولى دينـەوە ئەم كتيبـە هەروەكـو مامـۆسـتـا مەلا عبـدالكـريم دەفەرموێ كتـيـبكى زۆر بايەخدارە مەولەوى بە فەرمانى شيخ « محمد بهاء الدين» داناوە.

مامۆستا مەلا عبدالكريم مدرس بە ناوى «الوسيلة في شرح الفضيلة» كە بريتىيە لە شەرحێ لەسەر «الفضيلة» لە سالى ١٩٧٢دا چاپ كردووە.

ـنمەى مەولەوى خۆمان كە شيخ و پيرەكەى داواى لىكردووە تاكو ئەم كتيبە دابنێ هەروەكو ئەو داوا كردنە وايەكە:

[« حسـام الـدين چلبى» شەوێ مەولانـا لە خەلـوەت دا دەبينێ دواى گفتوگۆ دەربـارەى زۆرى غەزەليـاتى داواى لێدەكـا كە كتيبێ لەسـەر شيـوەى إلهى ـنمەكەى سنائى [١٥] » بە واتا «حديقة الحقيقة» تەكەى يا لەسەر شيوەى « منطق الطير»ى «عطار» [١٦] بهۆنيتەوە، دەلين مولانا دەم و دەسـت كاغذيك كە لەناو سەربەستەكەىدا دەبێ «عەمامەكەى» دەرهيناوەو «٨» بەيتى سەرتاى « مثنوى» تيادا نووسراوە كە بەمە دەست پێدەكات:

«بشنـو أز نى چون حكـايت مكينـد تاكـو» پس سخن كوتـاه بايـد والسـلام» دەداتە دەست « حسـام الدين [١٧] .»]

ب - پەخشـان:

١ - ناميلكەيەك لە بارەى ئيسپات كردنى دروستى (رابطة)وە كە يەكێكە لە ئادابى تەريقەى نەقشبەندى، بە فارسىيە.

٢ - نامەكانى مەولەوى.

مەولەوى گەلێ نامەى پر واتاو پر سۆزى بەرامبەر شيخەكان و پيرەكان و هاورێيان و پياوماقولان و كاربەدەستان لەپاش بەجێماوە. بە ئيمزاى معدوم وەيا بە ئيمزاى عبدالرحيم الحسينى، وەيا المعدوم: عبدالرحيم هەروەكو مامۆستا مەلاعبدالكريم دەفەرموێ.. گەلێ نامەى لەپاش بەجێماوەو هەر بەوەشـا كە ئەو نامـانـە گەلێ لەوە كەمتـرن كە لەگـەل پايـەى لە گەلێ سـەرەوە بەرزى مەولەوىدا بگونجێن ديارە چەند ئەوەندە شيان فەوتاوە يا هەر هيچ نەبێ زۆريان هيشتا لەژێر بارى تۆزى گەردوون دا شاراونەتەوە.

« بۆ ئەم بابەتانە سەيرى يادى مەردانى مامۆستا مدرس بكە» مامۆستا مەلا عبدالكريم لە يادى مەردانەكەىدا سىو هەشت نامەى لە نامەكانى مەولەوى پيشان داوە كە جگە لەوانەى كە لە پيشەوە پيشانمان - دا.

كە يەكـەميـان نامـەيـەكـە بۆ «شيـخ عثمـان سراج الـدين»ە [١٨] دووەم و سێيەم بۆ «شيخ محمد بهاء الدين»ەو چوارەم بۆ « كاك ئەحمەدى شيخ»ە. بەم جۆرە بۆ هاورێىمـەلاو زانـاو پيـاومـاقـولان و بەگـزادەى جافـەكـان و، والىيەكانى سـنەو گەلێ ناسياو و هاورێىترى.

مەولەوى رۆميش وەكو لەپيشەوە پيشانمان دا بەشێ لە بەرهەمەكانى پەخشانى بريتىيە لە نامەو مكاتيب [١٩]

سەرنج:

لەم چەند لاپەرەيەدا دەمەوێ بە شيوەيەكى كورت و پوختە ئەو شوێنانە پيشان بدەم كە مەولەويى كورد ئاگاى لە مەولەويى رۆمىو شارەزاى بەرهەمەكانى بووەو تا رادەيەك لە دڵ و دەروون و بەرهەمەكانىدا رەنگىداوەتەوە.

يەكەم:

مەولـەويى خۆمـان لە سەرتـادا «تخلص»ى شيعـرى معـدوم بووەو لە زۆر پارچەى شيعرىدا دەبينرێ:

لەم قەسيـدەيـەى كە بۆ لاوانـدنـەوەى «عنبر» خاتوونى خيزانى گوتوويەتى « تەخەلوصى »ى «معدوم»ى بەكارهيناوە:

ئەدا پەشيوىى حالات جەستەم [٢٠]
دوورەن جەتەحرير خامەى شكستەم
بەلام «مەعدووم» هەرس ديدەش جۆوەردەن
ناعيلاج خامەش وەدەسگيركردەن

هەروەها لەو قەسیدەیەی کەقسە لەگەڵ شێخ «حسن سازان»ی دا دەکا . . .
دەڵێ:

مەعدووم ئانا ها جەگیان تەواسان [٢١]

کەیلەن جە خەیاڵی خاڵ خاڵ خاسان.

وەیا لەو قەسیدەیەدا کە بۆ «شێخ ضیاءالدین »ی نووسیوە لە وەرامی ئەوەدا کە ئەو چەپکەیەك وەنەوشەی بۆ ناردبوو.

شیفای ئێش و نێش ئەزامان سەخت [٢٢]

ضیای دیدەو دڵ مەعدوومی ی بەدبەخت.

هەروەها لەگەڵێ شوێنی تریش دا جگە لە نامەکانی کە هەموو بە ئیمزای «معدوومە»ە.

بەڵام دەبینین لە دوایی دا بە «مەولەوی» ناوبانگی دەرکردووەو بوو بە «تخلص»و خەڵك هەر بە «مەولەوی» یەوە دەی ناسن.

هەروەها « مەولەوی» رۆمیش بەپێی باوەری « الفت اصفهانی» «تخلص»ی «خاموش» بووە چونکە لەدوایی زوربەی غەزەلەکانی یەوە ئەم وشەیە بە شێوەیەك جێ کردوتەوە، وەیا بە شێوەی «خمش کن» یا «بس کن» [٢٣]
کەواتە هەر دوو مەولەوی لەمەدا یەك دەگرنەوە

دووەم:

که سەیری بەرهەمەکانی مەولەوی خۆمان دەکەین دەبینین لەگەڵ ئەوەش دا کە نیسبەت بە بەرهەمەکانی مەولەویی رۆمی کەمە بەڵام لە زۆر شوێن دا لەوە دەچێ ، مەولەویی خۆمان ویستویتی وەکو مەولەویی رۆمی بی‌و لەو کەمتر نەبێ. کە سەیری عەقیدەکانی دەکەین دەبینن هەمووی بریتی‌یە لە بیرو باوەری موسڵمانی‌و روون کردنەوەی. لە «العقیده المرضیة» کەی‌دا ئەم بابەتانە دەبینین کە تا رادەیەك لە رووی بابەت، وەیا ناوەرۆکەوە لە «مثنوی» یەکەی «جلال الدین رۆمی»دا هەیە وەك [٢٤]:

مبحث الصلاة والسلام ـ مبحث الایمان ـ مبحث الوجود والوجب ـ مبحث الوحدة ـ الایمان بالله ـ الأصل الاول من اصول الستە.

صفات الله ـ الحیاة والعلم . . . . هتد

هەروەها لە « العقیدة الفارسیة» کەی‌دا « الفوائح» هەمان بابەت و قسەی تی‌دایە دەربارەی بیرو باوەرو گەلێ شتی موسڵمانی [٢٥]

ئەمە جگە لە دیوانی شیعری کە لە زۆر بەیت دا رەنگ دانەوەو بۆن و واتای مەولەویی رۆمی پێوەیە، ئەگەر راستەوخۆ نەبێ. هەر دووکیان لە هەمان سەرچاوەوە وەریان گرتووە [٢٦]. ئەو سەرچاوەیەش سەرچاوە روون و پاك و بێ گەردەکەی ئیسلامە کە هەر دوو کیان باوەری تەواویان پێی هەبووە. ئەم بەیتانە ئەگەرچی کە من بەڵام رەنگ دانەوەی مەولەویی رۆمی پێوە دیارە، هیچ نەبێ لە رووی واتاو مەبەست و فەلسەفەکەیەوە.

مەولەویی رۆمی لە سەرەتای «مثنوی»یەکەی‌دا دەڵێ، وەیا بڵێین «مثنوی»یەکەی بەمە دەست پێ دەکات:

بشنو از نی چون حکایت میکند
واز جدائیها شکایت میکند

سینه خواهم شرحه شرحه از فراق
تا بگویم شرح حال درد اشتیاق.

من بهر جمعیتی نالان شدم
جفت بدحالان و خوشحالان شدم

سەیری ئەم بەیتانەی مەولەوی بکە:

خامه سراوێز نەجای سیایی [٢٧]
مەرێزۆ ئەسرین شەکوای جیایی
نامەی صەد شەکەنج وە هەم پێچ وەردەن
چون من سەرتاپاش شکستەی دەردەن

خامە: قەڵەم: هەمان نەی‌یە «نی»

وەیا دەڵێ:

خامه شەق وەردەن دەم مەکەردەوە
زارزار مەناڵو وە دەم دەردەوە

وەیا دەڵێ:

نەوای ناڵەی دڵ وێنەی صەدای نەی
پیاڵەی زوخاو مەنۆشوو چون مەی

وەیا ئەمە کە دەڵێ [٢٨]:

گرد سەرشار مەی لە قانماوە
هەر من بەستەی خاك چەم ئەو دماوە

جەو فکرەدا بیم یەك هام دەردوێم
ریزە بلووری قەدیمش دا پێم

ئاما وە جواو ریزەی قەدیم سال
بە زوبان حال فەصیح تەر جەقاڵ

وات: من سەنگێ بیم کەفتەی هەواران
بێ قەدرو قیمەت ناروای شاران

گرتم نە گەردەن بێ‌باك و شادان
بەڵای پیك سەخت کوورەی ئوستادان

وردیم جۆشم وەرد تاویامەوە
تا وە روتبەی بەرز سەرنیامەوە

مەولەوی لەم پارچەیەداو لەسەر زمانی پارچە بلوریك دەیەوێ ئەوە بڵێ کە مرۆڤ خامەو دوایی پوختە دەبێت و بە رەتبە و مقامی خۆی لە عرفان دەکات.

مەولەویی رۆمی دەڵێ[29] :

**حاصل عمرم سەسخن بیش نیست**
**خام بدەم پختە شدم سوختم**

جگە لەمانە لێرەدا دەمەوێ ئەو ئیشارەتانەی مامۆستای خوالێخۆش بوو «محی‌الدین صبری النعیمی کانیمشکانی» لە پەراوێزی «العقیدە المرضیة» کەی مەولەوی‌دا نووسیوێتی روون بکەمەوەو ببێ بە بەشێك لەوەی کە رەنگ د ئەوەی مەولەویی رۆمی لەلای مەولەویی خۆمان دەربخا لێرەدا زۆر سوپاسی خوالێ خۆش بوو «محی‌الدین صبری کانیمشکانی» دەکەم و قەبری پڕ لە نوور بێ، بۆ ئەو خزمەتەی کە کردوێتی بەرامبەر مەولەوی‌و کورد هەروەها سوپاسی بێ‌پایانم بۆ مامۆستای گەورەم «مەلا عبدالکریم ی مدرس» کە لە بەرگــی دووەمــی «یادی مەردان»ە کەی‌دا زۆر شتــی گرنـگــی دەربـارەی مەولەویی کورد کە جێی شانازی‌و مایەی سەربەرزیی هەموو کوردێکە روون کردوتەوە.

و بە پێی ریزی ئەو بەیتانەی مەولەویی خۆمان و ریزو شوێنی بەیتەکانی مەولـەویی رۆمی دەخـەمـە بەرچـاو. کە ئەمە هەروەکو کورد دەڵێ مشتێ نموونەی خەرواریکە.

لێرەدا «العقیدەالمرضیة» کەی چاپی میــسر ۱۳۵۲هـ دەکەم بە ئەساس بۆ مەولـەویی خۆمـان و هەمـان ئیمـلاو شێوە نووسینی دەیخەمە بەرچاو هەروەها «مثنوی»یەکەی چاپی نیکلسون و چاپی تاران بۆ مەولەویی رۆمی دەکەم بە ئەساس.

مەولەویی خۆمان لەژێر «مبحث الوجود والوجوب» دەڵێ:

**نە دوی انفاسم و لاسیما**
**انفاس انفس قدسی اولیا**
**حصوصاً منهم شیوخ الارشاد**
**حق برکتیان زیادکا زیاد**
**بی اوان ناوی بقول فحول**
**نەعلم و عمل نەرتبۀ وصول**
**منتهای علوم علم اوانە**
**مقتدای عمل اوان بزانە**

مەولەویی رۆمی دەڵێ:

**پیررا بگزین کە بی‌پیر این سفر**
**هست پرافت و خوف و خطر**
**ان رهی کە بارها تو رفتۀ**
**بی قلاوز اندر ان اشفتۀ**
**پس رهی‌را کە ندیدستی تو هیچ**
**هین مرو تنها ز رهبر سر مپیچ**

**گرنبا شد سایۀ او بر توگول**
**پس ترا سر گشتە دارد بانگ غول**
**(چاپی نیکلسون)**

**پیررا بگزین کە بی پیراین سفر**
**هست پر آفت و خوف و خطر**
**آن رهی کە بارهاتورفتە‌ای**
**بی قلاوز اندر آن أشفتەای**
**پس رهی راکە نرفتی تو هیچ**
**هین مرو تنهاز رهبرمپیچ**
**هر کە او بی مرشدی درراەشد**
**او زغولان گمره و در چاەشد**
**گر نباشد سایۀ پیر أي فضول**
**بس ترا سرگشتە دارد بانگ غول**
**چاپی تاران.**

لای مامۆستـا نعیمی بەیتـەکانی پاش و پێش پیشـان داوە[30] ئەمە پوختەی واتای ئەو چوار پێنج بەیتەیە بە عەرەبی:

[فاختر لك شيخاً مرشداً. فإن السـفر بدون المرشد، كثيراً.
مايكون مليئاً بالأفات والمخاوف والاخطار.
وبــدون الـدليـل، تكـون حائـراً «حتى» في الطـريق التي طرقتهـا مراراً فحاذر، ولاتمش وحيداً في الطريق التي لم ترها قط! ولاتحول وجهك عن الدليل!
فإنك ايها - الاحمق - إن لم تـستظل بظله، يجعلك صوت الغول «جزعاً» دائر الرأس]

ترجمة - مثنوى - الدكتور محمد عبدالسلام كفافي

مەولەویی خۆمان دەڵێ:

**عقیدە جکیو دلیل جە کیە**
**دلیل فقیر دارینە پیە**[31]

مەولەوی رۆمی دەڵێ:

**پای استدلالیان چوبین بود**
**پای چوبین سخت بی‌تمکین بود**

مثنوی نیکلسون
و چاپی تاران

إن هؤلاء الاستـدلاليين يسعـون على ساق خشبيـة، والساق الخشبية متعثرة واهية - ترجمة - د. محمد عبدالسلام كفافي.

مەولـەویی خۆمان لەژێر باسی «مبحث رؤية الله تعالی»دا دەڵێ:

وقوع رؤیت روژقیامت
دری بەدلیل کتاب و سنت

ارکسی پلی ناریک چادرم
[illegible]

**لەبر ليلة البدر ار دوينى**

**إلى ربها ناظره خوينى**

مەولەوى رۆمى لەژێر بابەتى [ملاقات پادشاه با آن طبيب الهى . .] دا دەڵێ :

**اى لقاى تو جواب هر سؤال**

**مشكل از توحل شودبى قيل وقال**

**ترجمان هر چه مارا در دلست**

**دستگير هر كه پايش در گل لست**

هەروەها لەژێر بابەتى (شرح آن كور دوربين . .) دا دەڵێ .

**جان جملة علمها اين است اين**

**كه بدانى من كيم دريوم دين**

خواڵێ خوش بوو «محي الـدين صبـري النعيمي الكـردي» لە پەراوێـزى ئەم باسەدا لە «العقيدة المرضية» كەیدا دەڵێ :

(١) وفي حديث مروي عن واحد وعشرين من الصحابة ان رسول الله صلى الله عليـه وسلم قال : سترون ربكم كالقمـر ليلة البـدر ولا تضـامون في رؤيته ـ اي لاتشكون فيه .

(٢) ونزل في سورة القيامة قوله تعالى «وجوه يومئذ ناضرة إلى ربها ناظرة» .

مەولەويى خۆمان لەژێر بابەتى «مبحث حضرة الرسول عليه الصلاة والسـلام» دەڵێ :

**دوم خاتم أنبيا ورسل　　خيـر المـرشدين لـخيـر السـبل**

**آخـر مؤخر أول مقدم　　ذو الغنى وذو الفقر أكمل وأتم**

مەولەويى ڕۆمى لەژێر لە بابەتى «دربيان آنكه حكما گويند آدمى عالم صغرى» لە دەفتەرى چوارەم ـ دا دەڵێ :

**مصطفى زين گفت كآدم وانبيا　　خلف من باشـند در زيرلوا**

**بهر اين فرموده است آن ذوفنون　　رمز نحن الآخرون السـابقون**

**گر بصورت من آدم زادەام　　من بمعنى جدّ جدّ افتادەام**

**كز براى من بدش سجدۀ ملك　　وز پىِ من رفت بر هفتم ملك**

**پس ز من زائير در معنى پدر　　پـس زميوەزاد در معنى شجر**

**اول فكر آخر مّد در عمل　　خاصه فكرى كو بود وصف ازل**

**(مثنوى چاپى نيكلسون»**

پوختەی واتاو مەبەستى هەر دوو مەولەوى ئەمەيە كە خواى گەورە پێش خەلقى ئادەم نورى پێغـەمبـەرى خلق كردووە . سەيـرى أ ـ السـابقـون أليك المقربون ، ئايەتى «١٠» لە سورەتى الواقعة .

ب ـ قصصى قرآن مجيد ـ نيشابورى ل٤١٠ بكە

مەولەويى خۆمان لەژێر بابەتى «الخلافة والامامة»دا دەڵێ :

**چلون فضليكى واضحة وجلى　　من كنت مولاه مولاه على**

مەولەويى ڕۆمى لەژێر بابەتى «در تفسير اين خبر كه مصطفى .

لە دەفتەرى شەشەم دا» دەڵێ !

**زين سبب پيغمبر با اجتهاد　　نام خودو اّن على مولا نهاد**

**گفت هركس رامنم مولاو دوست　　ابن عم من على مولاى اوست**

**كيـست مولا انُك آ زادت كند　　بند رقيت ز پايت بركند**

**«مثنوى چاپى نيكلسون»**

مەولەديى خۆمان لەژێر بابەتى ١ ـ «القضاء والقدر»وە لەژێر بابەتى ٢ ـ «فرق الخلق والاكتساب والارادة والقدرة[33] والاختيار»دا دەڵێ :

**١ ـ بوچ انسان هروكْ حَجَرْ دىَ قرار**

**نيوى قدرت و فعل واختيار**

**خوى مكلفة ومعاقب ومُثاب**

**له سر كردارى چاك واى خراب**

**فايده تكليفيچ هيه بزانه**

**داعى اختيار فعل انـسانه**

**٢ ـ اسناد افعال هركس بوخوى**

**ددا أبالْ خوى تماشا دكى**

**فلان تواناس اوْ ناتوانا**

**اوه دانايه اوْ يان نەدانا**

**رويم و هلسام دانيشتم بردم**

**خواردم و كُشْتم نمكرديا كردم**

مەولـەوى ڕۆمـى لەژێـر بابـەتـى «١ ـ جوب گفتـن مؤمن سنى كافـرى جبرى . . . و لەژێر بابەتى» «٢ ـ دربيان درك وجدانى چون اختيار . . » دەڵێ :

**١ ـ جمله عالم مقر در اختيار　　امر ونهى اين بيارو آن ميار**

**اوهمى گويد كه امر ونهى لاست　　اختيارى نيـست وين جمله خطاست**

**٢ ـ درك و جدانى بجاى حس بود　　هردو دريك جدول اى عم مير ود**

**نغز مى‌آيد بروكن يا مكن　　امر و نهى و ماجراى سخن**

**اينكه فردا اين كنم يا آن كنم　　اين دليل اختيارست اى صنم**

مەولـەويى خۆمـان لەژێـر بابـەتى «مبحث فرق الخلق والاكتسـاب والارادة والقدرة والاختيار»دا دەڵێ :

**وجود ممكن يكْ يك دبىكرَ　　هر يك راس خوى أمّ پرّ تا اوْپرَ**

**مسنداً عرضاً نه طولايه حق　　وسايط نيه مپْرْ لقْ أو لق**

مەولـەويى ڕۆمى لەژێـر بابـەتى «دربيـان آنكه عطاى حق قدرت او موقوف بر قابليت نسيت همچون . . . ) دەڵێ :

**تا مسبب بيند اندر لامكان　　هر زه بيند جهدو اسباب دكان**

**از مسـبب ميرسد هر خير شر　　نيـست اسباب و سائط را اثر**

مەولەويى خۆمان لەژێر هەمان بابەتى پێشوودا

**دَلى ملى نار احراق لديك　　برداً سلاماً سلام عليك**

مەولەويى ڕۆمى لەژێر بابەتى «قصة عشق صوفى بر سفرەتهى از خورش . .

دەڵێ :

گلستان باشد بر ابراهیم نار    لیک بر نمرود باشد زهرمار
برسمندر باشد آتش خاندان    لیک باشد بر دگر مرغان زیان

لێرەدا ئیشارەتە بۆ داستانی ابراهیم کە نمرود خستیە ناو ئاگرەوە بەڵام ئاگرەکە بە ئەمری خوای گەورە بۆی بوو بە گوڵ و گوڵزار.

سمنـدر: ئاگر کاری تێ ناکات. جانەوەرێکە وەکو مارمیلکەو شەوگەرد وایە لە ناو وشکـانیدا دەژی، دەڵێن هەر کاتێ بگـاتـە ئاگـر ماددەیـەك فڕێ دەدا کە ئاگرەکە خامۆش دەکات، بە واتا ئاگر بۆ سەمەندەر وەکو شوێن و ماڵی وایە، بەڵام بۆ مەلی دی زیانی هەیە. . .

مەولەوی خۆمان لەژێر هەمان بابەت دا دەڵێ :

او فعله دفعی خالق ودود    تعقیباً ذاتی تیریته وجود
بنده لویدا قوی بەمختار    بو تکلیف شرع دوی بەمدار
اکرویی او قصهٔ مذکوره    خلق فعل کردبنده مجبوره
خلاصه عادت جاریهٔ حقّه    او خلقی سبب عادی ام خلقه
تابنده بۆ طرز نکا بمختار    تکلیف شرعی لی ناکا جبّار
نشانهٔ شیوهٔ مختاری چیه    تیَسّر بو او ترك فعلیه

مەولەوی رۆمی لەژێر بابەتی «اعتراض کردن مریدان بر خلوت وزیر باردیگر» دەڵێ :

گر بپرانیم تیرآن نی زماست    ماکمان و تیراندازش خداست.
این نه جبراین معنی جبّاری است    ذکر جباری برای زاری است
زاری ماشد دلیل اضطرار    خجلت ماشد دلیل اختیار
گرنبودی اختیار این شرم چیست    وین دریغ خجلت وآزرم چیست
زجر استادان بشاگردان چراست    خاطر از تدبیرها گردان چراست

(فاذا رمینا بسهم فلیس اندفاع السهم منا، فنحن القوس، اما الذي یلقي بالسهم فهو الله.

ولیس ذلك قولاً بالجبر، وإنما هو معنی الجبروت، وذكر الجبروت (جاء) لكي نستشعر بالذلة.

وذُلّنا دلیل اضطرارنا، وأما خجلنا «من الآثام» فهو دلیل اختیارنا.

ولو لم یكن هناك اختیار، فما هذا الخجل «من الأثم»؟ وماذلك الاسف والتحرج والحیاء؟.

ولماذا یكون زجر الاساتذة للتلامیذ؟ ولماذا ینصرف الخاطر عما استقر علیه من تدبیر؟

ترجمة د. محمد عبدالسلام كفافي

مەولەوی خۆمان لەژێر بابەتی «مبحث الخاتمة بالتوبة. .» دەڵێ :

ظاهر شرعی بكَر اكردنْ    تا ام مردن تی یاخود او مردن

مەولەوی رۆمی لەژێر بابەتی «چاره اندیشیدن آن ماهی. . .» دا دەڵێ :

مرگ پیش از مرگ امنست ای فتی    اینچنین فرمود مارا مصطفی
گفت موتوا کلکم من قبل ان    یأتي الموت تموتوا بالفتن

لێرەدا هەر دووکیان ئیشارەت دەکەن بۆ فەرموودەی پێغەمبەر «ص» کە دەفەرمووێ «موتوا قبل ان تموتوا» بە واتا بمرن لەپێش مەرگ دا، مەبەستی لەوە دێ واز لە خۆپەرستی و داوا بهێنەو خۆت وەکو مردوو وابی ئازاروبێ داوا پیشان بدە (ببە)، تاکو نەجاتت بێ. مەولەوی خۆمان لەژێر هەمان بابەتی پێشوودا دەڵێ :

جی نیه جلوهٔ ذاتی بتاقی    مردل مؤمن فانی و باقی

مەولەوی رۆمی لەژێر بابەتی «دل نهادن مرد عرب بر التماس دلبر خویش. .» دا دەڵێ :

گفت پیغمبر که حق فرموده است    من نگنجم هیچ در بالاو پست
در زمین و آسمان و عرش نیز    من نگنجم این یقین دان ای عزیز
در دل مؤمن بگنجم ای عجب    گرمرا جوئی در آن دلها طلب

مثنوی چاپی نیكلسون.

بە واتا:

کە خوای گەورە فەرمـوویـەتی من نە لە باڵاو نە لە نزمی «ژێر» جێم نابێتـەوە «ناگونجێم»، نە لە زەمین و نە لە ئاسمـان و نە عەرش، . . بەڵام لەدڵی خاوەن ئیمـان دا دەگونجێم ئەگەر بۆمن دەگەڕێی، لە دڵی ئەوان دا، داوام بکە . .
ئیشـارەتـە بۆ فەرمـوودەی پێغـەمبەر «ماوسعني ارضي وسمائي ولكن وسعني قلب عبدي المؤمن التقي النقي الورع»

«حدیث قدسي»

دوا قسـە دەڵێم مەولـەوی خۆمـان جگـە لە مەولەوی رۆمی، شارەزاو ئاگای لە حافـزی شیـرازیش بووەو گەلێ ئیشـارەت هەیـە لە بەرهـەمـەکـانیدا کە ئەمە دەردەخا. ئەم بابەتە بە واتا مەولەوی و حافز دەخەینە، دووتوێی باسێکی ترەوە - خوایاربێت.

**پەراوێز و سەرچاوەکان :**

١) - أ - نالی و ئەدەبیاتی دراوسێ - رۆشنبیری نوێ - ژمارە ١٠٧ ایلول ١٩٨٥
ب - قورئان لە شیعری جزیریدا - رۆشنبیری نوێ - ژمارە ١٠٦ ١٩٨٥
٢) - سەیری:
أ «زندگانی مولانا جلال الدین محمد مشهور به مولوی - بدیع الزمان فروزانفر - تهران/ چاپ سوم - ١٣٥٤ ل٣ - ل٣٣ بکە
ب - یادنامه مولوی - علی اکبر - مشیر سلیمی - تهران - ١٣٣٧ - ل٩٣
ج - فرهنگ ادبیات فارسی دری - تهران ١٣٤٨ - زهراء خانلری ل٤٩١
د - مثنوی جلال الدین الرومي - الكتاب الاول - ترجمة وشرح ودراسة للدكتور محمد عبدالسلام كفافي - بیروت - ١٩٦٦ ل١ - ٣
هـ - نفحات الانس - لكهنو ل٤٠٩
٣) - هەمان سەرچاوەکانی ژمارە (٢):
أ - ل٣٤ - ٤٤
ب - ل٩٣
حـ ل٣

٤) ـ هەمان سەرچاوەی ژمارە (٢):
أ ـ ل٤٩
٥) ـ هەمان سەرچاوەی ژمارە (٢)
أ ـ ل٥٥ ـ ٦٣
ب ـ مثنوی معنوی ـ مولانا جلال الدین محمد بلخی رومی ـ محمد رمضانی ـ تهران چاپ دوم ـ ١٣١٥ ـ ١٣١٩ ل٩
٦) ـ مەولـەوی رۆمی یەکجـار شەمـسی خۆش ویـستووەو وەکو سەرۆکێکی گیان، رابەرێکی رۆحی‌دا ناوەو دەڵێ:

من جگویم یک رگم هشیار نیست
شرح آن باری که آنرا یارنیست

خودثنا گفتن زمن ترك ثناست
کاین دلیل هستی و هستی خطاست

شرح این هجران و این خون جگر
این زمان بگذار تا وقت دگر.

مەولـەوی خۆشمـان بە جۆری پابـەنـدو شێت و شەیـدای شێخەکانی بووەکە جاریکی شێـخ دێ بۆپرسـە بە هۆی کۆچی کورێکی مەولـەوی‌یـەوە مەولـەوی دەڵێ: خۆزگە هەموو ساڵێك کورێکم بمردایەو تا تۆ بێت و بە دیدارت شادبم.

٦) ـ سەرچاوەی ژمارە (٢)
أ ـ ل١٤٨ ـ ١٧٠
ب ـ سەرچاوەی ژمارە (٥) ب ل١٠ ـ ١١
ج ـ گنج سخن جـ٢ دکتر ذبیح اللەصفا تهران ل١٤٧ ـ ١٤٨
د ـ فرهنگ ادبیات ل٤٩١
هـ ـ مثنوی جلال الدین الرومی الکتاب الاول ـ الدکتور محمد عبدالسلام کفافی بیروت ـ ١٩٦٦ ل١٠.
٧)ـ أـ یادی مەردان بەرکی دووهەم ـ مەلا عبدالکریمی مدرس ـ بەغدا/ ١٩٨٣ ل٣٢ ـ ٣٦
ب ـ دیوانی ـ مەولەوی ـ مەلا عبدالکریمی مدرس ـ
٨)ـ مەولـەوی ـ گەلێ سەفـەری تری کردوە وەك ئەوەی چووە بۆ: سابـلاخ، بۆ کەرکـوك، بە نیـازی حەج گەیشتـۆتـە بەغـداد، بەڵام لەبەر نەخۆشی بووبێ، یا لەبـەرئـەوەی هاوڕێکـەی پارەکـانی دەبـا، ـ ناچـار مەولـەوی لە بەغـدادەوە دەگەڕێتەوە. ل٣٧٠ ـ ٣٧٥ یادی مەردان.
٩) سەیری دیوانی مەولەوی ـ ل٢٦٤ بکە (قەسیدەی (٣٠)

**رەفیق مەحرەم عیجزو سرورم**
**حەکیمەکەی ئیش زام ناسۆرم**

٩) ـ یادی مەردان ل٣٧٦
١٠) ـ تەصەووف چی‌یە ـ ئەمین شێخ علاءالدین نەقشبەندی ـ بەغدا ـ ١٩٨٥ ل٤٩٥
١١) ـ ١٢) ـ ١٣) ـ دیوان کبیر ـ
١٤) ـ أ ـ یادی مەردان ـ ل٣٦٧ ـ ٣٦٩

ب ـ العقیدة المرضیة ـ چاب میسر ـ ١٣٥٢
ح ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ ل٢٧٦ ـ ٢٨٤
١٥) ـ سنائی، حکیم ابو المجد مجدودبن آدم ـ لە شاعیرە گەورەکانی سەدەی شەشـەمـە لەپێشـا لە شاعیرانی دەربـاری غزنـویـان بووە، دوای سەفـەری بۆ خوراسان و چاوپێ کەوتنی بە «شێخە سۆفیەکان» وازی لە دەربارو پاشایان هێناو، چووە ئەڵقـەی ـ سۆفیـانـەوە. لە بەرهەمە گران بەهاکانی، الهی‌نامە ـ کە بە حدیقە الحقیقـة ـ بەناوبانگە. جگە لە دیوانی شیعروگەلێ بەرهەمی‌تر، فرهنگ أدبیات فارسی دری دکتر زهرای خانلری کیا، تهران ـ ١٣٤٨ ص٢٧٧.
١٦) ـ عطار: شیخ فریدالدین ابوحامد محمد بن ابوبکر ابراهیم بن مصطفی، لە سۆفیـە گەورەکـان و پێشـەوای شاعیـران. سوفی گـەریـانـە، لە بەرهـەمـە بە ناوبـانگـەکـانی ـ «منطق الطیـر»ە کە بریتی‌یـە لە ٤٦٠٠ بیت کە بریتی‌یـە لە معراجێك بە ناوی تەیرەوە. کە هەموویان بەدوای سیمرغ دا کە کنایەیە لە خوای گەورە ـ وا دەگـەڕێن. ـ بەشێ لە داستـانی منطق تەیـر کە حکـایـەتی شیـخ ی «صنعـانـە»، لەکـوردیشـا، لەلایەن شاعیری بەرزی کوردەوە فەقێ تەیران هەمان حیکایەت بە ناوی «شێخ ی سەنعان»ەوە هەیە بە شێوەی کرمانجی سەروو.
١٧) ـ سەرچاوەی ژمارە (٢) أ ـ ل١٥٧
١٨) ـ سەیری یادی مەردان ـ ل٤٢٤ بکە
١٩) ـ سەرچاوەی ژمارە (٢) أ ـ ل١٦٧
٢٠) ـ دیوانی مەولەوی ـ مەلا عبدالکریمی مدرس. ل٥٥
٢١) ـ دیوانی مەولەوی ـ مەلا عبدالکریمی مدرس. ل٤٣٣
٢٢) ـ دیوانی مەولەوی ـ مەلا عبدالکریمی مدرس. ل٣١٧
٢٣) ـ بۆ وێنە غەزەلی (٢٦٢٥) دەڵێ:

طفل خرد تو بتبارك برسیدی در مکتب شادی ز کجاد عبستی
خاموش، که اینها همه موقوف موقتست گردقت بدی داعیه فریاد رستی

کلیات شمس یا دیوان کبیر ـ بدیع الزمان فروز نفر تهران ـ ١٣٤٠ جـ ٦ل٥
٢٤) ـ سەیری «العقیدة المرضیة» کەی بکە.
٢٥) ـ هەمان سەرچاوەی پێشو بەشی دووەمی.
٢٤) ـ دەبێ ئەوەمـان لەبیـر نەچێ کە مەولـەوی خۆمان شـارەزای حافزی شیـرازی بووەو لە هێنـدێ شوێن دا ڕەنـگ دانـەوەی حافـز زۆر ئاشکـرایـە. سەیـری العقیدەکەی بکە ـ
٢٧) سەیری شەرحی مامۆستا مدرس بکە (دیوان مەولەوی) ل١٩٢
٢٧) ـ واتـای ئەو چەنـد بەیتـەی مەولـەوی رۆمی ئەمـەیـە کە دەڵێ بشنـوازنی ـ «استمع للناي کیف یقص حکایته. إنه یشکو آلام الفراق.
«یقول» «انني منذ قطعت من منبت الغاب، والناس رجالاً ونساء یبکون لبکائي.
إنني انشـد صدراً مزقـة الفـراق، حتی اشـرح له الم الاشـتیـاق فکل انسان اقام بعیـداا عن اصله، یظـل یبحث عن زمـان وصله لقـد اصبحت في کل مجتمـع نائحا وصرت قرینا للبائسین والسعداء.

ترجمة/ د. محمد عبدالسلام کفافی

٢٨) ـ أ ـ ديوانی مەولەوی ـ مدرس ـ ل٢٥٦
ب ـ سەرچاوەی ژمارە «١٠» ل٥٠٤
٢٩) ـ سەرچاوەی ژمارە (،) ب ل٣١
٣٠) ـ سەیری العقیدة المرضیة کە بکە ٦
٣١) ـ سەیری العقیدة المرضیەکە بکە ل٧
٣٢) لەمەولا ناوی «مبحث»ەکە دەنووسم پێویست بە ئیشارەت وژمارەی لاپەرە ناکات.
٣٣) ـ ٣٤) ـ لێرەدا ئەوە پیشان دەدات کە هەردوو مەولەوی دەربارەی بابەتی «قضا وقدر» ـ جبر واختیار، بیروڕای خۆیان پیشان داوە.
٣٥) ـ ئیشارەتە بۆ داستانی حەزرەتی ئیبراهیم کە «نمروو» خستی یە مەنجەنیقەوە «ناگرەوەو یە ئەمری خوا هیچی لێنەهات ـ «قلنایانار کونی بردا وسلاماً علی ابراهیم»
سورەتی انبیاء ئایەتی ٦٩
جگــە لەو سەرچــاوەوکتێبــانــەی لە پەراوێــزەکــان دا ناویــان هاتــووە سود لەم سەرچاوانەش وەرگیراوە،

٣٦) ـ قصص الانبیاء ـ عبدالوهاب النجار ـ بیروت لبنان
٣٧ ـ قصص قرآن مجید ـ نیشابوری ـ تهران ـ ١٣٤٧
٣٨) تفسیر ونقد وتحلیل مثنوی ـ جلال الدین محمد مولوی ـ محمد تقی جعفری ـ تهران ـ ١٣٥٤
٣٩) ـ «جەلالەدینی رۆمی و سرودنی» ـ احمد تاقانە ١٩٧٩
٤٠) ـ الادب المقارن ـ د. طەندی ـ ١٩٧٥


## ملخص البحث

# مولويان



**د. امين علي موتابجي**
**جامعة بغداد**



يقدم الباحث موضوع **التأثير والتأثر في الادب بصورة عامة، ومن ثم يعرفنا بشاعر صوفي كبير له تأثير واضح في الاداب الشرقية للشعوب لمتجاورة وشهرة شعره طبقت الافاق وترجمت قصائده الى لغات شرقية** وغربية عديدة ذلك هو محمد جلال الدين الرومي الذي يعرف بالمولوي، وقد ولد سنة ٦٠٤هـ في مدينة بلخ واستقر في مدينة قونية بتركيا الحالية وتوفي ودفن فيها فتلقب بالرومي. وكان والده «بهاء ولد» **من شيوخ التصوف الكبار زار بغداد وتوجه مع اسرته الى المكة المكرمة وعن طريق الشام قصد تركيا** حيث سكن مدينة قونية واشتغل بالوعظ **والارشاد ونشر الطريقة الصوفية.**

**واخذ جلال الدين العلوم** عن والده وعن علماء حلب والشام ومن ثم **انخرط في سلك التصوف حتى** وصل الى المرتبة العليا من العرفان **واشتهر عدا التصوف بشعره.** ومن مؤلفاته الشعرية:

١ ـ **ديوان الغزليات: ويحتوي** على ما يقارب الـ(٤٠٠٠٠) بيت.

٢ ـ **المثنويات: وفيها** شرح لاسرار التصوف ومبادىء الدين ويربو عدد **ابياتها ٢٥٦٣٢ بيتا.**

٣ ـ **الرباعيات: التي** يصل عدد ابياتها الى ٣٣١٨ بيت.

**واشتهر في محافظة السليمانية**، في القرن التاسع عشر، شاعر صوفي لاتقل منزلته في قلوب قراء اشعاره الكردية عن منزلة جلال الدين الرومي المولوي، حتى اطلقوا عليه مجازا لقب المولوي، فعرف هو الاخر بالمولوي ايضا. واسمه السيد عبد الرحيم ابن الملا سعيد ولد سنة ١٢٢١هـ في قرية (سەرشاتە) بناحية (تاوەگوز) ويرتقي نسبه الى العالم المشهور ذي التآليف الكثيرة في العلوم الدينية الملا ابوبكر چوري المشهور بالمصنف.

اخذ العلوم في مدارس خورمال و سنه وبانه والسليمانية. حيث اجازه الملا عبدالرحمن النودشي مدرس جامع ملكندي **في السليمانية فاشتغل** بالتدريس والوعظ والارشاد وقد اخذ **الطريقة النقشبندية من الشيخ** عثمان سراج الدين وظل متعلقا بحبه وحب ابنه **من بعده الشيخ** بهاءالدين. وقد فجر التصوف في شعره **العاطفة الرقيقة والاحساس** المرهف والوجدان الصافي. وله منظومات واراجيز **في العقيدة واصول** الدين. ومن مؤلفاته ديوان شعر ورسالة بأسم العقيدة المرضية، واخرى بأسم الفضيلة، ورسائل اخرى.

وقد أشار الباحث الى نقاط التشابه والالتقاء بين مضامين اشعار المولويين وبين انعكاس بعض اراء المولوي الرومي في بعض قصائد عبد الرحيم والى تأثر الاخير به، ولايستغرب حدوث هذا التأثير ولاسيما ان شعرهما ينبع من معين التصوف وان عقيدة الاسلام واصول الدين الحنيف تشكلان اسس ثقافتهما وعلومهما. هذا واورد الباحث شواهد كثيرة من شعرهما وقارن بينهما وبيّن نوع التأثير والتأثر، وشرح معانيها ومدلولاتها.

# گۆران و گۆڵدسمث و تازەکردنەوە لە هۆنراوەدا

د. عبدالله دەباغ
کۆلێجی ئەدەبیات / زانکۆی سەلاحەددین

## پێشەکی

کاریگـەریی ئەدەبی ئینگلیـزی لە شیعـری گۆران دا شتێکی دیـارە، بەتـایبـەتی چونکـە گۆران خۆی، ڕاسـتەوخـۆ، دەست نیشـانی ئەو هۆنـراوە ئینگلیزیانەی کردووە کە سەرچاوەی بیری هێندێك لە هەڵبەستەکانی خۆی بوون. لە پێش هەمـوویـان دا هەڵبـەستـە لیـریکـەکـانی شاعیرە ڕۆمانسی‌یە ئینگلیزەکانن کە دەورێکی گەورەیان هەبوو لەو تازەکردنەوەیەی کە گۆران لە شیعـری کوردی‌دا کردوویـەتی، هەروەهـا لەو ڕێـرەوە ڕۆمـانسیـانـەی هەڵبـەستـەکـانی گۆران دا، بەتـایبـەتی هەڵبـەستی کوردیش بە گشتی، لە ساڵانی نێوان دوو جەنگە جیهانی‌یەکەدا، تەنانەت کاتێ گۆران دەکەوێتە ژێر کاریگەریی بەرهەمی ئەدەبی ئینگلیزیی دەرەوەی سەردەمی ڕۆمانسی‌یەوە، بۆ وێنە هەڵبەستە بەناوبانگەکەی ڕۆبرت هێریك: (گوڵە نێرگزەکان) (Daffodils) کە دەگـەڕێتـەوە بۆ سـەدەی حەڤـدەهـەم یاخـود چیـرۆکـە کورتە ڕەمزی‌یەکەی ئۆسکار وایڵد، (بولبول و گوڵ) (The Nightingale and the Rose) کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی دوواتر، گۆران لەو بەرهەمانەدا بەتەواوی ئەو توخمە ڕۆمانسیانەی لەگەڵ بۆچوونە گشتی‌یەکەی‌دا دەگونجێن وەردەگرێت و دەیان کات بە بەشێك لەو قاڵبـە ڕۆمـانسیـانـەی کە دروستی دەکـات بۆ بزووتنـەوەی تازەکـردنەوە لە شیعری کوردی‌دا بە تێکرا.

لەوانـەیـە وتـارەکـەی عومـەر مەعروف بەرزنجی [١] فراوانترین شت بێ تا ئێستا دەربارەی کاریگەریی ئەدەبی ئینگلیزی لە گۆران نووسرابێ و نووسەر لە زۆربەی سەرنجەکانی‌دا ئەوەندە ڕاسـت بۆ مەسەلەکە چووە کە وامان لێ بکات بڵێین هیـچ شتێکی تری وا نەمـاوە لەم بابـەتـەوە بووترێ. بەڵام، هەر وەکو نووسەر خۆی دەڵێ، وتارەکە لە ڕاستی‌دا نزیکترە لە سەرەتای لێکۆڵینەوەیەکی گەورەتـر بۆ هەمـوو کارتێکـردن و ڕەنگـدانـەوەی ئەدەبی جیهـانی لە شیعـری گۆران دا. بەڵکـو تەنـانـەت کە باس تەنهـا لە ئەدەبی ئینگلیـزی دەکرێت پێم وایـە بۆ لێکـۆڵینـەوە لەو پێـوەندی‌یە مەیدانێکی فراوانتر هەیە بەتایبەتی ئەو هۆنـراوانـەی ئەو پێـوەنـدی‌یـەیـان تێ‌دا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەرناکەوێت و بەشێکی ئەو مەسەلەشە کە ئێمە لەم لێکۆڵینـەوەیەدا دەمانەوێ باسی بکەین.

چونکـە بە ڕاستی شتێکی سەرنـج ڕاکێشـە کەوا ئەو هەڵبـەستانەی گۆران تێ‌یـان دا کەوتـوتـە ژێـر کارتێکـردنی بیـر یاخـود چوارچێـوە گشتی‌یـەکـەی هەڵبـەستێکی ئەدەبی ئینگلیـزی هۆنـراوەی گرنگتـرو کارتێکـەرتـرن لەوانـەی بەتـەوا وەتی وەری‌گـرتـوون، بەو ڕادەیـەی پێـویستـە پێیان بووترێ وەرگێرانی شیعـری نەك هۆنـراوەی ڕەسـەن. لە ڕاستیش دا تەنهـا نمـوونـەی ئەو جۆرە وەرگرتنە هەڵبەستی (بۆ گوڵی لاولاو)ە کە دەتوانرێ پێی بووترێ وەرگێرانێکی سەربـەخـۆی هەڵبـەستـەکـەی ڕۆبـرت هێریك کە لە پێش دا باسمان کرد. لەوانـەیـە ئەو خۆبـەستنـەوە تەسکـە بە بیرو تەکنیکی هەڵبەستە ئینگلیزی‌یەکە یەکێك لەو هۆیانە بێت کە هەڵبەستەکەی گۆران دەخاتە ناو چوارچێوەیەکی کلاسیکی‌یەوە لە ڕووی کێشی شیعری‌و لە ڕووی وشەوە. هەروەها ڕێگای ئەو تاقی‌کردنەوەو ئەو تازەکردنەوەیەی گرتبوویە بەر لە هەڵبەستەکانی تری‌دا لێ بگرێت.

دەتـوانـرێ ئەو هەڵبـەستـە لەگـەڵ هەڵبـەستە بەناوبانگەکەی گۆران دا (بۆ بلبـل)، کە گۆران خۆی دەڵێت سەرچـاوەی ئیلهـامـەکـەی هەڵبـەستی (بـۆ کلاوکـورە) (To a skylark) ی شاعیـری ڕۆمـانسی ئینگلیـزی شێلی‌یـە بەراورد بکـرێت. لێـرەدا هەڵبـەستێکمـان لەبـەر دەست دایـە کە بە شێـوازە تازەکەی هەڵبـەستی ڕۆمـانسی کوردی لە ڕووی کێش و لە ڕووی وشـەوە نوێنـراوەو کاکڵەی ڕێرەوی ڕۆمانسی لە ئەدەب دا تێ‌دا دەدۆزرێتەوە (ئەوەش دەربڕینی ناکـۆکیـەکـانی ژیـان و هەستکـردن بەو ناکـۆکیـانـەیـە، هەروەها پرسیارێکی ئازاراوی‌یـە دەربـارەی چۆنیـەتی دۆزینـەوەی چارەسـەری ئەو ناکـۆکیانە بەبێ

دۆزینەوەی ڕێگایەك بۆ گەیشتن بەو چارەسەرییە). [2] ئەوهەڵبەستە بەهیچ شتێك قەرزارباری شێلی نییە جگە لەو ڕێرەوە ڕۆمانسییە گشتییە نەبێ کە هەر یەکێـك لەو دوو شاعیـرانـە بە شێـوەی تایبـەتی خۆی دەریدەبـڕێت. دەتوانرێ هەمان شتیش دەربارەی چیرۆکەکەی ئۆسکار وایلد کە باسمان کرد بگوترێت. لەو چیرۆکەدا گۆران هەڵبەستی (گوڵی خوێناوی) دروست کرد کە لە ڕووی شێوەو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دەچێتەوە سەر دونیایەکی زۆر جیا لە دونیای ئەو چیرۆکەو بۆ هیچ شتێك قەرزارباری نییە تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە سەرچاوەی ئیلهامی گۆران بووەو وەکو گڕێك خەیاڵی گۆرانی داگیرساندوەو پاڵی پێوەناوە بۆ دروستکردنی هۆنراوەیەکی کوردی ڕەسەن.

من لەو بڕوایـە دام کە پێـوەنـدییـەکی لەم جۆرە لەنێـوان هەڵبەستی گولد سمـث، (دێی وێـران) (The Deserted Village) ، و (گـەشـت لە هەورامـانـەکەی گۆران دا هەیە کە تا ئێـستا کەس باسی نەکردوە. بەڵام پێش ئەوەی بچینە ناو بەراووردکردنی ئەو دوو هەڵبەستە پێویستە یەکەم جار خوێندەر بە گۆڵدسمث و بە هەڵبەستی، (دێی وێران)، بناسێنین.

## ئۆلیڤەر گۆڵدسمث و (دێی وێران)

ئۆلیڤـەر گۆڵـدسمث یەکێکـە لە نووسـەرە مەزنـەکانی ئەدەبی ئینگلیزی لە سەدەی هەژدەهـەم دا و لە هەمـوو سەردەمێـك دا. گۆڵـدسمث بە ئەصـل ئیرلـەنـدی بوو و بە هەژاری ژیـاو بە هەژاری مرد لە تەمـەنێك دا کە چل و شەش ساڵ زیـاتـر تێپـەر نەبـوو بوو. هەرچـەندە بەرهەمە ئەدەبییەکەی هەرە گەورە نییـە بەڵام بەوەدا دیـارە کە هەمـە جۆرە چونکـە گۆڵـدسمث هۆنراوەو ڕۆمان و شانۆگەرییو وتاری نووسیوەو لە هەموو لەو مەیدانانەدا پێشڕەو بووە.

شانۆگەرییەکەی بەناوی، (خۆی بچووك دەکاتەوە تا سەرکەوێ) (she stoops to conquer) ، بە یەکێـك لە شـاکـارەکـانی کۆمیـدیای ئینگلیزی دەژمێردرێت و ڕۆمـانـەکـەش، (قـەشـەی وەیکفیلد) (The Vicar of Wakefield) ، بە یەکێـك لە ڕۆمـانـە سەرەکییـەکـانی سەدەی هەژدەهـەم دەژمێـردرێت و کاریگـەریی لە ڕۆمانی ئینگلیزییو ڕۆمانی ئەورووپادا بەگشتی لە هەموو ڕۆمانەکانی سەردەمی خۆی زیاتر بووە. ئەو کۆمەڵە وتارانەش کە لە ژێر ناونیشانی، (هاو وڵاتیەکی جیهان)دا (A Citizen of The World) ، و لەسەر زاری چینییەك کە بۆ یەکەم جار هاتۆتە بەریتانیاو سەرنجەکان و ڕوونکردنەوەکانی خۆی دەربارەی ئەم کۆمەڵەی لای ئەو سەیرە بە شێوەی نامە بۆ چین تۆمار دەکات، کارێکی پێشڕەوە لە ڕووی فۆرم و لە ڕووی ناوەڕۆکـەوە لەوێدا گۆڵـدسـمـث ئەو چوارچێوە ڕۆژهەڵاتییە بەکار دەهێنێت بۆ ئاراستەکردنی ڕەخنەیەکی واقیعی گاڵتـەکـەرو بۆ دروستکـردنی فۆرمێکی ئەدەبی تازە کە لە دواییدا هێنـدێك دەنگدانەوەی بەناوبانگی لە ئەدەبی ئەورووپادا دەبێت. لە کۆتاییدا هەڵبەستی (دێ وێـران) مان هەیـە کە بە بەڵگـەیـەکی کۆمـەڵایـەتی گرنگ و وێنەیەکی ئەدەبی واقیعی بێ هاوتا لە ئەدەبی کلاسیکی ئەو سەردەمەی ئینگلستان دا بەتایبەتییو ئەورووپادا بە شێوەیەکی گشتی دەژمێردرێت.

(دێ وێران) هەڵبەستێکی مام ناوەندییە لە درێژییداو بە ژمارە (٤٣٠) دێـڕەو بەو فۆرمـە نووسـراوە کە پێی دەووتـرێت دوودێری قارەمانێتی (heroic couplets) دوو دێـڕی بە هەمـان سەرواو هەمـان کێشی پێنـج بڕگـەیی (iambic pentameter) نووسـراوە ـ کە لە هەڵبـەستی کلاسیکی ئینگلیـزیی سەدەی هەژدەهـەم دا باوبـووە، هەرچـەنـدە گۆڵـدسمث جۆرێکی زۆر کراوەتـرو سروشتیتری ئەو فۆرمە بەکار دەهێنێت لەوەی کە لە نموونە کلاسیکییەکانی هۆنراوەکانی ئەلیکساندەر پۆپ دا دەیبینین.

لە ناوەڕۆکیش دا ئەم هەڵبـەستـە زۆر جیـاوازە لە هەڵبـەستـە کلاسیکییـە ئینگلیزییەکانی تری ئەو سەردەمە کە بە گشتی داشۆرێن یاخود هەڵبەستی فەلسـەفی بوون. لێرە بەرهەمێکمان لەبەر دەستایە کە لایەنێکی کۆمەڵایەتی واقیعیو بێوێنەی ئەدەبی ئەو سەردەمەی پێوە دیارە. هەڵبەستەکە ئاراستەکراوە دژی بە زۆر بێ چۆڵ کردنی دێهات و دژی ئەو ئازارو تەنگە و چەڵەمەیەی ئەوەی ئەوسا پێی دەوترا یاسای پەرژین کردنی زەوی (Land Enclosure Act) کە هەوڵی دەدا جووتیار لە لادێکان دا دەربکات و پاڵیان

پێوەبنێت ئیش لەو کارگە تازانەدا بکەن کە نەخشەیان بۆ ئەوە دەکێشا کە لە مەودووا بە دەوری (شۆڕشی پیشەسازی) بە ناوبانگەو زەویی کشتوکاڵ بکات بە لەوەڕ بۆ ئەو مەڕو ماڵاتانەی خورییەکانیان بە کەڵکی کارگەکانی چنین دەهات.

مەبـەستـە کۆمـەڵایـەتییـەکـەی گۆڵـدسمث لە هەمـان کات دا لەوەدا دەردەکەوێت کە هێرش دەباتە سەر کۆبوونەوەی سامانێکی هەرەزۆر لە دەست ژمـارەیـەکی کەم لە خەڵکیو بڵاوبـوونـەوەی هەوڵـدان بە دووای سامـان و ڕابواردن شان بە شانی ئەو هەژارییو زۆر داماوییەی خەڵکی دێهات تێدا دەژیان لە دوایی ڕووخاندنی ژیانە ساکار و بێدەنگ و بەختیارەکەی جارانیان

هەروەها هەمان مەبەستیش لەو پێشەکییە کورتەی گۆڵدسمث دا ئاراستەی وێنـەکێشی بەنـاوبـانگی ئینگلیـزی سێـر جۆشـوا ڕێنـولـدزی دەکـات و دەردەکـەوێت، چونکـە لەوێدا گۆڵـدسمث، بۆ بەرپـەرچ دانـەوەی هەمـوو نارەزاییـەك کە خۆی یاخـود یەکێـك لە هاوڕێکـانیـان دەربـارەی ڕاستی ڕووداوەکـانی هەڵبـەستـەکـە هەیبێت، دەڵێت کەوا خۆی «ئـەوەی پێی کرابێ کردوویـەتیو هەمـوو ئازارێکی کێشـاوە، لە و چوار پێنـج ساڵـەی گەڕان بە لادێدا بۆ ئەوەی بە تەواوی دڵنیـا بێ لەو شتـانـەی کە دەیڵێت و بە ڕاستی هەمـوو لێکـۆڵینـەوەکـانی دەیگەیەننە ئەو قەناعەتەی کەوا هەموو ئەو هەژارییو کەساسییەی هەوڵ دەدات باسیان بکات لە هەڵبەستەکەدا ڕاستن». [3] لە کۆتایی ئەو پێشەکییەدا گۆڵدسمث دەڵێت کەوا لە هەمان کات دا کە خەفەت بۆ چۆڵ کردنی دێهـات دەخـوات زۆر بە تونـدی دژی پەرەسـەنـدنی سامـان بەدەسـت هێندێك کەسەوە دەوستێت و ئەوە بە مەترسییەك و زیانێکی گەورە بۆ وڵات دادەنێت چونکە ئەو جۆرە دەوڵەمەندییو ڕابواردنە هەمیشە یەکێك لەو هۆیانە بووە کە وڵاتانیان لاواز کردووە و ڕووخاندوویانە. ئەمانە هێندێك لە دێرە نموونەییەکانی هەڵبەستەکەن:

**«ئۆبێرن»ی شیرین ... ـی جوانترین دێی ئەو ناوچەیە،[١]**
**خێراتی تۆ جووتیاری ڕەنج دەری بەختەوەر کردبوو و**
**بەهار بە زەردەخەنەیەکەوە یەکسەر بۆ لات،**
**دەهات و گوڵەکانی هاوین ماوەیەکی تر لات دەمانەوە پێش ڕۆیشتنیان.**

*   *   *

**چەند جار لەناو زەویی سەوزەکەت دا پیاسەم کردووە،[٧]**
**ئەو زەوی‌یەی ساکاری‌و بەختیاری هەموو لایەکی گرتبۆوە.**
**چەند جار نزیك هەموو دیمەنێکی ڕەنگین وەستاوم**
**ئایا هی خانوویەکی دڵگیر یاخود زەوی‌یەکی کێڵراو بێت،**
**یاخود ڕووبارێکی نەوەستاو یان ئاشێکی چالاك،**
**یان کڵێسەیەکی پاك بەسەر زوورگێکی نزیکەوە،**
**یان ئەو دار گوێژەی سێبەر دەکات بۆ**
**پشوودانی پیران و گفت وگۆی دڵداران.**

*   *   *

**ئەی گونـدی شیـریـن و دەم بە پێکـەنیـن، ئەی جوانـتـریـن دێی ئەم سەوزاییە،[٣٥]**
**خۆشی جێ هێشتی‌و هەموو قەشەنگیت کشاوە پاش**
**لەناو خانووە هێمنەکانت دا دەستی زۆردار درێژ بوو و**
**ماڵ وێرانی کەساسی دەبارێنی بەسەر هەموو لایەك دا.**

*   *   *

**لەناو ڕووبارە ڕوونەکەت دا ئیتر تیشکی ڕۆژ ڕەنگ ناداتەوە،[٤١]**
**قامیش خنکاندوویەتی‌و دڕك و گیا ڕێگای لێ‌گرتووە.**

*   *   *

**خانووەکانت هەموو ڕووخان و بوون بە وێرانە،[٤٦]**
**گیای درێژیش بەسەر دیوارە ڕووخاوەکانت دا سەرکەوتوون،**
**ئەوە تۆش دەلەرزیت و بچووك دەبیتەوە لەژێر دەستی زۆرداردا**
**مناڵەکانیشت لە دووری دوورەوە زەوی جێ‌دەهێڵن.**

*   *   *

**چەند ڕەشە چارەنووسی ئەو زەوی‌یەو چەند زوو دەبێتە کوشتەی دەرد[٥١]**
**کاتێ کە سامان کۆدەبێتەوە و مرۆڤ دەپووکێتەوە،**
**چونکە میرو پاشا بەرز دەبنەوە یان کزدەبن**
**بە ساتێك دروست دەبن و بە ساتێك دەگۆڕێن،**
**بەڵام جووتیاری قارەمان، جێگای شانازیی وڵات**
**ئەگەر هاتوو شکێنرا هیچ کەسێك جێگای ناگرێتەوە**
**سەردەمێك هەبوو پێش ئەوەی ئەو کارەساتەی ئینگلستان دەست پێ‌بکا[٥٦]**
**کە هەر پارچە زەوی‌یەك خاوەنەکەی خۆی دەژیاندو**
**هەموو خێراتی خۆی پێشکەش دەکرد لەبری کارێکی سووك و**
**ئەوەی پێ‌دەدا کە بەسی بێ بۆ ژیان و هیچی تر.**
**ئەو کاتەی پاکی‌و لەش ساغی چاکترین هاوڕێی بوون و**
**دووری لە سامان لە دونیادا تاقە سامانی بوو.**

*   *   *

**بەڵام زەمان گۆڕراو کاروانی بازرگانی بێ بەزەیی‌یە،[٦٣]**
**زەوی زەوت دەکات و جووتیار دەردەکات و**
**لەو هەردانەی پڕبوون لە خانوو**
**کۆشك و تەلاری سامان و ڕابواردنی پیاوکوژ دەردەکەون،**
**چونکە هەموو نەبوونی‌یەك بە سامان و ڕابواردنەوە بەستراوەو**
**هەموو ئازارێکی ئەنجامی چەوسانەوە بێت بەستراوە بە**
**فیزو لووت بەرزی‌یەوە.**

کەواتـە ئەو هەڵبـەستـە پەرەسـەندنێك و تازەکـردنـەوەیـەکی ئەوەیـە کە پێی‌دەووترێ هەڵبـەستی شوانـان یاخـود هەڵبەستی لادێ (pastoral) لە ئەدەبی ئینگلیزی‌دا بەتایبەتی و ئەدەبی ئەورووپادا بە گشتی. مەبەستی سەرەکی ئەو جۆرە هۆنـراوانـە هەڵـدان بوو بە جوانی‌و هێمنیی لادێ‌و بە ساکـاریی ژیـانی لادێ‌دا بە شێوەیەك کە وێنەیەکی ئیدیالی‌و زۆر جار دوور لە واقیعیان لە کاتی ئەو پیاهەڵدانەدا بۆ دروست دەکرد. بەڵام گۆڵدسمث ئەو وێنە ئیدیالی‌یە بەو واقیعـە تاڵـە ئازاراوی‌یـەی لادێ تێ‌دا دەژیـا دەبەستێتەوەو لایەنێکی واقیعی دەخـاتـە ناو هەڵبـەسـتـەکـەی کە، وەکـو لە پێش دا ووتمـان، لە هەمـوو هەڵبەستەکانی تری سەردەمی خۆی جیای دەکاتەوە. گۆڵدسمث بە تەواوی لە بەرزکـردنـەوەی ناوەڕۆکی هەڵبەستەکەی‌دا بۆ سـەرووی ناوەڕۆك و کەلەپووری هۆنراوەی شوانان و هۆنراوی لادێی کلاسیکی‌و گەیشتنی بە شەپۆلی ئەدەبی واقیعی کە، وەکو قۆناغێکی ئەدەبی دیاریکراو، هێشتا نزیکەی سەدو پەنجا ساڵ لەوەوە دوور بوو، سەرکـەوتـووە، ئەمـە لە هەمـان کات دا کە لە ڕووی فۆرمەوە لە چوارچێوەی کێش و سەرواو دارشتنی هۆنراوەی کلاسیکی دەرناچێت.

کەواتە لە هەڵبەستی دێی وێران دا زۆر وێنەی شیعری هەن کە واقیع و خەیـاڵ بە یەکـەوە دەبـەستنـەوە لەکـاتی باس کردنی ژیـانی لادێ، هێمنی ساکاری جوان دا، پێش ئەوەی ئەو کارەساتانەی گۆڵدسمث لە دێرەکانی‌تردا باسیان دەکات بەسەردا بێن. دەبینین یەکێك لە خاڵە دیارەکانی، هێزی ئەو هۆنـراوەیـە، بەستـنـەوەی کارتێکـەرەکـەیـەتی لە نێوان وێنەی ڕابردوو و وێنەی ئێـسـتـادا لە هەمـان کۆمـەڵـە دێـردا و بە جۆرێـکی بەردەوام لە هەمـوو هەڵبەستەکەدا. لەو وێنە سەرکەوتووە کارتێکەرانە جگە لە دەیان دێری تری گۆڵدسمث تیایاندا باسی دیمەن و خانووەکان و جۆری ژیانی لادێ دەکات، وەسفی قەشەو مامۆستای قوتابخانەی دێیە کە ئەو دێرانەی خوارەوەم لێ هەڵ بژاردوون:

**لە کڵێـە بە وێڵ و لەسەرخۆو بێ‌فیز، (١٧٧)**
**دیمەنی قەشە ئەو جێگا پیرۆزەی ڕازاندبۆوەو**
**بە هێزێکی کاریگەرەوە ئەو ڕاستی‌یەی لەدەمی دەردەچوو زاڵ دەبوو.**
**تەنانەت پیاوە گێلەکانی هاتبوون بۆ گاڵتەپێ‌کردن بۆ نوێژ دەمانەوە.**

**ـمیش هەموو نوێژەکان دا لە دەوروبەری ئەو پیاوە چاکە زۆر**
**ـەگەرمی‌یەوە، بێ‌پشوو هەموو جووتیارێکی سەرراست کۆدەبۆوە**
**تەنانەت منداڵەکانیش بۆ ئەوەی بەشداری زەردەخەنەی ئەو پیاوە چاکە بن**
**ئەو زەردەخەنەی هەمیشە بەزەیی‌یەکی باوکانەی تێدا هەبوو،**
**چونکە خۆشی ئەوان دڵشادی دەکردو ئازاریشیان برینداری دەکرد،**
**ـن و خۆشەویستی‌و ئازارەکانی هەموو بۆ ئەوان بوو**
**هەرچەند بیرە قووڵەکانی هەر بەرەو ئاسمان دەڕۆیشتن.**
**وەکو بەردێکی بڵند کە دیمەنە بەسامەکەی دیارەو**
**بەسەر دۆڵەکەدا بەرز دەبێتەوەو سەیری گەرداوەکەی خوارەوە دەکات**
**ـیشکی هەتاوی ئەمر هەمیشە بەسەر سەری دادەبێت.**

* * *

**ـە دێ‌دا لە بارەگا بەدەنگەکەی خۆی زۆرزانانە، (۱۹۳)**
**مامۆستا قوتابخانە بچووکەکەی خۆی بەڕێوە دەبرد.**
**کابرایەکی توندو بەدیمەن ترسێنەریش بوو،**
**چاکم دەناسی، چۆن هەموو کەسێك دەیناسی،**
**زۆر لەوانەی لێی دەترسان فێربووبوون وێنەی**
**گیروگرفتەکانی ئەو ڕۆژە لە خەتی دەم وچاوی بیانیانی بخوێننەوە**
**پڕ بە دەم و بێ‌ترس لەگەڵ قسەخۆشەکانی**
**پێ‌دەکەنین، ئەو قسە خۆشانەی زۆری لێ‌یان هەبوو و**
**هەروەها بە هێواشی‌و بە چپە دەدوان.**
**کاتێ کە نیشانەی هەواڵێکی ناخۆشی لە دەم و چاوی‌دا دیاردەبوو.**
**لەگەڵ ئەوەش دا بەرەحم بوو، هەرچەند هێندێك جار توند بوو**
**چونکە زانستی خۆش دەویست،**
**هەموو دێ‌یەکە باسی زانینی ئەویان دەکرد،**
**گومان نەبوو کەوا نووسین و حیسابی هەبوو و**
**دەشی‌توانی زەوی بپێوێ‌و لە کشتوکاڵ دا سەر دەرهێنێ**
**لەمشت و مڕدا قەشە دان بە توانای ئەودا دەناو**
**چونکە تەنانەت لە کاتی دۆڕانیش دا دەیزانی چۆن ڕا دەربڕێ‌و**
**وشە درێژو دەنگدارەکانی**
**سەری ئەو جووتیارانەی لە دەوری‌دا کۆبوونەوە دەسووڕماند**
**هەرچەند زیاتر سەیریان دەکرد ئەوەندە زیاتر سەریان سووڕدەما**
**چۆن سەرێکی ئەوەندە بچووك دەیتوانی ئەوەندە شتە هەڵ بگرێتەوە.**
**بەڵام هەموو ناوبانگەکەی ئێستا کۆتایی پێ‌هات ـ چونکە ئەو جێگایە خۆی**
**کە تێ‌دا چەند جار سەرکەوتوو بۆ ئێستا لە بیرکراوە.**

# گەشت لە هەورامان

(گەشت لە هەورامان)ی گۆران بریتی‌یە لە (۱۲٤) دێری دابەشکراو بەسەر (٥٢) دوو دێری بە کێشی پێنج برگە نووسراودا. کەواتە وەکو (دێی ویران)ەکەی گۆڵدسمث هەڵبەستێکی مام ناوەندی‌یە لە درێژایی‌داو بە هەمان فۆرمی شیعری‌و هەمان کێش نووسراوە. هەڵبەستەکە، هەروەکو شاعیر خۆی لە پێشەکی‌یەکەی‌دا دەڵێت (٤)، ئەنجامی تاقە گەشتێك نی‌یە بەڵام لە تێکەڵاوبوون و «خولاصەی هەموو ئینطباعاتی «گەشتەکانی پێشووی شاعیر لەگەڵ کاری ئەو سەردانەی داوییەی بۆ ناوچەی هەورامان هاتۆتە دی. هەڵبەستەکە بریتی‌یە لە دە بەش و هەر بەشێك هەشت تا شانزە دێری تێ‌دا هەیەو باسی ئەمانەی خوارەوە دەکەن:

۱ ـ دیمەنی ڕێگاو بان، ۲ ـ ڕێگای ناوباخ، ۳ ـ دێ، ٤ ـ ژینی دیوەخان، ٥ ـ مەلای دیوەخان، ٦ ـ بەیان، ۷ ـ مزگەوت، ۸ ـ کانیی ژنان، ۹ ـ ژن ۱۰ ـ گۆرانی.

باشترین پێناس بۆ ئەو شێوازەی ئەو هەڵبەستەی پێ‌نووسراوە ئەوەیە کە تێکەڵاوکردنێکی هونەریی ڕەنگین (رائع)ی واقیعیەت و ڕۆمانسیەتە لە وەسفی ژیانی جوان و هێمن و ساکاری لادێ‌دا. هەموو وێنەیەك لەو وێنانەی کە گۆران پێشکەشیان دەکات وێنەیەکی ڕاستەقینەی واقیعی لادێی کوردەواری‌یەو بە پەرێکی ئیدیالی دروست کراوە وەکو ئەوەی پوختە (خلاصە)یەکی نموونەیی بێت کە ژوور واقیع دەکەوێت بە جۆرە (سیحرێك) کە خۆی کاکڵەی شێوازی ڕۆمانسی‌یە.

کەواتە گۆران وەکو گۆڵدسمث لە چوارچێوەی هەڵبەستی کلاسیکی‌دا لە وەسف دا (وە لە وەسفی سروشت دا بەتایبەتی) دەردەچێت و بە هەنگاوی گەورەوە بەرەو ڕیالیزمی ئەدەبی دەڕوات. هەروەها جیاوازی لە نێوان ئەو دوو شاعیرانە لەوە دایە کە گۆران وێنە واقیعیەکانی خۆی لەناو چوار چێوەیەکی ڕۆمانسی پێگەیشتوودا دروست دەکات، بەڵام گۆڵدسمث لەو چوارچێوە کلاسیکی‌یە دەرناچێت و لە کۆتایی‌دا تەنها وەکو ڕێگا خۆشکەرێك بۆ ڕۆمانسیەت دەمێنێتەوە. ئەو ڕۆمانسیەتەی شاعیرانی وەکو وردزوورث و شێلی‌و کیتس، لە دووای گۆڵدسمث بە دەیان ساڵ، چوارچێوە پێگەیشتووەکەیان بۆ دروست کرد.

کەواتە لە وانەیە (دێی ویران) سەرچاوەی ئیلهامی (گەشت لە هەورامان)ەکەی گۆران بێت هەر وەکو چۆن (بۆ کلاوکوورە)کەی شێلی سەرچاوەی ئیلهامی (بۆ بلبل)ی گۆران بوو، لەوانەشە مەسەلەکە تەنها ڕێکەوت بێت بەڵام لە هەر دوو حاڵەت دا خاڵە سەرەکی‌یەکە لەوەدا نی‌یە کە گۆران هەڵبەستەکەی گۆڵدسمتی خوێندبێتەوە بەڵکو لە ڕادەی کارتێکردنی ئەو هەڵبەستەش دا نی‌یە، هەرچەندە شتێکی چاکە لەو مەسەلانە تا بتوانرێ دڵنیا بین. بەڵام ئەوەی بە ڕاستی پێویستە بایەخی پێ‌بدرێت دەرچوونی ناوەڕۆکە تازەکانی ئەو دوو هەڵبەستەیە لە چوارچێوەو فۆرمە شیعری‌یە کۆنەکان و ئەو واتا قووڵانەیە کە توانای ڕێرەوی واقیعی ئەو دوو هەڵبەستە دەردەخات لە بزووتنەوەی تازەکردنەوەی شیعردا.

لە وێنە واقیعی‌یەکانی گۆران دا وێنەی لادێی کوردەواری، زۆر شت هەیە کە بە شێوەیەك بە ڕاستی سەر سووڕمێنەرە. وێنەکانی گۆڵدسمث، وێنەی

لادیێ ئینگلیزیمان دەهێنەوە یاد هەر چەندە بێگومان جیاوازی‌یەکی زۆر هەیە لە تایبەتیەتەکان دا هەڵبەستەکەی گۆران بێگومان هەڵبەستێکی کوردی رەسەنە چونکە سەرچاوە سەرەکیەکەی واقیعی لادیێ کوردەواری‌یە، کە گۆران، بە وردی‌یەکی واقیعیانە لەناو چوارچێوەیەکی رۆمانسیانەی ئیدیالی‌دا کە هەوڵ دەدات بکاتە نموونەیەکی واقیع، لە هەمان کات دا کە راستی‌و وردیی لایەنە جیاوازەکانی ئەم واقیعە دەپارێزێت، وێنەی‌دەگرێت. بەڵام لەیەکچوونێکی سەرەکی گشتی هەیە لە نێوان ئەو دوو هەڵبەستەدا، ئەوەش توانای رێبرەوە واقیعیەکەیانە بۆ چوونە دەرەوە لە هەڵبەستی کلاسیکی، لە رووی فۆرم و ناوەڕۆکەوە، لەلایەن گۆرانەوە، و لە لای «ئۆلیڤەر گۆڵدسمث»ەوە لەرووی ناوەرۆکەوە بە شێوەیەکی سەرەکی.

کەواتە یەکێك لەو شتانەی دەتوانین دایمەزرێنین و بیکەین بە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە کورتە رۆڵی سەرەکی ناوەڕۆکە لە کاری تازەکردنەوەی شیعرو دروست کردنی فۆرمی تازەی هەڵبەست. چونکە مەسەلەی تازەکردنەوە دەبێ لە چوارچێوەی یەکێتی دیالێکتیکی نێوان فۆرم و ناوەڕۆك دا سەیر بکرێت و بە مەسەلەیەك دانەنرێت کە تەنیا پێوەندی بە فۆرمەوە هەیە. ئەوە شتێکە زۆر جار فەرامۆش دەکرێت یاخود بە باش لێی تێ‌ناگەیەندرێت. ئەوەتا گۆڵدسمث وەکو ئەوەی ناوەرۆکە ئازاراوی‌یەکەی هەڵبەستەکەی بە پاڵ پێوەنان پاڵی پێوەنابێ بۆ ئەوەی لە سنووری بابەتەکانی هەڵبەستی کلاسیکی‌و هەڵبەستی شوانان و لادێ دەربچێت و پێش بینی‌یەك بکات، بە شێوەیەکی هەست پێکراو، لەسەر مەودایەکی فراوان کە بە راستی ناتوانرێ تەنها بە ئیلهامێکی کورتی کەم خایەن دابنرێت، بە رێرەو هەڵوێستەکانی روانگەی واقیعی لە ئەدەب دا کە ئەوەبوو بەشێوەیەکی پێگەیشتوو و باو بە تەواوەتی تەنیا دوای گۆڵدسمث بە نزیکەی سەدو پەنجا ساڵی دەرکەوت. ئەوەتا گۆرانیش بارو دۆخی کۆمەڵە تازەکەی‌و ئاسۆ رووناکەکەی گەل و وڵاتەکەی‌و ئەو بیرە تازانەی بێگومان لەگەڵ ئەو گۆڕانانەدا هاتبوونە کایەوە رێگای بلیمەتی‌یە شیعری‌یەکەیان بۆ کردبۆوە بۆ ئەوەی بەسەر ئەم شێوازە شیعری‌یە رۆمانسی‌و واقیعی‌یە تازانەدا بروات و زۆر بە سووك و ئاسانی تاکو چوار چێوەی هەڵبەستی کلاسیکی کە ئیتر لە توانای دا نەمابوو ئەو واقیعە تازەیە دەرببرێت جێ بهێڵێت.

پەراوێزەکان

(١) عومەر مەعروف بەرزنجی، «گۆران و ئەدەبی ئینگلیزی» (رۆژی کوردستان)، تشرینی ٢، ١٩٧٦، ژمارە ٤٢، ل٤٠ ـ ٤٧.

(٢) بە تایبەتی سەیری سی دێری کۆتایی ئەو هەڵبەستە بکە، لە (دیوانی گۆران).
چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٠، ل١٠٧ ـ ١٠٩.

(3) - «OLiver Goldsmith, «The Deserted VilLage», in Louis I. Bredvold, et. al. editors, Eighteenth Century Poetry and Prose, (Ronald Press .Co - New York, 1956), P. 806

(٤) (دیوانی گۆران)، ل١٢٧.

# گۆران و گولدسمث و التجديد في الشعر

● د. عبدالله دەباغ

كلية الاداب /جامعة صلاح الدين

• يتضمن البحث مقارنة في الشكل والمضمون بين قصيدة الكاتب الارلندي اوليڤر گولدسمث، (القرية المهجورة)، وقصيدة گوران الشهيرة، (سفرة الى هورامان)، تبين ان هناك اوجه تشابه كبيرة بين القصيدتين على الرغم من ان العلاقة بينهما ليست علاقة تأثير وتأثر مباشرين بل قد تكون القصيدة الاولى مصدر إلهام للقصيدة الثانية وأشبه بشرارة أشعلت خيال گوران ودفعته الى خلق القصيدة الكردية الاصيلة.

قصيدة گولدسمث تطوير وإبداع على القصيدة الريفية (pastoral) و تقاليدها التي تتصف بالتغني بجمال الريف وهدوئه وبساطة الحياة فيه وذلك لان گولدسمث يربط بين هذا التصوير المثالي الحالم وبين الواقع المر المؤلم الذي يعاني منه الريف مما يكسب القصيدة كلها بعداً واقعياً متميزاً عن جميع قصائد ذلك العصر على الرغم من انها تبقى في اطار القصيدة الكلاسيكية من ناحية الوزن والقافية والبناء.

اما قصيدة گوران فهي مزيج فني رائع بين الواقعية والرومانسية في وصف حياة الريف الجميلة الهادئة البسيطة. ان گوران مثل گولدسمث يتجاوز القصيدة الكلاسيكية في الوصف (وفي وصف الطبيعة على وجه التحديد) ويتقدم بخطوات كبيرة نحو الواقعية الادبية. ان هناك تشابهاً أساسياً عاماً بين القصيدتين في قابلية توجههما الواقعي على تجاوز إطار القصيدة الكلاسيكية شكلاً ومحتوىً لدى گوران وفي المحتوى بالدرجة الاولى عند اوليڤر گولدسمث.

من الاشياء التي يمكن استخلاصها وتثبيتها من هذه الدراسة الدور الرئيس للمحتوى في عملية التجديد الشعري وخلق الأشكال الجديدة للشعر، فمسألة التجديد يجب النظر اليها في إطار الوحدة الجدلية بين الشكل والمحتوى وليس باعتبارها قضية متعلقة بالشكل فقط وهذا أمر كثيراً ما نلاحظ إهماله أو عدم إدراكه الادراك الكافي.

# ئارثەر میللەر و تراژیدیای کۆمەلایەتی

نووسینی: ئازاد حەمە شەریف

**تراژیدیا چی‌یە؟**

تراژیدیا شێوە درامایەکی (جیدی‌یە) کە پاڵەوانەکەی تێدا تووشی زۆرانبازی دێت و ئازارێکی مەزن دەچێژێو لە ئاکام دا دەبەزێو دەمرێت.

پێناسەی کلاسیکی تراژیدیا بەپێی ڕوانینی ئەرستۆ لە کتێبەکەی (دەربارەی هونەری هۆنراوە)دا پاڵەوانێکی پایەبەرز تووشی گێژاوەیەك دەکات و چارەنووسی بە خراپ دەگێڕێت بە هۆی پنتێکی لاواز لە کەسایەتی پاڵەوانەکەدا (کە پێی دەگوترێ خەوشی تراژیدی)، دەنا پاڵەوانەکە لە هەموو ڕوویێکی ترەوە مرۆڤێکی زۆر چاك و خوو بەرزە. هەروا بە پێی بۆچوونی ئەرستۆ دەبێ تراژیدیا لەلای بینەر دوو جۆرە هەست لەیەك کات دا بورووژێنێ کە (بەزەیی‌و ترس)ن. ئەم هەستانەش دەبێ بە شێوەیەکی ئاوا بن کە ببنە هۆی پاکژکردنەوەی هەستی بینەران.[1]

لە تراژیدیای گریکی‌دا سێ بنەمای هەرە گرینگ هەن بۆ ئەوەی هەر شانوگەری‌یەك ببێت بە تراژیدیا:

**یەکەمیان ـ کەسێتی پاڵەوان:**

هەروەك لەسەرەوە دەست نیشانمان کرد دەبێ پاڵەوان کەسێکی ڕەشۆکی‌و ئاسایی نەبێت، بەڵکو دەبێ، یا شا، یان بەگزادە، یان لە بنەماڵەیەکی دیارو بەناوبانگ بێت، دەنا ئەوە کاریگەری کارە تراژیدی‌یەکە لەسەر بینەران بەتین نابێت، چونکە بینەران کە دەبینن ئەو پاڵەوانە مەزنە لەو ئاستە بەرزەی‌دا دەکەوێت، هەڵبەتە ئەوانیش هەست د،کەن کە لەو چارەنووسە بەدەر نین و لە گوینە هەمان شت بەسەر ئەوانیش بێت.

**دووەمیان ـ ڕۆڵی چارەنووسە**

مەبەست لەوەش ئەوەیە کە هێزێکی لە توانابەدەری مرۆڤ هەیە کە لەلایەن خواکانەوە ئاراستە دەکرێت و بەرەو ماڵ وێرانی بردنی پاڵەوانەکە هەر ئەو هێزەشە پنتێکی لاواز لە کەسێتی پاڵەوانەکە دەدۆزێتەوە.

**سێیەمیان ـ ورووژاندنی هەر دوو هەستی بەزەیی‌و ترس:**

لە ئەنجامی کەسێتی پاڵەوان و ڕۆڵی چارەنووس ئەو دوو هەستە لەلای بینەران دروست دەبێت. با بزانین مەبەست لەو دوو هەستە چی‌یەو چۆن سەر هەڵ دەدەن؟ هەر کە بینەران دەبینن پاڵەوانی تراژیدی (کە زۆر لە خۆیان مەزنترە) لەو ئاستەوە دەکەوێتە خوارەوە، ئەوان هەست بە ترسێکی یەکجار گەورە دەکەن لەوەی کە ڕەنگە هەمان چارەنووسیش چاوەڕێی ئەوان بێت، بۆیە ئەوان دەکشێنەوە ناخی خۆیان تا ناخی خۆیان بپشکنن و چەوتی هەڵەکانی خۆیان ڕاست بکەنەوە.

بەڵام هەستی دووەم کە بەزەیی‌یە، لەو ئەنجامەوە پەیدا دەبێت کە بینەران هەست بەوە دەکەن کە ئەو پاڵەوانەی لەسەر شانۆ دەکەوێت، کەسێکە وەکو ئەوان لە گۆشت و خوێن و بگرە مرۆڤێکی ئەوەندە چاکیشە کە هەرگیز شایەنی ئەو چارەنووسە نی‌یە کە بەسەر دێت. هەر بۆیەش ئەوان لە ناخەوە هەست بە بەزەیی‌یەك مرۆڤانە دەکەن بەرامبەر پاڵەوانە تراژیدی‌یەکە

جا کاتێك تەماشاکەران ئەو هەستانە دەردەبڕن ئەوان لە بازنەی خودی خۆیانەوە دەردەچن و تێکەڵ بە هەستە مرۆڤا یەتی‌یە مەزنەکە دەبن و هەر لە ئەنجامی دەربڕینی ئەو هەستانەشەوەیە پاکژ بوونەوە ـ catharsis ـ ڕوو دەدات.

ئێستا با بزانین تراژیدیای کۆمەڵایەتی (ئارثەر میللەر) بەچی لە تراژیدیای گریکی جیاوازەو پاشتر دێینە سەر شی‌کردنەوەی شانۆیی (مردنی دێوەرەیەك) لە ڕوانگەیەکی کۆمەڵایەتی‌یەوە لەژێر ناوونیشانی (هەڵوەشانەوەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە مردنی دێوەرەك)دا.

بە بەراوردکردنی ئەو تراژیدیا کۆمەڵایەتی‌یەی میللەر لەگەڵ تراژیدیای گریکی هەست بەم جیاوازی‌یانەی خوارەوە دەکەین:

**یەکەم: کەسێتی پاڵەوان.**

پاڵەوانی ـ مردنی دێوەرەیەك ـ مرۆڤێکی چینی خوارەوەی کۆمەڵەو ئەو مەزنێتی‌و شکۆمەندی‌یەی کە لە تراژیدیای گریکی دەبینینەوە لەلای میللەردا نی‌یە، وە نەبێ میللەریش هەر لە خت و خۆڕایی‌و بەبێ ئاگایی وای کردبێت: نەخێر، لەلای میللەر گرنگ نی‌یە پاڵەوانی تراژیدی سەرۆکی دەوڵەت بێت، یان کەسێکی لات، بەڵکو گرینگ ئەوەیە کە چڕی ئەو ئازارە تراژیدی‌یە چەندێك و چ جۆرێکە کە پاڵەوانەکە دەی‌چێژێت.

**دووەم: زۆرانبازیی چینایەتی.**

ئەگەر لە تراژیدیای یۆنانی‌یەوە تراژیدیاکە لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارەوە، یان با بڵێین خواوەندەکان چارەنووسی پاڵەوان دەست نیشان بکەن، ئەوا لە (مردنی دێوەرەیەك)ی میللەردا ئەو چارەنووسەو ئەو کۆستە گەورەیەی بەسەر پاڵەوانەکە دێت لە ئەنجامی چەوساندنەوەی (ویلی لۆمان) لەلایەن هاوارد واگنەری خاوەن کۆمپانیا دێت کە نوێنەری ڕژێمی سەرمایەداری‌یە.

**سێیەم: ورووژاندنی هەستی بەزەیی‌و ڕق.**

لە تراژیدیای گریکی‌دا بینەران لە ئەنجامی ئەو کۆستەی لە پاڵەوانەکە

دەکەوێت و لە ئەنجامی ڕۆڵی چارەنووس (Fate) کە خواوەندەکان دەی‌گێڕن، دوو سۆزی ترس و بەزەیی دەبنـــە هۆی پاکـژ بـوونـەوە، کەچی لەلای ئارثـەر میللەر وانی‌یە. چونکە لەلای میللەر ئەو هەستە مەندە (static) دروست نابێ کە لە کۆتــایی تراژیـدیـای گریکی دروست دەبێت، بەڵکـو هەستێکی بزۆك (kinetic) پەیدا دەبێت کە بریتی‌یە لە هەستی بەزەیی‌و ڕق؛ بەزەیی‌هاتنەوە بە خێزانی (ویلی لۆمان)و هەڕروون بە هەڕروون کردنی خێزانەکەی کە نمونەی خێزانی مرۆڤی چەوساوەیە لە کۆمەڵگای سەرمایەداری‌دا.

لەو شانـۆیی‌یـەی میللەردا بە تەنیـا پەنجـە ناخـرێتـەسـەر ئەوەی کە پێوستە سروشت و ڕەفتاری خۆمان بگۆڕین (وەك لە تراژیدیای یۆنانی‌دا ئەو مەسەلە ڕەوشتی‌یە دەردەخرێت و ئەگەر وا نەکەیت خواوەندەکان بەربەڵات دەکەن) لە شانــۆیی میللەردا پەنجــە خراوەتـە سەر شتێکی گرنگتـرکـە دروست کردنی هۆشیاری‌یە لەلای جەماوەر، ئەویش ڕەخنەگرتن لەو ڕژێمەو باوەڕنەکردن بە بەها مرۆڤ ڕەتێنەکانی‌و پێوستی گۆڕینی ئەو چەشنە ڕژێمە بە ڕژێمێکی لە بارترو مرۆڤانەتر.

(٢)

**هەڵۆشانەوەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە (مردنی دیۆرەیەك)دا:**

مردنی دیۆرەیەك (١٩٤٩) بە ئاووهەوای زورانبازی دەست پێ‌دەکات ئەو زۆرانبـازی‌یـەش لەنێـوان خانـووە گچکـە پەڕپـووتـەکەی ویلی لۆمانە لەگەڵ بووورجی نووك تیژی ئەو ساختمانانەی کە چواردەوریان گرتووە. ئەم دیمەنە دۆخێکی پڕ ڕق و دوژمنکـاری دەردەبـڕی، چونکـە ئەو ساختمـانە زەبەلاحانە هیمای ئەو هێزە کۆمەڵایەتی‌یانەن کە هەڕەشە لە ژیان و مانی خێزانی ویلی دەکەن و پاڵیان پێوە دەنێن بۆ ناو گێژاوی کێشەکان:

خانووی دیۆرەکە، کە هەر چواردەوری بە خانووی بووورجینی سوچدار دراوە، دیــارە. تەنهـا ڕەنگی شینی ئاسمـانی بەســەر خانـووەکـەو پێشـەوەی شانــۆکــەدا پەخش دەبێتـــەوە. کەچـی ڕەنگێکی نارنجی گەشی تووڕە لە دەوروبەری خانووەکە بەدی دەکرێت. هەرکە سەر شانۆکە نەختێك ڕۆشنتر دەبێتـەوە، ترۆپکی ئاپـارتمـانـەکـانی دەورویـەری خانـووە بچکۆلە دارزاوەکە دەردەکەوێ. (پەردەی یەکەم، ل١٠)[٢]

ئەم چەشنـە چوارچێـوە درامی‌یـە دەوری سێبـەر هاویشتنـەسـەر دەبینێت، چونکی پێش وەختی بە بینــەران ڕادەگــەیـەنێت کە خەون و ئاواتی خێـزانی لۆمـان؛ ئەو خەونـانـەی لە ئەنجـامی تێ‌گـەیشتنێکی ناتـەواوی واقیعـەکـەیان هەڵ دەقوڵێ، ئەو خەونانەی کە بەرهەمی کۆمەڵگەکەیانەو ڕژێمی وڵاتەکەیان پڕۆپــاگــەنــدەی بۆ دەکــات تا ڕێ بە هەژاران بزربکــات ـ تا ئەو کاتـەی خەونـەکـانیـان لەنـاو ماڵی خۆیـانن بێ‌کەم و کوڕی‌و تەواون، چونکە دونیای دەرەوە دونیـایـەکی دوژمنکـارانـەو دڵ ڕەقـە. هەر بۆیـەش، هەر لەسەرەتاوە، بینەران هەست بەوە دەکەن کە چارەنووسی ئەو خانووە نووسراوە بڕوخێ‌و ئەو خێزانەش هەڕروون بە هەڕروون دەبێت.

هەر لە ئەنجامی ئەو کێشەیەشە کە هەموو کێشەکانی دی ناو خێزانی لۆمان سەر هەڵ دەدات. هەر بۆیــەش، خەون و خۆهــەڵکێشــان و درۆ بزێتین لە پڕکـردنـەوەیـەکی زۆر ئاسـایی بۆ ئەو شتـانـەی کە نیـانەو ناشتوانن بە دەستی بهێنن. وێــڕای ئەوەش، وەکــو مرۆڤی بەزیــو، ئەوان هەوڵ دەدەن بەسـەر بێ‌ئارامی‌و نائومێدیان زاڵ بێن بەدزی‌و مێ‌بازی‌و زەبرو زۆری.

ویلی لۆمــان ـ ی پاڵــەوانی سەرەکی (مــردنی دیــوەرەیـەك)، مرۆڤێکی پەککـەوتـەیـە، بەهـۆی بەزین و بێ‌مـانایی ژیانی‌یەوە پەشۆکاوە. پاش پتر لە (٣٤) ساڵی گەشت و دیۆرەیی، ئەوەی بۆ ڕوون دەبێتەوە بەزیوەو ژیانیشی بێ‌هـوودەیـە. ئەو بێ‌هـوودەیـەش داویشتـرێتە ناو ژیانی ویلی پاشی ئەوەی هەموو هێزو توانایەکی لێ‌چك دەکرێت، بە دڵ ڕەقی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ‌و سەرۆکەکەی فڕێ دەداو بەلای دەنێت ـ هەر کە هاوارد واگنەر مووچەکەی لێ دەبــڕێت و تەنیــا کرێ‌بــارەکـەی دەداتێ. گیـروگـرفتی ئیش شان بەشـانی گیروگرفتی خێزان بەردەوام لە مێشکی ویلی‌دا دەخولێتەوە، هەر چەندەش ئەو گیروگرفتەش یەکەمەکەیان دەیوروژێنێ، تا لە ئەنجام دا تووشی دەمارگرژی‌و نامـۆیی‌و شیـزۆفـرینیـای دەکـات. کاتێـك خەیـاڵی سەرکەوتن و هەبوونی لە کەللەی ویلی دەدات لەو کۆمەڵگا پڕ پێش برکێ‌یەدا، ئەو دەبینێ کە بەزیوو بێ‌بایەخ و تەنیایە. ئەو گێژەنە پاڵ بە ویلی‌یەوە دەنێت درۆ بکات دەربارەی ئیشەکەی‌و خەونی پێوەببینێ. بە هەرحاڵ، ساتی واش هەیە کە ئەو ڕاستی‌و ڕاستی خەونـەکـانی دەخـاتـە بەر ئەزموون، لەئەنجام دا بەدەر دەکەوێت کە ئەوانە بێ‌سوودن. بەڵام هەمیشە دوای ئەو ساتانە ساتی پڕ هوڕینەو گێژاوەی بەدوادا دێت.

گەڕان و سوڕانی ویلی بەدوای هێــزو دەسـەڵات دا بریتی‌یـە لە گەڕان بە دوای پەنـایـەك کە لەم لاوازی‌و بێ‌بـایـەخی‌یـەی بیپـارێـزێت. چونکە ویلی تووشی نەخـۆشی مێشـك هاتـووە، پێـوستی‌یەکی توندوتیژ لەوەدا دەبینێت کە کار لە خەڵکی دی بکات ـ بەوەی لەبەر دڵان بێ‌و ڕێزی بگیرێت. جا ناوە ناوە کەڵکەڵەی وا دەکەوێتە مێشکی‌یەوە کە کار لە خەڵکی‌دی بکات بە قسە فشــۆڵ و پڕ نووکتــەکــانــی. وێــڕای ئەوە، ئەو دڵـی خۆی بە دروشـمــە بازرگانی‌یەکان دەداتەوە وەك: «ئەگەر هات و بەشتی مەزن دەستان پێ‌کرد سەرەنجـام بە مەزنی کۆتـایی دێ.» «کـەسـایەتی هەمیشە ڕۆژگار دەباتەوە.» [پەردەی یەکەم، ل. ٧٦]یان سەپاندنی هەڵوێستی کۆن وەکو «پیاوێك داوای یازدە هەزار دۆلار بکات ناڵێ نەهێ. . !» [پەردەی یەکەم، ل/٧٦] یان وەکو «بەسەر دونیا زاڵ بن و بەسەر پەیژەکانی‌دا سەرکەون. . ! هەردووکتان پێکەوە دەتـوانن بەســەر هەمـوو پەیژەکانی دونیای شارستانی‌دا سەرکەون.» [پەردەی یەکەم، ل/٧٥]. هەر چۆنێك بێ، ئەو ڕژێمە پڕوپاگەندەی بیرۆکەی لەوە ترسنـاکتـریش دەکـات، تا بێ گونـاهـان بخـاتـەتـەڵـەوە بەهـۆی خولقاندنی وێنـەیـەکی بۆش و درۆزن.[٣] لـەنێـوان ئەو بیـرۆکـانـەو، مرۆڤ دەتوانێت بە ڕاشکاوی پەنجە بۆ بەڵێنی سەرکەوتن لە دنیای کاروبارو خێرو بێر زۆری‌و بە ئامانج گەیشتن ڕابکێشێت، کە ئەمانەش بـە نـاوی خەونی ئەمریکـی‌یەوە ناسـراون.[٤] ئەو خەونــە بەڵــێـنــی ئەوە دەدات «کــە ئەگــەر تۆ بە چاکـی

نیشت کرد، پارەی خۆت پاشەکەوت کرد، هەوڵ و کۆششت کرد، کەپووی خۆت بە پاکی ڕاگرت، سەرەنجام هەبووە دەبیت.»[٥] ویلی لۆمان، لەسەر ئەم خەونە، هەموو ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ ئەوەی ئەم بەڵێنە بەدەست بهێنێ، لەگەڵ ئەوەش دا خۆیو کورەکانی بە بەزیوی دەبینرێن. بەدڵنیایی ئەم ڕاستی‌یە جاری کەوتنی یەگجارەکی ئەو خەونە دەدات.

ویلی لۆمانی یەك لابین هەمیشە لە ئاوزینگ دایە چونکە هەست بەوە دەکات کە لە شوێنێکی ساختەدا دەژیت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو، توانا بیرکەرەی نی‌یە تا دۆخی خۆی بە ماقوڵی دەرببڕێت، ترسی بەزین بەردەوام سەری لەدوای ناوە. نەبوونی توانای تێ‌گەیشتن لە نهێنی سەرکەوتن، ئەو هەمیشە خۆی لە باوەشی شپرزەیی‌و پەشۆکان دا دەدۆزێتەوە. ئا بەم چەشنە، ئەو حاڵەتە مێشکی خاو دەکاتەوەو پڕو پتریش پاڵی پێوە دەنێت بکەوێتە ناو گەریای چالاکی پێشبڕکی‌کاری. هەروا هەرکە ئەو حسێبی زیان و قازانجی خۆی لەو مەیدانەدا دەکات، هەردەم وەکو دۆڕاوێکی نائومێد خۆی دەبینێتەوە. جا هەر لە دژی ئەو هەست بەبێ‌هێزی کردنەیەتی، خەونەکانی دەخولقێن و دەرسکێن بۆ پڕکردنەوەی ئەو شتانەی ئەو دەستی پێیان ناگات. هەر لەبەر ئەوەشە؛ لەو ساتانەی کە هەست بەو نیگەرانی‌یە دەکات؛ مێشکی دەکەوێتە دەرهاویشتنی سێ ئایدیاڵ (مثل علیا) باوکی‌و (بین)ی کاکی‌و دیڤ سینگلمان، کە ئەو سێیە لەلای ویلی وەکو کۆتەڵی سەرکەوتن دەوەستن و دڵی ویلی دەدەنەوە لە ڕووی هەست بە بەزین کردن.

ئەو مفارەقەیەی لێرە بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە ئەو ئایدیالانەی مێشکی ویلی - یان خەوانـدووە سەر بە کاتی ڕابـردوون، یا لەمەڕ کاتێکی وان کە گەڕانەوەی بۆ نی‌یە، ئەو کاتەی هێشتا ماوەی سەرکەوتن بۆ کەسێکی وەك ئەو مبوو. کەچی ئێستا کە بارودۆخ گۆڕاوە لە ڕابردوویەکی کشتوکاڵی‌یەوە، یا بیمچە بازرگانی‌یەوە بۆ سەردەمێکی وا کە ئامێرکاری‌و ماکینـدنان هەموو ڕووکارەکانی ژیانی گرتوتەوەو چەوساندنەوە گەیشتوتە چڵەپۆپە، قوشمەجورجانێی ویلی بۆ سەرکەوتن دەبێتە شتێکی کیخۆتانە.

لە «پیشەکی» کۆمەڵە شانوگەریەکانی‌دا، میللەر پەنجەی بۆ ئەو ڕاستی‌یە ڕاکێشاوە کە مێشکی ویلی بریتی‌یە لە «کۆمەڵێك شتی دژ بەیەکتری.»[١٠] یەکەم دژ لەمانە لەنێوان سەربەستی چێژ وەرگرتن لە کامی دیمەنی دەشتەکی‌و ژیانی پڕ پێش برکێی شارەکانە، دووەمیان لەنێوان ئەو ڕێگایەیە کە کوڕەکانی فێر دەکات چۆن ڕەفتار بکەن؛ ڕاستگۆو ئیشکەرو جەرگ سۆز بن، لە کاتێك دا هەر تاوێك باشتر خۆی بەر پەرچی خۆی دەداتەوە بەوەی هانیان دەدات دزی لە خەڵکی بکەن، سێیەمیان لەنێوان ئەوەیە‌ چی بە کوڕەکانی دەڵێ‌و چۆن خۆی ڕەفتار دەکات، چوارەمیشیان لەنێوان ئەو ئایدیالانەیە کە ئەو پڕبەدڵ بڕوای پێیان هەیە. بەدڵنیایی مێشکی ویلی بەرهەمی ئەو کۆمەڵگەیەیە کە ئەو تیای‌دا گەورە بووە. کەواتە، ئەو هەموو دژایەتیانە لە کۆمەڵگای ئەمریکی‌دا هەن. کارن هۆرنی، دەروونناسێکی ئەمریکی‌یە، ئەو دژایەتیانە لە سێ جۆری سەرەکی‌دا کۆ دەکاتەوە: لەنێوان سەرکەوتن لەسەریەکەوەو خۆشەویستی برایانە لە سەرێکی‌ترەوە، لەنێوان وروژاندن و هاندان بۆ دەردەست کردنی پێویستی‌یەکانی مرۆڤ و ڕێ‌لێ‌گرتنی تەواوەتی؛ هەروەها لەنێوان سەربەستی‌یەکی درۆیاوی تاکەکەس و پەل بەست کردنی لەڕاستی‌دا.[٨] بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو دژایەتیانە لەسەر مێشکی ویلی دیار بکەین، لێکۆڵینەوەیەکی ئایدیاڵەکانی ویلی ئەوە بەڕوونی ئاشکرا دەکەن. ویلی بە باوکی خۆیەوە دڵبەندە، ئەو پیاوەی کە شمشاڵ دروستکەرێکی گەڕۆك بوو و عەشقێکی مەزنی جەربەزەیی‌و سەوداسەری لە کەللەی‌دا بوو، کە ویلی خۆشی ئاواتیان بۆ دەخوازێت:

بێن: باوکمان پیاوێکی مەزن و بەجەرگ و کۆڵنەدەر بوو. لە (بۆستن)ەوە دەستی پێ‌دەکردو هەموو خێزانەکەی لەنێو عەرەبانەیەك دەپەستاو پاشان سەرتاپای وڵات دەگەڕا: بەنێو (ئۆهایۆ)و (ئندیا)و (مەشیگان)و (ئیلانۆی)و هەموو ناوچەکانی‌تری ڕۆژئاوای‌دا دەبردین. لە هەموو گوندو شارێك دەوەستاو ئەو شمشالانەی دەفرۆشت کە لە ڕێگا دروستی دەکردن. باوکم داهێنەرێکی کارامە بوو. بەهۆی تاقەئامێرێکەوە لە هەفتەیەك دا زیاتری لەوە بەدەست دەهێنا کە پیاوێکی وەك تۆ بەدرێژایی ژیانی بە دەست دەهێنێ.

ویلی: ئا منیش هەر بەو شێوەیە پەروەردەیان دەکەم، بێن.. **مناڵەکانم** لای هەموو کەس خۆشەویست و لەبەردڵانن.

**[پەردەی یەکەم - لاپەڕە /٥٦]**

به وشەیەك، باوکی ویلی ئایدیالی سەدەی نۆزدەمە کە **بایەخ بە ڕۆحی** جەربەزەیی دەدات، ئەو ڕۆحەی کە لەگەڵ **هاتنی تەکنۆلۆژیا ئاوابوو.**

دووەم ئایدیالی ویلی، دیڤ سینگلمانە، کە پیرە دێوەرەیەکی (٨٤) ساڵی‌یە. ئەو پیاوە سەرکەوتن بە هۆی مەزنی کەسێتی‌یەوەی لەگەڵ ڕۆحە چاکە دۆست پەروەرانەکەی بە دەست دێنێ. ئا بەم چەشنە، سینگلمان توانی ببێتە کەسێکی ئەفسانەیی مەزن بە هۆی پەیوەندی کۆمەڵایەتی‌و ناسینی خەڵکی کە ئەو دووە لەناو بیردۆزەکانی دیل کارنیجی‌دا[٩] بەرجەستەکراوە.

ویلی: ... لەسەر ڕۆیشتن بووم کە (دیڤ سینگلمان)ی دێوەرەم لە (پاکەرهاوس)دا دی. ناوبانگی ئەو پیاوە، لە تەمەنی هەشتاو چوار ساڵی‌دا لە سی‌ویەك ناوچەدا دەنگی دابوەوە. قەت ئەوە لەبیر ناکەم کە پیرە (دیڤ) دەچووە ژوورەکەی‌و کەوشە قەدیفەکانی لەپێ‌دەکرد. (تەلەفۆنەکەی) هەڵ دەگرت و قسەی لەگەڵ کڕیاران دا دەکرد. پیرە (دیڤ)، لە تەمەنی هەشتاوچوار ساڵی‌دا، بەبێ ئەوەی ژوورەکەی خۆی بەجێ‌بهێڵێ، بژیوی خۆی بەدەست دەهێنا. هەر کە ئەو پیاوەم بینی وام هەست کرد کە دێوەرەیی مەزنترین پیشەیە مرۆڤ بتوانێ وەدەستی بهێنێ. چونکە چ شتێك لەوە شادبەخشترە مرۆڤ لە تەمەنی هەشتاوچوار ساڵی‌دا بچێتە بیست سی شاری جیاوازو تەنها تەلەفۆن هەڵ گرێ‌و هێشتاش هەر لەلای خەڵکی خۆشەویست بێ‌و وردو درشت یارمەتی بدەن؟ خۆ ئەوەش دەزانی کاتێ ویستی لە شاری پڕ دووکەڵی - نیویۆرك و نیوهاڤن و هارتفورد - ەوە بچێتە - بۆستن - مرد..

بەرێکەوت مردنەکەشی دیۆمرانەبوو، چونکە هێشتا کەوشە قەدیفەکانی لەپێ‌دا بوو. کاتێ مرد سەدان کڕیارو فرۆشیار لەسەر تەرمەکەی ئامادە بوون. بگرە تەنانەت چەند مانگێکیش پاش ئەم کارەساتە دڵتەزێنە هەموویان دڵتەنگ و خەفەتبار بوون. . .

[پەردەی دووەم - ل ۹۳ - ۹٤]

دوا ئایدیاڵی ویلی - بێن - ی برایەتی کە بەرزمەنی خۆیەتی (الانا العلیا) - کە ڕۆحی پێشڕەوایەتی ئایدیالی ئەمریکی دەنوێنێ. ئەو گەشتێکی بەرەو ئالاسکا کردبوو، بەڵام چونکە هەنگی ڕوانینێکی هەڵەی بۆ جوگرافیا هەبوو، پاش چەند ڕۆژێك ئەوەی بۆ روون بۆوە کە بەرەو ڕۆژئاوا دەچێت، تا بەو چەشنە خۆی لەناو جەنگەڵەکانی ئەفریقیا دەدۆزێتەوە. ئەگەر بە زمانی هێما بدوێین، ئەو گەشتە بریتی بوو لە دۆزینەوەی واقیعی ئەمریکا لەلایەن (بێن)ەوە. . چونکە ئەو، بە هۆی ئەزموونەکانی‌یەوە، لەوە گەیشت کە ئەو وڵاتەی ئەو تیای‌دا دەژیت وڵاتی خەون و ئاوات نی‌یە، بەڵکو وڵاتی «زۆرانبازی»یە لەپێناوی مانەوەدا.» ئەو چووە ناو «جەنگەڵ» و لەوە گەیشت کە سەرکەوتن لە وڵاتە جەنگەڵستانەکەی‌دا تەنیا لەسەر هێزو تاکپەرستی و فروفێڵ دەوەستێت. جا ویلی داوای ڕێ نیشان دان دەکات لەو «مرۆڤە سەرکەوتووە»ی کە چۆن کوڕەکانی لەسەر هەمان ڕێ پەروەردە بکات. ئینجا بێن وانەیەکی گرینگ دەداتە بیف:

بێن: (بە هێواشی شەپ لە ئەژنۆی بیف دەدات) کاتێ لەگەڵ بێگانەیەك دا زۆرانێ دەکەیت، هەرگیز دادوەر مەبە. دەنا بەم شێوەیە هەرگیز لە جەنگەڵ دەرباز نابی. . .

[پەردەی یەکەم - لاپەرە (٥٧)]

ئەو سێ ئایدیاڵە دژ بەیەکە لەلای ویلی خەونی سەرکەوتن و بە ئامانج، گەیشتن پێك دێنن کە دەتوانرێت ناوی (خەونی ئەمریکی) لێ بنرێ. لە ئەنجام دا، بەزینی ویلی وەکو دیۆەرەیەك لە ئەنجامی دارمانی ئەو خەونانەوە دێت لەسەردەمێکی پڕ گۆڕانکاری‌دا. (۱۰)

سەرەنجام بەبیرهاتنەوەی ڕابردوو و ئێستا لەلای ویلی دەبێتە چاوگی خەم و ئازار، چونکە لە ڕابردوودا هەموو شتێك خۆشی بەخش بوو - خێزانی بەختەوەرو (ئادۆنیس) ئاسای هەبوو و پارەیەکی چاکیشی لە ئیشەکەی پێ‌دەبرا. هەر لەبەر ئەمەشە ناو لە ڕابردوو دەنێت «کاتەمەزنەکان» (پەردەی دووەم - ل ۱٤۷). کەچی ئێستاکە هەموو شتێك گۆڕاوە - باری ئابووری‌و ڕەوشتی خێزانەکەی لە ئاوابوون دایە. ئەو خۆی بە لاوازی‌و پەل و پۆشکاوی دەبینێتەوە لە بەرامبەر ئەو هێزانەی ژیانی بەرێوە دەبن، وێرای ئەوەش، کوڕەکانیشی وەکو خۆی بەزیون. یەکێکیان «خوێڕیەکی بێ‌کەڵك و هیچ و پووچە» [ل - ٦٦]و ئەوی‌تریان «هەروەك منداڵ وایە.» [ل - ٢٦]

گۆڕانێکی دی کە لە کاتی ئێستادا ڕوودەدات ئەوەیە کە پەیوەندی‌یەکان تێك شکاون بە هۆی ڕۆحی ماددەپەرستانەی خەڵك و ناچار مرۆڤ خۆی وەك بێگانەیەك لەناو کۆمەڵگای‌دا دەبینێتەوە. هاوڕێ چی دی ناتناسن و ئیشە چاکەکانت هەڵ ناسەنگێنن، کەچی بەدوای دۆزینەوەی خراپەدا دەگەڕێن. لەو قسەیەی دادێ. . میللەر تێ‌بینی‌یەکی چاکی ئەو گرفتە دەکات:

بە قسەیەك دەڵێم ئەو ڕۆحە نەماوە. لە گوینە هەردوو جەنگی جیهانی لەگەڵ دڕندایەتی بێ‌ئەندازەدا، ئەوەی لەسەر زەوی سڕی بێتەوە؛ لە گوینیشە پرۆسەی تەکنۆلۆژیا ئەوەی لە ڕۆحی مرۆڤ دا چڵك کردبێت؛ بەڵام ئەوەی دیارە ئەو ڕۆحە نەماوە. زۆر مرۆڤ بە دەگمەن بەیەکتری بەستراونەتەوە، جگەلەوەی کە کڕیارو فرۆشیار، یان کرێکارو خاوەن کار، یان دارا لەگەڵ نەبوون و بەپێچەوانەشەوە - بەکورتی، وەکو ئیشکەرێکن کە بە شێوەیەك بەکاردەهێنرێن، نەك وەکو مرۆڤێکی وا کە لە بنەڕەت دا بایەخی هەبێ. (۱۱)

ئەو دیاردەیەی نامۆبوونی مرۆڤ (۱۲) و دابڕانی لە هاوڕێی مرۆڤی خۆی‌و تێك شکانی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان بەشێکی تەواوکەری ئەو شانۆیی‌یە پێك دەهێنن، چونکە میللەر بناغەی شانۆیی‌یەکەی لەسەر ئەو وێنانە هەڵ ناوە:

وێنەی پیرو کەنەفتەبووی و نەمانی زۆربەی هاوڕێکانت و دانیشتنی بێگانە لەسەر تەختی دەسەڵاتداری، کە نەدەتناسی‌و نە سەرکەوتن و نە بەهای ڕاستەقینەت دەزانێ. . . وێنەی خۆنەناس کردنی خەڵك لەیەکتری کە تەنها یەکتری هەڵ دەسەنگێنن. . . هەروا هەمیشە لەمیانی وێنەی مرۆڤێکی تایبەتی‌یەوە لە دونیای پڕ لە بێگانەدا، دونیایەك دەبینین کە نە ماڵەو نەمەیدانی جەنگە بە ئاشکرایی، بەڵام تەنیا کۆمەڵێك ئەستێرەی ئاواتی مەزنە لەسەرووی ترسی بەربوونەوەدایە. (۱۳)

ئەوەی ڕاستی بێت، هەر لە دژی ئەو بارەی نەبوونی تێ‌گەیشتنی مرۆڤانەو گوێ‌بەیەك نەدانە کە ویلی بەرووی هاواردا هاوار دەکات کە چەوساندوویەتیەوەو ئینجا فڕێی داوەتە لایەك:

ویلی: ئەوسا لە ڕابردوودا کەسایەتی دەوری دەگێڕا، کەسایەتی. پیشەی دیۆەرەییش ڕێزو هاوڕێ‌یەتی‌و چاوو ڕووخۆشی تێدابوو. بەڵام ئەمڕوکە هەموو ئەوانە لەناوچوون، ئەوتان! هیچ هەڵێك نەماوە بۆ ڕەخساندنی هاوڕێ‌یەتی‌و کەسایەتی. خۆ دەزانی چ دەڵێم؟ ئەمڕۆ تەنانەت هەر کەس ناشم ناسێتەوە.

[پەردەی دووەم، ل۹٤]

گۆرانێکی دیکەی گرنگ کە ئێستا ڕوویداوە ئەوەیە کە هیچ گوێ بە باری تەندروستی‌و سایکۆلۆژی مرۆڤ نادرێت، چونکە هەموو ئەوەی کە سەرمایەدارەکان گوێی پێ‌دەدەن بریتی‌یە لە کەڵەکەکردنی سەرمایە - نەك ئازارو پێویستی‌یەکانی مرۆڤ. (۱٤) هەموو بستە زەوی‌یەك لەو شوێنەی ویلی دەژیت داگیرکراوە: «کەرپووچ لەسەر پەنجەرەو پەنجەرە لەسەر کەرپووچ.» [ل ۱۸] جا هەر لەوێ، تەنانەت دیمەنە سروشتی‌یەکانیش کاول کران لەپێناوی سەرکەوتنی ماددی‌دا:

ویلی: شەقامەکان بە ئۆتمبێل ئاخنراون و تەنانەت ئۆزقاڵێك هەوای خاوێن لەو دەوروبەرە نی‌یە. لەوەو پاش چیتر گژوگیا ناڕوێ. هەروا

نلشتوانی گێزەر لە باغچە بچێنن. پێویست وابوو یاسایەك دژ بە ئاپارتمان دروست کردن هەبووایە.

[پەردەی یەکەم ـ ل١٨]

ئەو دۆخ و بارەی کۆمەڵگاکەی هەمیشە کابوسیکەو مێشکە شەپلە دارەکەی ئازار دەدات. رۆناڵد هێمان وا دەنووسێ: «هەر لەسەرەتاوە ترسانی ویلی لە جێگاکانی ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ هۆکانی ماکینانـدن و بەشاریکردن (تحضر)، شێتی ویلی ـ یش دەگەڕێتەوە بۆ حەزرەت خوازتن بە گەڕانەوە بۆ سەردەمە چاکترەکانی ڕابردوو.»[١٥]

ویلی پترێ لەسەر رەخنەگرتن لەو بارە نامرۆڤانەی کۆمەڵگاکەی دادەگرێت:

ویلی: زۆربوونی خەڵك ئەم وڵاتە وێران دەکات..! ژمارەی دانشتووان لە ڕادە دەرچووە. کێبڕکێ خەڵکی شێت دەکات! بۆن بوگەنی نێو ئەپارتمانەکان مرۆڤ وڕ دەکات.

[پەردەی یەکەم ـ ل١٩]

وێنە هەرە زاڵەکانی ناو (مردنی دێوەرەیەك) وێنەی (دارستان) یان (جەنگەڵ)ە کە زۆر جار لەلای بێن و ویلی بەکارهێنراوە. ئەو وێنەیە بەکارهێنراوە بۆ دەربڕینی یاسای جەنگەڵ کە «ململانێ لەپێناوی مانەوە»دایە. لەنێوان ئەو شێوە جیاوازانەی کە ئەو وێنەیە خۆی تێدا دەنوێنێ بریتی‌یە لەو زۆرانبازی‌یەی لەنێوان کۆشکە هەوربڕەکان و ماڵی ویلی دایە. (پەردەی یەکەم، ل١٠) ئەوەی ویلی لێی تێ ناگات بریتی‌یە لە ڕووکار (مظهر)و ڕاستی. هەر بۆیەش ئەو باوەڕ بەو بیرۆکانە دەکات کە ڕژێم پڕۆپاگەندەی بۆ کردووە بۆ لە خشتەبردنی هەژاران. بەڵام ویلی «بەتەواوی لە ڕاست ئەمە بەئاگای نی‌یە»[١٦] و مێشکی هەر بە ڕابردووی مەزنەوە خەریکەو ڕووکاری ئەو بەهایانەی ئەو هەڵیانی گرتووە مێشکیان سڕکردووە. ئەمەش سەبارەت بەو مزە لەنکاوەیە کە درا بۆ چاککردنی تەکنیکەکانی بەرهەم هێنان و ئەو جیاوازی‌یە دیارەی هەیەتی لەگەڵ گوێ نەدان بە باری مرۆڤ. ئەم چەشنە گۆڕانە، سەرەنجام، ئەو دیاردەیە دەڕسکێنێ کە لە سۆسیۆلۆجیا بە «بەجێ‌مانی شارستانی‌یانە» ناسراوە. ئێریك فرۆم، (وەکو دەروونناسێك) لە بارەی هۆکانی ئەم دیاردەیەوە دەنووسێ:

ئەگەر دۆخە دەرەکی‌یەکان بەشێوەیەکی وا بگۆڕێن کەچی دی لەگەڵ کەسێتی کۆمەڵایەتی پێشوو نەگونجێن، ئەو (بەجێ مانێك) ڕوو دەدات کە زۆرجار ڕۆڵی کەسێك دەگۆڕێت بۆ ئەوەی ببێتە توخمێکی هەڵوەشێنەر نەك سەقام گیر، ببێتە دینامێت نەك تۆپێکی کۆمەڵایەتی، کە جاران وابوو.[١٧]

هەموو ئەو گۆڕانانەی باسمان لێوەکردن، چ بە جەستەو چ لەلایەنی دەروونی‌یەوە ویلی لەناو مەنجەڵە گەورەکەی خۆی‌دا پڕووکاند. ئەو گۆڕانانە هەمیشە مێشکی داگیر دەکەن و هەرگیز لێی ناگەڕێن گەشە بکات. جا بەم چەشنە ئەو خۆی بە نامۆیی و بێ‌کەسایەتی دەبینێتەوە، چونکە لە کۆمەڵگایەکی ئاوا پڕ پیشەسازی قورس دا، ژیان بێ‌تام و ئاڵۆز دەبێ و پەیوەندی مرۆڤیش ئەوەندە وردو لێك هەڵ وەشاوە دەبێت تا ڕادەیەك کە مرۆڤەکان دەبنە «نمرە کە نە قورسی و کەسێتی‌یان دەبێ جگە لەوەی کە کڕیار، یان سەرباز یا ماشین گێڕن...»[١٨]

کۆمەڵگای (مردنی دێوەرەیەك) هەر هەمووی دەردەدار بووە چونکە دزی‌و سۆزانی‌یەت و چەوساندنەوە بریتین لە ئەدگارە هەرە زاڵەکانی. هەر ئەوەشە وا لە مرۆڤی هەستیار دەکات ببێتە پشت تێ‌کراو و وای لێ دەکات هەمیشە لەناو چەنگی بێزاری‌و نامۆیی‌دا بێت. هەر ئەم واقیعە بوگەنەشە وا لە بیف دەکات (وەکو کریسی پاڵەوانی شانۆیی هەموو کوڕم بوون) هەست بکات کەسێکە نامۆیە لە کۆمەڵگاکەی. هەر بۆیەش ئەو رەخنەیەکی زۆر توندو تیژ ئاڕاستەی ئەو بارە نامرۆڤانەیە دەکات:

بیف: باشە.. دوای جێ‌هێشتنی ئامادەیی ئەوا شەش حەوت ساڵێکم بەسەر برد تەنها بۆ ئەوەی بتوانم خۆم پێ‌بگەیەنم. بە چەندن پیشەی جیاجیام تاقی کردەوە، هەر لە نووسەری بارکردنی پاپۆڕەوە بگرە تا دێوەرەیی و چەندین پیشەی تریش. ئاخۆ چۆن ژیانی وا بێ سوود نەبێ، وەرە بە درێژایی ڕۆژ لە قرچەی گەرمای هاوین دا لە نوێن کاربکەی! یا هەموو ژیانت بە کۆمەك کردنی کەل وپەل، یا کوورك بوون لەسەر تەلەفۆن یا مامەڵەکاری بفەوتێنێ! ئازاری پەنجا هەفتە بکێشی تەنها بۆ ئەوەی دوو هەفتە پشووت بدرێتێ، لە کاتێك دا کە بە حەزرەتی ئەوەوەم کراسەکەم داکەنم و لەعو دەشتە بەرهەڵ دایە بژیم و کەس نەبێ فرمانم پێ‌بکات. لەپاڵ ئەم دەردەسەریەش دا، وەرە بەتەمای ئەوە بێت دوا ڕۆژێك بۆ خۆت دابین بکەی؟

[پەردەی یەکەم، ل ٢٤ ـ ٢٥]

بیف کەم حەز بە سەرکەوتنی ماددی دەکات. ئەو مرۆڤێکی تەریکە لەناو دونیای ئیش و کارداو بێزی لەو قوشمە جۆرجۆرانەی حەڵکە شێتەکەی کۆمەڵگایەکەیەتی، کە باوکی دەپەرستێ. لە جیاتی ئەوە ئەو مرۆڤێکی ئایدیالیستەو جوانی سروشت دەپەرستێ. ئەو لەلای میللەردا «سیستەمی خۆشەویستی دەنوێنێ کە دژی یاسای سەرکەوتنە»[١٩] بۆ پتر ڕوون کردنەوەی ئەو خاڵە، پێویستە بۆ ئەو بۆنەیە شتێك لە شێللی بخوازینەوە: «خۆشەویستی لەژێر باری کۆت و زنجیران دەژاکێ، چونکە نەژادی خۆشەویستی سەربەستی‌یە.»[٢٠] خۆشەویستی، بەو مانا هەرە فراوانەی کە هەیەتی، مانای خۆشەویستی گشتی و مرۆڤایەتی‌یە کە دوژمنی ئەو ڕۆحە دڕندەو دوژمنانەی پێش برکێ‌کاری ڕژێمی سەرمایەداری‌یە. دوای ئەوەی بیف لەوە دەگات کە هەموو بەهاکانی باوکی «ساختە»و «درۆن» هەر کە ئەوان بەهایان لەگەڵ ڕاستی ئەو کۆمەڵەی ئەو تیایان دا دەژی بەرامبەر یەك ڕادەگرێت، سەرەنجام بیف ئامۆژگاری‌یەکانی باوکی دەربارەی سەکەوتن لە ئیش و کارو دێوەرەیی‌دا ڕەت دەکاتەوە. هەرچەندەش ئەو پشت دەکاتە ژیانی شار لەپێناوی هی گوند، کەچی هێشتا ئەو نیگەران و بێ ئارامە چونکە هەست بەوە دەکات ئەو لەو ڕێیەوە ژیانی خۆی بەفیڕۆ دەدات:

بیف: (توڕەیی‌یەکەی لە زێدەبوونە): هاپ، پێش جەنگە، هەر کە ماڵم

جیٚ‌هێشت، نزیکەی بیست تا سی پیشەی هەمە چەشنم بەسەرکردەوە، کەچی سەرەنجامی هەمووان هەروەك یەکتری بوون و هەمان شتیشم لە کۆتایی هەریەکێکیان دا هەست پیٚ‌دەکرد تا. . . بەرەومال بگەڕێمەوە. ئەو کێلگەیەی کە تێیدا کار دەکەم، ئێستا لەوێ بەهارە، بڕوانە؟ نزیکەی یازدە جوانووی لیٚ‌یە هیچ دیمەنێك لەوە جوانتر نی‌یە کە ماینێك بینی‌و جوانوویەکی ساوای لەبەربیٚ. ئێستا لە تکساس بەهارەو ئاووهەواش فێنکە، هاپ. هەر کاتەی بەهار ڕوو لە شوێنێك دەکات کە منی لیٚ‌یە، خودای گەورە! لەپڕ هەست بەوە دەکەم کە بە هیچ ناگەم! ئەوە چ دۆزەخێکە من تێی کەوتووم! هەفتەی بۆ بیست و هەشت دۆلاری بیٚ‌وەج لەبەر ڕەوە ئەسپانم. ئەوا تەمەنم گەیشتە سی‌و چوار سال، پێویستیشە دوا ڕۆژێك بۆ خۆم دابین بکەم. ئا هەر ئەم هەستەشە بەرەو مال پالم پێوە دەنێت. ئێستاکەش نازانم لێرە چی بکەم؟. . . هەموو دەم هیوام وابوو کە ژیانیٚ خۆم بەخۆڕایی نەدۆڕێنم! بەلام هەر کە دەگەڕێمەوە ئێرە، بۆم ڕوون دەبێتەوە کە هەرچی‌یەکی کردوومە تەنها دۆڕاندنی ژیانم بووەو بەس. [پەردەی یەکەم، ل٢٥]

هەلوێستی بیف هەلوێستێکی تاکەکەسی نی‌یە، چونکە لەو هەلوێستەی‌دا هاوبەشە لەگەل سەرتاپای (نەوەی‌بیت)ی [٢١] پەنجاکان کە لە مەنگی کۆمەلگاکەیان بێزار ببوون و هیچ هەستیان بە جەرگ سۆزی بەرامبەر بە مەسەلە گرینگەکانی ژیان نەدەکرد. ئەمەش یاخی بوونێك بوو لە ڕووی ئەو خراپی‌یە کۆمەلایەتی‌یانەی لەناو کۆمەلگاکەیان هەبوو. بەم پیٚ‌یە، ئەم هەلوێستە بریتی‌یە لە ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو (کەلێنە نەوەیی‌یەی) لەنێوان گەنج و پیران پەیدا ببوو. [٢١] کە ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی کێشەیەکی بیٚ‌کۆتایی لەنێوان دەوەلام هاتنی هەریەکێك لەو دوو نەوەیە بەرامبەر بە ژیان و واقیع:

بیف: ویلی، نە من پێشڕەوی خەلکیم و نەتۆش، تۆ مازووکەری کون لە پاشۆلی بووی‌و وەك هەموو خەلکی‌تر فڕێ درایتەسەر گوفەك. من سەعاتی بە دۆلارێك کاردەکەم، ویلی! حەوت ناوچە گەڕام و نەم توانی لەوە زیاتر بەدەست بهێنم. تاقەدۆلارێك خۆ تێم دەگەی.. وانی‌یە؟ لەوەو پاش چی‌تر دیاری ناهێنمەوە مال و دەبیٚ تۆش چی‌تر چاوەڕێی ئەمە نەکەی. خۆ تیٚ‌گەیشتی؟

[پەردەی دووەم، ل ١٥٣]

دووەم کوڕی ویلی کە هاپی‌یە، ئەویش بەزیوە، بەلام ئەو خەون بینێکی گەورەترە لە براو باوکی. ئەو «هەرگیز بڕیاری نەداوە ڕوو بکاتە ڕووخان و بەرەنگاری ببێتەوە. بۆیەش زیاتر شێواو و شلەژاوە، بەلام لەڕوالەتدا زۆر لەخۆڕازی‌یە» (پەردەی یەکەم، ل٢١) کەچی ناتوانێت لە ئیش دا لەگەل خەلکی‌دی پێش برکیٚ بکات، بەلام لە سێکس دا پێش برکیٚ‌یان دەکات، یان خۆی بەهێزی جەستەیی هەل دەکێشیٚ‌و دەلێت دەتوانێت پشتی هەر کەسێکی فەرمانگەکەی بشکێنیٚ. ئا بەم چەشنە، ئەو ناتوانێت سەرکەوتوو بێت و بەسەر پەیژەی کۆمەلایەتی‌دا هەل گەڕێت، بەلام لەجیاتی ئەوە «دەیە دزو ئافرەتان بۆ خۆشی‌یەکی ساتەوەختی دەدزێت و خەیالی سەرکەوتنیش بە درۆو دەلەسە دەدزێت.» [٢٢] سەربارەی ئەوەش، هاپی بەرتیل وەردەگرێو خۆی لە ئیش دەدزێتەوەو هەمیشە تا بنا گوێیٚ لە پلان دانان نقوم بووە. تا خەلکی‌دی لە خشتە ببات. بەکورتی، دارمانی ڕەوشتی خێزانی ویلی شان بەشانی دارایی‌و کۆمەلایەتی‌یان دەڕوات سەرەنجام، هاپیش وەکو باوکی‌و برای دەبێتە نێچیرێکی بیٚ‌دەستەلاتی تەنیایی‌و وەڕەسی:

هاپی: . . . بەلام نازانم من بۆ چ نەعلەتیەك کاردەکەم. زۆرجار نە ئاپارتمانەکەی خۆم دادەنیشم و کاتیٚ بیر لەو کریٚ‌یە دەکەمەوە کە دەی‌دەم، ئەقلم لەسەردا نامێنیٚ. کەچی هەمیشە ئەو ئارەزووەم بووە، ئاپارتمانی خۆم، ئوتومبێل و کۆمەلە ئافرەتێك. بەلام هێشتا هەر دەلێم: نەفرەت لەم ژیانە بیٚ چونکە هەست بە تەنهایی دەکەم. [پەردەی یەکەم، ل٢٦]

تووڕەو ورە ڕووخاو بە هۆی بەزین و بیٚ‌هێزی‌یەکەی، هاپی ڕۆحێکی شەڕخوازانە لە هەموو ئەو کەسانە هەل ڕەگرێت کە لە پلەو پایەدا لە سەرووی ئەوەوەن، جا بەم شێوەیە ناتوانێت پەیوەندی لەگەل کەس بکات:

هاپی: . . . زۆرجار لەنێو کۆگادا دەمەوێ کراسەکەی بەرخۆم دادڕم و ئەو بەڕێوەبەرە فەرمەسۆنەی کۆگا بدەمە بەرکولەمست و لەپێستی‌دا وردی بکەم. مەبەستم وایە، کە دەتوانم هەموو ئەوانەی نێو کۆگا وردبکەم و تێکیان بشکێنم. . . من فەرمان لەو بۆرە پیاوانە، لەو زۆلانە وەربگرم! چی‌تر نە توانام دا نەماوە دان بە خۆم دا بگرم.

[پەردەی یەکەم، ل٢٧]

وەك پڕکردنەوەیەك بۆ نەبوونی توانای پێش برکیٚ، هاپی هەول دەدات کە بەسەر بیٚ‌هێزی‌و سەرلیٚ‌شێواوی‌دا زال بێت بە هۆی لەخشتەبردنی دەزگیرانی گەورەکانی. پاش ئەوەی ورەیان دەڕوخەینیٚ، بەجیٚ‌یان دیلیٚ. ئەو ئەو ڕۆحە سادی‌یە وەك میکانیزمی ڕاکردن لە دەست تەنیایی‌یە تاکە کەسانەکەی تیٚ پەیدا دەبێت: [٢٣]

هاپی:- ئەو (چارلۆت)ەی ئەمشەو لەگەلم بوو مارەی براوەو پاش پێنج هەفتەی‌تر دەگوازرێتەوە. . . .

بیف: . . . . بەس گالتەو فشەفش بکە.

هاپی:- بیٚ‌گومان، دەزگیرانەکەی بۆ جێگری بەڕێوەبەری کۆگا هەل بژێرراوە. نازانم مەزنێتی ئەو لە چی‌دایە؟ لەوانەیە توانای پێش برکیی ئەو لە هی من زیاتر بێت. بەلام هەر چۆنێك بیٚ بردم و خراپم کرد. لەگەل ئەوەش دا ناتوانم وازی لیٚ‌بهێنم و ئەوە سی‌یەمین کەسە کەوای لیٚ‌دەکەم، توخوا ئەمە کارێکی پووچ نی‌یە؟ سەرەڕای ئەوەش لە ئاهەنگی زەماوەندەکەیان ئامادە دەبم. . ! (بە پەستی‌یەوە، بەلام پیٚ‌دەکەنیٚ) پیاوی وەك من نەدەبوایە بەرتیل وەربگریٚ. . . کەچی ناوبەناو خاوەن کارگەکان سەد دۆلارێکم پێش کەش دەکەن، تا لە کاروباری بەپێش یەکتری کەوتن دا ڕێگایان بدەم. بڕوانە من چەند دلسۆزو دەست پاکم، بەلام بە هۆی ئەو

کیژە بێز لە خۆم دەکەمەوە، چونکە من ئەو کیژەم ناوی کەچی هێشتاش هەر دەیبەم و لەگەڵی‌دا ڕادەبوێرم.

(پەردەی یەکەم، ل٢٩)

هاپی هیـــچ بەزەیی و دڵنـەرمی بەرامبـەر باوکی نی‌یـە. ئەو مرۆڤێکی زۆر خۆپـــەرست و گەمـــژەیـــە؛ هەمـــوو ئاواتی ئەوەیـە کە «ئـاپـارتمـانی خۆی و ئوتمبێلێك و کۆمەڵێك ئافرەتی هەبێت.»

(پەردەی یەکەم، ل٢٦)

ئەو ئاوا خۆی بە قەپێلکی ژیان بەستۆتەوە. هەر بەم شێوەیە، لەلای ئەو سێکس مەسەلەیەکی گرینگترە لە ژیان و مردنی باوکی. ئەو تەنانەت ئامادەیە کە باوکی بەجێ‌بهێڵێت بۆ خۆی لەناو چەشمەی خواردنگاکەدا وڕینە بکات لەپێناوی دوو سۆزانی‌دا وێڕای ئەوەش، ئەو لەو جۆرە کەسانەیە کە دەتوانێت هەموو چەشنە پەیوەندی‌یەك لەگەڵ باوکی‌دا بسڕێتەوە:

هاپی:ـ نەخێر، ئەوە باوکم نی‌یە، تەنها ناسیاوێکە.

(پەردەی دووەم، ل١٣٢)

هەندێ ڕەخنەگر، لەمانە ڕۆبێرت وو. کۆریگان وا دەڕوانن کە سێکس ڕۆڵێکی یەکجار بەهێزی هەبووە لە هەڵ وەشاندنەوەی خێزانی لۆمان. (٢٤) نە هەر گفتوگۆیەکی فەلسەفیانەدا ئەگەر تەنها پەنجە بۆ دیاردە درێژ بکرێ و بنچینەی مەسەلەکان پشت گوێ بخرێ، ئەوە بە پێشەکی دەست پێ‌کردنێکی ناتـەواو دەدرێتـە قەڵـەم. هەمـان شتیش دەربـارەی بیـرۆکـەکـانی کۆریگـان دەچەسپێ. چونکـە سێکـس هۆیـەکی ڕاستـەقینەی هەڵوەشاندنەوەی خێزانی لۆمان نی‌یە، بەڵکو سێکس بریتی‌یە لە دەربرین لەو گیروگرفتانەی کە ویلی و بیف و هاپی لە ناخەوەڕا هەڵ دەلووشێ. ئەوەی ڕاستی بێت، هۆی سـەرەکی ئەو گیـروگـرفتـانـە بریتی‌یـە لە زۆرانبازیی نێوان هەبوون و نەبوونەکان. پاش ئەوەی کە باری قورسی هێـزە کۆمـەڵایـەتی‌یـەکـان خێـزانی لۆمان دەڕەتێنێ، ئەوان هەست بە نامۆیی و پەل وپۆ شکاوی دەکەن. سەرەنجام، ئەو نامۆیی‌یە نیگەرانی و هەست بەخود سڕانەوە لەلایان دەخولقێنێ. جا ئەوان دەست بە سێکسکاری دەکەن بۆ سەپاندنی خودی خۆیان و هێورکردنەوەی نیگەرانیان.

ئەو شانـۆیی‌یـە تەنهـا دەربـارەی چەرمـەسـەری و مردنی ویلی لۆمان نی‌یە. ئەوەی ڕاستی بێت لێـرە باس باسی چەرمـەسـەری و مردنی هەمـوو بنـەماڵەی لۆمـانـە. هەر یەکـەیـان بەنـاو تاقی‌کـردنەوەی مردنێکی بەکاوەخۆدا دەڕوات. ڕاستـە. . لە شانـۆیی‌یـەکـەدا تەنیـا ویلی لۆمـان بەجەستە دەمرێت، کەچی ئەوەی ڕاستی بێت، هەموو ئەوانی دی لەناو بارێکی مردنی ڕۆحی‌دان هەر کە دەبینن ئەو ئەو هێـزە کۆمـەڵایـەتی‌یـانـەی کاریـان تێ‌کـردوون پەل وپـۆی شکاندوون. بەڕاستی، ویلی بەناو هەردوو ئەزموونی مردن دا دەڕوات.

تاقە کەسێك کە ئاگای لەو گێژاوەیەی ویلی بووبێت (لیندا)ی خێزانیتی، ئەو بەشـدارە لە هەمـوو چەرمـەسـەری و ئازارەکـانی. هەرچـەندە دەزانێت کە مێردەکەی هەوڵ دەدات کە خۆی بکوژێ، وێ ناتوانێت ڕێی لێ‌بگرێت. هەر ئەو زانینەشە کە هەموو ژیانی پڕی ترس و نیگەرانی هەمیشـەیی دەکات:

لیندا: من شـەرم لە خۆم دەکەمەوە. چۆن دەتوانم ئەوەی بەبیر بێنمەوە؟ هەموو ڕۆژێك دەچمە کوورخانێ و پارچە لاستیکەکە لێ‌دەکەمەوە. بەڵام هەر کە دێتەوە ماڵ لەجێی خۆی دادەنێمەوە. چۆن دەتوانم بەم چەشنە ڕووشکێنی بکەم؟ نازانم چی‌بکەم؟ هەموو ڕۆژێك دەستم لەسـەر دڵمە، ڕۆڵەکانم. من دەزانم چی بە مێشکی‌دا دەی.

[پەردەی یەکەم، ل٦٩]

ئەم شانۆیی‌یە پڕاوپڕی گیروگرفتی خێزانە. هەر ئەندامێك گلەیی لەوی‌تر دەکـات و ئەوی‌دی لەبـەر بەزینی خۆی تاوانبـار دەکـات. ویلی ڕووی دەمی گازانـدەو ڕەخنـە دەکـاتـە هەردوو کورەکـانی چونکـە بەزیـون. هەروا ئەو بە دڵڕەقی لەگەڵ لیندا ڕەفتار دەکات لەو کاتانەی هەست بەدڵتەنگی دەکات. لینـدا ڕەخنـە لە بیف و هاپی دەگـرێت لەبـەرئەوەی باوکە دارزاوەکەیان پشت گوێ خستووە. کەچی بیف ئەو تاوانە دەخاتەملی هاپی، وێڕای ئەوەش، ئەو هۆی بەزینی خۆی دەخاتە ملی باوکی:

بیف:ـ بۆیـەکـا بە هیـچ نەگـەیشتم، چونکـە تۆ ئەوەنـدەت پف دام تا وات لێ‌کردم خەڕۆو قەپۆز بەرز بم و نەتوانم فەرمان لە کەس وەرگرم! جا ئەمە تاوانی کێ‌یە؟

(پەردەی دووەم، ل١٥٢)

مرۆڤ دەتـــوانێت چوار ساتی پرکێشــەی چڕ لەو شانـــۆیی‌یـە هەست پێ بکات. سێ لەمانە لەنێوان ئەندامانی خێزانی ویلی ـ ن، بەڵام چوارەمیان لەنێوان ویلی و هاوارد واگنەرە ـ خاوەن کارەکەی. لە ئەنجامی ئەو کێشانەدا خێزانی لۆمان پەرەبەپەرە دەبێ و پەیوەندی‌یەکان دەپچڕێن.

یەکەم کێشە لەنێوان لینداو هەردوو کورەکەی دەقەومێ. لیندا گازاندەیان لێ دەکـات بەوەی کە ڕێـزی باوکیـان ناگـرن و گوێی پێ‌نادەن. هەردووکیان لەبەردەم دوو ڕێگا دادەنێ: یان دەبێ باوکیان خۆش بوێ و بەرێزەوە ڕەفتاری لەگەڵ بکەن، یان دەبێ هەتاهەتایە ماڵ بەجێ‌بهێڵن. چونکە ویلی «تەنها بەلـەمێکی بچـووکـەو بەدوای بەندەرێکی پڕ ئاسایش دا دەگەڕێ تا لەنگەری تێدابگرێ.» [ل٨٨]

جا بۆیـە داوایـان لێ‌دەکـات کە وەك پێـوستـە گوێی پێ‌بـدەن دەنا ژیانی ئەو دەکەوێتەبەر مەترسی:

لیندا:ـ من ناڵێم باوکتان پیاوێکی مەزنە. ویلی لۆمان نە هەرگیز پارەیەکی وەدەست هێناوە، نە هەرگیز ناوی لەسـەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە چاپ کراوەو نە هەرگیـز بۆتـە پیـاوێکی ئەوەنـدە بەنـاوبـانگ تا ناوی وەك بروسکە بە هەموو لایـەك دا بڕوات. بەڵام هەر هیـــچ نەبێ خۆ مرۆڤێکــەو شتێکی یەکجـــار ترسناکیشی لێ چاوەڕێ دەکرێ. جا پێویستە ئاگامان لێی بێ و نەیەڵین وەك پیرەسەگێك بەڕبێتەوە نێو گۆڕ. دەبێ ئاگامان لێی بێ. دەبێ زۆر ئاگامان لێی بێ. . .

(پەردەی یەکەم، ل٦٤)

لینـدا هۆیـە ڕاستـەقینـەکـانی سەرلێ‌شێـوانی ویلی دەر دەبـڕێ و یەکسـەر بە

چەوساندنەوەی بێ ئەندازەی کۆمپانیاکەی دەبەستێتەوە، لەگەڵ نەبوونی لێك تێگەیشتن لەنێوان خۆی و کوڕەکانی:

لیندا:- لەم ژیانەدا پیاوی بچووکیش وەك پیاوی گەورە تووشی ماندووبوون و هیلاکی دەبێ. ئەوە نزیکەی سی و شەش ساڵە لەو کۆمپانیایەدا کار دەکات و بەچەندان ناوچەی نەزانراوی گەورە گەورەی بۆ دۆزیونەتەوە کەچی ئێستا کە پیرو کەنەفتە بووە مانگانەکەیان لێ بڕیوە.

- - - - - - - - - - - - - - - - - -

بیف: ئەو زۆڵە بێ چاوو ڕوانە!

لیندا: گوایە ئەوان لە کوڕەکانی خۆی خراپترن؟ کاتێ گەنج بوو، پارەیەکی باشی بەدەست دەهێنا بەدیداری دڵ خۆش بوون. کەچی ئێستا ئەو برادەرو کڕیارە کۆنانەی کە یەکجار خۆشیان دەویست و ڕێزیان دەگرت و لە کاتی ناخۆشییدا بە هانای دەهاتن، هەموویان مردوون، یا خانەنشین کراون... هەموو ڕۆژێ نزیکەی حەفت سەد میل دەبڕێ و کە دەگەڕێتەوە ئێر کەس هەر ناشی ناسێتەوە، تەنانەت کەس بەخێرهاتنیشی ناکات. ئاخۆ دەبێ چ بە مێشکی کەسێکی وادا بێ کە ڕۆژێ حەفت سەد میل ببڕێ و بگەڕێتەوە ماڵێ بەبێ ئەوەی بایی پوولێك بفرۆشێ؟ ئاخۆ بۆ پیاوێکی وا کلۆڵ و بێ هێزو دڵتەنگ لەبەر خۆیەوە قسە نەکات؟ بۆ؟ بۆ لەبەرخۆیەوە نەدوێ کە دەچێتە لای چارلی تا هەموو هەفتەیەك پەنجا دۆلاری لێ قەرز بکات و وا پێشان بدات کە ئەوەندەی فرۆشتووە؟ تاکەی ئەمە وا بڕوات؟ تاکەی؟ خۆ دەبینن لێرە وەستاوم و شتێکی ترسناکی لێ چاوەڕوان دەکەم؟ کەچی تۆ پێی دەڵێی تۆزقاڵێك دەماری پیاوەتی تێدا نییە؟ ئەو پیاوەی کە تاقە ڕۆژێك بۆ سوودی ئێوە نەبێ کاری نەکردووە؟ کەی دەبێ میدالیای سەربەرزی ئەو ڕەنجەی وەربگرێ؟ ئەوە پاداشتیەتی!! - کە لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی ڕوو وەربگێڕێ و ببینێ و ئەو منداڵانەی کە تەنانەت لە ژیانی خۆیشی خۆشتر دەویستن هەریەکە بوونەتە خوێڕییەکی بێ کەڵك و هیچ و پووچ و..

[پەردەی یەکەم، ل ٦٥ - ٦٦]

ئەو کێشەیە بە بەڵێنێك و ئاواتێك لە بفیەوە دادەمرکێتەوە، هەر کە بڕیاری ئەوە دەدات کە لە شار بمێنێتەوەو بچێتە دیدەنی بێل ئۆلیڤەری کۆنە خاوەن کاری و خاوەنی کارگەی کەل وپەلی وەرزشی تا داوای قەرزێکی دە هەزار دۆلاری لێ بکات. بەڵام ئەم ئاواتەش خەونێکە و بەرناگرێ.

دووەم کێشە کە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر چارەنووسی ویلی هەیە لەنێوان ویلی لۆمان و هاوارد واگنەرە. ویلی کە پتر لە (٣٤) ساڵ بۆ کۆمپانیای واگنەر وەك دیوەرەیەکی وڵات گەڕ ئیشی کردووە، ئێستا پیرو کەنەفت بووە، ماندوو و دارزاوە. ئەو داوا لە هاواردی سەرۆکی دەکات لە نیویۆرك ئیشێکی پێ بدات و لە سەفەرکردن بیبوورێت. وەڵامی ئەو داوایەی بەم چەشنە دەدرێتەوە: «ڕۆڵە، من ناتوانم خوێن لە بەردێکی وشك و برینگە بگرم...» (پەردەی دووەم، ل٩٥) جا ئەو هیچ گوێ ناداتە ناڵەی خەمماوی ئەو مرۆڤەی کە هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ خزمەت کردنی کۆمپانیاکەی. لەلای ئەو، جیاوازییەك هەیە لەنێوان هەستی مرۆڤایەتی و ڕێ و ڕەسمی ئیش. ئا بەم چەشنە بە ویلی دەڵێ: «بەڵام دەبێ ئەوە بزانی کە شۆل شۆڵە.» (پەردەی دووەم، ل٩٣) ویلی هەوڵ دەدات کە هەستی مرۆڤانەی هاوارد بجوڵێنێ، لەلای هاواردێك کە هەستی مرۆڤانەو دڵنەرمی تەنیا مانای پارەو پول و سەنت و دۆلارە. بەم جۆرە، ویلی زۆر بە نارەوایی ڕیسوا دەکرێ و کەرامەتی ژێر پێ دەنرێت بە پا بێ بەزەیی یەکانی ماددەپەرستێك. هەر ئەم هەستەشە کەوا لە ویلی لۆمان دەکات هیستریانە بە ڕووی هاوارد بتەقێتەوەو داوای مافی ڕەواو کەرامەتی بزرکراوی خۆی بکات:

ویلی:... چەندان گفت و بەڵێن لەسەر ئەم مێزە دراوە! نابێ پێم بڵێی دەمەوێ خەڵکی ببینم. من سی وچوار ساڵی ژیانم لەو کۆمپانیایەدا داناوە، هاوارد. ئێستاش پارەم نییە مانگانەی تەئمینەکەم بدەم. تێ بگە! مرۆڤ میوەجات نییە کاکڵەکەی بخۆی و پەلکەکەی فڕێ بدەیت! (پاش کەمێك وەستان) جا تۆزێك ئاگادار بە! باوکت لە ساڵی (١٩٢٨)دا کاری باش بوو، لەبەرئەوەی سەرجەمی فرۆشتنی هەفتەیەکم سەدوحەفتا دۆلاربوو.

(پەردەی دووەم، ل٩٥)

لەلای هاوارد، ئەو ڕابردووەی ویلی باسی لیوە دەکات هیچ مانایەکی نییە، چونکە وەکو چەوسێنەرێك، ئەوەی لەلای ئەوەوە گرینگە سەرکەوتنی ماددییە نەك ژیان و مردنی مرۆڤێك. جگە لەوەش، لەلای هاوارد ویلی پتر نییە لە ماکینەیەك کە بەکارهێنراوەو تێك چووەو تێ هەڵدراوە.

لەلای ویلی ئاسۆ تاریکترو بەدیوم تر دەبێت. بەپێچەوانەی ئەو ئاواتە بەرزەی ئەو بە بیفی هەبوو کە هەمیشە وەك مرۆڤێکی بەردڵان و خۆسەپێنی دەبینی، پولێك لە بیل ئۆلیڤەر بەدەست ناهێنێ. بەم شێوەیە، میللەر ئامادەمان دەکات بۆ دیتنی دیمەنی خواردنگا کە لوێدا خەون و ڕاستی، قەپێلك و ڕاستەقینە ڕووبەڕووی یەك دەوەستن. ئێستاکە ویلی دەرکراوە ڕیسواو و ورە ڕوخێنراوە بە ڕەفتارە دڵڕەقانەکەی هاوارد، ویلی تروسکەیەکی ڕووناکی نابینێت بێجگە لە پرۆژەی بیف. هەروا بیف - یش دەتاسێ کە دەزانێت باوکی دەرکراوە. ویلی چاوەڕوانی هەواڵی خۆش لە بیفەوە دەکات، کەچی بیف - یش دەیەوێ ویلی لەناو قوڕو لیتەی خەونی ئەمریکی لەبارەی سەرکەوتن بهێنێتە دەرو بۆ تاقەجارێك و هەتا هەتایە ڕۆشنایی بخاتەسەر ڕاستی خۆی و خێزانەکەی. بەڵام ویلی هەرگیز ماوەی ئەوەی نادات، لەجیاتی ئەوە ناچاری دەکات کە درۆ هەڵ ڕێژێ.

ئا لەو ساتە سامناکەی کێشەکەدا، کاتی ڕابردوو و کاتی ئێستا لە مێشکی ویلیدا یەك دەگرنەوە. ئەو هۆی بەزینی بیف بە ڕووداوێکەوە گرێ دەدات کە لە (ئوتێلی بۆستن) قەوماوەو وا بیر دەکاتەوە کە بیف دەتوانێت مرۆڤێکی سەرکەوتووی لێ دەربچێت، بەڵام ئەو خۆی ئەوەی ناوێت، تا بەم شێوەیە تۆڵە لە ویلی بکاتەوەو وای لێ بکات هەست بکات ئەو هۆی بەزینێتی. کەچی بیف هەوڵ دەدات ئەوە ڕوون بکاتەوە ئەو بەزیو نییە تا تۆڵە لە ویلی بکاتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەیە کە ناشێ مرۆڤی بێ پارە لە کۆمەڵگایەکی وا

جیبەنی سەرکەوتوو بێت.

ئەو ساتەی چزووی ڕووداوێکی ڕابردوو گاز لە ویلی دەگرێ کە لەگەڵ سەریەك لە - ئوتێلی بۆستن - بوو، کێشەکە لە ویلی‌یەوە دەگوازرێتەوە بۆ هەپی. بیف گازانـدە لە هاپی دەکـات چونکـە باوکی پشت گوێ خستـووە. هەپی - یش، لەبەر ئەوە بەرگری لە خۆی دەکات و بە بیف دەڵێت: «ئەو خۆی هەموو جار ماڵی بەجێ هێشتووە.»

[پەردەی دووەم، ل١٣٢]

ئەو کێشـەیـە ئەو ساتـە کۆتـایی پێ‌دێت کە ویلی لە چەشـمـەی خواردنگـا بەجێ‌دەهێڵرێ بۆ وڕێنەکردن و ئەوانیش (بیف و هاپی) لەگەڵ سۆزانی‌یەکان دەچن بۆ باوەشی دونیای نەرم ونیانی سێکس.

لەناو ئەو جیهـانـە دڵـڕەقـەدا، ویلی دەزانێ کە هیـچ ڕێگـایـەك نی‌یە بۆ دەربازبوون لەو گێژەنە، ئەو دەزانێت کە خۆی چ وەك باوك، چ وەك دیوەرەو چ وەك مێرد مرۆڤێکی بەزیوە، چونکە هیچ کەسێك هەرگیز ئەو بیرۆکانەی بڕ ناکرێت کە پێی فرۆشراوە هەر بۆیەش ویلی «لەفرۆشتنی کەل وپەل... دەکـەوێتـە فرۆشتنی خۆی، جا سـەرەنجـام ئەویش بۆتـە کەل وپـەلێـك وەك کەل و پەلەکانی‌دی کە لە وەختێك دا وەك کەل و پەلێکی ئابووری فڕێ دەدرێت.»[٢٥] بەم چەشنـە دەگـاتـە ئەو ئەنجـامـەی کە تەنهـا پارەیـە بتوانێ خێزانەکەی لە ڕووخانی یەگجارەکی ڕزگار بکات. سەرەنجام بڕیار دەدات کە خۆی بکوژێ‌و پارەی مـسوگەرگردنی ژیانی - کە بیـست هەزار دۆلارە - بۆ بیف بەجێ بهێڵێ تا لەوەوە دەست بە ئیش بکات. نزیکەی هەر لە هەمان کاتیش دا بیف وابیـردەکـاتـەوە کە هەر خۆیـەتی هۆی هەمـوو کێشەکانی ناو خێزانەکەی‌و لە ئاکام دا بڕیاری ئەوە دەدات هەتا هەتایە ماڵ بەجێ‌بهێڵێ. ئەمە دەگەیەکی ترسناکە بۆ ویلی کە بڕیاری - داوە خۆی بۆ بکاتە قوربانی، چونکە ویلی وا بیر دەکاتەوە کە بیف نایەوێت سەرکەوتووبێت تەنها بۆ ئەوەی تۆڵـەی لێ‌بکـاتـەوەو بەم چەشنــە ڕیسـوای بکـات. هەر ئەم لێـك تێـك نەگەیشتنەشە بەرەو کێشەیەکی یەگجار چڕوپڕی نێوان ئەو دووەمان دەبات:

ویلی: تۆڵە، تۆڵە هۆی ڕووخان و بێ‌کاری تۆیە. کاتێ دەڕۆیت و ئێرە جێ دێـڵی، لەبیــرت بێ کە بەدەستی خۆت ئاگــرت لە ماڵی خۆت بەردا. کاتێ بە ڕێبـواری ڕێگـا چۆڵـەکـان دەگـری‌یە بەر، یا بەتەنیایی لە هەندەران دادەرزێی لەبیرت بێ کە بە خۆت ماڵی خۆت کاول کردو نەوێری ئەو تاوانە بخەیتە ئەستۆی من!

(پەردەی دووەم، ل١٥٠)

ویلی هێشتا خۆی هەڵ دەخڵەتێنێ‌و هێشتاش هەر هەموو بڕوای وایە کە سەرکـەوتن لەسـەر توانـای کەسـایەتی‌و ئیشکەری دەوەسـتێت نەك جۆری ئەو ڕژێمەی کە لە سایەی‌دا دەژیت. کەچی بیف، بە چەشنی کریس، هێشتا لەسەر ئەوە ڕشتە باوکی بەرەو تێ‌گەیشتنێکی قووڵ ببات؛ ئەوەی تێ‌بگەیەنی کە هەر کەســەی ئامــادە نەبـێت خەڵکی بخڵەتێنێ‌و ئازادی خۆی پێ‌شێـل بکـات و ببێتــە پارچــەیــەك لە ماکینــە گەورەکــەی ڕژێم. ناتــوانێت سەرکـەوتـوو بێت. لەو زۆرانبـازی‌یـەی ئەو دوو ئەڤـانی‌یەدا (ارادة)، بیف بە باوکی دەڵێت کە ئەو بەو بیرۆکە درۆزنانەی کە ڕژێم پڕوپاگەندەی بۆ دەکات هەڵ خڵەتاوە. هەر لەبەر ئەوەشە باوکی بەوە تاوانبار دەکات کە هەر ئەو بوو ئەو بیرۆکە مرۆڤ فریودەرانەی دڵۆپاندوتە ناو سەریان:

بیف:- ئەو پیاوە نازانێ ئێمە کێین؟ دەبێ بزانی ئێمە کێین!...

تەنانەت دە خولەکیش لەو ماڵە ڕاستیمان نەگوتووە!

- - - - - - - - - - - - - - - - - -

بۆیـەکـا بە هیـچ نەگـەیشتم، چونکـە تۆ ئەوەنـدەت پف دام تا وات لێ‌کردم خەڕۆ و قەپۆز بەرزبم و نەتوانم فەرمان لە کەس وەرگرم! جا ئەمە تاوانی کێ‌یە؟

- - - - - - - - - - - - - - - - - -

بابە، دەرزنە پیاوێکی وەك من دە پوول دەهێنێ، تۆش هەروا.

ویلی:- دەرزنە پیاوێکی وەك من دە پوول دێنێ! نەخێر! من ویلی لۆمانم و تۆش بیف لۆمانی!

- - - - - - - - - - - - - - - - - -

بیف:- بۆ ئەو خەونە فریودەرانەت فڕێ نادەیت پێش ئەوەی شتێکی سامناك ڕوویدات؟ (پەردەی دووەم، ل١٥١ - ١٥٤)

کاتێـك بیف هەست بەوە دەکـات کە هیـچ ڕێگـایـەك نی‌یـە بۆ گۆڕینی شەختــەبــڕواکـانی (dogmas) ویلی، دڵی پێ‌دەسـوتێ‌و بۆی دەگـریت. ئەو گریـانــەی بیف، لەلای ویلی نیشـانــەیــەکی دی دڵنیـاکـردنـە لەوەی کە هەرچی‌یــەکی ئەو بیــری لێ‌دەکــاتـەوەو بڕوای پێ‌یـە ڕاستن. هەر بۆیـەش دەست بەجێ بڕیـاری خۆکـوشتن دەدات، تا پارەی مـسوگـەرکـردنی ژیـانی (تأمین الحیاة) بۆ بیف بهێڵێت.

خۆکوشتنی ویلی، هەرچۆنێك بێت، زۆر پرسیار دەوروژێنێ:

ئایــا ئەوەی ویلی نارەزاییــەك بوو لە دژی پێش برکێی مرۆڤ فەوتێن لەنـاو دونیــای سەرمــایــەداری پڕ چەوســانــەوەدا؟ یا خود ئایا ئەوە بریتی بوو لە قوربانی‌دانی نەوەی کۆن بۆ نەوەی نوێ؟ ئایا ئەوە مزگێنی‌یەك بوو کە کەوتنی خەونی ئەمریکی‌و بیروباوەڕە کۆنەکان دەردەخات؟ ئایا ئەوە ئەمە دەسەلمێنێ کە ئەو خەونانە ڕۆح وێرانکەرن؟ ئەو پرسیارانە بەبێ وەڵام درانەوە بۆ بینەران بەجێ‌دەهێڵرێ، تا ئەوان هەر کەسەو ئەنجامێکی ڕەوشتیانەیان لێوە هەڵ هێنێ.[٢٦]

مردنی ویلی نەیتــوانی کێشــە جۆربــەجــۆرەکــانی ناو خێــزانــەکـەی دابمرکێنێتەوە، چونکە تەنانەت کاتێك خێزانەکە لەسەر گۆڕەکەی کۆ بوونەتەوە بۆ خواحافیزی کردن لە مردووەکە، جارێکی‌دی کێشەکە لەنێوان بیف و هاپی هەڵ دەچێتەوە لەسەر بەهاکانی باوکی‌و بڕیاری دوارۆژی خۆیان:

بیف: خەونەکانی درۆ بوون. هەموو خەونەکانی هەڵە بوون.

- - - - - - - - - - - - - - - - - -

هاپی:- ڕۆڵە، دەبێ بۆ تۆو خەڵکی‌تر بسەلمێنم کە ویلی لۆمان لە ڕێگای

هیـــچ دا نەمـــرد. ئەو خاوەنـــی خەونـــێـکـی یەگـجـــار گەورەو مەزن بوو. تاقەخەونێك. بۆ ئەوەی پیاوێکی زۆر بالآت لێ‌دەربچێ. ئەو لەم هەوارە تێ‌کۆشاو خەباتی کرد، ئەمەش هەر هەمان هەوارە کە دەبێ سەرکەوتنی تیادا بەدەست بهێنم.

(سەردولکەیەك، ل ١٦٠ ـ ١٦١)

بەم شێـوەیـەی دەبینین خێـزانی ویلی دادەرمێ‌و هەر یەکـە لە ئەنـدامـانی ڕێگایەك لە ژیان هەڵ دەبژێرێ کە مـسـۆگەر نی‌یە. بیف بڕیاری گەڕانەوە بۆ ڕۆژ ئاوا دەدات کەچـی هاپـی بڕیـــار دەدات لە شار بمێـنێـتـــەوەو تا ئەو «تـەڵیسمـەی سەرکـەوتن بشکێنێ، لینـداش بەسـەر لێ شێـواوی دەمێنێتەوە چونکی «تێ‌نــاگــات» (ل ١٦٢) بۆچی ویلی خۆی کوشت. سەرەنجـام، هەمـان هەواو کەشی زۆرانبـازی کە شانـۆیی‌یەکەی پێ‌کرایەوە، جارێکی‌دی هەموو خەون و پلانەکانی ئەو کەسە داروخاوانەی دەخاتە بەر هەڕەشە هەر کە «قـوللەی نووك تیــژی ساختمــانـەکـانی دەوروبـەری خانـووەکـە بە ناخی ئاسمان دا هەڵ دەچن.» (ل ـ ١٦٢)

## پەراوێزو تێبینی

1 - See AristotLe, On the Art op poetry, (penguin Bookn, I 965).

٢ ـ ئارثـەر میللەر، مردنی دێـوەرەیـەك، لەبـڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیریی کوردی (بـەغـدا ـ ١٩٨٤)، وەرگـێـڕانـی: ئازاد حەمـە شەریـف. هەر لێ‌وەرگـرتنێکی دیو نمـوونـەی دەقی شانـۆیی‌یـەکـە لەم نووسینـەم دا دەست نیشان کردنی ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم دەقە کوردی‌یە یە.

3 - Geraid WeaLes, «Arthur MiLLer; Man and His Image» in The CrucibLe; Text and Criticism (ed.) GeraLd Weales CMiddLesex; Penguin Boors, 1978) p. 336.

٤ ـ زاراوەی «خەونی ئەمریکی» دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان هاتە کایەوە. ئەو کاتەی کە زوربەی ئەمریکی‌یەکان بەشی خۆیان لەو ساڵە پڕ خێرو هاتانەدا پێ‌برا بوو تا ڕۆژانی قەیرانی گەورە. ئەو هات و هەبوونی‌یە لەناو ڕۆمانسەکانی ئەلگیر هۆراشیۆ ڕێچکەی خۆی کردبۆوە کە دەبینین هەموو کەسێك دەتوانێت دەوڵەمەند بێت بەهۆی ئیشی چاك و هەوڵی تاکە کەسی. بەم پێ‌یە، ئەو خەونـە «وێنـەی کۆمـەڵگـایـەك دەخـاتـە مێشکـەوە کە هێشتا سەرکەوتن بەهۆی تاکە کەسی ئەوەندە شتێکی ئاسانە بۆ پیاوێکی ئاسایی وەك چۆن وابـوو لە ڕۆژە بەرهـەڵـداو پڕ لە جەربـەزەکـاری‌یەکانی سەدەی ڕابردوو ،ئێستـاش دەتـوانیت بە حەزەوە ئاوڕ لە بەهـا سادەو ساکـارەکـانی ئەو ڕۆژانە بدەیتـــەوە، یان ڕووبکـــەیتـــە پێشـــەوە بۆ دەردەست کردنی هەل و ڕێکـەوت بەهەمان هێزو توانا لە بارودۆخی ئێستادا، تا ئەو ڕادەیەی تەنانەت پڕۆژەی سەربـەخـۆی پوخت و ڕێـك خەڵاتی بردنـەوەی پێ دەبـەخشرێ‌و بارودۆخی

ژیانێکی چاك بۆ تاك و خێزان دەرەخسێنێ‌و هەروا ڕەنگیشە تێرو تەسەلی لە کۆمەڵدا دەردەست بکرێت.»

Dennis WeLLand, MiLLer; Astudy of his pLays, (London; Eyre Methuen, 1976) p.39.

5 - Arther MiLLer, «The Bored and VioLent» Harpers .VoL 225 No. 1350. (No Vember, 1962). p.52.

6 - See pul BLumberg, «Work ALienation in the PLays of Arthur MiLLer» American QuarterLy, pp. 2gg - 300.

7 - Arther MiLLer, «IntroducLiOn» to Arther MoLLer's CoLLected PLays, p.23.

8 - Korn Horny, The Neurotic persohality of our time, (London; RoutLedge and Kegan PauL, Ltd. 1957) P. 288.

9 - Henry Popkin, «Arther MiLLer; The strange Encounter, » The Sewanee Eeview, VoL. LXVIII, No. I )winter, 1960» P.52.

10 - RonaLd Hayman, Arther MiLLer, P. 27.

11 - Arthur MiLLer, «The Bores and the VioLent», PP. 55 - 56.

١٢ ـ ئێـریـك فرۆم سەرنـجی خۆی دەربـارەی نامـۆ بوون بەم چەشنـە دەردەبڕێت: مەبەست لە نامۆ بوون ئەو جۆرە ئەزموونەیە کە کەسێك خۆی وەك نامۆیەك دەبینێ. دەتوانین بڵێین ئەو لە خۆیشی بۆتە بێگانەو خۆیشی وەك چەقی ئیش و کارەکـان نابـینێت ـ بەڵکـو ئیش وکـارو سەرەنجـامی ئیش وکـارەکـانی لێی دەبنـە خودان و گوێ ڕایـەڵیـان دەبێت، بگرە تەنانەت دەشیان پەرستێت.

12 - Erich Fromm, The Sane Society, (New York: HoLt, Rinehart, and Winston, 1965) P.120.

13 - Arthur MiLLer, «Introductio» to Arthur MiLLer's CoLLected PLays, PP. 29 - 30.

14 - See Arthur MiLLer, «On SociaL PLays» Introductio to Aview from the Bridge, (New York: The Viking Press, 1955) P.10.

15 - RonaLd Hayman, Arthur MiLLer, P.30.

16 - Robert Hogan, Arthnr MiLLer, (Minnea poLis: Univsity of Minnesota press, 19614» P.22.

17 - Erich Fromm, The Sane Society, P.81.

18 - Arthur MiLLer, «On SociaL PLays» P.8.

19 - Arthur MiLLer, «Intraduction» to Arthur MiLLer's CoLLeted PLayr, P.36.

20 - Percy Bysshe sheLLey, «Nales on Queen Mab», The ConpLete poeticaL Worlrs of Pevcy Bysshe SheLLey, (ed.) Thamas Hutchinon (Newyork: Oxford University press, 1945) P.806.

٢١ ـ ئەوەی بیت: دەتوانین بلێین ئەوانە ناوکی بزووتنەوەی هیپی یەکانی ئەورووپا بوون. زوربەی هەرە زۆریان گەنج بوون. بە کوڕوکچیانەوە لە ڕەوشتە کۆن و داڕزاوو بارە مەندە بوگەنەکەی کۆمەڵەکەیان بێزار بوون. هیچ بڕوایەکیان بە پەیامداریێتی نەبوو، چونکە دیتیان کە پەیامداریێتی باوك و باپیرەیان لە قوڕ بەسەری (نسکۆو تەنگوچەڵەمەی ئابووری ساڵانی سی یەکان و جەنگی دووەمی جیهان و هەزار کۆستی تر شتێکی چاکی لێ نەکەوتەوە. جا هەر بۆیە دروشمی ئەوانە یاخی بوون بوو لە ڕووی شتی کۆنینەو (پیرۆن) کە باوکیان بەدڵ دەیان پەرستن. دروشمێکی تریان ئەوە بوو: کات رابوێرەو چێژ لە جوانیو خۆشیی ژیان وەرگرە.

22 - Irving Jacobson, «FamILy Dreamts in Death of a saLesman, «Americam Literature, VoL. 47. No.2. (May, 1975) P.253.

23 - RoLLo May, The Meaning of Anxiety, PP.182- 182.

24 - Robert W. Corrigan, «The Achievement of Arthur MiLLer» in Arthur MiLLer: Acolectio of Critical Essays, (ed.) Rpbert W. Corrigan (Englewood cliffs: prentice - Hill, Inc., 1978) P.310.

26 - See Brooks Atuison, «Review of Death of salerman», NewYork Times, section 2. (February 20, 1949) P.1.

تێبینی: ئەم نووسینە بەشێکە لە نامەی ماجستێرەکەم کە لە ساڵی ١٩٨٣دا لە زانکۆی بەغداد پێشکەشم کرد

# ارثر ملر والتراجيديا الأجتماعية

آزاد حمد شريف
ماجستير في اللغة الانكليزية

تنقسم هذه الدراسة الى قسمين:

يبحث القسم الاول في تعريف عام للتراجيديا وعناصرها كما جاء في النصوص الأغريقية وخاصة عند ارسطوطاليس في كتابه فن الشعر. وبعد ذلك يستعرض الباحث عناصر التراجيديا الأجتماعية وجوانب التشابه والأختلاف بين هذا النوع من التراجيديا والترجيديا الكلاسيكية (الأغريقية). وهذه بحد ذاتها تشكل مدخلاً الى مفهوم التراجيديا الأجتماعية عند آرثر ملر وخاصة في مسرحيته «موت بائع متجول».

يحلل البـاحث في القسم الثـاني تحت عنـوان فرعي «تفكك العلاقات العائلية في مسرحية «موت بائع متجول» اسباب سقوط عائلة ويلي‌لومان ـ بطل المسرحية من وجهة نظر اجتماعية. ونستنتج بأن «الحلم الأمريكي» و «المنافسة» التي نراهما في هذه المسرحية من الأسباب المهمة التي أدت الى سقوط وحرمان وشعور باليأس عند ويلي لومان وابنائه. كتعويض نفسي لهذا الحرمان انهم يبحثون عن شاطيء الأمان في الجنس والسرقة، ولكن شتان مابين توقعاتهم وواقعهم الأجتماعي. فمن خلال محاولاتهم المدؤوبة للنجاح وسقوطهم في نهاية كل محاولة نرى كل الشرور الأجتماعية والسلبيات الموجودة في المجتمع. لذا نلمس هنا وهناك بأن الكاتب المسرحي الشهير ارثرملر يعبر بطريقة ضمنية بأن هذا المجتمع بشكل عام مريض وبحاجة الى التغيير والا فان المجتمع في طريقه الى الأنهيار وان مصير أفراده هو السقوط والضياع.

# چەند لاپەڕەیەکی نوێ سەبارەت بە بەرهەمەکانی هەردوو مستەفا شەوقی

ئومێد ئاشنا

سەبارەت بە بەرهەمەکانی هەریەك لە مستەفا شەوقی ڕەمەزان و ـ قازی زادە: دکتور مستەفا شەوقی ـ لەلایەن چەند نووسەرێکی کارامەو دڵسۆزەوە[1]

گەلێ هەوڵ دراوە بۆ ناساندن و ڕۆشنایی خستنەسەر ژیان و بەرهەمی هەریەکەیان. منیش لە لای خۆمەوە، لەم نووسینەدا هەوڵم داوە چەند لاپەڕەیەکی نوێ سەبارەت بەو دوو نووسەرو شاعیرو نیشتمانپەروەرە بڵاوبکەمەوە. ئەوەی زیاتریش هانی‌دام کە خۆمی پێوە خەریك بکەم، ئەوە بوو کاتێ بەراودی زانیاری‌و لاپەڕە نوێیەکانی لای خۆمم کرد لەگەڵ ئەو باس و لێکۆڵینەوانەی ئەو بەڕێزانە لام ئاشکرا بوو کە ئەمە من دەی‌نووسم ٧ی ئەوان نەنووسراوەو خستنە پشت گوێ‌و کەم تەرخەمی کردنیش بەرانبەری بۆ بڵاونەکردنەوەیان کارێکی باش نابێت، ئەوا لێرەدا بە کورتی‌و پووختی وەبەر چاوی دەخەین و دەی‌کەین بە سێ بەشەوە:

بەشی‌یەکەم:ـ

**مستەفا شەوقی ڕەمەزان و گۆڤاری زاری کرمانجی:ـ**[2]

گۆڤاری زاری کرمانجی، ئەدیب و مێژوونووس و شاعیرو نیشتمانپەروەر، ـ حسین حوزنی ـ داماوی موکریانی‌و ـ هەوڵی مەردانەی گیوی موکریانی‌برای، بووە ئەستێرەیەکی پرشنگدار بە ئاسمانی ڕۆژنامەنووسی کوردی‌یەوە. گەلێ باس و خوازو بەرهەمی کەڵەپیاو و نووسەری بلیمەتی کوردی بڵاوکردۆتەوەو لە لەناوچوون ڕزگاری‌کردون. بۆ نموونە لەلاپەڕە (٤، ٥)ی ژمارە (٢١)ی ساڵی (١٩٣٠)دا نووسینێکی زۆر بەرزی مستەفا شەوقی خەڵکی سلێمانی بڵاوکردۆتەوە، کە هەتا ئێستا پێ نەزانراوەو نەخراوەتە ڕیزی ئەو لێکۆڵینەوانەوە. نووسینەکە بەڕاستی شایانی ئافەرین و ڕێزلێ‌نانێکی زۆرە لەلایەکی‌کەشەوە گرنگی‌یەکی تایبەتی هەیە لە ڕووی جۆری ئەو بابەتەی کە نووسەر هەڵی‌بژاردوە، بەتایبەتی لەو ڕۆژگارو سەردەمەدا، گرنگی‌دووەمیش بریتی‌یە لە شێوەی نووسین و داڕشتن و ئەو زاراوەو ئەو واتا کوردی‌یە جوان و خۆماڵیانەی بەکاری هێناوە، کە ئەمە بۆ ساڵی ـ ١٩٣٠ ـ واتە پەنجاو هەوشت ساڵ بەر لە ئێستا هەروا کەم نی‌یە!. ئەگەرچی شێوەی چاپی ئەو ڕۆژگارە لە نرخی نووسینی هەندێ وشەو واتای کەم کردۆتەوە، بەڵام بەهێنانە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆکەی باو ئەم لایەنەش بۆ خۆی ڕاست بوەوە. ئەمە دەقی تەواوی ئەو نووسینە بەرزەی مستەفا شەوقی ـ نووسەرو ڕۆژنامە نووس و نیشتمانپەروەرە:ـ

## زمان و نووسینمان

لە عیلمی ئیجتماع دا وا دیاری ئەدا کە ئینسان لە منالی‌یەوە بە هۆی دەنگ و سەرووەی زمانی دایکەوە هۆشی یەتە بەردڵ و گیانی ئەبووژێتەوە. دەنگی لای‌لای‌یەی دایك لە ڕەگ وڕیشەی کار ئەکات. هەموو ئێش و ئازارێکی بە هۆی ئەو دەنگەوە دائەمرێت. لە کوڵی گریان بە دەنگی ئەو لای‌لایەوە ڕقی خاو ئەبێت و ژیر ئەبێتەوە، بۆیە زمانی دایك لە هەموو زمانێك جوانترو خۆشەویستترە. منالی ساوا لە منالی‌یەوە بە چی زمانێك بەخێو بکرێت و پێ‌بگات هەموو خووڕەفتارێکی لە هاو زمانانی خۆی وەرئەگرێت و بەتەواوی لەوان ئەگات. لەبەر ئەوەیە کە ئینسان بە کۆمەڵی هاو زمانی خۆی ئەبەسترێتەوە، وە لەناو کۆمەڵی غەیرەدا بە خۆشی ڕانابوێرێ وە هەڵ ناکات. کەمی خۆی بە زۆری غەیرە ناگۆڕێتەوە. وە هەتا لێی نەقەومێت و ناچار نەمێنێت لە کۆمەڵی هاوزمانی خۆی دانابڕێت و جیانابێتەوە، نەخوازا تووشی دەردو نەخۆشی‌یەك دەبێت کە ئەو نەخۆشی‌یە لەلای ئێمە بە دەردی غەریبی ئەخوێنرێتەوە. بە دیدەنی وەتەن و هاوزمانانی خۆی ئنجا دەردی سارێژ ئەبێت و لەو نەخۆشی‌یە ئەحەسێتەوە. لە دونیادا لە خلقتی بەشەرەوە تا ئێستا هەر وەکو هەموو کۆمەڵێك بە پێی وتەی زمانی خۆیەوە بە قەوم و قەبیلە

ناونــووس كراون. قەدرو نرخی بەرزیو نزمی هەمــوو قەومێكیش لە ڕیـزەی ئەقــوام دا بە زمــان و بە نووسین بە عیلم، بە زانینی خۆیـەوە ئەنـاسـرێت و ئەخوێنرێتەوە. ئەگینا هیچ میللەتێك نەبومو نەبینراوە كە زمان و نووسینی خۆی نەبێت و وە بە زمــانی غەیـرەوە ژیـابێت و پایـەدار بووبێت. هیـچ دووری بۆ نەچین با كراسێك لەبەر خۆمان دادرین چونكە ئەم كارە بە تەواوی لە ئێمە ڕووی داوە. وە ئەمڕۆ ئێمە میللەتی كورد وێنەیەكی زیندووین و نەخۆش و كوشتـەی ئەم دەردەین. لە مەیـدانی شەڕو هەرادا دوژمنـان كە بە یەكتـری‌دا ئەچن هەمیشە لە جێگای نازك و گۆشتەوە هەڵمەت بۆ یەكتری ئەبەن و شیرو گورزی خۆیان ئەوەشێنن. بۆ ئەوەی كە هەچ لایەكیان لەپێشا كوتەكی خۆی لە جێگای پێویستەوە وەشان ئەوسا ئەو لایە ئەگەر هەزار ئەوەندە بە هێزو تین بێت پەكی ئەكەوێت ناتوانێت بزوێت و بجوڵێتەوە. ئنجا ئەو میللەتانەی كە چاكەی خۆیان لە سستیو نوشوستی میللەتی كورددا دۆزیوەتەوە كوتەكیان بە جۆرێـك وەشـانـدووە میللەتی كوردیـان بە جارێـك لە دڵ و هەناوەوە برێندار كردووە. كەواتــە ئێـستــا هەر بە ئێش و ئازاری ئەو برینــەوە ئەنــاڵێنێ وە بە خەفەت و زوخاوی ئەو دەردەوە لەژێر باری غەما ئەتلێتەوە. هەچ میللەتێك هاتبێتە ناومان بە فروفێڵ بە زۆرداری كتێب و نووسینی خۆی بڵاوكردۆتەوە. ئێمەش لەبەر ئەوەی كە خوێندن و نووسینمان بە زمانی خۆمان نەبووە، لێمان داگیـركـراوە بە زمـانی غەیـرە خوێنـدن و نووسینمـان پێ‌سووك و ستەم بووە: میللەتی كورد لەبەر خۆشەویستی زمانی خۆی بێزی نەهاتوە، بە ئەتكی زانیوە بە زمانی غەیرە فێری خوێندن و نووسین بێت. لەبەر ئەوە كە میللەتی كورد تا ئێـسـتــا گەلێكیــان لە خوێنــدەواری لە عیلم و زانین مەحــروم و بێ‌بــەری ماونەتەوە. گەرچی لەناو میللەتی كورددا گەلێ خوێندەوارو عولەمای گەورەو بەناوبانگ پێ‌گەیشتوون و گەلێ كتێب و تەئلیفاتیان بە زمانی غەیرە داناوە، بەڵام هیچی بۆ چاكەی كورد نەبووە وە بە كەڵكی میللەت نەهاتووە. لەبەر ئەمەی كە بە زمانی غەیرە فێری خوێندن و نووسین بوون وە لە قوتابخانەو مەكتـەبی غەیـرەدا بەخێـوكـراون و پێ‌گـەیشتون بەزەیی‌یان بە میللەتی خۆیانا نەهـاتـوە تەربیـەی بێگـانـە وا لە مێشكیـان كاری‌كردوە ئێـستاش هی وایان تیا هەڵ ئەكەوێت نایەوێت بە زمانی كوردی خوێندن و نووسین دابمەزرێت دوو بەشی برا كوردان كە لە خوێنـدن مەحـروم ماونـەتـەوە سەبـەبـەكەی ئەمەیە. ئەگینا چی خوا هەڵ ئەگرێت برا كوزدانی كەركوك و دهۆك و ئاكرە، ئامێدی، زاخۆو ئەو ناوە كە سەرچاوەی كوردستانن بە زمانی خۆیان نەخوێنن؟!. ئاخۆ چی عەقڵێكی سەلیم ئەی‌ســەلمێنێت كە میللەتێكی ماران گەزی وەكـو ئێمـە لەپاش ئەم هەموو فەلاكەتانەی بەسەرمانا هاتووەو تووشی بووین لەم عەسری بیستــەمینی قەومیــەتــەدا زمـان و نووسینمـان بنێین بە لاوە، وە بە جارێـك ناوونیشانمان كوێربكەینەوە؟!. ئێمە ناڵێین جگە لە كوردی هیچ زمانێكی‌تر ناخوێنین، ئێمە ئەڵێین زمانی خۆمان بەسەر هەموو زمانێكا خۆشەویستـرو بە فەرق ئەبینین. ئەمانەوێ معارفمان لە ڕۆحی كوردایەتی بومشێتەوە، لەگەڵ ئەمــەش ئەو زمـانــانــەی كە پێــویـــــت بێــت خۆمان ئاوات خوازین كە فێری ببین. نامانەوێت، خوا هەڵ ناگرێت، زمانی خۆمــان بنێین بەلاوە، وە هەر ڕۆژە نارۆژێــك بە خوتــوخـۆرایی خۆمـان بە زمانێكەوە خەریك بكەین.[3]

- مصطفا شەوقی -[4]

ئەمە ئەو نووسینە جوانەی مستەفا شەوقی ڕەمەزان ـ ی خەڵكی سلێمانیو دانیشتووی بەغداو خاوەنی گۆڤاری پەیژە بوو كە ئەگە بە وردیو بە ویژدانەوە لە هەردوو لایەنی ئوسلوبی نووسین و دارشتن و ناوەرۆكی‌یەوە لێی بكۆڵینەوە ئەوا دەبێ نرخێكی تایبەتی دەرهەق بەو ڕۆژگارەی خۆی بدرێتی وە هەر ئەو مستــەفــا شەوقی‌یــە پێش ئەم نووسینـە جارێكیـان لە ساڵی ـ ١٩٢٥ ـ[5] و جارێكی‌دیكەش لە ساڵی ـ ١٩٢٦ ـ[6] دا دوو نووسینی نیشتمانیْ سەبارەت بە كورد نووسیوە. پێویستە ئەوە بڵێین كە نووسەری بەڕێز ـ كەمال ڕەئووف محەمەد ـ كاتی خۆی لە ژمارەكانی (٤١،٤٢)ی گۆڤاری ـ كاروان ـ دا، ئامـاژەی بۆ ئەم دوو نووسینـە كردبـوو، بەڵام بەداخـەوە دەقی نووسینـەكـانی بڵاونـەكـردبـوەوە. كە هەر یەكـەیـان نرخی مێـژوویی خۆی هەیـەو یەكەمیان شەست و سێ ساڵ و دوەمیان شەست و دوو ساڵ بەر لە ئێستا نووسراون. هەروەها لە ڕووی گەلێ زانیاری‌یەوە سەبارەت بە مێژینەی میللەتی كورد لە توركیا سوودی لێ‌وەردەگیرێت.

**نووسینی یەكەم: ـ بێ‌ناونیشانە ـ[7] ساڵی (١٩٢٥)**

مەسئەلـەی كوردستـانی شیمـال بۆ بناغە دامەزرانی ژیانی میللەتی كورد دەرس و عیبـرەتێكی زۆر گەورەیـە، با بەدخـواهـانی ئەم میللەتـە هەتا پێ‌یان ئەكـرێ بە هەڵـەتـو فێـڵ و درۆو دەلـەســە ئینكاری ڕاستی بكەن هیچ كەڵك ناگرێ، چونكە لەلای ئەقوامی موتەمەدینەدا میللەتی كورد لە مێژەوە ناسراوەو لێیان عەیان بووە كە ئەم میللەتە وەكو میللەتەكانی تر پێ‌گەیشتووە، ئەمڕۆ وا داوای هەقی خۆی ئەكا، ئەمڕۆ جگە لە میللەتی كورد هەموو میللەتێ بەپێی خۆی كەم و زۆر ئەم هەقـەیـان دەست كەوتـوە خۆیـەخـۆی خۆیـان بناغەیان دامەزراندوەو ڕۆژ بە ڕۆژ، هەنگاوبەهەنگاو بۆ پێشكەوتن ڕویان گرتووە. لەناو ئەم میللەتانەدا كەس وەكو كوردان بێ‌ناوو پەرش و بڵاوو پەرێشان نەماوە ـ فوائد قوم عند قوم مصائب ـ ومصائب قوم عند قوم فوائد ـ. ئەم مەسەلە كە بۆ مەنفـەعـەت پەرستـان مەسـەلێكی مەشهورە بەتەواوی لە ئێمەی ڕوداوە. جەمهوریەتی توركیا بۆ دەوام و نەفعی خۆی شێخ و سەیدو مەلاو گەورەی ئەم میللەتـە بێ‌خـاوەنـەی تەفنـوتوونا كرد، بە عالەمی ئاشكرا بە سێدارەوە هەڵی واسین و بە ناهەق كوشتنی، كە ئەم فكرە نابودبێو هەر وەكو جاران كوردان بلۆشن و بیخـۆن. فەقــەت ئیتـر ڕابـورد كوردان لەمـەودوا بە فێڵوهـەڵـەت ناخەڵەتێن خوێنی كوڕو براو باوكیان لەبیر ناچێ. لەمەو دوا منداڵی كورد بە لای لایـەی باوكـو برا كوژ ڕاو بۆ تۆڵـە بەخێـو ئەكـرێ لەبـەر كردگاری ڕۆمیان كەس لۆمەیان ناكا. مەسئەلەی كوردستانی شمالی كەوا ئێمە لە ڕۆژنامەو ئەم لاو ئەولا خەبەرمان زانی ئەمە كردگاری ئەمڕۆو دوێنێ نی‌یە بناغەی ئەم كارە

چەن ساڵێ لەمەوپێش دامەزراوە.

تورکیش ناتوانی ئینکاری بکا چونکە ئیمرۆ لە هەموو لایەك بە نهێنی جەمعیەتیان هەیەو بەهیچ لەونێ ناکوژێتەوە. میللەتی کورد هەتا هەقی خۆی دەست نەکەوێ ناسرەوێ.

لەمەوپێش کوردان کەتێگەیشتن هەقیان بە ئاسانی ناسەنرێ لەساڵی ـ ١٩٢٠ ـ ی میلادیەوە هەموو بە جارێك قیامێکی زۆر گەورەیان ڕێکخستو فەقەت ئەو عانە تورکەکان لەشەراتێ گلابوون. یونان تا ـ پولادلی ئەستاسیونی ـ نیوسەعات نزیك بە ئەنقەرەهاتبوو. کوردان پیاوەتیان نوان و ترسان لەناو عالەمی مەدەنیەتا تووشی تانوت بین و لە بەر ئەوە قیامی خۆیان دوا خست و هەروەکو جاران دەستیان دایە دەستی تورك لەمەیدانی شەڕا لەسەنگەرێکا خوێنیان بۆ ڕژانن و لە هەموولایەکی کوردستانەوە بەنان و بەرگی خۆیان لەشکریان بۆ کردو یارمەتیان دا تالەمردن ڕزگاریان کردن لەپاشا هەروەکو پێشینان فەرمویانە کوردان وایان لێ قەوما «ـ ئەوەی پێم ئەکرد خێرە، لێم بوو بە گورگم و شێرە ـ». ئەمجا کوردان بە تەواوی ئەولادی جەنگیزیان ناسیو چاك بڕوایان کرد کە «گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێ ـ». ئەو هەقەی کە کوردان داوایان کرد بوو شتێکی زۆر گەورە نەبوو داوای تاج و تەختیان لێ نەکردبوون، بۆ پێشکەوتن و سەربەرزی میللەتی خۆیان داوای ئیدارەیەکی تایبەتکاریان کردبوو کە لەژێر باری جەهالەت دا دەرچن. لەپاش ئەم هەموو ئەتك و تەفنوو توونای کوردان تورك تەمایەتی دیسان بە فێڵ و فیشاڵ کردگاری خۆی بپۆشێ، فەقەت لەمەودوا کەڵك ناگرێ. ئەمڕۆ وا لە ـ عصبة الأمم ـ وە، ئایا، لە پاریسەوە جەنابی جەنەراڵ ـ لایدونیر ـ تەشریفی هاتۆتە عیراق بۆ تەحقیقی وەقعەی ـ گۆیان ـ کە ناوچەی کوردستانە، جەنابی جەنەراڵ بە نامی بەشەریەتەوە ئاورێ بداتە کردگاری تورکان ئاخۆ عەسری مەدەنیەت، ئەم یادی جەهل و زوڵمە ڕەوا ئەبینێ؟! کە هەروا لەسەر شانی میللەتی کورد بێ».

- م. شەوقی -[٨]

ناوەرۆك و مەبەستی ئەم نووسینەی مستەفا شەوقی ئەوەندە ڕوون و ئاشکرایە کە هیچ پێویستیەکی بە لێدوان و لێکدانەوە نی‌یە. تەنها ئەوە نەبێت لە ڕووی زمان و نووسینەوە ئەگەر لەگەڵ نووسینەکەی ساڵی ـ ١٩٣٠ ـ دا بەراوردی بکەین کە پێنج ساڵیان ماوە لە نێوانداپە دەبینین ساڵ بەساڵ نووسەر لە هەموو ڕوویەکەوە بەتایبەتی لە دارشتنی ڕستەو واتای کوردی پەتی‌دا کە ئەو کاتە لە سەرەتای گەشەکردن دا بوو چەندە هاتۆتە پێشەوە. چەندە نووسەر لە هەوڵی زیاتر چەسپاندن و دەق پێوە گرتنی ئەو جۆرە نووسینە بووە. کە ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی نووسەری باش و بڕوا بوو بە پێشکەوتن و داهاتووی گەش. ئەم نووسینەی خوارەوەش هەروەك باسمان کرد ساڵی ـ ١٩٢٦ ـ[٩] نووسیویەو ساڵێك لەگەڵ ئەوی پێشوودا ماوەی هەیە!

نووسینی دووەم بە ناونیشانی:

«کوردستان»

ئەگەر بەتەواوی تێ‌بفکرین و بەڕاستی‌و بەبێ مەزاقی لێکی‌بدەینەوە لێمان دیاری ئەدا کە ئیمەمانان کە تورك نین، بە کوردو عەرەب و ئەرناود... الخ، عەناسری موختەلیفە لە عەهدی پێشووەوە هەموو بە مەیلی خۆشەویستی ناوی ئیسلامیەت و خەلافەتەوە بە ڕۆمیانەوە بەسترابوون. هەنگێکی‌تر کە بە نیسبەت ئیمەمانان لە دەرەجەی ئەقەلیاتا بوون و موسوڵمان نەبوون ئەوانیش بە هۆی هێزی یەکێتی ئەم جەمعە غەفیرەی ئیسلامیەتەوە چارناچار لەژێر باری حوکمی ڕۆمیا پێویست بوون بۆ پێشکەوتن و پارێزگاری ئەو ئیدارەیە بە دڵ و بە گیان هەموو پێکەوە هەوڵ و تەقەلامان ئەدا بەڵام لەبەر ئەوە کە بە جەهل و زوڵم ئیدارە ئەکرا سەری‌نەگرت، لەپڕا هەموو میللەتێکی بەجارێ وەڕس کرد. ئاخری بەرەبەرە یەك لە دوای یەك لە یەکتری ترازان و جیابوونەوە چۆنکە ئەم میللەتانە بە عیلم و عیرفان لە ڕۆمی کەمتر نەبوون. لەژێر زوڵم و جەهلا خزمەتی ڕۆمیان بەعەیب و عار دەزانی، ئەمە شتێکە کە بە هیچ لەونێ ئینکار ناکرێ، بەم تەرحە یەك لەدوای‌یەك لە ڕۆمی جیابوونەوە، ڕۆمی تا ئێستا لەسەر ئەم هەموو ڕیسوایی‌یە کە بە سەریانا هات هێشتا عاریان نەناوە، ئەمڕۆ برا کوردانی شیمال کەوا ڕۆژ بەڕۆژ بە کولمەرگی چاوەڕوانی ڕزگاری‌و دەست کەوتنی هەقی خۆیانن. دیسان لەم ڕۆژانەدا بەدەست ڕۆمیانەوە بە بیانوی شەپقەوە تووشی دەردەسەری کراون ئەمجارە وا بەزو شەپقە لەسەر کردنیان داهێناوە، لاسایی ئەوروپا ئەکەنەوە، بەڵام ئەبێ بزانن ئیتر لەمەودوا ناتوانن کەس بخەڵەتێنن. کەسێ نەما کەئەولادی جەنگیز نەناسێ، بەشەپقە ناتوانن خۆیان داپۆشن، ئەبێ خۆیان بگۆڕن. کوردستانی شیمالی لەرێی دەست کەوتنی هەقی خۆیان عالەم ئەزانێ کەچیان پێ‌کراو چیان بەسەر هات. نەتەوەی شوهەدای مەغفور جەناب شێخ عەلی ڕەزا ئەفەندی‌و سەید عبدالله ئەفەندی لەگەڵ خاوخێزانیان و وا لەپێش چاومانە بەڵام کوردان بە هۆی ئەم ئەتکانەوە کە تا ئێستا بەسەریانا هات زۆر چاك شارەزای هەموو شتێك بوون، زۆر شتی داپۆشراویان بۆ دەرکەوت ئەمڕۆ بەتەواوی لە سیاسەتی عالەم تێ‌گەیشتن ئیتر لەمەودوا بەنگە و باویان لێ‌ناکرێ، ئێستا وا چاوەڕوانی بەڵێنی ئەوروپا ئەکەن بەڵێ ئەو بەڵێنە هەقەو هەقێکە هەر لە کوردان زەوت کراوە. کە بە هیچ لەونێ ناشارێتەوە، چونکە ئەو هەقە ئەمڕۆ وا بەدەست غەیرەوەیە بۆ بەجێ‌هێنانی ئەم بەڵێنە ئەمڕۆ جەمعیەتی ئەقوام ئەبینین کە بۆ ئەم کارانە دامەزراوەو بڕوامان هەیە کە جەمعیەتی ئەقوام وەکو ناوی خۆی بەخۆیەوەیەتی جەمعیەتی دوەل نی‌یە، جەمعیەتی میلەلە، بۆ ڕزگاری‌و پارێزگاری هەقی هەموو میللەتێك خەریکە.

لە خۆمان وردئەبینەوە بناغی هەستی میللەتمان لەناو ئەقوامی ترا سەر بەرزەو دیارە لە چەند ساڵەوە تا ئێستا لەژێر حوکمی ئیستبدادو جەهالەتی ڕۆمیانا ڕێ‌وشوێنی خۆی ون نەکردوە، خۆبەخۆی خۆی لەناو ماڵ و موڵك و سنووری خۆیا میللەتێکی بەهێزو گەورەو زیندەیە. بە بەپێی ڕاسپاردنی

جەمعیـەتی ئەقـوام کوردان ئیمـرۆ وا لە بازاڕی سیـاسـەت دا چاوەڕوانی دەست کەوتنی هەقی خۆیان ئەکەن لەبەر ئەوە ڕۆمی ماخۆلای پێ گەیشتوە، چونکە تێگەیشتن کە کوردان ئیتر چاووڕاویان لێناکرێو نابن بە خۆراکی کەس. کوردان لە هەق لاریان نی‌یە، سەربەخۆ بەبێ یارمەتی بەبێ ڕەهبەر، پارێزگاری خۆیان پێناکرێ، واتا ڕاستە، چونکە لە هەموو لایەکەوە چاویان تێبـڕیـون، بەڵام ئەوەی خۆی بە ڕەهبـەری کوردان دائـەنێ ئەبێ لەپێش هەموو شتێکەوە بە عیلم و بە سەروەت و بە قوەت بێو میللەت بە ساحێب هەق و ساحیب ماڵ بناسن.

ڕۆمی، بڵحـە، داماوە، لە ئیـستبـدادو جەهـل و وەحشەت زیاتر مالك بە هیچ شتێکی‌تر نی‌یە، لەبەر ئەوە کوردان لەگەڵ ڕۆمی ڕێك ناکەوێ. ڕۆمی لەم ڕۆژانـەدا بەم نەوعـە شڵەژاوە، چەنـد شەخسێکی مەنفـەعەت پەرست و چەند مەبعوسێکی خۆ خۆری لە دەوری خۆی گردکردۆتەوە تەمایەتی بەوانە هەقی کوردان گوم بکا، بەڵام ئەمڕۆ جەمعیەتی ئەقوام و عالەمی مەدەنیەت هەموو بە جارێك لە ئەوانەی ئەفکاری عمومیەی کوردان تێگەیشتون، ئیتر ئەوانـە هەرچی بڵێن کەڵـك ناگـرێ چونکـە مەبعوسەکانیان کرێگرتەن، هەر وەکـو مەئمـور تەعین کراون لەبـەر ئەوە دەرهـەق بە کوردایـەتی هەرچی بڵێن هەموو پەشمە!

ئەوانــەی کە بۆ نەفـعی شەخـسی خۆیــان خەریکن ئەوانیش ئەبێ بزانن میللەت نەنووستوەو لەمەودوا بە بەندوباو هیچیان بۆ ناکرێ چونکی میللەت بۆ نەفعی چەنـد شەخـسێ لە هەقی خۆی نابـوورێ، مەنفـەعـەتی شەخـسی لە خزمــەتی نەفعی عمـومی میللەت داوابکـەن، ئەگینـا بەنـادڵی میللەت و بە فرۆفێڵ و بە زۆری قوەتی تۆپ و تفەنگ هەرچی بکرێ سـەرناگرێ میللەت تا هەقی خۆی دەست نەکەوێ ناسرەوێ چونکە هەق لە هەموو شتێك گەورەترو بەهێزترە، خواش لەگەڵ هەقە.

**«مصطفی شوقی»** [10]

**بەشی دووەم:-**

---

**«ڕاست کردنەوەی هەڵەیەك»**

ئەو کارە مەزن و دڵسـۆزانەیەی کاك ـ مومتاز حەیدەری ـ لە ساخ کردنەوەو چاپ کردنـەوەی گۆڤـاری ـ پەیـژە ـ ی مستـەفا شەوقی خەڵکی سلێمانیدا، بووە گوڕو تین و هۆیـەك کە سەبـارەت بە بەرهـەمی ئەم مـستـەفـا شەوقی‌یـەو دکتور مـستەفا شەوقی خەڵکی مەهاباد گەلێ نووسـەر بکەونە تاووتوێ کردن و پشکنین و ڕۆشنـایی دانـان لە سەر ژیـان و بەرهـەمی هەردووکیـان. بەڵام لە کتێبەکەی کاك ـ مومتاز حەیدەری [11] ـ دا هەڵەیەك هەیە کە نە مـستەفا شەوقی خۆیو نە کاك مومتاز وە هیچ کام لە نووسەران هەستیان پێنەکردوە ئەویش ئەوەیــە لە لاپــەڕە(١٣٦، ١٣٧)ی کتێبـەکـەدا شیعـرێـك هەیـە بە ناوی ـ وەسیــەت ـ، لە پێـڕستی گۆڤـارەکـەدا لە لاپـەڕە ـ ١٤١ ـ دا نووسـراوە « ـ وەصیت ـ شعـر ـ سیـد عبـدالخـالق کرکـوکی ـ » واتـە شیعـری ئەسیـری ـ شـاعیری کەرکووکی. بەڵام ئێمە بە چەند بەڵگەیەك ڕوونی دەکەینەوە کە ئەوە شیعری ـ مامەند کەرکوکی ـ [12] واتە ـ ڕەمزی ڕەحیم ـ ی کەرکوکی‌یە، کە یەکێـك بوو لەو شاعیـرانـەی لە نوێ ـ کردنـەوەی شیعـری کوردی ساڵەکانی بیست دا دەستێکی باڵای هەبوو:-

**بەڵگەی یەکەم:-**

———— مستەفا شەوقی کە ساڵی ـ ١٩٢٧ ـ گۆڤاری پەیژەی چاپ کردو بڵاوی‌کــردەوە، ئەو شیعـرو نووسینـانـەی بە دەستی لە خاوەنـەکـانیـان وەرنەگرتووە، بەڵکو لەو گۆڤارو ڕۆژنامانەوە وەری گرتوون کە پێش ساڵی ـ ١٩٢٧ ـ بڵاوکرابوونەوە. بۆ نمونە شیعری ـ هاواری وەتەن ـ ی شێخ نوری شێخ ساڵح، هەروەها نووسینی ـ وەتەن و میللەت ـ وطن و ملت ـ کە بابەتی یەکەمی گۆڤاری پەیژەیەو [13] مستەفا شەوقی خۆی نووسیویە، بەڵام تەواوی نووسینەکە لە ژمارە (١٥، ١٦)ی ڕۆژنامەی ـ بانگی کوردستان ـ ی ساڵی ـ ١٩٢٦ ـ بڵاوکراوەتەوە.

بەڵگەی دووەم:- ئەو شیعری ـ وەسیەت ـ لە ژمارە ـ ٤٤ ـ ی ساڵی (١٩٢٥)ی ڕۆژنـامـەی ـ ژیـانـەوە ـ دا بڵاوکـراوەتـەوە. لەگـەڵ دوو شیعری دیکــەدا لە ژمـارەکـانی ـ ٤٣، ٤٤ ـ ی هەمـان ڕۆژنـامـەو هەمـان ساڵ دا. هەرسێکیان بە ئیمزای ـ کەرکوکی ـ واتە مامەند کەرکوکی ـ ڕەمزی ڕەحیم ـ . بەڵام دوایی واتە لە ساڵی ـ ١٩٢٧ ـ ەوە هەر لە ژمارەیەکی گۆڤاری زاری کرمـانجی‌یـەوە بە ئیمـزای ـ مامـەنـد کەرکوکی ـ شیعری بڵاو دەکردەوە هەتا لەگــەڵ شیعـرەکـانی ـ ئەسیـری ـ دا تێکـەڵ نەبن کە ئەویش بە ئیمـزای ـ کەرکوکی‌یەوە بڵاوی دەکردنەوە ـ

**بەڵگەی سێیەم:-**

———— ئەسیــری ـ بە پەیـڕەوی شاعیـرانی کلاسیکی کوردی نازناوی خۆی لە نیوە دێڕی دوا بەیتی شیعرەکەدا نووسیوە. بەڵام کە تەماشای شیعری ـ وەسیەت دەکەین هیچ نازناوێکی لەسەر نی‌یە. بەڵگەی چوارەم ـ لەو ژمـارەیـەی ڕۆژنـامـەی ـ ژیـانەوە ـ دا کە لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی دەست دەکەوێ بە قەڵەمێکی ڕەش لە تەنیشت چاپی ناوی ـ کەرکوکی ـ یەوە نووسراوە ـ مامەند ـ ئنجا بەلای منەوە ئەو کەسەی کە وشەی ـ مامەند ـ ی نووسیوە، خوێنەرێکی سادەو ئاسایی نەبوەو هەر لە خۆیەوە ئەمەی نەنووسیوەو من دڵنیام کە شارەزایی لەم مەسەلەیەدا هەبووە.!.

**بەشی سێیەم:- ـ**

———— لەو نووسینـانـەی کە سەبـارەت بە دکتـور مستـەفا شەوقی ـ قازی‌زادە ـ ی مەهابادو دانیشتوی ئەستەمۆڵ نووسراوە سەرچاوەی یەکەم کە زانیــاری‌و دەقی بەرهــەمــەکــانی ئەوی لێوەرگیــرابێت گۆڤــاری ژینی ئەستەمۆڵە. [14] وێنەی ئەم گۆڤارەو هەندێ لە لاپەڕەکانی لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێو کاروان دا بڵاوکراونەوە. ئەو زانیاریانەی بەدەستەوە دراون هەتا ژمارە دە

(١٠)ی ئەم گۆڤارە بوون، وە هیچیان لە بەرهەمەکانی ئەو ژمارانەی یازدە (١١) هەتا پازدە (١٥) یان باس نەکردوە. هۆی ئەمەش ئەوە بووە کە ئەو ژمارانە ئەو کاتە لەلایەن ئەدیبی دڵسۆز ـ محمد ئەمین بوز ئەرسەلان ـ [15] وە لە چاپ نەدرابووەوە. لەم ڕۆژانەدا خۆش بەختانە برای خۆشەویست کاک ـ عبدالرقیب یوسف ـ ئەو پێنج ژمارەیەی گۆڤاری ـ ژین ـ ی بۆ هێنام. تەماشام کرد دوو شیعرو نووسینێکی دکتور ـ مستەفا شەوقی ـ قازیزادە ـ ی تیادا بڵاوکراوەتەوە. کاتێ هاتمە سەر ئەوەی ئەو دوو شیعرەو نووسینەکە بهێنمە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆی باو هەستم کرد هەڵەی چاپی زۆر زەق و گەورەیان تیادایەو ساغ کردنەوەیان هەروا لە خۆوەو بێ پرس و ڕاوێژکردن نابێ بەتایبەتی هەندێ واتاو زاراوەی موکری کە لای ئێمە بەکارنایەن و کەسێکی شارەزای موکریزانی پێویستە. پەنام بردەبەر مامۆستا ـ عبدالقادری دەباغی ـ و بە خۆشحاڵی یەوە ئەو گیروگرفتانەی بۆ چارەسەر کردین، ئەمە دەقی هەر دوو شیعرەکەو نووسینەکەیە شیعری یەکەم لە ژمارە ـ ١٤ ـ ی گۆڤاری ـ ژین ـ ی ـ ٢٠ ـ ی مارتی ـ ١٣٣٥ ـ ی ڕۆمی ـ ١٩١٩ ـ ی زایینیدا لە لاپەڕە ـ ٢٣ ـ دا بڵاوکراوەتەوە هەروەها لەم گۆڤارەدا نوسخەی ـ فۆتۆ ـ ی هەردوو شیعرەکەو نووسینەکەی گۆڤارەکە بڵاودەکەینەوە:ـ

شیعری یەکەم

«لە بۆ کوردان»[16]

لە موڵکی کوردەکان ئەوڕۆ تەپ و مژ هێندە پەیدابوو
دڵی مەحشەر خێزانە، یا لە ڕۆژاوا خواراوا بوو[1]
کە پووری بێکەس و خوشکی هەتیوت چاو بە فرمێسک بن
کەماڵی باب و باپیرت سەراپا چۆڵ و ڕووخا بوو
تەماشای دەسگیرانت کە بە کێردی دوژمنی نامەرد
درابوو دامەنی پاکی‌و بە هیجران قەلبی سووتا بوو
لەژێر زنجیری زوڵم و بەندی یەخسیری چەمەحزوونە
تەماشای دایکی مەحبوبت بکە، چۆن دەستی بەسترابوو
کە موڵکی موکریان و[2] شاری ساببلاغ بێ تۆ خاپوورە
لەسەر قەبری جوانان چاوی نێرگس غەرق دەخوێن دابوو
سەراپا مەوتنی ئەجدادی پێشووت جا تەماشاکە
لە بۆچ ڕووخاوە، بۆچ سووتاوە، کاکت بۆچی خنکابوو
تەماشاکە ـ لە کانی قوڵقوڵاغێ ـ[3] سوور وسوێراوە
ئەوە گەرمەبرینی کاکە، چۆن لێرە، کوژرابوو
لە موڵکی خۆشەویستی تۆ، دەخوێنێ کوند[4] سبەینان زوو
کە ئەی کوردی فەقیر تاکەی دەنوی هەستە چ قەومابوو
لە بۆچی تۆ دەنوی‌و خەڵکی بێگانە بە چالاکی
بیەستن دەستی پڕ زۆرت، مەگەر مەردانە کێت وابوو
لەنێو کوردان کەسێك موڵکی نەبێ خۆ نۆکەرە بێشك
لەسەر خەڵکی لەبەر موڵکە، کە ئەمری ئێوە موجرابوو[5]

بەبێ موڵکی وەتەن ئەی قەومی کوردی لێت یەقین بێ تۆش
بە یەخسیری و زەلیلی سەر دەبەی عومرێك کە بۆت مابوو
دەگەڵ ـ شەوقی ـ وەرن، ئەوڕۆ هەتاکو فرسەت و ماوە[6]
بە عیلم و مەعریفەت تێراو بکەن مەوتن کە ڕووخابوو»

ـ قازی زادە ـ

م. شەوقی

پەراوێزەکانی ئەم شیعرە:ـ

---

١ ـ لەبەر ڕەوانی شیعرەکە وەهامان نووسی‌یەوە، ڕاستیەکەی ـ خۆرئاوا ـ یە
٢ ـ ناوچەی موکریان و شارستانی ـ ساببلاخ ـ مەهاباد
٣ ـ کانی‌یەکی نزیك مەهاباد بووە.
٤ ـ کوند ـ کونەپەپوو. بووم
٥ ـ موجرا ـ لەوە دەچێ ـ ئیجرایێ‌و ئەمە هەڵەی چاپ بێت
٦ ـ واوی ئاخری فرسەت لە زاراوەی موکریان دا نیشانەی ـ کۆ ـ یەواتە: فرسەتتان ـ

شیعری دووەم:

«مەگەر، لێم عاجزی ؟!»[17]

«لە من بۆچ زیزی؟!، عومرم، چاوەکانم، ماهی تابانم
تەووێڵت[1] بۆچی گرژە؟! یا چە قەوماوە، چە تاوانم؟!
لەپێشیا، پێشی تابوری موژەت هەردوو برۆت کەچ بوو
دڵێ بۆ تیپی عاشق ـ ذوالفقار ـ ە تیغی بوڕڕانم
کە مەندی[2] زوڵفی خاوت چونکە بازوبەندی یارمو ـ مە ـ[3]
چە حاجەت واعیزی سەر زل بە ئەفسون بەندی دەستانم[4]
(....................)
مەلامەت بەس بکەن چون من غەریب و خانەوێرانم
تەلیسمی گەنجی حوسنی تۆ موعەمای عالەمی کۆنە
لە حەللی وی بەسەرچوو عومرم و هێشتاکو (جوانم)
کە نەرمین باوەشی تۆ بێشکەیە بۆ قەلبی مەجروحم
بە لەنجە لێگەڕێ ساتێ، هەدا[5] دا تفلی گریانم
بەڵێ ـ شەوقی ـ کە کوردە چاوبەخوێنە، قەت هەدا نادا
بە خوێنی چاوەکانم سوور بووە چاکی گریبانم»
٢٣ ـ کانوون اول ٣٣٣

ـ قازی زادە ـ[18]

ـ م. شەوقی ـ

پەراوێزەکانی ئەم شیعرە:-

١ - تەوێڵ:- ناوچاوان. هەنیە.
٢ - واتـا، کەمـەنـدی زوڵـفی خاوت وەك دوعـای چاوەزار لە باسـك و بازووم دایەو ئیتر واعیزی سەرزل هیچ نیازێکم بە دوعای ئەفسوون بەندی تۆ نی‌یە. دوعای ئەفسوون بەند لە نێو عەجەم دا بۆ پاراستنی گشت بەڵایەك دەی‌نووسن.
٣ - مە - بە شێوەی موکری - ئێمە - بەڵام ئەگەر بە (بازوومە)ی بخوێنینەوە ئەوسا لە رووی ماناوەو لە رووی گونجانی لەگەڵ بازوویەندو دەستان و بەندا باشترێك دەبێ.
٤ - دەستان - واتە زمان بازیو پێداهەڵ گوتنێ پرووپووچ.
٥ - ئەشێ (هێشتاوەکو) بێ و هەڵەی چاپ. کە لەنگی کردوە.
٦ - هەدادان - بە زاراوەی موکریان واتا - ئارام گرتن، هێدی بوونەوە.

دەقی نووسینەکە:

- وەتەن -[١٩]

- قازی زادە -

- مصطفی

لە خیلقەتی حەزرەتی ئادەم کە ئینسانی حازری هەموو نەوەی وینە، (دنیا - وەکـو لە کتێبی موقـەدەس دا نووسـراوە سەراپـا چۆڵ و دێم و لێـرەوار بوو، بە غەیـری وشـەوشی باو، گرەگـری رەعـلو خورەخـوری چۆم و دەریـایـان و زریوزریوی دەعبایان، شتێکی‌دی لەسەر ئەو ئەرزە وەسیعە مەوجود نەبوو). سەراپا چۆڵ، واحد القهار!!.

ئەوی دەمی حەزرەتی ئادەم هاتـەسـەر ئەو ئەرزە چۆڵـەو بە موقتـەزەیـاتی ئیرادەی خودای، مەئموووربوو، کە (بە ئەولادی خۆی ئەو سەحرای واسیعەی مەعمـوور بکـاتن. تاوەکـو لەنێـو زوریەتی ویدا هەندێك وەحدانیەتی خودای بزانن. وجودی وی تەقدیس بکەن) - حەدیسی قودسی -.

خودا دەفەرموێ:- کنت کنزاً مخفیاً، فأردت ان اعرف - یەعنی، ئەمن وەکو خەزێنەی پێش چاوان ون بووم و کەیفم لێ‌بوو کە عەبدی من بمناسن، داوەبوو کە دنیام خەلق کرد.

جا لەبەر سری ئیلاهی بە زەمانێکی کەم، لە دایك و بابێکی، زۆر کەس پەیدابوون و،سەبر سەبر رووی دنیایان داگرت. بەڵا ئەوان وەکو ئێمە، خانوو شاریان نەبوو. جوتیان نەدەزانی، لیباسیان دە بەردا نەبوو، وەکو مەیموونان بە میـوەی داران و رەگی گیـایـان بەرێ دەچـوون وە لەبـەر شـیـدەتی سەرمـای زیستـانێ و گەرمی هاوێنێ و وەحشـەتی درنـدان زۆریـان مردوون، موتـەفەرق بوون، ئەگـەر ئەو ئینسـانـە زەعیفـانـە بە ئەو جۆرەی مابان و لە بۆ محافەزەی حەیاتی خۆیان لە قوەی عەقڵیان ئیستفادە نەکردبایە، ئەورۆکە مومکین بوو ئینسانێك دەسەر دنیا نەبێ.... (دوماهیك هەیە)

- وەتەن - پاشماوەی ژمارە - ١٠ -

مەعلووم بوو کە ئەوی وەی زەروورەتی - ئیحتیاج - ئینسانی مەجبوور کرد کە بەعزێ، حەتتا - ئەلمەقدور - لە موقابیلی دوشمنی خارجی رابوەستن، وە. بە کۆمـەڵی موداف‌عـەی خۆیـان خۆیـان بکـەن، چونکـە حەیـاتیـان لەژێـر تەهلەکـەدا بوو، لەدوایـە لە مەغـارەو هەوەڵ - هەوەڵ داران - داوەخـزیوون و عائلەیان تەشکیل کرد. لە بەردو دار لە بۆ مودافەعەی نەفسیان ئەسلەحەیان دروست کردو بەو نەوعە مەرتەبەی ئەوەڵ مەدەنیەت پەیدابوو. لاکین ئەوەش لە موقابیـل ئیحتیـاجـاتی نامـوتەناهی ئینسانی کیفایەتی نەدەکردو شەرۆژی ئیحتیاجی ئینسانان رووی لە زیادەیی بوو، مەجبور بوون لە قوەی عەقلیەیان ئیستیعـانـە بکـەن و دەفعی ئەو ئیحتیـاجـانـە بکـەن و ئەوە بوو کە مەعدەنیان کەشف کردو لیـباسیـان دروست کردو حەیـوانـاتی وەحشیە وەکو ئەسپ و گاو گامێشیـان گرت و رامی خۆیـان کرد، هەتـاوەکـو ئیحتیـاجی سەفـەرو ئیحتیـاج جووت و خواردن بەوان بتـوانـن تەئـمین بکـەن. ئەوە تەبـەقـەی دوەمی مەدەنیـەتـە، وە لە ئەو دوایی‌یـەدا حەقیقـەتەن عائلەی بەشەر کەمێك رەفاهی پەیداکرد. لاکین چونکە ئینـسان بە تەبیعەت مەجلوبی حیرس و تەمەعن وە لە بۆ ئەوەی کە بە ئەزیەتێکی کەم سەعادەتێکی زۆر پەیدا بکەن هەڵستان دەستیان کرد بە خراپی و چاویان لە نیعمەتی جیرانیان بری کە تاڵان بکەن و ماڵی زۆر پەیـدابکـەن. بەو نەوعـە ئینسـان لەبـۆ جەلبی مەنفەعەت بوون بە دوشمنی یەکتـری، دەستیـان بە شەرو پیـاوکـوشتن کردو بەو نەوعـە حوسنی برایەتیان لە فکر چووەوە. بەو کەرەتەی ئینسان مەجبوور بوون کە بە موتەفیقی نیعمـەتی خۆیـان لە موقـابیـل یەکتـری محـافـەزە بکـەن، وە ئەوەبـوو کە عەشیرەت و ئەقوام پەیدابوون، وە مەعلوم بوو کە ئەو هەموو ئەزیەتەو سەعیە لە بۆ تەئمینی ئیستراحەتە، ئەمیش فەقەت بە دوو شتان مومکین دەبێ:

١ - تەدارك کردنی لوازماتی حیاتیە
٢ - محافەزە لە دوشمنی خارجی

١ - لوازماتی حیاتیەی ئینسانی:- ئێمە دەزانین کە ئینسان بە خواردن و پێخەف و لیباسی موحتاجە، ئەوانەش مومکین نابێ کە بە یەکێ بێتە جێ. دەبێ یەکێك خەیات بێ، ئەوی‌دیکە کەوش دروو، وە یەکێکی دی جوتیار بێ، کەوش دروو لە موقـابیـل کەوشی خۆی لە جوتیـارێ‌دەغڵی بکـرێ‌و جوتیاریش لە موقابیل دەغڵی لە خەیاتی لیباس بستێنێ. هەتاوەکو نە جوتیار بێ‌لیـاس و خەیـات بێ‌دەغـڵ و نەکـەوش دروو بێ لیـاسی بمێنێ. لەوەش تەقسیم - ی ئەعمال هاتە وجود، کە دەڵێن - انسان مدنی الطبعه - مەعنای وایە لەبۆ دەفعی احتیاجی خۆی دەبێ لە رەفیقی خۆی مەزهەری معاونەتی بێ. ئەوەش بینای میدەنیەتەو بەس.

٢ - محـافـەزە لە دوشمنی خارجی:- ئەوەست دیـسـان بە بە پیـاوێکی مومکین نابێ، چونکە ئەو تەنها نە لە موقابیل درندەی وەکو شێرو پڵنگ و نە لە موقابیل دوشمنی بەنی نەوعی خۆی پێ محافەزە ناکرێ جا لەبەر ئەوی مەجبور بوون کە چەند کەسێك وەخربێن و ئەو دوشمنانە دەفع بکەن. بەڵام

ئینسان ئەو وەختەی دەتوانن پێکەوە بژین کە ئیرتبات و تێکەڵیان بێ. ئەو تێکەڵیەش یا خزمایەتی‌یە، وە یاخود هاوزبانی‌یە، کە ئەویش دەچێتەوەسەر خزمایەتی‌یەکی، پیاو کە بۆی مومکین بێ ئەڵبەتە دەگەڵ خزمی خۆی دەژی، لەبەر ئەوی بوو کە خزم و ئەقریبا وەخربوون و لەبۆ دەفعی ئەو ئیحتیاجیانەی کە عەرزم کردن عەشیـرەتیـان دانـا، ئەو عەشیـرەتـەش زۆر بوو، بووە دوو عەشیـرەت، دە عەشیـرەت، نیهـایـەت قەومیکی لێپـەیـدابـوو. وە دە هەقیقـەت دا هەر میللەتێـك کە عیبـارەتـە لە ئەو هەمـوو عەشیـرەتـانە خزمی یەکترن و ئەرازیەك کە بۆ خۆیان گرتوە وەتەنی وانە. چلۆن خانەوادەیەك ـ یەعنی پیاو و ژنێك بێ‌ماڵ ناژی، وە عەشیرەتێك لە بۆ تەئمینی ئیستراحەتی خۆیان موڵکێکیان پێ‌دەوێ کە مەڕی لێ‌بلەوەڕێنن و جووتی لێ‌بکەن ئەڵبەتە قەومێکی لەبۆ ئەوەی لەسەر دنیایە بمێنێ ئەرزێکی پێ‌لازمە ئەو ئەرزە عیبارەتە لە مەجموعە موڵکی ئەو عەشیرەتانە، ئەگەر وابو بە مولاحەزەی وی کە ئەمن کوردم ئەرزی من کوردستانەو وەتەنی ڕەنگینی منیش ئەوەیە. بە مولاحەزەی وی کە عەشیرەتیم، موڵکی من سابلاغە، وە بە مولاحەزەی وی کە فەردم ماڵی من لە سابلاغە، ئەگەر وابوو مەعنای وەتەن مەوهوم نی‌یەو مەحەبەتی وەتەن وەکو پێغەمبەر فەرمویەتی ـ حب الوطن من الأيمان ـ لازمە. وەتەنی ئێمە کە کوردان، عیبارەتە لە مەجموعی موڵکی ئەو عەشیرەتانە کە هەموو پێکەوە خزمن و هاوزبانن. لەبۆ محافەزەی مەوجودیەتی خۆیان بەڵکو چەند هەزار ساڵ لەوی پێش وەعـدو قەولیـان کردوە کە پێکـەوە بژین و لە موقـابیـل دوشمنی خارجی پێکـەوە حەرەکـەت بکـەن لەبـۆ ئێمـە لە باب و باپیـرمان بە میرات بەجێ‌ماوە وە دەبێ ئەگەر دەمانەوێ کوڕی بابی خۆمان بین قەولی‌وان نەشـکـێـنـیـن، حیـمـایـەی موڵـکـی یەکـتـری بکـەیـن. چونکـە هەمـوومـان خزمین، بەو نیشـانـە کە فکرمان، حسمان، ئەخلاقمان عاداتمان موشتەرەکە، ئەگەر بێت و قـەی وان بەجێ نەهێنن، مودافەعەی یەکتری نەکەین، چمان لێ‌دێ؟ بەبێ شك هەمووشمان دەبین بەژێر ئەقوامی دیکە کە چاویان لە مەملەکەتی خۆشی ئێمە بڕیوە. ئەمیش پێم وایە پیاو کە پیاوبێ، پێی عەیبە ماڵی خۆی بە حیزیی بەجێ بێڵێ، وە حەرەمی خۆی بەرەڵڵا بکاو بێتە نۆکەری خەڵقی. عەرەب واتەنی :ـ

«فلختر لنفسـك منزلاً تعلو به
أو مت كريماً تحت ظل القسطل»

بەس وەتـەنی ئێمـە مەعلومـە، حازرە، مەوجـودە ئەویش کوردستـانـە ـ مەهدی ـ ظهور ـ [21] ی مەدەنیەتی عالەمە. (. . . . . ، . . . . . ، . . . . . )ی ئێمە بینای حکومەتیان دانا (. . . . . . )ی ئێمە نموونەی شەجاعەتی باب و باپیـرمـانـە، موڵکی ئێمـەو، وەتـەنی ئێمـە یادگـاری (. . . . . . ، . . . . . ، . . . . )ە. ئەوانە لە مەجالیـسی شاهانەی خۆیان بە ناموس سوێندیان خواردوە کە حیفـزی بکـەن. ئەڵبـەتـە ئێمـەش حیفـزی بکـەین و دەبێ قسـەی وان نەشکێنین، هەتاوەکو عالەم تەعنمان نەکا.

لەدوای ئەوە کە وەتـەنمـان حیفـزکـرد، لەبـۆ تەئمینی ئیستـراحەتی خۆمان دەبێ سەعی بکەین وەکو قەومی دیکە بە واستەی زۆر شتی تازە ـ ظهور ـ موڵکی خۆمان، ماڵی خۆمان ئاوەدان بکەین. ئەگەر وا بکەین دەژین وە ئیللا دەمرین وە یاخو دەبین بە یەخسیر

« ـ زان صرصر شمال و زان اتش جنوب
شوقی وطن خراب و گلشن ارغوان شود»[22]

قازی زادە
ـ مصطفی ـ

پەراوێزەکان :ـ

---

١ ـ ئەو نووسەرە بەڕێزانە بریتین لە ـ «پیرەمێرد، نجم الدين مەلا، دکتور مارف خەزنـەدار، دکتـور کەمـال مەزهـەر، هێمن، مومتاز حەیدەری، کەمال ڕەئووف محەمەد، عبداللەحداد».
٢ ـ گۆڤاری زاری کرمانجی ـ تەماشای کتێبی مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی ـ /عبدالجبار محمد جەباری/ بکە ـ ل٨٩ ـ
٣ ـ زاری کرمانجی ژمارە ـ ٢١ ـ ساڵی ١٩٣٠ ـ ل٤، ٥ ـ
٤ ـ لە گۆڤارەکەدا ناوەکە بەو شێوەیە نووسراوە.
٥ ـ ژیانەوە ژمارە ـ ٤٩ ـ ت٢ س١٩٢٥
٦ ـ ژیان ژمارە ـ ٦ ـ شوباتی س١٩٢٦
٧ ـ لەبـری ناونیشـان ئەم بەیتـە شیعـرە فارسیـەی نووسیـوە کە ئێمـە لێـرەدا دەی‌نووسینەوەو ماناکەی لێك دەدەینەوە: بەڵام نەم زانی ئەم بەیتە لە شیعری کام شاعیردا هاتووە!.

مکن ز غصه شکایت که در طریق طلب
به راحتی نه رسید انکه زحمتی نه‌کشید

واتا:ـ لە خەم و پەژارە شکات و سکاڵا مەکە چونکە لە ڕێگای ویستن دا ئەوەی کە زەحمەت و ڕەنجی نەکێشا هەرگیز بە ڕاحەتی‌و خۆشی نەگەیشتوە.
٨ ـ م. شەوقی. ژیانەوە ژ ٤٩ ـ ت٢ ١٩٢٥
٩ ـ ژیان ژ ـ ٦ ـ ٢٥٠ی شوباتی ـ ١٩٢٦ ـ
١٠ ـ سەرچاوەی پێشوو. ناوەکە خۆی وەها نووسراوە
١١ ـ مستەفا شەوقی‌و پەیژە. مومتاز حەیدەری ـ ١٩٨٥ ـ
١٢ ـ بۆ شارەزابـوون لە مامـەنـد کەرکـوکی بڕوانـە. لێکـۆڵینەوە بەنرخەکەی مامۆستا کەریم شارەزا لە گۆڤاری ـ بەیان ـ ی ژ (١٧، ١٨، ٢٣)
١٣ ـ گۆڤاری پەیژە. ل٩٩
١٤ ـ گۆڤاری ـ ژین ـ وەك لە بەرگی یەکەمی نووسراوە ـ گۆڤارێکی ـ ئاینی ئەدەبی، کۆمـەڵایـەتی، ئابـوری‌یـە، بە کوردی‌و تورکی دەردەچێت. بەڕێوەبەری بەرپرسیاری ـ ئەشرەف حەمزەو دوای ئەو مەمدوح سەلیم بووە. یەکەم ژمارەی لە (٧ی تشرینی دوەمی ١٣٣٤ی ڕۆمی ـ ١٩١٨ ـ ی زاینی لە ئەستەموڵ دەرچووە. دەنگی کۆمەڵی پێشکەوتنی کورد بووە. بیست و پێنج ژمارەی لێ‌دەرچووە.

١٥ ـ دەربارەی ـ محمد ئەمین بوزئەرسەلان ـ بروانە نووسینێکی مامۆستا ـ مستەفا نەریمان ـ گۆڤاری کاروان ژ ـ ١٩ ـ س١٩٨٤

١٦ ـ بروانە گوڤاری ـ ژین ـ ژ ١٤ ٢٠ی مارتی (١٣٣٥) ـ ١٩١٩ ـ ل٢٣

١٧ ـ بروانە گۆڤاری ـ ژین ـ ژ ١٥ ـ ٣٠ی مارتی ١٣٣٥ ـ ١٩١٩ ـ ل٢٠

١٨ ـ دکتور مستەفا شەوقی بەم ئیمزایە شیعرو نووسینی خۆی لە گۆڤاری ژینی ئەستەموڵ دا بلاْودەکردەوە.

١٩ ـ گۆڤاری ژین ـ ژ ـ ١١ ـ ١٥ی شوباتی (١٣٣٥) ـ ١٩١٩ ـ ل١٢ پێش ئەویش ژمارە ـ ١٠ ـ ی ٢ی شوباتی ١٣٣٥ی رۆمی

٢٠ ـ شێوەی نووسینی ناوەکەی بەو جۆرەیە.

٢١ ـ نەدەکرا وشەی ـ ظهور ـ ی عەرەبی بکەمە ـ زهور ـ هەتا رێنوسەکەی ببێتە کوردی، چونکە ماناکەی دەگۆڕێو دەبێتە مانای جیاواز لەوی خۆی.

٢٢ ـ مانای ئەو بەیتە فارسی‌یە بە کوردی ئەمەیە:ـ

ـ لەو بای سەرسەرە کە دەبێتە گێژەڵوکەو ولاْت وێران دەکات، کە مەبەستی هێزی سامناکی روسیای تەزاریە کە ئەو بەشەی ئێران و کوردستانی ئێرانی کاول کردو قەلاْچۆی خستە مەهابادەوەو لەو ئاگرەی کە لە خوارووی ئێرانەوە دێت و مەبەستی هێزی رەشی ئیستعماری بەریتانی‌یە، ئەی شەوقی، نیشتمان وێران و کاول دەبێت و گوڵی گوڵستانی وەك رەنگی ئەرخەوانی ماتەمینی بەسەردا دێت.

---

# صفحات جديدة من نتاجات كل من مصطفىٰ شوقي رمضان والدكتور مصطفىٰ شوقي قاضي زاده

ئومید ئاشنا

نشر بعض الأدباء والباحثين في الأونة الأخيرة، مجموعة من البحوث والدراسات حول حياة ونتاجات كل من مصطفىٰ شوقي رمضان ـ صاحب مجلة ـ پەیژە ـ ،والدكتور مصطفىٰ شوقي قاضي زاده، والقوا أضواء جديدة عى حياتهما وكتاباتهما المنشورة وغير المنشورة. شارك كل من الشاعر ـ پيرەميرد وحسين حزنى مكرياني‌و نجم الدين ملا و د. معروف خزندار وممتاز حيدري وكمال رؤوف محمد وعبدالله حداد، مشاركة جدية ومثمرة، لأعطاء هذين الأديبين قسطاً كبيراً من حقوقهما ازاء خدماتهما وحقيقة حياتهما المنسية عبر السنين ورفع الستار عن كتاباتهما وفتح ممتاز حيدري صفحة جديدة، عن هذا الموضوع عندما أصدر كتابه ـ مستەفا شەوقی وپەیژە ـ.

تناول الكتاب البحث عن مصطفىٰ شوقي رمضان صاحب مجلة ـ پەیژە ـ سنة ١٩٢٧ وعندما قارنت ماتجمع عندي من المعلومات حول هذين الأديبين وما نشرت حولهما، تبين لي بأن مالدي من المعلومات تشكل بعض الصفحات الجديدة حول الموضوع. وفي دراستي هذه، حاولت ان اوجز المعلومات والآراء وانشر النصوص الموجودة. بحوزتى، مثلما كتبت في الأصل، الا من ناحية واحدة هي شكل الكتابة القديمة. حيث ان القاريء في يومنا هذا يصعب عليه قراءة هذه الكتابة، وحاولت ـ قدر المستطاع ـ نقلهما الى الشكل المتبع حالياً في الكتابة.

وقسمت البحث الى ثلاثة اقسام:ـ في القسم الأول تناولت موضوع ـ ثلاث مقالات لـ ـ مصطفىٰ شوقي ـ صاحب مجلة ـ پەیژە ـ المنشورة اولهم في مجلة زارى كرمانجى ـ التي اصدرها الكاتب والمؤرخ حسين حزنى مكريانى في رواندز سنة ـ ١٩٢٧ بعنوان ـ زمان و نووسینمان ـ لغتنا وكتابتنا ـ سنة ـ ١٩٣٠ العدد ـ ٢١ ـ . ومقالتين في جريدة ـ ژیانەوە ـ ١٩٢٥ ـ وجريدة ژيان ـ ١٩٢٦ ـ. الأولى ليست لها عنوان وتناول الكاتب موضوع الثورة الكردية في تركيا بعد الحرب العالمية الأولىٰ، والمقالة الثانية بأسم ـ كردستان ـ، لها اهمية خاصة وبالغة في الحساسية في تلك الأيام، حول الوضع السياسى والأقتصادي والأجتماعي للشعب الكردي.

والقسم الثاني حول تصحيح خطأ ورد في الصفحة ـ ١٣٦ ـ من كتاب ـ مستەفا شەوقي وپەیژە ـ، ولم يدركه صاحب الجملة نفسه في حينه، حيث توهم مصطفىٰ شوقي بأن القصيدة المنشورة في الصفحة المذكورة للشاعر ـ عبدالخالق اثيري ـ ولكننا أوضحنا بدلائل واضحة ان صاحب القصيدة هو ـ مامند كركوكى.

والقسم الثالث من البحث حول ـ الدكتور مصطفىٰ شوقي قاضي زاده ـ . وحصلت على قصيدتين ومقال لهذا الشاعر والأديب في مجلة ژين التي صدرت في ـ استانبول عام ـ (١٩١٨ ـ ١٩١٩) في الأعداد ـ ١١، ١٤، ١٥ ـ. وانني على يقين بأن لكل من هذين الأديبين كتابات واشعار اخرى غير منشورة حتىٰ الآن.

# سوریالزم

نووسینی: معتصم سالەیی

باس و لێدوان دەربـارەی ڕێبـازێکی ئەدەبی و هونـەری و فەلسـەفی وەك ڕێبازی سوریالیزم وامان لێدەکات کەیەك بەیەك لە هەمووئەو هۆو پاڵپشتانە بکـۆڵینـەوە کەوا بوونـەتـە هۆو مایـەی سەرهـەڵ دان و پێکهـاتنی ئەم ڕێبازە. ڕێبازی سوریالیزم وەکو هەر ڕێبازێکی دیکە دومەڵان ئاسایی لە زەوی‌یەکەی خۆی‌دا نەڕواوە، بەڵـکـو بارو دۆخ و زرووفـێکـی تایبـەت بووە بنـەمـای سەرهـەڵـدان و بڵاوبـوونـەوەی. بەدرێـژایی مێـژوو دەبینین چەنـد ڕێـبازو قوتـابخـانـەی فەلسـەفی و ئەدەبی و هونەری پەیدابوون و لەنێو خەڵکی‌دا شوێن خۆیـان کردوّتـەوە، خەڵکیش کەم و زۆر بەپیـریـانـەوە چوون و بانگیـان بۆهەڵداون. ئەدەبی یۆنانی کۆن بارودخی ئەو سەردەمەی یۆنان بووە هۆی سەرهـەڵـدان و چەسپ بوونی. لەشـانـۆیی‌یـەکـانیـان دا دەردەکـەوێت کەوا هێزێکی نادیار پاڵ بە پاڵەوانەکانیانەوە دەنێت و چارەنووسیان دەست نیشان دەکـات. ئەم ڕێـبازە بەبیـرو باوەڕو فەلسـەفـەی باوی ئەو سەردەمەی خۆیەوە بەنـدە. بەڵام ئێستـا لەم سەردەمـەی ئێمـەدا هیـچ نووسـەرێـك یاخـود هونەرمەندێك ناتوانێت پەیڕەوی ڕێبازێکی ئاوها بکات، بۆ نموونە شانۆیی نووسێکی هاوچەرخ ناتوانێت پاڵەوانی شانۆیی‌یەکەی بکات بەبووکە شووشە تابە هەوەسی خواوەندەکان بجووڵێتەوە.

وەکـو ووتمـان هەر بیـرو بـاوەڕو فەلسـەفەیەکی تایبەتی بگرین ئەوا دەبینین ڕۆڵـەو جگـەرگـۆشـەی قۆنـاخ و سەردەمـەکـەی خۆیـەتی. سـەدەی بیـستەم بە سـەدەیەکی دژوارو جەنجاڵ دادەنرێت، هەر لەسەرەتای ئەم سـەردەیەمانەوە، گەلێك بیرو باوەڕو ڕێبازو قوتابخانەی هونەری و ئەدەبی پەیدا بوون و خۆیان بەسـەر بیـرو هۆش و مێشکی نووسـەران و هونـەروەران دا سەپـاند. هەر لەم چەرخە جەنجاڵەمان دا گەلێ شتی گرنگ و کاریگەر ڕوویان داو بوونە هۆو تەکاندەر بۆ ئەو هەموو ڕێبازو قوتابخانانە. لە سەرەتای هەموویانەوە جەنگی جیهانی یەکەم دێت، هەروەها کێشەی چینایەتی و نەتەوایەتی قووڵ بوونەوەو باری پیشـەسـازی و کشت وکـاڵی گەشـەی سەنـدو، بەجـۆرێکی سەرسـوڕ هێنـەریش ئاستی خوێنـدەواری و زانـست پەرەی‌سـەنـد. لەلایـەکی تریشـەوە ژمـارەی دانیشتـووانی سەر زەوی بە شێـوەیـەکی سەرنـج ڕاکێش زیادی‌کرد، هەروەها گەلێ شتی تردەرکەوتن و زۆر بەگرانیش کەوتنەوە لەسەر مرۆڤایەتی و پاشماوەی ناهەمواریشیان لەدووای خۆیان بەجێ‌هێشت.

شەڕو جەنگ لەتێڕوانینی خەڵکی دەگۆڕن و وەهادەکەن کەوا بەچاوێکی دیکـەوە بڕوانـە دەورو بەری خۆیـان، بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی و تێپەڕبوونی هەروا بەسانایی بەسەر بیرو هۆشی خەڵکی‌دا ڕانەبوورد، بەڵکو ئەم جەنگـە ترسنـاکـە گەلێ شتی بەدووای خۆی‌دا ڕاپێـچ کردو، هۆیـەکی کاریکـەریش بوو بۆ سەرهـەڵـدان و بڵاوبـوونـەوەی گەلێ بیـرو باوەڕو ڕێبازو قوتـابخـانـەی هونـەری. سوریـالیـزمیش یەکێـك بوو لە ئاکامەکانی جەنگی یەکـەمی جیهـانی لە ڕەوتی ڕۆشبیـری‌دا. ئەم قوتـابخـانـەیـە ئەڵقـەیـەك لەزنجیـرەیـەکی درێـژ پێـك دەهێنێت. لەپێش ئەم ئەڵقـەیـەدا، ئەڵقـەیەکی گرنگی کە بەدی دەکرێت کە ئەویش پێی دەووترێت ڕێـبازی ڕەمزی. ئەو ڕێبازە ڕەمزی‌یە لە سەدەی نۆزدەهەمدا سەری هەڵداو، گەلێ نووسەرو شاعیر چوونە ڕیزیەوە وەك: بۆدلێرو مالارمێ و ڕامبۆو ڤرلین و گەلێ نووسەری تر. . . ئەم شاعیرو نووسەرانە لە سەردەمێکی جەنجاڵ و دارزاوو داڕزاودا دەژیان. هەروەك ئەم سـەدەیـەی ئێمـە، لەو سەدەیـەشـدا گەلێ جەنگ و شەڕو شۆڕو هەراو هوریا بەرپابوو وەك شۆڕشی مەزنی فەرەنسـاو شەڕی حەفتاو کۆمۆنەی پاریس و شەڕو جەنگەکانی ناپلیۆنی یەکەم. یاخود چینی سەرمایەداری ڕۆژ لەدووای ڕۆژ زیاتر چنگی لە گۆشتی خەلکی ڕەش و ڕووت گیردەکرد. ئەم هەمـوو دیـاردانـە بوونـە هۆی نائومێدی و قات و قڕی خەڵکی ئەو سەردەمە. لەلایەکی دیکەیشەوە نابێت ئەوە لەیاد بکرێت کە ئەو سەدەیە بە تەکانێکی گورج و گۆڵ لەڕەوتی مرۆڤـایـەتیـدا دادەنـرێت بۆپـەرەو پێشـەوە چوون. شاعیـران و نووسـەرانی قوتـابخـانەی ڕەمزی هەروەك خەڵکی سەردەمەکەیان بەسـەر لێشێواوی و هیوا بڕاوی‌یەوە دەژیان، بەڕادەیەك ئەو نووسەرو شاعیرانە بڕوایـان بە ڕواڵەتەکانی بەرچاوی هەست پێ‌کراو نەما. بۆدەربڕینی هەست و هۆشیان پەنایان دەبردە بەر ڕەمزو هیما. (ڕامبۆ)ی شاعیر یەکێك بوو لەوانەی کە سوریـالیستـەکـان بەبـاوکی گیـانی‌ی خۆیـان دای دەنێن، شیعـرە ڕەمـزیـەکـانیشی جێی ڕەزامـەنـدی‌ی ئەم دەستـەیـەیـە. ڕامبۆ ژیانێکی زۆر سەخت و سەیرو سەمەرەی بردەسەر.- گەر سوریالیەکان بەدەستی ئەنقەست نێـوەنـدێکی نابـەجێ و سەیـرو نارێك بۆخۆیان دروست دەکەن تاخۆیان تێدا نوقم بکـەن، دەبینین ڕامبـۆ بارو دۆخی سەردەمـەکـەی لە هەڵـس و کەوت و کاری نارێـك و نابـەجێـدا نوقمی کردبـوو. شیعرەکانی شاعیر ئاوێنەی ژیانی خۆیـەتی. کاتێـك شاعیـر (کـەشتی‌ی مەست)ی بڵاوکـردەوە، خەڵکی زۆر بەتـونـدو تیـژی و، بەدەنگی ناڕەزاییـەوە ڕووبـەڕووی بوونـەوە، بەهۆی شێوە ڕەمـزی و ناوەرۆکـە نائـاسـاییـەکەیەوە کەلەگەڵ ئاکاری گشتی‌دا نەدەگونجان. شاعیر شیعرەکانی لەنێوانی ساڵەکانی (١٨٧١ ـ ١٨٧٣) دا بڵاوکردەوە، یانی لەتەمەنی شازدەوە بۆنۆزدە ساڵی. . شاعیر لەژیانیدا بەگەلێ تاقی‌کردنەوەی جەرگ بڕدا تێـپەڕی تەنـانـەت تووشی تاقی‌کـردنـەوەی لەشیش بوو. ئەوەی

سەیرە ئەو تاقی کردنەوانەی لە شیعرەکانی‌دا ڕەنگیان داوەتەوە. ڕامبۆ هەردەم ئەی ووت (بەڵێنم بەخۆم داوە.. کەخۆم لەڕەوشت نزمی‌دا بئاخنم) وەهای خەچوو کەئەو نارێکیانە دەی گەیەننە پلەی بینین (الرؤیا).. یاخود دەی ووت (من یەکێکی ترم) ئەم ووتەیەی جێی ڕەزامەندیی سوریالیەکان بوو. شاعیر بەهەموو شتێکی نائاسایی هەڵدەستا بەڕادەی ڕەوشت گەوزاندن لەنێو جلپاودا. ڕامبۆو ڤرلین ببوونە سەردەم و بن دەمی خەڵکی ئەو سەردەمە، مەحوی ئەو پەیوەندیە ناوێزەیەی کەلەنێوانیان دابوو. ڕامبۆ لەنۆزدە ساڵی‌دا مبەك جاری ببڕای ببڕ وازی لە شیعر نووسین هێناو دەستی بەئیش و کاروباری بازرگانێتی کرد، لە کۆتایی‌ش دا لە ئەفریکادا پێیەکی تووشی نەخۆشیەکی سەخت و گران هات و برییانەوەو لەپاشانیش دا مرد.

(مالارمێ) هەروەك ڕامبۆ پلەو پایەیەکی بڵندی لەلای سوریالیەکان هەیە. هەڵبەستی (هیرۆدیاد)ی ڕەمزیی شاعیر کارێکی زۆری کردەسەر بیروهۆشی سوریالیستەکان. ئەم هەڵبەستە لە نەوەت و شەش دێر پێك هاتووە. شاعیر لە (تۆرۆن)دا لەساڵەکانی (١٨٦٥ ـ ١٨٦٦)دا نووسیویەتیەوە دووا بەدووای مردنی شاعیر لەساڵی (١٩٢٦)دا بڵاوکرایەوە. ئەم هەڵبەستە بریتیە لە دایلۆگێك لەنێوان (هیرۆدیاد)ی شۆخ و دایەنەکەی‌دا. شاعیر ئەم هەڵبەستەی بەشێوەیەکی ڕەمزیانەی ناڕاستەوخۆ داڕشتووە. هیرۆدیادی شەنگ دەیەوێت خۆی لەگەردوون دا بتوێنێتەوە تاهەردووك بین بەیەك پارچە بەوێنەی گەوهەرێك کەپارچەو بەشێکە لەگەردوون دا. شاعیر لەم هەڵبەستەیدا دەیەوێت ئەوە بسەلمێنێت، کە مردن و جوانی یەك شتن و هیچکات جودا نابنەوە. بایەخێکی زۆری بە شێوەو جۆری داڕشتنی هەڵبەستەکەی داوە. ڕۆژێك (دێگا)ی وێنە کێشی کارتێکراوی بەدڵ شکستیەوە بەخۆی‌و هەڵبەستێکەوە بۆ کن شاعیر دەچێت و پێی ڕادەگەیەنێت کەئەو هەڵبەستەی لە ئاکامی تەقەلایەکی دوورو درێژدا نووسیوەتەوە. شاعیرش وەڵامی هونەرمەند دەداتەوەو دەڵێت (باشە ئەی دێگا، بەڵام هەڵبەست لە بیر پێك نایەت، بەڵکو لەووشە پێك دێت)[1]

کارتێکردنی (لۆتریامۆن)ی ڕەمزی، لەشاعیرانی تری ڕێبازی ڕەمزی بۆسەر سوریالیەکان کەمتر نەبوو. ئەم شاعیرە وەك زۆربەی شاعیرە ڕەمزیەکان ژیانێکی زۆر سەخت و دژواری بردەسەرو لە تەمەنی بیست و چووار ساڵیدا لە (١٨٧٠)دا کۆچی دووایی کرد. (سروودەکانی مالدۆرۆ) لەکاتی خۆیدا زۆر بەگران و زەحمەت خۆی دەگەیاندە بەردەستی خوێنەران. لەم هەڵبەستەدا شاعیر وەك سوریالیەکان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەرەو ناخی شتەکان شۆڕدەبێتەوە. ڕوواڵەتی شتەکان کە وەك خۆیان هەن دەریان نابڕێت؛ بەڵکو بەڕای ئەو دەبێت شاعیر جیهانە نادیارەکانی پێش لەدایك بوون و پاش مردن دەرببڕێت. یاخود بەڕای شاعیر دەبێت شاعیران خۆیان لە گێژاوی سەردەم دوورە پەرێز بگرن.! (سروودەکانی مالدۆرۆ) پڕە لەشتی سەیرو سەرنج ڕاکێش، زۆر جار ناوی مارو مێروو جرو جانەوەر هاتوون وەك (ماسیی قرش و بۆق و ئەکتەپۆس و قرژانگ و... هتد)

شیعر وەك دەزانین لە سۆزو بیرو ئەندێشەو وێنە پێك دێت. شاعیرانی پێش ڕێبازی ڕەمزی وێنەی شتەکان و دەورو بەرو ناخ و دەروون و سۆزو ئەندێشەی مرۆڤیان بەشێوەیەکی وەها دەردەبڕی کە زۆر لە ڕاستی‌و ڕوواڵەتەکانیانەوە نزیك دەبوونەوە. هەروەها ڕاستەوخۆ هەڵس و کەوت و تەعامولیان لەگەڵدا دەکردن. بەڵام، ڕەمزیەکان ئەم ڕێچکەیەیان شکاند، دووای ئەوەی کە بەشێوەیەکی هیمایی ناڕاستەوخۆ لە شت دەدووان و وەسفیان دەکردن و وێنەیان دەگرتن. سوریالیستەکانیش پەیڕەوی هەمان نەریت دەکەن بۆ دەربڕینی هەست و وێنەگرتنی شتەکان. بەڵام بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرو جیاوازتر.!

سوریالیستەکان دژی ڕواڵەتی شتەکان دەوەستن، بەڕادەیەك مەنتیقی عەقڵ و سۆزی قوول، لەکارەکانیان دا دوور دەخەنەوە، سوریالیستەکان بەشێوەیەکی جوداتر لەوەی کە هەیە ڕەنگی شتەکان لەبەرهەمەکانیان دا دەردەخەن گەلێ جار دەبینین ئامرازو ئامێری پیشەسازی لەگەڵ مادەکانیان دا ئاوێتە دەکەن تابەرهەمەکانیان لەسۆزو بیری قووڵی هێمن و ڕاستەوخۆ بپارێزن.

پێش ئەوەی قوتابخانەی سوریالیزم بێتەکایەوەو وەکو ڕێبازێکی ئەدەبی‌و هونەری‌و فەلسەفی خۆی بسەپێنێت، ڕێبازی دادایزم لەئارادابوو، وەکو ڕێبازێکی نائاسایی‌و نوقم بوو لەنێو دەریای پڕ لەنهێنی لەرزۆك دا. ئەم ڕێبازە واتە دادایزم هەر لەسەرەتای پەیدابوونیەوە تۆوی مردن و لەناوچوونی لەگەڵ خۆی‌دا هێنایە ڕووەوە، ئەم ڕێبازە پەیڕەوو بیرو باوەڕێکی تایبەتی دەست نیشان کراوی نەگرتبووە خۆی هەر دووا بە دوای شەڕی گێتی یەکەمەوە بێ‌هوودەیی‌و سەرلێشێواویەکی تەواو خۆی بەسەر خەڵك دا سەپاند بەتایبەتی لەسایەی ڕژێمی سەرمایەداری‌دا کەپارەو پوول لەژیانی ڕۆژانەدا پلەی یەکەم وەردەگرێت

گەلێ لە هونەرمەندو ڕۆشنبیران بەشداری شەڕی گێتیان کردبوو بەچاوی خۆیان ئەو هەموو کارەساتە جەرگ بڕو دڵتەزێنانەیان بینی، تەنانەت بەشێکی زۆریش لەڕۆشنبیران لەو شەڕەدا لەنێو چوون. لەم جەنگەدا ملیۆنەها کەس لەنێو چوون، هەروەها چەندین شارو ئاوایی‌و کارگە خاپوور بوون هەموو ئەم کارەساتە نائاسایی‌و پڕ لەئەشکەنجانە بوونە تۆوی دروست بوونی. پەیڤی داداش مانای ئەسپە دارینەی منداڵان دەبەخشێت. وەکو ووتمان ئەم دەستەیە هیچ ئامانجێکیان نەبوو بۆ هیچ بڕوایەکی مرۆڤایەتی تێ نەدەکۆشان

ناهەمواریی شەڕ وای لە دادایستەکان کردبوو کەوا بڕوا بەهیچ جۆرە پێوانەیەك نەکەن و هەرچی پێی ڕێساو داب و نەریتێك پێ شێل بکەن، لەیەکێ لەکۆڕەکانیان دا ئەوەندە قسەی پڕو پووچ و بێ‌مانایان خوێندەوە تاوەکو لەئەنجام دا لەلایەن جەماوەری کۆڕەکەوە درانە بەر بەردو تێلا بەڵام کۆڕگێڕەکان بەو کارە زۆر شادمان بوون و ووتیان خەڵکەکەش گیانی دادایزم چووە لەشیانەوەو کۆڕەکەمان سەرکەوتنی بەدی هێنا...!!

کپ بوونەوەو لەناوچوونی ئەم بزووتنەوەیە لەپڕدا شتێکی چاوەڕوان نەکراو

نەبوو. . . بگرە کاریکی ئاسایی بوو چونکە هەر خۆی لەگەڵ لەدایك بوونی خۆیدا تۆوی پووکانەوەی خودی خۆی لەگەڵ دا هێنا. هەر لەپاش لەنێوچوونی دادایزم دا سوریالیزم سەری هەڵ داو هاتە گۆڕەوە گەلێ لەنووسەرو هونەرمەندان خۆیان دایە دەم لافاوی سوریالیزمەوە، تەنانەت بەشێك لەوانەی پێشتر لافی دادایزمیان لێ‌دەدا چوونە باوەشی سوریالیزمەوە وەکو «ئەراگۆن و بریتۆن و ئەپۆلینێرو ماکس ئارنێست و فیلیب سۆبۆو گەلێکی تریش» پاشان شاری پاریس بووە مەڵبەندی سوریالیزم.

سەرباری بنەمای فەلسەفی و ئەدەبی دەتوانین شەڕی گێتی‌ی یەکەم و چەند بیرو باوەڕێك دەست نیشان بکەین وەکو هۆی کاریگەر لەبۆ لەدایك بوونی ئەم ڕێبازە. . ئالەم سەدەیەی ئێمەدا گەلێ بیرو باوەڕی ناعەقڵیانە هاتنە کایەوە کەوا زۆربەیان دوورە پەرێز لەجیهانی ڕاستەقینە دەوەستان و خۆیان دەهاویشتە جیهانی ئەندێشەو نادیارو فەنتازیاوە.

لەسەرەتای سەدەی بیستەم دا بەتایبەتی لەساڵی «١٩٠٥»دا زانای ئەڵەمانی «ئەلبێرت ئەنشتاین» تیۆرە ناودارەکەی خۆی ئاشکراکرد کەوا بە «تیۆری نیسبەت» ناسراوە. . بەپێی ئەم بیردۆزە کات و شوێن و گەلێ دیاردەی تری ڕۆژانە نسبین و موتڵەق نین،" ئەم بیرانەی ئەنشتاین گەلێ بیرو باوەڕی چەسپاوی کۆنی پووچ کردەوە. . بەڵام مخابن هەندێك لایەن سەرکەوتنی ئەم تیۆرەیان بەهەڵ زانی و لەپەنایەوە هەڵیان کوتایە سەر ڕێساو باوەڕی لەبەرچاو گیراو تاوەکو سەرنگومیان بکەن ویۆیەکجاری بیان سڕنەوە. . . هەوڵی بێ‌ووچانیان سەلماندنی ئەوەبوو کەوا هەموو شتێك لەگەردوون دا نیی وریژەیمو ڕێك و پێك و ڕاست و ڕەوان و جێ‌ی متمانە نین و بیری مرۆڤیش وەکو هەر شتێکی دیکە ڕێژەیین و جێ‌ی بڕوا نین. ئەوەیان لەبیرخۆ بردەوە کەوا سەرباری ئەوەی زۆربەی دیاردەکانی دەوروبەر ڕاستەیەکی سەدا سەد نین بەڵام هەموو شتێك لەسەردەم و بارو زرووفێکی تایبەتی دا پێوانەیەکی خۆی هەیە، چونکە گەلێ لەو پێوانانە لەسەردەم و قۆناغێکی تایبەتیدا زیاتر لە هەندێ پێوانەی تر لەڕاستیەوە نزیك دەبنەوە.

هەر لەم سەدەیەی ئێمەدا «بێرگسۆن»ی فەیلەسووف ویستی کۆشك و تەلاری عەقڵ و ژیری خاپوور بکات و لە شوێنیدا مەزنە «حدس» دابمەزرێنێت. . . بەڕای ئەم فەیلەسووفە (حدس) لەمێشك و بیری مرۆڤ دا هەموو شتێکە نەك عەقڵ. هەر ئەم «حدس»ەشە کەوا دەتوانێت پەی بەبوونی عەقڵی بێ‌کۆتایی بەرێت نەك عەقڵی ڕووت. ئەم مەزنەیەوەکو بوونێکی ڕاستی نەترازاو لەپاڵ عەقڵەوە خۆی مەڵاس داوەو کاری ڕۆژانەی دەبات بەڕێوە. . . !

سەرباری زۆربەی ئەو بیرو باوەڕانە سوریالیستەکان گوشادو دڵ خۆش بوون بەتیۆرە دەروونی‌یەکانی «سیگمۆند فرۆید». بەتایبەتی ئەو تیۆرانەی کەوا باس لەبێ ئاگایی دەکەن. ئەم دکتۆرە نەمساوی‌یە کاریکی ڕاستەوخۆو هەست پێ‌کراوی کردە سەر بەرهەم و هەڵس و کەوت و ڕەفتارەکانی سووریالیەکان. . فرۆید عەقڵی مرۆڤ دەکاتەسێ بەشەوە: یەکەم بەشی ئاگایی «الشعور» ئەرکی ئەم بەشەش ئەوەیە کەوا پەیوەندیەکانی مرۆڤ لەگەڵ دەورو بەردا بگونجێنێت. دووەم بەشیش لەعەقڵی مرۆڤ دا پێشووی ئاگایی‌یە «ماقبل الشعور» ئەم بەشەش بریتی‌یە لەو بیرەوەریانەی کە مرۆڤ دەتوانێت بەئاسانی بۆ هەست و هۆشی ئاگاداری خۆی بیان گەڕێنێتەوە ئەم بەشە دەکەوێتە نێوان بەشی ئاگایی و بەشی سێ‌یەمەوە لەعەقڵی مرۆڤ دا کەوا فرۆید بەبێ‌ئاگایی «اللاشعور» ناوی دەبات. بەلای فرۆیدەوە بێ ئاگایی لەگرنگترین بەشەکانی عەقڵی مرۆڤەو، لەئاکامی کۆبوونەوەی ئەو هەموو پاڵنەرانە پێك دێت کەفرۆید بە بناخەو بنەڕەتیان دادەنێت، کەوا بریتین لە ئارەزووە سەرکێشەکان (الغرائز) وەك: تینوێتی و برسێتی و سێکس. ئەم شتانەیش بەڕای فرۆید بابەتی سەرەکین.

(فرۆید) لەهەمان کات دا کەسایەتی‌ی مرۆڤ بەپێ‌ی تیۆرە تایبەتیەکەی دابەش دەکات بەسێ بەشەوە ئەم سێ بەشەش بریتین لە: بەشی یەکەم کەبە (Ego) یاخود (خۆ ـ من) ناوی دەبات. ئەم بەشە بەکاری نێوبژی و گونجاندن لەنێوان جیهانی واقیع و (خۆ)ی نزمدا هەڵدەستێت بەم پێیەش مرۆڤ دەپارێزێت و، ئارەزووەکانی لەپێناوی ئامانجە ڕاستەقینەکان دەم کوت و تەپس دەکات. ئەم بەشە دەکەوێتە بەشی هۆش یاخود بەشی ئاگای‌ی (الشعور) لەعەقل دا.

دووهەم بەشی کەسایەتی‌ی مرۆڤ. (فرۆید) بە (supeY ego) یاخود (خۆی بەرز) ناوی دەبات. ئەم بەشە لەئاکامی داب و دەستوورو پەروەردەی خێزانی و ئاین و ویژدان پێك هاتووە. بەکاری چاودێری و سانسۆری (خۆ) هەڵدەستێت و فەرمانی دەداتەسەر لەکاتی پێ‌لارکردنەوەی‌دا لە جادەی ڕاستی و دروستی‌داو هەمیشە هەڕەشەی ئاراستە دەکات. ئەم بەشەیش لە کەسایەتی‌ی مرۆڤ دا دەکەوێتە خانەی پێشووی ئاگاییەوە لەعەقڵ دا. بەشی سێهەم لەکەسایەتی‌ی مرۆڤ دا. فرۆید بە (Id) یاخود (خودی‌نزم ـ ئەو) ناوی دەبات. ئامانجی سەرەکی‌ی ئەم بەشە تێرکردنی ئارەزووەکانە، جاگەر بەهۆی ڕێیەکی نارەواوە بێت یاخود ڕەواوە. ئەم بەشە لەو هەموو ئارەزووانە پێك دێت کەپشتاو پشت لەباوباپیرانەوە بۆمان ماونەتەوە. ئەم بەشەیش لەکەسایەتی‌ی مرۆڤ دا دەکەوێتە خانەی ئاگاییەوە لەبەشی عەقڵ دا.

سوریالیستەکان هەوڵ و تەقەلایان پەنا بردەبەر بەشی بێ‌ئاگای‌ی بوو بۆدەربڕین و داڕشتنی بەرهەمەکانیان، جائیتر لەبوواری شیعر نووسین دا بێت یاخود لەتابلۆی هونەری دا بێت. دەبینین هونەرمەند خۆی لەڕووالەتی شتەکان دوور دەخاتەوە. ئەو شتانە دەردەبڕن کە هونەرمەند لە جیهانی بێ‌ئاگایی‌دا دەرکیان پێ‌دەکات. بۆیە دەبینین هونەرمەندێکی سوریالی دەم و چاو بۆسروشت دروست دەکات. یاخود هونەرمەند پەنا دەباتە بەر خەون بۆداڕشتنی تابلۆکانی و گەلێ شتی‌تر لەم بابەتانە. بەتێکرا سوریالیەکان خۆیان بەبیروباوەڕەکانی (فرۆید)ـەوە دەبەستنەوە. ئەوەی جێ‌ی سەرسوڕمانە فرۆید خۆیشی شتێکی ڕوون و تەواوی دەربارەی تیۆرەکانی خۆی نەدەزانی، جگە لەو تاقی‌کردنەوە تاکیەی خۆی نەبێت بەتایبەتی کە پزیشك بوو و پەیوەندیەکی

زۆری لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەبوو کە تووشی نەخۆشیی دەروونی دەبوون (دان بەوەدا دەنێت کەخۆی لەهەموو کەس نەزانترە، گەر یەکێك هاتوو داوای تەعریفێکی تەواوی سروشتی ڕاستەقینەی چۆنیەتی بێئاگایی ی لێ بکات)[2].

هەروەك دەس نیشانمان کرد، کارەساتەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی بوونە هۆی ئەوەی کەوا شوورەکانی عەقڵی دەرەوە لەبەرچاوی هەندێك خاوەن بیرەوە بڕووخێن. (فرۆید) یەکێك بوو لەوانەی کە جەنگ کاری تەواوی کردەسەر بیروباوەڕو بۆچوونەکانی. خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: (عەقڵی ناوەوە ڕاست گۆییەکی پتەوترمان لەڕاستیی سەرەوەمان پێدەبەخشێت. عەقڵی ئاگادار بەبیرێکی دەساو دەس کراویو گەمژەییەوە کاردەکات، بەبەڵگەی ئەوەی کەعەقڵی مرۆڤ نەیتووانی کارەسات و جەنگ دووربخاتەوە)[3] فرۆیدو هەموو ئەوکەسانەی ئەم جۆرە بیرو باوەڕەیان دەربارەی عەقڵ هەیە، ئەوەیان نەبیر دەچێت یاخود لەبیر خۆیان دەبەنەوە، کە بەرپابوونی ئەو جۆرە جەنگ و شەڕو شۆڕانە هۆیەکانی بۆکەم و کوڕیی عەقڵی مرۆڤ ناگەڕێنەوە بەڵکو هۆی جەنگی یەکەم و دووهەمی جیهانی بۆسروشتی کۆمەڵگای سەرمایەداری دەگەڕێتەوە. گەر بێت و لەهۆی بەرپابوونی هەردوو جەنگە جیهانیەکە بکۆڵینەوە، ئەوە زۆر بەئاسانی بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کەوا جەنگێکی ئیمپریالی بووە. وڵاتە گەورە سەرمایەدارەکان لەپێناوی بەچنگ هێنانی زیاتری وڵاتە بێدەسەڵاتەکاندا، ئەو جەنگەیان هەڵگیرساند. وڵاتە سەرمایەدارو ڕەگەز پەرست و کۆنە ویستەکان دەستە دەستە لاوەکانیان کردە خۆراکی لوولە تۆپەکان لەگۆڕەپانی جەنگە نارەواکانیان دا. هەر ئەو ڕژێمانە دەبنە هۆی هەڵ گیرساندنی جەنگ، نەك عەقڵی مرۆڤ کەپیرۆزترین و بەرزترین ئاکامێکە لەئاکامەکانی ئەم گەردوونەدا. هەر عەقڵی مرۆڤ تاکو ئێستا توانیویەتی بەزۆر شتی سەیرو سەرسوڕهێنەرو پیرۆز هەڵبستێت و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەڕووی شارستانیەتدا پێش بخات. فرۆیدو هەموو ئەو کەسانەی کەدژ ی عەقڵی ئاگاداری مرۆڤ دەوەستن و بەڕوویدا دەجەنگن و، جاری پووك کردنەوەی بۆدەدەن، بیانەوێت و نەیانەوێت خزمەت بەبیرو باوەڕی ئیمپریالیو ئایدیای کۆنەپەرست دەگەیەنن، جا گەر بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یاخود بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆبێت. پاپلۆ نیرۆدا دەڵێت:

(سەرمایەدار شیعرێکی دەوێت کەتابۆی بکرێت لەواقیع دابڕاوبێت، ئەو شاعیرەی بەنان دەڵێت نان و، بەمەی دەڵێت مەی جێی مەترسیە لەسەر سەرمایەداری نیوە مردوودا)[4]

سوریالیەکان بەهۆی تێك شکاندنی عەقڵەوە، هەموو وێنە بینراوە ڕاستەقینەکانیان داخان کرد، یاخود سەرەو قوڵپیان کردنەوە، بەو بیانووەی کە لە ڕووانگای بێئاگاییەوە بۆ کارە هونەریەکانیان دەچن. هەروەها لە ئاکامی سوود وەرگرتن بوو لە هەموو ئەو وێنە ناڕاستەوخۆ ڕەمزیانە کەشاعیرە ڕەمزیەکان پێی هەڵدەستان. وێنەی شێوەکاری لەو گۆڕانکاریە نوێ خووازیانە بێبەش نەبوو کەئەمەیش لە نووسین دا ڕوویان دا. لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا چەند هونەرمەندێك وەك پیکاسۆو براك شێوەی نوێ خووازیان خستە نێو بەرهەمەکانیانەوەو قوتابخانەی (کۆبیزم) خشتەکی یان دامەزراند. پیکاسۆ لەتەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا دەستی لەوێنەی ئاسایی ڕاستەقینە وەردا. لەساڵی (١٩٠٦ ـ ١٩٠٧)دا لەشاری پاریسدا تابلۆی (ئافرەتانی ئاڤینیۆن)ی کێشا. لەم تابلۆیەدا هونەرمەند وێنەی مرۆڤی ئاسایی لەخاسیەتە بنەڕەتیە بینراوەکانی دابڕکرد. پیکاسۆ لەم تابلۆیەدا وێنەی چەند ئافرەتێکی ڕووخاوی کێشا، نەك وەك ئەوەی کەخۆیان هەن، بەڵکو بەشێوەیەکی جیاوازتر لەبوونی خۆیان و، یاساکانی مەنزوورو پێوانەی ئەنـدامی لەشی تێك شکاندو، ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر شێوەی خشتەکی لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگیان دەدایەوە. گەر بێت و هونەرمەندی کۆبیزمی وێنەی تەنیشتی چەپی ڕووی ئادەمیزادێك بکێشێت، ئەولەهەمان کاتدا ڕووی تەنیشتی ڕاستەی ئەو ئادەمیزادەمان بۆدەکێشێت. سوریالیەکانیش هەمان نەریت دەگرنەبەر بۆ تێك شکاندنی ڕووی شتەکان بەڵام بەشێوەیەکی جیاوازتر. بەکورتی سەرهەڵدانی قوتابخانەی سوریالیزم لەئاکامی ئەو هەموو ڕووداوو تاقی کردنەوە هونەریو ئەدەبیانە بوو، کەیەك بەدووی یەکدا هاتنە کایەوە. بابزانین ووشەی سوریالیزم چیەو لەچیەوە هاتووەو مانای چیە؟

(تایریزیاس) لەئەفسانەی یۆنانیدا، پەیامبەرێك بووە لەشاری (تیبە)دا، ئەثینای خوواوەند، یاخود (هێرا) کەئەمیش هەرخوواوەندە لەبینایی چاو بێبەشی دەکات، بەڵام بەهەرەی بینینی دووارۆژ ی پێدەبەخشێت. دەووترێت گوایە تایریزیاس نوقڵانەی خراپی بۆ زۆربەی ڕووداوەکانی ئەفسانەکان دابوو. ئەم پێغەمبەرە سەرەڕای ئەوەی پیاویش بووە، بەڵام وەك ژن دوو مەمکی شۆڕی داچەکاوی هەبووە. ئەپۆلینێری شاعیر ئەم ئەفسانەیەی کردووە بەکەرەسەو مایەی شانۆگەریەکەی کەبەناوی دوو مەمکەکانی تایریزیاس)ەوە بوو. لەساڵی (١٩٠٣)دا دەستی بەنووسینەوەی کردووەو لەساڵی (١٩١٧)دا تەواوی کردووە. لەم شانۆگەریەدا زۆر شتی سەیرو نائاسایی ڕوودەدەن، کەمێشکی مرۆڤی ئاسایی نایان سەلمێنن. مەبەستی نووسەریش ئەوەی دەگەیاند کەوا زۆربوونی ژمارەی خەڵکی دەبێتە هۆی پەرەسەندن و گەشەسەندنی وڵات، خۆشی ئەم شتەی لەپێشەکیەکەیدا دەست نیشان کردووە (ئەپۆلینێر) ناوی ئەم شانۆییەی خۆینا «درامای سەرووی سروشت» )[5] ئەم شانۆگەریە کارێکی تەواوی کردە سەر نووسەرە نامافوولەکان کەوا لەپاش ساڵانی پەنجاکانەوە دەستیان دایە نووسینی شانۆییە نامافوولەکان. هەر لەوساڵەی کەوا ئەپۆلێنێر ئەم شانۆییەی بڵاوکردەوە، «دیاگلیف» شانۆگەری نمایشی (العرض) دەرهێنا کەسیناریۆکەی «ژان کۆکتۆ» نووسیوویو (ساتی)یش مۆسیقاکەی بۆ دانا بوو، «پیکاسۆ»ش وێنەی بەرگ و دیکۆری بۆکێشا بوو. لەڕاستیدا پیکاسۆ وێنەی ئەسپێکی بۆ دیکۆری شانۆگەریەکە کێشابوو، «مەدام دۆنوای» تەشبیهی کردبوو بەدارێك کەپێ دەکەنێت.. هەروەها هونەمەند وێنەی دوو گاڵتەجاڕیشی کێشابوو.. ئەپۆلێنێری شاعیر لە پرۆگرامی باڵیەکەدا ووتەیەکی نووسیبوو تێیدا هاتبوو کەوا سوریالیزم «sur realism» یانی (سەرووی واقیع

بەزمانی فەرەنساوی) لەم باڵیەدا پێك هاتووە ئەمەش یەکەم جار بوو کەوا پەیڤی یاخود زاراوەی سووریالی بنووسرێت. ئەپۆلێنێر بە داهێنەری ناوی ئەم قوتابخانەیە دادەنرێت. لەنامەیەکیدا کەلە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٧ دا بۆ «پۆڵ دێرمێ»ی ڕەوانە کردبوو تێیدا هاتبوو کە ووشەی (سەرووی واقیع - sur realism) لە (سەرووی سروشت - sur natu ralism) پەسەندکراو ترە. هەروەها شاعیر لەو نامەیەدا دەڵێت ئەم ووشەیەش لەفەرهەنگ دا بەدی ناکرێت.

سووریالیستەکان هەردەم پەنا دەبەنە بەر جیهانی نادیارو وون، بەڕای ئەوان گەوهەری ڕاستەقینەی دیاردەکان بەچاو نابینرێن چونکە خۆیان لەپاڵی ڕواڵەتی تەن و بوونەوەرەکان دا مەڵاس داوە. وەکو دەردەکەوێت یاوەرانی سوریالیزم دوژمنی سەرسەختی واقیع و ژینگەن هەموو تەقەلایەکیشیان لەبۆ دۆزینەوەی ئەو دوورگە نادیارو شاراوانە دەخەنە کار کەگوایە چاوی مرۆڤی ئاسایی و سادە نایان بینێت و پەییان پێ نابات. هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەم قوتابخانەیەدا وەکو مزگێنیەکی شادی بەخش، گەلێ لەوێنەکێش و نووسەرو شاعیران و خاوەن بیران پێشوازیان لێکردو چوونە ژێر ئاڵایەوە. بگرە زۆربەی دادایی یەکانیش پشتیان لەڕێبازەکەی خۆیان کردو چوونە ڕیزی ئەم قوتابخانە نوێیەوە.

هەموو دۆزینەوەو داهێنانەکانی ڕەمزیەکان لەمەیدانی شیعردا بوونە ڕێخۆشکەرێك بۆڕێبازی سوریالیزم... سوریالیەکان هەروەکو ڕەمزیەکان بەڕێگەیەکی ڕاست دا بەرەو بوونی شتەکان نارۆن، بەڵکو چەند پێچ و پەنایەك دەگرنە بەر تاوەکو دەگەنە ئەو خاڵەی کەوا مەبەستیانە ئەمەش بەو بیانوەی کەگوایە هەرچەند بەسەختی و ناڕاستەوخۆیانە بەرەو ڕووی دیاردەکان بنەوە ئەوا زیاتر لە نهێنی بوونیان تێدەگەن و دەچنە ناخیانەوە... ئەم دەستەو تاقمە بۆ بڵاوکردنەوەو دەربڕین و ڕوون کردنەوەی بیرو ڕاتایبەتیەکانیان دەستیان دایە نووسین و بڵاوکردنەوەی بەیانامەی تایبەتی (ئەندرێ بریتۆن)ی ڕابەری ئەم ڕێبازە چەند نووسین و بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە. یەکەم بەیاننامەی لەساڵی ١٩٢٤دا بڵاوکردەوە، لەم بەیانامەیەدا خاڵە سەرەکیەکانی ڕێڕەوی ڕێبازەکەیانی دەست نیشان کردووە. ئەم ڕێبازە بەپێچەوانەی دادیزمەوەیە کەوا تەنها چەند بیرو باوەڕو ڕێبازێکی دیاریکراوی هەبوو. ئەم ڕێبازە نوێیە چەندێ ئەدەبی و هونەری بوو بگرە ئەوەندەش فەلسەفی بوو ئەمە لەگەڵ ئەوەش دا کەوا فەیلەسوفیشیان نەبوو. ئەندرێ بریتۆن لەپێناسەکردنی سوریالیزم دا دەڵێت: («سووریالیزم»: مێ ینەیەو ئامێری و دەروونی و تاکی ڕووتە، مەبەستی دەربڕینە گەر بەووشە بێت یاخود بەنووسین یان بەهەر ڕێگەیەکی تر بێت لەشێوارەکانی بیری ڕاستەقینە، تێرکردنی مێشکە لەودەمەی کەوا هەموو چاودێری و سانسۆریەکی عەقڵ وون دەبن، لەهەموو بایەخێکی جوانی ئاکاری بەدەرە.

«بەمانا فەلسەفیەکەی»: سوریالیزم لەسەر بناخەی باوەڕ هێنان بەڕاستیەکی بەرزی هەندێ ڕوخسارو شێوازی یەك لەدوای یەك هاتووی بیر کەوا لەکاتی خۆیدا فرامۆش کرابوون. بەتوانای خەونی مەزن و کارکردنی بیری دوور لەهەموو ئامانجێك هەوڵی ڕووخاندنی تەواوی هەموو پێك هاتووە دەروونیەکانی تر دەدات. ئەم بەڕێزانە بەسووریالیزمی مووتڵەق باوەڕیان هێناوە: ئەراگۆن، کاریڤ، کرۆڤێل دیلتێل، دسنۆس، ئێلوار، جیرار، لامبۆر، مالکین، مۆریس، ناڤێل نۆل، بێرێ، بیکۆن، سۆبۆ، ڤیتراك)[٦]

هەموو هەوڵ و کۆششی سووریالیەکان ئەوەبوو نادیارو بزر لەدیار هەڵبهێنجن لەوەی کەوا جێی باوەڕی خۆیان بوو. بۆیە لەوگۆشەوە بۆ دەربڕین و وێنە دەرخستنی شتێك - جا لە تابلۆی هونەریدا بێت یاخود لە وێنەی شیعریدا بێت - شتی دژ واریان بەیەکتر دەردەبڕی. سەبارەت بەم خاڵە «ئارنێست» لەبارەی سوریالیەتەوە دەڵێت: (مارەبڕینە لەنێوان دوو ڕاستەقینەدا کەوا لەتواناداا نیە لە ڕواڵەت دا مارەیان لەیەکتری ببڕێت و هەرگیزیش پێکەوە ناگونجێن)[٧]

ئەندرێ بریتۆن لەبۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ڕێبازەکەیان لە «دەفرە کوناو دەرەکان»دا «الاواني المستطرقة» دەڵێت: (هێڤی دارم کەسوریالیزم بەهیچ تەقەلایەکی لەوە چاکتر هەڵنەستابێت، کەوا دەزوولکەیەك لەنێوان جیهانی لێك ترازاوی جیهانەکانی ئاگایی و خەون دا بدۆزێتەوە، یاخود واقیعی ناوەکی و دەرەکی، عەقڵ و شێتی، هێمنی و زانستی و خۆشەویستی، ژیان بۆ ژیان لەگەڵ شۆڕش دا.

لە بەرهەمەکانیاندا شێوەی نووسینی ماکینەییان (الكتابة الآلية) دەگرتەبەر، بەو بیانووەی گوایە لەکاتی بەرهەم هێناندا خۆیان لە عەقڵی ئاگادار دوور دەخەنەوەو جڵەو بۆ بێئاگایی شل دەکەن. تا لەسەرخۆ وەك کانیاوێك هەڵ قووڵێت. هەروەك شەلم کوێرم ناپارێزمەکەی دادایی یەکان، بەڵام نەختێك لەوان ڕێك ترو مەنتیقی تر. فلیپ سۆپۆ کاتێك لەڕیزی دادایەکاندا بوو دەی ووت: گەر بتەوێت هەڵبەستێکی دادای بنووسیت هەرئەوەندەت لەسەرە چەند پارچە کاغەزێکی بچووك بهێنیت و لەسەر ڕووی هەریەك لەو پارچانە ووشەیەك بنووسیتەوەو بیانخەیتە نێو کڵاوێکەوە پاشان چۆن لەگەڵ دەستدا هات یەك لەدووای یەك پارچە کاغەزەکان دەربهێنیت و ڕیزیان بکەیت. بەم شێوەیەش هەڵبەستەکە لەو ڕیزە ووشانە پێك دێت.

زۆرجار لەکاتی مەستیدا بەرهەمیان دەهێنایە کایەوە، بەو بیانووەی گوایە لەکاتی سەرخۆشیدا عەقڵی ئاگادار دوورەپەرێز خۆی ڕادەگرێت. ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی کەوا بەرهەمەکانیان گەلێ شتی شاردراوەو نەگونجاوو ناڕاستەوخۆ لەخۆیان کۆبکەنەوە. بەڕادەیەك مێشکی ئاسایی بەئاسانی نەتووانێت شییان بکاتەوە لەپێش سوریالیستەکاندا (بۆدلێر) زۆر بەشان و باهووی بەنگ کێشیدا هەڵی دەداو، وای بۆدەچوو گووایە بەنگ کێشی دەبێتە هۆی لەدایك بوونی وێنەی بەهێزو جوان.

ئەو وێنانەی لەبەرهەمی سوریالیەکاندا دەردەکەون زۆر سەیرو سەرنج ڕاکێشن. گەرچی هونەرمەند داهێنەرو پەروەردەکەری بەرهەمەکەیەتی بەڵام ژیانی دەوروبەرو گەشەسەندنی شارستانیەت و پیشەسازی خۆیان بەسەرو سیمای کارە ئەدەبی و هونەریەکاندا دەسەپێنن وکاری تەواویان دەکەنەسەر. لە

شیعرێکی ئەپۆلێنیردا، شاعیر بە بەرگێکی تازەبابەتانەوە وێنەی ژیانی تازەی گرت و لەسەرەتای هەڵبەستەکەیدا دەڵێت:

ئەی شوان، ئەی قوللەی ئیڤل
ڕانە پردەکان بەم بەیانیە زووە دەبارێنن.

شاعیر لەم هەڵبەستەدا ویستیویەتی وێنەی شار پاریس بکێشێت و،قوللەی ئیڤل لە نێوەندی شاردا بەشوان بچوێنێت و، پردەکانی شاریش بەو هەموو تەنگە دەنگ و هۆرنی ئۆتۆمبیلانەوە بە ڕانەمەڕیان بچوێنێت!

پەیڕەوکەرانی ڕێبازی سوریالیزم بەهەموو کارێکی نائاسایی سەیر سەیر هەڵدەستان، لەپێناوی ئەوەدا کەخۆیان لە داب و نەریتی ژیانی ڕۆژانە دوور بخەنەوە. تێکڕای بەرهەمەکانیان شان بەشانی خۆیان بە نائاسایی و ناوێزە ڕەوتیان دەکرد.

پاش ماوەیەك دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە وردە وردە پاشەکشەیان لێکرد دووای ئەوەی زۆربەی زۆریان بیرو باوەڕی سۆشیالیستی ی زانیاریان گرتەبەرو دەستیان کرد بەخزمەت کردنی پارتەکەیان ئەوەی کاری تەواوی کردەسەر سوریالیستەکان ئەو ووتەیەی (ڕامبۆ) بوو کەداوای (گۆڕانی ژیانی) دەکرد، ئەم ووتەیەی شاعیری ڕەمزیان لەگەڵ ووتەی یەکێك لەدامەزرێنەرانی ئایدیۆلۆژیەتی سۆشیالیستی دا بەراوورد دەکرد، کەداوای (گۆڕانی جیهانی) دەکرد[8] لەساڵی (١٩٢٧)دا ئەراگۆن و بریتۆن و ئێلوارو بیری و ئونیك چوونەپاڵی سۆشیالیستیە زانیاریەکانەوە. سەرەڕای ئەوەی بریتۆن چووبووە ڕیزیانەوە بەلاّم جێی ڕەزامەندیان نەبووو وردە وردە لێیان تەکیەوە. هەروەها پیکاسۆی داهێنەری ڕێبازی تازەگەری چووەپال ئەو پارتەوە، بەلاّم دەس بەرداری ڕێبازی (کوبیزم ـ خشتەکیانە)ەکەی خۆی نەبوو. بەلاّم ئەراگۆن و ئێلوار بوونە دوو کۆڵەکەی هەرە گرنگی ڕێبازی ڕیالیزمی سۆشیالیستی.

ڕێبازی سوریالزم وەك دەس نیشانمان کرد دووا بەدووای ڕێبازی دادیزم ڕێبازێکی فیکری و هونەری هاتەکایەوە. لە پێش پەیدابوونی ڕێبازی سوریالیزمدا لەمێژووی هونەردا گەلێك نموونە هەن کەتارادەیەکی زۆر شێوازو سیمایان لەم ڕێبازەوە نزیك دەبنەوە. (باك ڕواند)ەکەی (مۆنالیزا)ی داڤینشی بەشێوو هەردو نشێوە خەوناویەکانیەوە، زۆر جار بە شێوازێکی سوریالی دەدرێتە قەڵەم. داڤینشی لەکاتی خۆیدا هانی قوتابیەکانی دەدا بۆ سوود وەرگرتن لە درزو هێڵە جۆراو جۆرەکانی هەوری ئاسمان و ڕووی دیوارەکان. لەسەدەی پازدەهەمدا (پۆش)ی هونەرمەند تابلۆی (باغی چێژەکانی ـ حديقة الملذات) کێشا، هێربەرت ڕید لەگەڵ بەرهەمەکانی سلڤادۆر دالی دا بەراووردیان دەکاو دەڵێت: (گەربێت و ئەندێشەی دالی لەگەڵ ئەندێشەی (بۆش)دا بەراوورد بکەین دەبینین ئەندێشەی دالی زۆر لاوازە، یاخود دەتوانین بڵێین ئەندێشەیەکی لەرزۆکە) هەروەها مۆرکی سوریالی لەتابلۆی (سەرکەوتنی مەرگ)ی (پرۆگل)دا لەسەدەی شازدەهەمدا دەردەکەوێت. یاخود گەلێ لەتابلۆکانی (ئارشیمۆڵد)و، (گۆیا)ی ئەسپانی لەسەدەی هەژدەهەمدا، بەتایبەتی تابلۆی (مەڵبەندی جادوگەران) و (زوحەل منداڵەکانی لورف دەکات)[9] لەهەمووی سەیرتر (والاس قاولی)، شەکسپیرش بەسوریالی دەداتە قەڵەم، بەتایبەتی لەشانۆگەری ی (هاملێت)دا. لەم بارەیەوە دەڵێت: (من زۆر دڵنیام لەوەی کەڕۆژێك لەڕۆژان کتێبێکی زۆر گرنگ و بایەخدار دەربارەی هاملێت دەنووسرێتەوە وەك پاڵەوانێکی سوریالی)[10]

وەك ئاماژەمان بۆکرد، دامەزرێنەرانی ڕێبازی سوریالیزم ئاش بەتاڵیان لێکردو، یەك لەدووای یەك ڕوویان لەڕێبازەکەیان وەرگێرا. بەلاّم چەند وێنەکێشێك لەدواییدا پەیدابوون و بەوپەڕی دڵسۆزیەوە لەبازنەی سوریالیەتدا کاریان کرد بەتایبەتی (سلڤادۆر دالی)

تابلۆکانی وەك خۆی زۆر سەیرو سەرنج ڕاکێشن.. تەنانەت وێنەی (مۆنالیزا)ی داڤینشی ی کێشاو، دەم و چاوی خۆی بەسمێڵە باریکە بەژوور هەڵکشاوەکەیەوە لەجیاتی دەم و چاوە نەرم و نۆڵەکەی مۆنالیزای لەسەر تابلۆکە نەخشاندوە.

„ سلڤادۆر دالی: دەڵێ بەڕێز من لەسەرەتادا دوژمنی چینەکەی خۆم بووم کەوا چینی بۆرژوایە، بەلاّم بڕوام بەوپەڕی ڕاست ڕەوی و پاشایەتی و ئۆرۆستۆکراتی هێناوە. من لایەنگری موتڵەقی پاشایەتیم، هەروەها ئاژاوەگێرم و هەموو ویسامێکش وەردەگرم...)[11]

«سلڤادۆر دالی»و «ماکس ئارنێست»و «مار شاگال»و «ماگریت»و هەموو وێنەکێشە سوریالیستەکانی تر پەنا دەبەنەبەر بێئاگایی «اللاشعور» بۆ دارشتی تابلۆکانیان. بەلاّم ئەوەی شایانی سەرسام بوونە ئەوەیە کە ڕۆژێکیان فروید چاوی بەتابلۆکانی دالی دا گێڕاو ووتی: ئەوەی لەبەرهەمەکانی دالی سەرنجی ڕاکێشام ئاگایی بوو نەوەك بێئاگایی!

ئەم «بێئاگایی»یە کەوا خاوەن بیرە بۆرژواکان لەووڵاتە سەرمایەدارەکان دا لافی بۆلێ دەدەن و بەشان و باهوویدا هەڵ دەدەن دەتوانین بڵێین شێوەیەکە لەبیرو ئەندێشەی میتافیزیقیانە. هەردووا بەدوای هەرەس هێنانی بیرو باوەڕی ئایدیالیزمیەوەو بەهۆی پەرەسەندنی زانیاریەوە، هیچ دەرەتانێك نەمایەوە جگەلەو قاڵبەی فروید نەبێت. زۆری لەبارەوە ووتراوەو دەوترێتەوە بەلاّم تاوەکو ئێستا هیچ ئاکامێکی ئەوتۆ لەوڕووەوە بەچنگ نەهێنراوە، جگە لەو ڕێیە بەستراوە نەبێت کەبەرەو ڕوویان بووەوە. (ئێمە بەگشتی دەتوانین بڵێین کەبزووتنەوەی دۆزینەوەی جیهانی دەرەوە ـ هەر هیچ نەبێت لەڕووی ڕوخسارو ڕواڵەتەوە ـ خەریکە بگاتە کۆتایی یەکەی. بەلاّم لەبارەی جیهانی ناوەوە نەتوانرا جیهانی بێئاگایی یاخود «ئەفریقای ناوەکی» وەکو نووسەری ئەڵەمانی «جان پاوڵ» ناوی دەبات بدۆزنەوە، ئەوەی لەڕاستیەوە نزیکە دەتوانین بڵێین دۆزینەوە بوێروو بەجەرگەکان کە شاعیران نزیکەی سەدەو نیوێکە پێوەی خەریکن «ئەفریقاکەیانی» ڕەش ترو چرتر کردەوە، ئەمە لەکاتێك دا کەوا هاوەڵە جوگرافیەکانیان توانیان لەسەردەمێکی کۆنترەوە ئەفریقا بدۆزنەوە، ئێستاش کەس ناتوانێت بە کیشوەری ڕەش ناوی ببات)[12]

هەروەکو دەبینین قوتابخانەی سوریالیزم وەکو فەلسەفەیەکی هونەری و

ئەدەبی بەتەواوی کزبووە، بگرە کاریگەریەکەشی لاواز بووە بەلاّم ناتوانرێت نکـوّلّی لەوە بکـرێت کەوا سوریـالیـزم وەکـو شێـوەیـەکی هونـەری‌و ئەدەبی لەهـەنـدێ شوێن دا پلەو پایـەی بلـندی هەیـە، بەلاّم کەم هونـەرمـەند هەیە بتـووانێت زوّر سـەرکـەوتـوانـە سوریـالیزم ـ وەکو لایەنی تەکنیکی هونەری ـ بەکاربهێنێت بەپێچەوانەی شێوەی (تجریدي) چونکە شێوەی تجریدی لایەنی خەلّـەتـانـدن و لاوازی شاردنـەوەی تێ‌دەکـەوێت بەنـاوی نوێ‌گـەری‌و تازەگـەریـەوە. . . وەکـو ئەوەی هونـەرمـەندی تجریدی وێنەی چەند هێلّێکی بەگـژ یـەکـدا چوو بکێشێت یاخـود چەنـد لەکـەیەك و پەلّە بوّیەیەك دابنێت و ناوونیشـانێکی قەبـەی بوّ دروست کات! کەگـوایـە ناخی دەروونی مروّڤ لە کەڤـالّـەکـانیـدا دەردەبـڕێت. . . ! ئەمـە بەپێچـەوانەی شێوەی سوریالیزمە کە پێـویـستی‌ی بە توانـاو کارامـەیی‌یـەکی زوّر هەیـە بوّ وێنـەکێشـان. هەر هونەرمەندێکی سـوریالیـستی ـ جائەگەر وەکو ئەدیبێك یاخود وەکو وێنەکێشێك ـ بیگـرین تاوەکـو خاوەن ئەزمـوونێکی گەورە نەبێت ئەوا هەرگیـز ناتوانێت بە کارەکەی خوّی هەلّبستێت.

نووسـەرو هونـەرمـەنـدی پێشکـەوتن خواز دەتـوانێت لەپێنـاوی خواست و مەبـەستێکی پیـروّزدا ـ وەکـو شێـواز نەك وەکـو فەلسـەفـەو ناوەڕوّك ـ شێـوەی سوریالی بەکاربهێنێت. . .

هەروەکو ئەم وتە بەناوبانگەکەی بەرنادشوّ وێنەکێشێکی پێش کەوتن خواز وێنـەی پەیکـەری ئازادی کێشـاوە بە مەبـەستێکی مروّڤـایـەتیانەوە وشێوەیەکی سوریـالیـانـە. لەم تابلوّیـەدا پەیکەرەکە لەبری مەشخەلّ کوتەکێکی لەڕووی خەلّکی بێ‌تاوان دا هەلّگرتووە لەخوارەوەش جەماوەری ڕەش و ڕووت خەونی پەمەی‌ی بەژیانەوە دەبینن.

یاخـود لەمـەیـدانی هەلّبـەست نووسین دا هەمان دەرفەت بوّشاعیر هەیە. «ژاك پریڤێر» شاعیری گەورەی فەرەنسـا کەوا لەساڵی «١٩٣٢»وە دەستی بە شیعـر نووسـین کردووە. شێـوەی سووریـالی کارێکی تەواوی کردبووە سەری سەرەڕای ئەمـەش شیعـرەکـانی بەسـەر زمـانی خەلّکـەوەیـە وەکـو گوّرانی‌ی فوّلکلوّری دەیانبێژنەوە. . ئەمەش خوّی لەخوّی‌دا پلەو پایەی شاعیر دەست نیشان دەکات.

لە هوّنراوەیەکی‌دا کەوا شێوەی سووریالی بەخوّیەوە گرتووە بەقلّپ کراوەیی هێرش دەباتە سەر ڕژێمی سەرمایەداری‌و دەلّێت:

چوّلەکەکەم کردە سەرم
کلاّوەکەشم خستە نێو قەفەسەکەوە
بەهەناسکە برکێ دەرچوومە دەرەوە
کاتێك کەجەنەڕال چاوی پێم کەوت، وەستا
پێ‌ی ووتم: بوّ دەستت بوّ بەرز نەکردەوە
چوّلەکەکە لەبریم وەلاّمی داوە:
ـ لەمەودوا چیتر باوی دەست هەلّبڕین نەماوە.
جەنەڕال بەگورجی داوای لێ‌بووردنی لێ‌کردو ووتی:
ـ لەمن وایە دەست هەلّبڕین هەرماوە
ـ قەیناکە، قەیناکە. چوّلەکەکە ووتی
خەلّکی تریش هەمان هەلّە دووبارە دەکەنەوە (١٣)

**پەراوێز وسەرچاوە**

١ ـ مشكلة الفن ـ د. زكريا أبراهيم ـ دار مصر للطباعة ١٩٧٦ ـ ل٤٠ ـ ٤١.
٢ ـ مجلة الآداب الأجنبية. عدد الأول السنة السادسة ـ ١٩٧٩ (بين النقد الأدبي والتحليل النفسي عادل الفريجات ـ ل٢٩٩.
٣ ـ الفن والأنسان ـ دعزالدين أسماعيل ل١٨٧.
٤ ـ مجلة الطليعة الأدبية ـ عدد الثالث السنة السادسة ١٩٨٠ (مفهوم الشعر عند نيرودا). حمادي عبدالله ل٢٦.
٥ ـ موسوعة المصطلح النقدي ـ اللامعقول ـ ارنولد ـ پ ـ هنچلف. و: د. عبدالواحد لؤلؤة ـ وزارة الثقافة والفنون ١٩٧٩ ـ ل٦٠.
٦ ـ بيانات السوريالية. اندري بريتون. و: صلاح برمدا ـ منشورات وزارة الثقافة والأرشاد القومي دمشق ١٩٧٨ ـ ل٤١.
٧ ـ اندريه بريتون والمعطيات الاساسية للحركة السريالية ـ ميشال كاروگ. و: ألياس بدوي ـ منشورات وزارة الثقافة دمشق ١٩٧٣ ـ ل١٢٨.
٨ ـ فلسفة السريالية ـ فردیناند آلكية ـ و: وجيه العمر ـ منشورات وزارة الثقافة والأرشاد القومي دمشق ١٩٧٨ ـ ل٨٣.
٩ ـ آفاق النقد التشكيلي ـ عباس الصراف ـ وزارة الثقافة والأعلام بغداد ١٩٧٩ ـ ل ١٥٠.
١٠ ـ عصر السريالية ـ والاس ڤاولي ـ و: خالدة سعيد ـ مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر بيروت ١٩٦٧ ـ ل١٢.
١١ ـ مجلة الهلال المصرية ـ ديسمبر ١٩٦٦ ـ حوارمع سلڤادور دالی ـ وەرگێڕان و ئامادەکردنی: خديجة قاسم ـ ل ١٥٠
١٢ ـ ثورة الشعر الحديث ـ الجزء الأول ـ د. عبدالغفار مكاوي ـ الهيئة المصرية العامة للكتاب ١٩٧٢ ـ ل٢٩ ـ ٣٠.
١٣ ـ گوّڤـاری ألف باء ـ ـ ژمـارە (٤٥١) السنة التاسعة ١٩٧٧ ـ (جـاك بریڤیر) نووسینی: عبدالوهاب الداقوقي ـ ل٥١.

# السريالية

بقلم: معتصم ساله يى

تعد الفترة الممتدة من نهاية القرن التاسع عشر وبداية قرن العشرين، بحق فترة التحولات الكبيرة والتطورات الهائلة في مسيرة المجتمع البشري. حيث طرأت تغيرات واسعة على نظرة الأنسان الكثير من الامور الجارية. وكما هو معلوم أن علاقة الفن والأدب بالحياة اليومية مترابطة ومتينة، ويؤثر كل واحد منها في الآخر بشكل فاعل ومؤثر، لذا نجد ظهور كثير من المدارس الفنية والأدبية والفكرية في تلك الفترة الزمنية التي تبدأ من نهاية القرن المنصرم. حيث نجد المدرسة الواقعية والأنطباعية والطبيعية والتعبيرية والرمزية والتجريدية والتكعيبية.. الخ.

قبل بروز المدرسة السريالية ـ والتي هي مدار بحثنا ـ تطالعنا الحركة الدادائية التي ظهرت حركةً فنية وفكرية في الساحة الاوربية. قام لفيف من الادباء والفنانين والمفكرين بتأسيس حركة فكرية وفنية وذلك في مدينة (زيورخ) سنة (١٩١٦) وأطلقوا عليها اسم المدرسة (الدادائية). ومن أبرز مؤسسيها هو (تريستان تزارا). مالبثت أن تلاشىٰ تأثير هذه الحركة وفقدت مفعولها. وولدت من رحمها حركة فكرية جديدة في عشرينات من قرننا الحالي، والتي تعرف باسم المدرسة (السريالية).

نُشر أول بيان لهذه المدرسة سنة (١٩٢٤) من قبل (اندريه بريتون). أما فيما تخص كلمة السريالية (SUR realism) فهي في الأصل كلمة فرنسية وتعني (ما فوق الواقع) وأنضوىٰ تحت لوائها كثير من الأدباء والفنانين أمثال (أراگون، أيلوار، أپولينير، جيرار، ماكس جاكوب وغيرهم).

قامت السريالية وبرزت كحركة فنية وفكرية أثر الظروف التي كانت قائمة أنذاك، جراء تأثيرات الحرب العالمية الأولىٰ ومارافقتها من تأثيرات في أذهان الناس وبخاصة الأدباء والفنانين والمفكرين.. هذا من جانب ومن جانب آخر كان لظهور سلسلة من المدارس الفنية والفكرية فيما سبق، الأثر الفعال لبلورة فكرة تلك الحركة... ولنظريات (فرويد) فيما تخص الحلم واللاوعي الأثر البالغ والحاسم في مجمل نتاجات السرياليين. لجأ السرياليون الى الحلم اللامألوف والكتابة الأوتوماتيكية، وتوغلوا في الأعماق السحيقة من اللاوعي ـ كما كانوا يدّعون ـ لأجل أنجاز نتاجاتهم الأدبية والفنية..

تضائل تأثير هذه المدرسة فيما بعد، وفترت هِمَمْ الكثير من روادها، شأنها شأن سابقتها أي الحركة الدادائية.. لكن السريالية كاسلوب لها حضور دائم في كثير من المعارض الفنية في كثير من دول العالم، وتفعل فعلتها في أذهان الكثير من الفنانين.. حيث بمقدور الفنان أن ينتج أثراً واقعياً من حيث المضمون، وسريالياً من حيث الأسلوب. وبذلك يستطيع خدمة رسالة الفن، بعكس التجريدية الخالصة التي لاتخدم الواقع أطلاقاً بأي شكل من الاشكال، والتي تحاول حجب الشمس عن التكوينات والاجسام الحية والجامدة بطبقات كثيفة من الضباب والغيوم، بغية أرباك ذهن المتفرج.

فالأدب والفن الكرديّ المعاصر، لم يكن بمنأىً عن تأثيرات المدارس الفنية العالمية. وأثرت السريالية تأثيراً بيناً في نتاج الفنانين والأدباء الكرد المعاصرين. وكما نجد ـ ملامح سريالية ـ في بعض القصائد الكلاسيكية الكردية، وكثير من القصائد الفلكلورية الشعبية...

# لێکدانی وشەکان

**د. وریا عمر امین**
**بەشی کوردی - کولیجی پەروەردە**
**زانکۆی بەغداد**

سادەترین کەرەسەی زمان ئەو تاکە دەنگانەن کە بە هۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن. . ئاڵۆزترین دانەش لە زمان دا ڕستەیە. پەیوەندیی نێوان ئەم دوو دانەیە لەسەر پەیڕەوێکی هەڕەمیی ئەم جۆرە دامەزراوە.




واتا لە هەر زمانێك دا کۆمەڵە دەنگێ هەیە کە بە هۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن. ئەم دەنگانە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانەکە پێك دەهێنن.[1] بە هۆی دەستەیێك یاسای تری دیسان فۆنۆلۆجی‌یەوە ئەم فۆنیمانە لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکی یەك دەگرن برگەی فۆنۆلۆجی پێك دەهێنن.[2] لەناو قاڵبی برگەی فۆنۆلۆجی‌دا. . . بە فۆنیمێك یا زیاتر مۆرفیم[3] پێك دیت. بە مۆرفیمێ، یا زیاتر وشە پێك دیت. . بە وشەیێك، یا زیاتر فریز[4] پێك دێت. چەند فریزێکیش ڕستە پێك دەهێنن.

دەست نیشان کردنی سروشتی پێك هاتنی ئەم کەرەسە خاوانەو زانینی یاساکانی لێکدانیان لە ناو ئەم پێك هاتنە هەرەمی‌یە بۆ دارشتنی دانەی گەورەتر. . ئنجا گەورەتر، تا دەگاتە لووتکەی هەرەمەکە (کە ڕستەیە) ڕێزمانی زمانەکەیە.

لە هەر (ئاست)ێك دا[5] یاسای تایبەتی هەیە بۆ لێکدانی دانەکان. ئەم باسە هەوڵدانە بۆ دەست نیشان کردنی ئەو ئامرازانەی وشەکان لەناو قاڵبی فرێزو ڕستەکان دا لێك ـ دەدا.[6]

یەکێ لە ئامانجەکانی ڕێزمان دەست نیشان کردنی پەیوەندی نێوان بەشەکانی ڕستەیە. ڕووێکی ئەم پەیوەندی‌یە لە چۆنیەتی لە یەکدانی وشەکاندایە. لە زمانی کوردی‌دا. . سێ ئامرازی بەستن «Conjunction» هەیە. (ناو و ناو)و (ناو و ئاوەڵناو) لە ناو چوارچێوەی ڕستەدا لەیەك دەدەن کە ئەمانەن: (و ـ ی ـ ـە). هەریەکە ئەرکی تایبەتیی خۆی هەیەو لە حاڵەتێکی تایبەتی‌دا دەردەکەوێ.

یەکێ لە یاساکانی ڕێزمانی کوردی ئەوەیە بکەر، یا بەرکار (ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ) . . . هتد لە ناوێك، یا زیاتر پێك دێت، ئامرازی لە یەکدانی ئەم ناوانە (و) یا (ی)یە. واتا هەموو ناوەلێکدراوەکان بە هۆی ئەم دوو ئامرازە دەتوانن دەوری بەشێکی بنجیی ڕستەی وەك بکەرو بەرکار. . هتد ببینن. جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە لێکدانە لەوەدایە، ئەو ناوانەی بە (و) لەیەك دەدرێن هەموو بەشداری لە ڕووداوی فرمانەکەدا دەکەن بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێیان سپێرراوە. وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

**أ ـ ئازاد و ڕزگار ئاوازو ئاهەنگ. . هاتن**

**ب ـ من ئازادو ڕزگارو ئاوازو ئاهەنگ ئەبینم**

**ج ـ من نامە بۆ ئازادو ڕزگارو ئاوازو ئاهەنگ دەنێرم**

ئەم چوار ناوە (ئازاد ـ ڕزگار ـ ئاواز ـ ئاهەنگ) بە ئامرازی بەستن (و) لێکدراون. لە ڕستەی (أ)دەوری بکەریی ڕستەکە دەبینن هەرچواریان (لە هاتن)دا بەشدارن. لە ڕستەی (ب) دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە دەبینن هەرچواریان بەشدارن لەوەی کە دەبینرێن. لە ڕستەی (ج) دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە دەبینن.. هەر چواریان بەشدارن لەوەی نامەیان بۆ دەنێررێ

لە لایێکی ترەوە ئەو ناوانەی بە (ی) لێك دەدرێن پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا لەسەر بیناغەی هەیی‌دایە (possessive) تەنیا ناوی یەکەم ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێ‌سپێرراوە بەجێ دەهێنێ. ئەم ناوەش سەر بە ناوی دووەم دەبێ، ناوی دووەم سەر بە ناوی سێیەم دەبێ و بەم جۆرە... وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

**د ـ برای مامۆستای کوڕی خوشکم هات .**

**هـ ـ من برای مامۆستای کوڕی خوشکم دەبینم**

**و ـ من نامە بۆ برای مامۆستای کوڕی خوشکم دەنێرم.**

لەم ڕستانەدا.. (برا ـ مامۆستا ـ کوڕ ـ خوشك) هەموو ناون بە ئامرازی بەستن (ی) لەیەك دراون. لە ڕستەی (د)دا هەموو بەیەکەوە دەوری بکەری دەبینن لە ڕستەی (هـ) دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەی (و) دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبینن. لە هەموویان دا تەنیا (برا) یە ڕووداوی فرمانەکە بەپێی ئەو ئەرکەی لەناو چوارچێوەی ڕستەکەدا پێی‌سپێرراوە بەجێ دەهێنێ. تەنیا (برا)یە لە ڕستەی (د)دا هاتووەو لە (هـ)دا دەبینرێ و لە (و)دا نامەی بۆ دەنێررێ. ئەم (برا)یە هی (مامۆستا)یە (مامۆستا)هی (کوڕ)ەو (کوڕ) هی (خوشکم)ە، یاسای لە یەکدانی ناوەکان لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە:




لەناو چوارچێوەی بەشە بنچییەکانی ڕستە هەر ناوەی دەشێ ئاوەڵناوێ یا زیاتری لەگەڵ دا دەرکەوێ. گەر هات و ناوەکە ئامرازی پێناسین (ەکە)ی لەگەڵ دا بوو. ناوەکە بە ئاوەڵناوی یەکەم و ئاوەڵناوەکان بە یەکەوە بە ئامرازی بەستن (ـە) لەیەك دەدرێن، ئامرازی پێناسین (ەکە) لەم حاڵەتەدا دەچێتە سەر دوا ئاوەڵناوەوە.







درەختە سەوزە بەرزەکە

ئامرازی کۆ (ان) گەر دەرکەوت هەمیشە بە (ەکە)ی پێناسینەوە دەلکێ.

درەختەکان

درەختە بەرزەکان

درەختە بەرزە سەوزەکان

ڕاناوی نیشاندانیش (ئەمە ـ ئەوە ـ ئەمانە ـ ئەوانە)چەمکی پێناسینیان هەیە چونکە کە ئاماژە بۆ شتێ دەکرێ.. پێ‌دەناسرێ بەپێی لۆجێك کە پەنجە بۆ شتێ ڕادەکێشێ پێی دەناسێنێ.. بۆیە گەر لەگەڵ ناودا دەرکەوێ ناو و ئاوەڵناوەکان بە ئامرازی (ـە) لەیەك دەدرێن. کە ناو، یا ناو و ئاوەڵناو دەچنە سەر ڕاناوی نیشاندان. دەبنە دووبەش بەم جۆرەی خوارەوە:

ئەم ـــــ ـە

ئەو ـــــ ـە

ئەم ـــــ انە

ئەو ـــــ انە

ناو و ئاوەڵناوەکان ئەچنە نێوانیانەوە







ئەم درەختە بەرزە جوانە




ئەو درەختە بەرزە جوانانە

تێبینی: ئامرازی (ەکە) و (ێك)و (ڕاناوی نیشاندان)...
هەرگیز هیچ کامێکیان لەگەڵ ئەوانیترا دەرناکەوێ.




لە هەموو حاڵەتێکی تردا ناو و ئاوەڵناو بە (ی) لەیەك ئەدرێن




درەختی بەرزی سەوز




درەختێکی بەرزی سەوز

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە، ئامرازی لە یەکدانی (ناو و ناو)و (ڕستەو ڕستە)ـدا (و)یە. هۆی ئەمە ئەوەیە ئەم دوو جۆرە لە یەکدانە یەك بنجیان هەیە، لە یەکدانی ناو و ناو ئەنجامی لابردنی بەشە هاو ئەرکە لەیەك چووەکانە Equi لە چەند ڕستەیەکی لەیەك دراو بەیاسایێکی ئابووری. بەپێی ئەم بۆچوونە ڕستەی:

× نیشـانـەی لەگـەڵ یەکتـر دەرنـەکـەوتنە ø نیشانەیە بۆ ئەوەی کە ناو هیــچ ئامـرازێکی لەگـەڵ دەرنـاکەوێ. یاساکانی لەیەك دانی ناو و ئاوەڵنـاو لەنـاو چوارچێـوەی (فـرێزی ناوی)، یا noun phrase هەموو لەم وێنەیەدا کۆکراونەتەوە.

من و ئازادو رزگار هاتین.

له بناغەدا ئەم سێ ڕیستەیەیە.

من هاتم و ئازاد هات و رزگار هات.

ئەم سێ ڕستەیە بە (و) لەیەك دراون.

فرمانی (هاتن) له هەر سێکیان دا دووبارە بۆتەوە. بۆ خۆلادان لەم دوو بارە بوونەوویە تەنیا یێکێکیان بەجێ دەهێلرێو ئەوانیتر لادەبرێن. لەبەر ئەوەی لە زمــانی کوردیدا هەمیشــە فرمـان لە کۆتـایی ڕستـەدا، دێ فرمانی دوا ڕستە بەجێ دەهێلرێو ئەوانیتر لادەبرێن، تا لە ڕستە تازەکە فرمـان لە شوێنی سروشتی خۆی بمێنێ ڕانـاوی لکـاوی دوافـرمانیش لادەبرێ، سێ بکەرەکە یەك دەگرن هەموو بە یەکەوە دەبن بە (من و ئازادو رزگـار). ئەمـانـە هەمـوو بەیـەکـەوە شوێنی (ئێمـە) دەگرن، بۆ ڕێکـەوتن ڕانـاوێکی لکـاو بە فرمـانـەکـەوە دەلکێنرێ بگونجێ لەگەڵ کەس و ژمارەی بکەرە تازەکە

**من هاتم و ئازاد هات و رزگار هات من و ئازاد و رزگار هاتین**

گەر بەرکار لە چەند ناوێك پێك هاتبێ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە (بکەر)و (فرمان)ی چەند ڕستەیێ هەمان شتن و بە هەمان پەیرەو لابراون، وەك لە ڕستەی،

من تۆ و رزگار و ئازاد دەبینم.

بناغەکەی ئەم ڕستەیەیە،

من تۆ ئەبینم و ڕزگار تۆ دەبینێو ئازاد تۆ دەبینێ چونکە بکەر لە زمانی کوردیدا لەسەرەتای ڕستە دەردەکەوێ... بۆیە بکەری ڕستەی یەکەم بەجێ دەهێلرێو ئەوانیتر هەموو لادەبرێن تا لە ڕستە تازەکەدا شوێنی سروشتی خۆیء بگـرێ. چونکـە فرمـان لە کۆتـایی ڕستـەی کوردیدا دەردەکەوێ. بۆیە فرمانی دوا ڕستە بەجێ دەهێلرێ.. تا لە ڕستە تازەکەدا شوێنی سروشتی خۆی بگرێ.

**من تۆ دەبینم و من ڕزگار دەبینم و من ئازاد دەبینم من تۆ و ڕزگار و ئازاد دەبینم**

ئاوەڵناوەکانی (خەبەر)ی[7] ڕستەی (کاری بوون)یش[8] هەر بە (و) لێك دەدرێن. بۆ نموونە ڕستەی:

ئەم درەختــە چەنـد گەش و سەوزو بەرزە بەلای منـەوە لە بنـج دا ڕستەیێکی لێکدراوەو لەم سێ ڕستە سادەیە پێك هاتووە:

**١ - ئەم درەختە چەند گەشە.**

**٢ - ئەم درەختە چەند سەوزە.**

**٣ - ئەم درەختە چەند بەرزە.**

لەهەر لێکچوونەوەی Equi ـ یەکێك دەمێنێتەوەو شوێنی سروشتی خۆی لە شارستەکە main sentence داگیر دەکات.

ئەم درەختــە (مبتــداء)ی هەر سێ ڕستــەکـەیـە. لە هی دووەم و سێیەم دا لادەچن و لە هی یەکەم دەمێنێ چونکە (مبتداء) لە ڕستەی کوردی لە سەرەتادا دەردەکەوێ. چەند (پلە)ی[9] ئاوەڵناوەکانە.. پلە هەمیشــە پێش ئاوەڵنـاو دەکـەوێ.. بۆیـە هی یەکـەم دەمێنێتـەوەو هی دووەم و سێیەم لادەچن.

(ـە)ی یەکـەم و دووەم لادەچن. هی سێیـەم دەمێنێتـەوە، چونکە فرمان لە ڕستەی کوردیدا دەکەوێتە دواوەی ڕستەکە.

١ - ئەم درەختە چەند گەشە. (ـە) لادەچێ

٢ - ئەم درەختە چەند سەوزە. (ئەم درەختە)و (چەند)و (ـە) لائەچن

٣ - ئەم درەختە چەند بەرزە.

(ئەم درەختە)و (چەند) لادەچن

ئەم درەختە چەند گەش و سەوزو بەرزە

ئامرازەکانی بەستن هەموو لەم وێنەیەدا ڕوون کراونەتەوە.



## پەراوێزەکان

١ - فۆنیم. . . دانەیێکی موجەرەدە abstract چەن دەنگێك دەنوێنێ کە هەموو پێکەوە نرخێك پێشان دەدەن لە زمانێکی تایبەتیدا بێئەی جیاواز ئەم شێوە جیاوازانەیان پێدەبەخشن. بۆ نموونە دوو دەنگی [س]و [ص] لە زمانی کوردیدا سەر بە هەمان فۆنیمن چونکە لەم زمانەدا هیچ ووشەیێك نادۆزرێتەوە بە ئاڵوگۆڕکردنی ئەم دوو دەنگەی مانا بگۆڕێ. کەچی لە زمانی عەرەبیدا دوو فۆنیمی جیان چونکە ئەم زمانـە گەلێ وشـەی هەیـە گەر ئەم دوو دەنگـەیـان تێدا ئاڵوگۆڕ بکرێ مانا دەگۆڕێ وەك (سلب - صلب/ عسیر - عصیر/ سار - صار. . . هتد) بەپێچەوانەوە دوو دەنگی (ر - ڕ) لە زمانی کوردیدا دوو فۆنیمی جیان (برین - بڕین/ کەر - کەڕ/ وەرین - وەڕین. . . هتد). لە زمانی عەرەبیدا سەر بە هەمان فۆنیمن چونکە هیچ وشەی عەرەبی نییە بە ئاڵوگۆڕکردنی ئەم دوو دەنگەی تیا مانا بگۆڕێ.

بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی فۆنیمەوە سەیری سەرچاوە ژ (٥) بکە.

٢ - برگە: تا ئیستا هیچ قوتابخانەیێکی زانستی زمان و فۆنۆلۆجی نەیتوانیوە پێناسینێکی ڕێکی بێکەلەبەری برگە پێشکەش بکات. بە شێوەیێکی گشتی دوو جۆری لێ دەست نیشان کراوە:

أ - برگەی فونەتیکی ئەم جۆرەیان گشتییەو هەموو زمانانی جیهانە تێدا بەشدارن. پەیوەندیی بە فسیۆلۆجیەتی هەناسەوەرگرتن و سروشتی کارکردنی ئەندامانی ئاخاوتنەوە هەیە. لەناو چوارچێوەی ئەم قاڵبە گشتییەدا زمانەکان جیاوازی پێشان دەدەن لە چۆنیەتی لێکدانی فۆنیمەکان. ئەم لێکدانە تایبەتییە برگەی فۆنۆلوجی پێك دەهێنێ.

ب - برگـەی فۆنـۆلـۆجی: لە هەمـوو زمـانێـك دا بزوێن vowel ناوکی برگـە پێـك دەهێنێ. لەگـەڵ ئەم بزوێنـەدا دەشێ چەنـد فۆنیمێکی کپ consonant دەرکەوێ. ژمارەی فۆنیمە کپەکان و جۆری ریزبوون و دەرکەوتنیان بەیەکەوە لە زمانەکان دا جیاوازن. بۆنموونە لە برگـەی زمـانـی کوردی لە یەك تا چوار کپ لەگـەڵ بزێـن دا لە برگەیەك دا دەردەکەوێو هەرگیز لە دوو زیاتر ناکەوێتە لایەکی بزوێنەکەوە.

لە زمانی ئینگلیزیدا تا پێنج کپ لە برگەیەك دا دەردەکەوێ. . لە زمانی عەرەبیدا تا دوو کپ دەتوانێ لە برگەیەك دا دەرکەون. . ئەم جیاوازییە برگەی فۆنۆلوجی پێك دەهێنن. ئەو یاسایانەی فۆنیمەکان لەناو قاڵبی برگەکان دا لێك دەدا بە یاساکانی فۆنۆلوجی ناو دەبرێن.

٣ - مۆرفیم: بچووکترین دانەی واتاداری زمانە لە فۆنیمێك یا زیاتر پێـك دێو دەورێ لە ڕێـزمـان دا دەبینێ بۆ نمـوونـە (دەیـانبینم) لەم مۆرفیمانە پێك هاتووە:

١ - /دە/ دوو فۆنیمە - چەمکی بەردەوامی دەگەیێنێ.
٢ - /یان/ سێ فۆنیمە - ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆیە.
٣ - /بین/ سێ فۆنیمە - ڕەگی کاتی ئێستای (بینین)ە
٤ - /م/ یەك فۆنیمە - ڕاناوی لکاوە.. کەسی یەکەم تاك دەئەگەیێنێ.

وشەی (گەلاوێژ) مۆرفیمێکی حەوت فۆنیمییە. بۆ چەمکی وشەو پەیوەندیی بە مۆرفیم و فۆنیمەوە سەیری سەرچاوە ژمارە (٦) بکەن.

٤ - وشەیێك یان زیاتر بتوانن دەوری بەشێکی بنجی لە ڕستەدا (بکەر. . . بەرکار. . هتد) ببینن فریزێك پێك دەهێنن. بۆ نموونە لە ڕستەی:

[ئازاد لە ساڵی هەزارو نۆ سەدو هەشتاو سێدا ئەم خانووە جوانەی دروست کرد]

ئازاد: فریـزێکـە لە یەك وشـە پێـك هاتـووە چونکـە بە تەنیا دەوری بکەری ڕستەکە دەبینێ.

لە ساڵی هەزارو نۆ سەدو هەشتاو سێدا: فریزێکە لە شەش ووشە و سێ ئامـرازی بەستن پێـك هاتـووە هەمـوو پێکەوە دەوری ئاوەڵکاری کاتی لە ڕستەکەدا دەبینن.

ئەم خانـووە: فریـزێکی ناوییـە لە دوو وشـە پێـك هاتـووە دەوری بەرکاری لەم ڕستەدا دەبینێ.

دروست کرد: فریزێکی فرمانییە لە دوو وشە پێك هاتووە. . فرمانی ڕستەکەیە

٥ - ئاستەکانی شیکردنەوە Levels of analysis زمان دیاردەیێکی لە ڕادەبـەدەر فراوان و ئاڵـۆز و چووە ناویـەکـە. . هەرگیز ناشێ هەر لە سـووچێکـەوە سەیـری‌بکـرێو شی‌بکـرێتەوە. بۆیە زانایان (لە بواری وەسفیدا) چەنـد ئاستێـك بۆ شی‌کـردنـەوە دەست نیشـان دەکـەن. دۆزینەوەی ئاستەکانی زمان لە دەسکەوتە هەرە گرنگەکانی مەیدانی زمانەوانییە. هەر ئاستەی سروشت و پەیڕەوو ڕێگەو تەکنیکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ شی‌کردنەوە. هەر قوتابخانەش بۆچوونی خۆی هەیە لە دەسنیشان کردنی ئاستەکان و سروشتی پەیوەندیی نێوانیان و شی‌کردنەوەیان. .

هەر کارێـکـی زمـانـەوانـی وەسـفی بێ. . . بەراووردی بێ. . مێـژوویی بێ. . ئەگـەر ئاستـەکـان لەشی‌کـردنـەوەدا ڕەچـاوتـەکـات تێکـەڵ و پێکـەڵ دەردەچێ. . فۆنتیـك و فۆنـۆلـۆجیو مۆرفـۆلـۆجیو

سینتاکسی و بەراووردیی و مێژوویی و وەسفی هەموو تێکەڵ بە یەکتر دەبن و کارەکە هیچ ئەنجامێکی رێک وپێک بەدەستەوە نادات و ناکەوێتە بەر پەیرەوی زانستی.

٦ ـ ئەم باسە تایبەتە بە کرمانجی خواروو (زمانی نووسین).

٧ ـ مەبەست لە خەبەری رستە (predicate) ە.

٨ ـ رستەی کاری بوون بەرامبەر (الجملة الاسمية)ی عەرەبی و (verb to be)ی ئینگلیزییە. هەندێ زمانەوان (م ـ یت ـ ـە ـ ین ـ ن ـ ن) بە کاری بوونی کاتی ئێستا لەقەڵەم دەدەن.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| من | | م | | I am |
| تۆ | | یت | | you are |
| ئەو | هیلاك | ـە | tird | he is |
| ئێمە | | ین | | we are |
| ئێوە | | ن | | You are |
| ئەوان | | ن | | They are |

٩ ـ (زۆر، نەختێ، تۆزێ، لەرادەبەدەر، یەکجار تۆزێ ... هتد) ئەم وشانە سەر بەو کۆمەڵەن کە لە زانستی زمانا بە intensifire ناو دەبرێ، واتا (رادە)و (پلە).. چونکە رادە وپلەی ئاوەڵناو پیشان دەدەن.. (زۆرجوان.. نەختێ ئاڵ.. یەکجار قورس.. تۆزێ تاڵ ... هتد).. من (پلە)م وەك زاراوە بۆ بەکارهێنا.

## سەرچاوەکان


١ ـ عبدالرحمن معروف (١٩٧٩) رێزمانی کوردی ـ بەرگی یەکەم ـ بەشی یەکەم. کۆڕی زانیاریی عیراق ـ بەغداد.

٢ ـ رێزمانی ئاخاوتنی کوردی (١٩٧٦) کۆڕی زانیاریی کورد ـ بەغداد.

٣ ـ وریا عمر امین (١٩٨٣) لایەنێکی جیاوازی.. گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عیراق ـ ژ (١٠) بەغداد.

٤ ـ وریا عمر امین (١٩٨٤) ئامرازەکانی بەستن ـ گۆڤاری رۆژی کوردستان ژ (٦٧) بەغداد.

٥ ـ وریا عمر امین (١٩٨٤) فۆنۆلۆجی ـ گۆڤاری کاروان ژ (٢٠).

٦ ـ وریا عمر امین (١٩٨٦) مردنی وشە ـ گۆڤاری کاروان ژ (٤٥)

٧ ـ نوری علی امین (١٩٦٠) رێزمانی کوردی

7 - Huddeston .R. (1977) An Introduction to English trans formation syntax. Longman.

8 - Lyonc. J, (1968) Introduction to theotical Linguistics.


# اداواة الربط


د. وريا عمر امين

استاذ علم اللغة المساعد

قسم اللغة الكردية ـ كلية التربية

جامعة بغداد



أصغر وحدة لغوية هي الوحدات الصوتية المفردة التي يولدها الانسان بواسطة الجهاز الصوتي واكبر وحدة لغوية هي الجملة. علاقة الجملة بالاصوات المفردة مبنية على اساس هرمي.

إن تحديد ماهية هذه الوحدات وكيفية ترابطها لتشكيل وحدات اكبر فاكبر ضمن التركيب الهرمي للجملة هي قواعد اللغة. فلكل مستوى للتحليل قوانينه الخاصة لربط الوحدات التي تشكل ذلك المستوى.

يحاول الباحث تحديد ادواة الربط في اللغة الكردية والقوانين التي تحدد ظهورها وعلاقة ظهور تلك الادواة بعناصر اخرى في الجملة مثل أداة النكرة والمعرفة.. والخ..

ويوضح الباحث آراءه واستنتاجاته بجداول توضيحية.

# ئاوەڵناو
# بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆیە

د. ئەورەحمانی حاجی مارف
بەشی کوردی - کۆلێجی پەروەردە
زاکۆی بەغدا

ئاوەڵنـــاو وەك بەشـــە ئاخـاوتنێـك، واتـای چۆنێتی و خاسیـەت و نیشـانـە رادەگەیەنێ. لە ئاوەڵناودا ئەم راگەیاندنە چ لە بەکارهێنانی رستەسازیداو چ لە تایبەتێتی وشەسازیدا روون و ئاشکرا بەدیاردەکەوێ.

لە مەیدانی رسـتەسـازیدا جیاوازیی ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا لەوەدایە، کە بەر لە هەر شت بە بەردەوامی وەك دیارخەر بەکاردەبرێ. ئاوەڵناو لە سروشتیدا دیارخەری خاسیەتی ناوە.

ئاوەڵنـاو لە پاڵ ئەوەدا کە دەوری دیـارخـەر دەبینێ، هەروەهـا دەش توانێ وەك بەشێکی گوزارە خۆی بنوێنێ. بەڵام لەبەرئەوەی بەشە ئاخاوتنی دیش دەتوانن ببنە بەشێکی گوزارەو لە نێویان دا ناویش، بۆیە لە راستیدا ناتوانرێ ئەو ئەرکە وەك تایبەتێتی سـەربەخۆی ئاوەڵناو تەماشابکرێ.

لەبەر ئەوەی ئاوەڵناو وەك ئەندامی دی رستە کەم بەکاردەهێنرێ،[1] بۆیە دەبینین مەیدانی ئەرك و وەزیفەی لە هی ناو تەسکترە.

لە حالێك دا ئەگەر دوو ئاوەڵناو یان پتر بەیەکەوە بێن، ئەوە هیچ یەکێکیان لەژێر باری ئەوی دییان دا نییە، بەڵکو هەردووکیان سەر بە ناوەکەن.

بەوێنە:

کوڕێکی چالاك و زیرەك

شووتییەکی سووری شیرین.

پیاوێکی ئازاو نەبەرد.

کچی جوان و نازدار.

.... هتد.

لەباری وشەسـازییەوە ئاوەڵناو لەچاو ناودا لە بوونی فۆرمی هەمەچەشن دا هەژارە.

لە رووی فۆرمەوە ئاوەڵناو لە زمانی کوردیدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ناودا نییە - واتە هیچ نیشانەییەکی رێزمانی نییە ئاوەڵناو لە ناو جیا بکاتەوە و دەشێ چ ئاوەڵناوو چ ناو بە هەر دەنگێکی بزوێن یان نەبزوێن کۆتایییان بێت. بۆ نموونە:

گەورە، سپی ... ورد، راست...

بەرە، شووتی ... کورد، دەست...

جیـــاوازیی ئەم دوو بەشـــە ئاخـاوتنـە لە گەیـانـدنی واتـاو بینینی ئەرك دا دەردەکـــەوێ و هەروەهـا ئاوەڵنـاو دۆخ و جنس و ژمـارەی نییـە[3] و بەڵام ناو هەیەتی. دەلالەتی دۆخ و جنس و ژمارەی ئاوەڵناو دەمێك بەدیدەکرێ، کە ناوەکـە دیـاریدەکـا - واتـە دەلالـەتی دۆخ و جنس و ژمـارەی ئاوەڵناو لەڕێی پێوەندی بە ناوەوە ئاشکرا دەبێ.[4]

ئەگـــەرچـــی ئاوەڵنـــاو دۆخ و جنس و ژمـــارەی نییـــە، بەڵام خاوەنـی خاسیەتێکی تایبەتی خۆیەتی، ئەویش بوونی پلەیە. بەم چەشنە لە لایەنی وشەسازییەوە پێوەندی ناوو ئاوەڵناو لەم شێوەیەدا دەردەکەوێ: لە سەرێکەوە ناو سێ حالـــەتی هەیـــە (دۆخ و جنس و ژمـــار)، کە ئاوەڵنـاو نییـەتی. لە سەرێکی دییـەوە ئاوەڵنـاو خاوەنی حالـەتێکـە - (پلە)، کە ناو نییـەتی. بەو پێیـــە بە گشتی ئاوەڵنـاوو ناو لە چوار لایـەنـەوە لە یەك جیـادەبنـەوە. جا لە ڕێگای ئەو چوار حاڵەتەوە دەشێ بە روونی ناوو ئاوەڵناو لە یەکتر جوێبکرێنەوە[5]

ئەگـــەرچی لە زمـــانی کوردیـــەیدا دەلـوێ لە ڕێگـای ئەو چوار حالـەتـە بنەڕەتییەوە ناوو ئاوەڵناو جیابکرێنەوە، بەڵام دەبێ ئەوەش لەبیرنەکەین کە لە هەنـدێ رووی دییـەوە ئاوەڵنـاو تایبـەتێتی وای هەیـە، ناو نییـەتی. یاخـود بەپێچەوانەوە تایبەتێتی ئەوتۆ لە ناودا هەیە، کە لە ئاوەڵناودا نییە. وەك:

هەرچەندە گەلێ پێشگرو پاشگر هەن و وەك یەك دەچنە سەر (ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکـــردار)ی سادەو دەیـــانکـەنـە ناوی دارێـژراو یان ئاوەڵنـاوی دارێژراو، بەڵام هەندێ پێشگرو پاشگر هەن، کە هەر ناو رۆدەنێن و ئاوەڵناو سازنـاکـەن، یاخـود بەپێچـەوانـەوە تەنیـا ئاوەڵنـاو دروست دەکـەن و یارمەتیی دارشتنی ناو نادەن... هەندێ پێشگرو پاشگر هەن دەچنە سەر ناوو ناچنە سەر ئاوەڵناو، یان بەپێچەوانەوە بە ئاوەڵناوەوە دەلکێن و بە ناوەوە نالکێن.

نموونە:

پاشگری (باز) لەگەڵ ئەوەدا کە یاریدەی رۆنانی وشـەی «سەرباز» دەدا، کە ناوی دارێـژراوە، هەروەهـا هاریکـاریی سـازکـردنی وشـەی «فێڵبـاز»یش دەکا، کە ئاوەڵناوی دارێژراوە...

پێشگری (بێ)و پاشگری (ێنە) یاریدەی ڕۆنانی ناوی دارێژ راو دەدەن «بێویست، بێخەف...»؛ «نیسکێنە، زەردێنە...»و یاریدەی سازکردنی ئاوەڵناوی دارێژ راو نادەن... بەپێچەوانەوە پێشگری (بێ) پاشگری (ن ـ in) هاریکاریی ڕۆنانی ئاوەڵناوی دارێژ راو دەکەن «بێهۆش، بێکار...»؛ «ورگن، تووکن...»و لە پێکهێنانی ناوی دارێژ راودا بەشداری ناکەن...

پێشگری (بە)و پاشگری (گەر) دەچنە سەر ناو «بەهێز، بەجەرگ...»، «ئاسنگەر، مزگەر...»و ناچنە سەر ئاوەڵناو... بەپێچەوانەوە پاشگری (وەك) دەچێتە سەر ئاوەڵناو... بەپێچەوانەوە پاشگری (وەك) دەچێتە سەر ئاوەڵناو «بەرزەك...»و ناچێتە سەر ناو....

وێنەیێکی دی لە جیاوازیی ناوو ئاوەڵناودا ئەوەیە، لەگەڵ ئەوەدا کە ناو دەبێ بە ئاوەڵناوو ئاوەڵناویش دەبێ بە ناو، بەڵام ناو نابێ بە ئاوەڵکرداروو هەرچی ئاوەڵناوە بە ئاسانی دەبێ بە ئاوەڵکردار. بەوێنە:

وشەی «جوان» لە ڕستەی «نەسرین کچێکی جوانە»دا ئاوەڵناوە، چونکە وەسفی ناو دەکا، بەڵام ئەگەر بوترێ: «نەسرین جوان دەڕوا»، ئەوە وشەی «جوان» دەبێتە ئاوەڵکردار، چونکە لێرەدا وەسفی کردار دەکا ـ واتە چۆنیەتیی ڕۆیشتن نیشان دەدا... وشەی «منداڵانە» لە ڕستەی «دارا ڕەوشتی منداڵانەیە»دا ئاوەڵناوە؛ لە ڕستەی «دارا منداڵانە دەجووڵێتەوە»دا ئاوەڵکردارە... هتد.

لە بەراوردکردنی ناوو ئاوەڵناوی ئاسادەدا، ئەوە بەدیدەکرێ، کە هەر یەك لەو بەشە ئاخاوتنە بەشداری لە ڕۆنانی یەکدیدا دەکەن. بەوێنە لە ڕۆنانی ناوی دارێژ راوی «بەرزی... گەورەیەتی... سپێتی... بڵندایەتی... قوولایی... چاکە... سەوزەلان... زەردێنە... ڕەشکە... پاکانە...»دا ئاوەڵناوی «بەرز... گەورە... سپی... بڵند... قووڵ... چاك... سەوز... زەرد... ڕەش... پاك...» هاوکاری کردووە... یان لە سازکردنی ناوی لێکدراوی «مێرگەسوور... ڕەشماڵ... سەوزەگیا...»دا ئاوەڵناوی «سوور... ڕەش... سەوز...» بەشدارە... بەپێچەوانەشەوە دەبینین لە پێکهێنانی ئاوەڵناوی دارێژ راوی «بێهۆش... بەهێز... جیهانی... شەرمن... زێرین... کرمێ... ژنانە... خێڵەکی... غەمناك... شەرانی... نازدار... فێڵباز...»دا وشەکانی «هۆش... هێز... جیهان... شەرم... زێر... کرم... ژن... خێڵ... غەم... شەڕ... ناز... فێڵ...»، کە ناون هاریکان... یاخود لە دروست بوونی ئاوەڵناوی لێکدراوی «دڵ ڕەق... خۆش باوەڕ... پیرەمێرد...»دا وشەکانی «دڵ... باوەڕ... مێرد...» کە ناون بەشدارن... هتد.

جیاوازیی ئەو دوو بەشە ئاخاوتنە ـ ناوو ئاوەڵناو ـ شتێکی بنەڕەتی‌یە. ئاوەڵناو بەپێی سروشتی سەربەخۆیی تەواوی‌نی‌یەو هەمیشە مەبەستی ناو نیشان دەدا، کە لە گەڵی‌دا هەڤاڵە. ئاوەڵناو خۆی ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك دیاری‌ناکا، بەڵکو چۆنیەتی‌و خاسیەت و نیشانەیان ڕادەگەیەنێ. بە واتایێکی دیکە ـ دەتوانین بڵێین واتای ڕاگەیاندنی چۆنیەتی‌و خاسیەت و نیشانەی ئاوەڵناو، پەیوەندە بە ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێکەوە ـ واتە چۆنیەتی‌و خاسیەت و نیشانە لە مەودای ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك دا. لە ئاوەڵناودا هەمیشە خەیاڵ لەبارەی گیانداری یان بێگیانی یان بیر یان کارەوە هەیە. جا ئەمەیە کە یاریدەی ئەوە دەدا بە ئاسانی‌و بە ڕەوانی ئاوەڵناو بەبێ ناو بەکاربهێنرێ. بەوێنە، کە دەوترێ: «قەڵەمێکم بدەرێ! ئەوە نا، سەوزەکە»، دیارە مەبەست «قەڵەمی سەوز»ە. ئاوەڵناوی «سەوز» واتای شتێکی (سەوز) دەگەیەنێ. خاوەنی ئەو خاسیەتە لە سەرپاکی ڕستەکەدا ئاشکرا دەبێ. خۆ ئەگەر نیشانەکە ـ (سەوز)ـ بەبێ پێوەندی خاوەنەکەی ـ (قەڵەم) بوترایە، ئەوە هیچ ئاشکرا نەدەبوو.

ئەو جێناوانەی ئیشارەت بۆ ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك دەکەن، هەمیشە دەچنە ڕیزی دواوە، چونکە ناوەکە ـ خاوەنی خاسیەتەکە ـ پتر ماناو مەبەستی وتراوەکەی هەڵگرتووە. ناو بە ئاوەڵناو بووە بە دیارخراو ـ «قەڵەمی سەوز». ئەگەر ناو لە ئارادا نەبێ، ئاوەڵناوەکە جێناوی نیشانەکە دەردەخا (هەروەك نموونەکەی سەرەوە «ئەوە نا»).

لەگەڵ ئەوەش دا، کە لە واتای ئاوەڵناودا هەمیشە نیشان دانی خاسیەتی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك هەیە، لە هەندێ باریش دا بە یارمەتیی نیشانەی دیاریکراوەوە دەتوانێ جێگەی ناو بگرێتەوە.

جیاوازی لە نێوان بەکارهێنانی ئاوەڵناو بەبێ ناو لەگەڵ بوونی ئاوەڵناو بە ناودا هەیە. بەوێنە:

١ ـ قەڵەمێکی چۆنت کری؟

ـ سەوز.

لێرەدا ئاوەڵناو «سەوز» بەبێ ناو «قەڵەم» بەکارهاتووە.

٢ ـ نەخۆشێکی زۆر بێهۆش لە تەنیشتمەوە پاڵ کەوتووە.

«نەخۆش»، کە لە بنەڕەت دا ئاوەڵناوە، لێرەدا بووە بە ناو.

لە زمانی کوردیدا گوێزانەوەی ئاوەڵناو بۆ ناو ئەو خاسیەتەی هەیە، کە وا ئاوەڵناوەگوێزراوەکە دەبێ بە کۆڵەکە بۆ دیارخەرەکانی دی. بەوێنە: «ئەو نەخۆشانە»؛ «نەخۆشەکانی دوێنێ»، «نەخۆشێکی بێهۆش».... هتد.

پرۆتسیی پێچەوانە ـ ڕوودانی بوونی ناو بە ئاوەڵناو، ئەمە لە سروشت دا کەمتر واقیعی‌یە، وەك لە بوونی ئاوەڵناو بەناو. ناو ئەگەرچی بەهۆی کەرەستەی وشەڕۆنانەوە بە ئاسانی دەبێت بە ئاوەڵناو، بەڵام ئەگەر لەو ڕێگەیەوە نەبێ، ئەوە بارو دۆخێکی تایبەتی دەوێ کە ئەو دەورە ببینێ.

هەموو ئەوەی لە سەرەوە باس کراوە، ئەوە نیشان دەدا، کە لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناو بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆیەو ناو و ئاوەڵناو دوو بەشە ئاخاوتنی جیان و هەر یەکەیان خاوەنی تایبەتێتی‌و خاسیەتی خودی خۆیانن.

* *

**پەراوێزەکان:**

(١) بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی ئەرکی ئاوەڵناو لە ڕستەدا، بڕوانە:

أ ـ د. کوردستان موکریانی، ئاوەڵناو لە ڕستەی کوردیدا، گۆڤاری «کاروان»، ژ ٥، هەولێر، ١٩٨٣، ل٣٩ ـ ٤٤

ب ـ د. کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٨٦، ل٩٨ ـ ٩٩، ١٠٥ ـ ١٠٧؛ ١١٥ ـ ١١٦؛ ١٢٤ ـ ١٢٦.

... و هەندێکی دی.

(٢) لە زمانی ئینگلیزیدا کۆتایی (L.Y) ئاوەڵناو لە ناو جیادەکانەوە (بڕوانە: ئا. ئی. سامیرنیتسکی، مۆرفۆلۆژیی زمانی ئینگلیزی، مۆسکۆ، ١٩٥٩، ل ١٥١). لە زمانی ڕووسیش دا ئاوەڵناو خاوەنی چەند نیشانەیێکی کۆتاییە (بڕوانە: ن. س. ڤالگینا، د. ێ. ڕۆزێنتال، م. ئی. فۆمینا، ف. ف. تساپکێڤیچ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ، چاپی چوارەم، مۆسکۆ، ١٩٧١، ل٢٠٢ ـ ٢٠٣).

(٣) ئاوەڵناو لە زمانی ئینگلیزیدا دۆخ و ژمارەی نییە (بڕوانە: ئا. ئی. سامیرنیتسکی، مۆرفۆلۆژیی زمانی ئینگلیزی، مۆسکۆ، ١٩٥٩، ل١٥٠). لە زمانی ڕووسیش دا ئەگەرچی ئاوەڵناو خاوەنی دۆخ و جنس و ژمارەیە (بڕوانە: ئا. ن. گڤۆزدێڤ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ، بەرگی یەکەم، چاپی سێیەم، مۆسکۆ، ١٩٦٧، ل٢٢٢) بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا وەسیلەیێکی سەربەخۆ نین لە دەربڕینی واتای لێکسیکی و ڕێزمانیدا، بەڵکو بەندن بە دۆخ و جنس و ژمارەی ئەو ناوەوە کە لەگەڵی هاتووە (بڕوانە: ن. س. ڤالگینا، د. ێ. ڕۆزێنتال، م. ئی. فۆمینا، ف. ف. تساپکێڤیچ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ، چاپی چوارەم، مۆسکۆ، ١٩٧١، ل٢٠٢ ـ ٢٠٣).

(٤) لە زمانی ئاوێستادا ناوو ئاوەڵناو وەك یەك خاوەنی دۆخ و جنس و ژمارەن و تەنیا هەندێ فۆرمی جیاوازی جنس و توانای پێکهێنانی پلە ئاوەڵناو لەناو جیادەکاتەوە. هەر دوو بەشە ئاخاوتنی ناوو ئاوەڵناو سێ جنس (نێر، مێ، بێ لایەن) و سێ ژمارە (تاك، جووت، کۆ) و هەشت دۆخیان هەیە (بڕوانە: س. ن. سۆکۆلۆف، زمانی ئاوێستا، مۆسکۆ، ١٩٦١، ل٤٠ ـ ٤٤). لە زمانی فارسیی ناوەڕاست دا ئەگەرچی لە فۆرمی دۆخ و جنس و ژمارەدا جیاوازی لە نێوان ناوو ئاوەڵناودا زۆرە، بەڵام ئاوەڵناو خاوەنی دۆخ و جنس و ژمارەیە (بڕوانە: ف. س. ڕاستۆرگویڤا، زمانی فارسیی ناوەڕاست، مۆسکۆ، ١٩٦٦، ل٥١ ـ ٥٢).

(٥) هەرچەندە پاشبەندو نیشانەی ئیزافە بە ئاوەڵناویشەوە دەلکێن، بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێ کە ئاوەڵناو خاوەنی دۆخ و جنس وژمارەیە، چونکە ئەمە تەنیا دیاردەیێکی ڕواڵەتییەو دەنا لە بنەڕەت دا ئەو نیشانانە نیشانەی ناون و لە هەموو بارێك دا هەر بۆ ناوەکە دەگەڕێنەوە. بەپێچەوانەشەوە، دەبینین هەندێ ناو نیشانەی پلەی بەراورد وەردەگرن، جا ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە (تر، ترین) نیشانەی تایبەتی ئاوەڵناو نەبن.

# الصفة احدى اقسام الكلام


## د. عبدالرحمن معروف عبدالله
## قسم اللغة الكردية بكلية التربية في جامعة بغداد



يبين الباحث الفروق الموجودة بين الاسم والصفة ومن ابرزها مايتعلق بالمعنى ودورها في الجملة علاوة على ان ليس للصفة (الحالة والجنس والعدد). ان الاسم هو الذي يقوم بدور تعين الحالة والجنس والعدد للصفة حسب العلاقة الموجودة بينهما اي بين الاسم والصفة في التركيب الوصفي. ثم يقدم الباحث ما للصفة خاصية وهي مايسمى في القواعد بـ(درجات الصفة) في حين ان الاسم ليس له هذه الخاصية. ويظهر لنا ان للاسم حالات ثلاث بعكس الصفة التي ليست لها هذه الحالات ولكنها تتصف بالدرجات. ومن هذا يبين ان الصفة والاسم اربع حالات يمكن عن طريقهما القيام بالمقارنة بينهما.

علاوة على الحالات الاربع الاساسية التي مر ذكرها هناك مميزات جانبية اخرى تخص الصفة فقط ولاتشمل الاسم. وبعكسه هناك خصائص جانبية اخرى للاسم تختلف عن ماهي موجودة في الصفة.

بالرغم من هذه الفروقات هناك بعض السوابق واللواحق تدخل على (الاسماء والصفات والافعال والظروف) البسيطة وتغيرها الى (الاسماء المشتقة او الصفات المشتقة) وهناك بعض السوابق واللواحق خاصة بالاسم لا الصفة وكذلك هناك ماتدخل على الصفات لا الاسماء. ويقدم الباحث النماذج والامثلة لبرهان وبيان ماذهب اليه.

ثم يذكر الباحث في بحثه هذا وجهاً اخراً في الفرق بين الاسم والصفة الا وهي ان الاسم يمكن استعماله كصفة وكذلك يمكن استعمال الصفة كاسم ولكنه يبين من جهة اخرى بان الاسم لايقوم بدور الظرف أما الصفة فتعمل عمل الظرف.

وقد تم ذكر بقية الفروق الموجوده بين هذين القسمين من الكلام (الاسم والصفة) ونتيجة للتحليلات التي قدمه الباحث في هذا المجال يظهر بان الصفة هي قسم مستقل في الكلام ولها الخصائص وان الصفة والاسم قسمان مستقلان في الكلام.



بتهوفن



موزارت

# باسێك دەربارەی مۆسیقای سەمفۆنی و شی كردنەوەی سەمفۆنیای نۆیەمی بیتهۆڤن

ئامانج غازی ڕەواندزی

## مۆسیقای سەمفۆنی[1]

فەیلەسووفەكان دەربارەی مۆسیقا زۆریان وتووەو نووسیوە، هەریەكێ بە پێی بیرو ڕای خۆیو بۆچوونی بۆ بابەتەكە كاریگەریی مۆسیقای لەسەر مرۆڤ و هەموو گیان ـ لەبەرەكانی تر دیاریكردووە. . .

كەچی ئەم كەڵە مرۆڤانە لە خاڵێك دا هەموویان دەگەنەوەیەك و یەك بیرورا دەردەبرن و دەڵێن :ـ مۆسیقا زمانێكی جیهانییەو هەمیشە خۆشیو بەختەوەری تێدا دەبینرێو هەمووكاتێ ڕێگامان بۆ خۆش دەكا كە هەموو ئێش و ئازارو زەحمەتییەك لە ژیانمان دا لابەرین. . . «نیتشە» پرسیار دەكاو دەڵێ : كەی دەنگ دەبێ بە مۆسیقا؟. هەرخۆی وەلامی پرسیارەكە دەداتەوەو دەڵێ : لەوپەری تەنگانیی مرۆڤ، لە خۆشیو كاتی هە ٰ چوون دا، لە هاواركردن دا لە هەموو كاتێك دا كە مرۆڤ بتوانێ لەگەڵ ڕەوڕەوەی خۆشیو شادیو ئازاری ئەم ژیانە هەڵ بكاو خۆی لە نێو بەختەوەریو ئازارەكانی ئەم ژیانەدا بدۆزێتەوە. . .

«كلود دیبوسی»[2] مۆسیقاری گەورەی فەرەنسا دەربارەی ئاوازو مۆسیقا دەڵێ، مۆسیقاو ئاوازی بەجۆش هەست و هۆش دەرنابرێ، خۆی هەست وهۆشە!!. . ئەم هەست و هۆشەش بە باشترین وێنە لە سەمفۆنیادا دەبینرێ. چونكە هەمیشە مۆسیقا بۆ بەختەوەریی مرۆڤ داهێنانی بەسەردا هاتووەو شێوەكاری سەمفۆنیەش داهێنانێكە كە مرۆڤ ئەوپەری چالاكیو بلیمەتی تێدا نواندووە. . .

«سەمفۆنیا» ئەمرۆ كیانێكی تایبەتی هەیەو ناتوانین بەسەریدا تێپەڕین و باسێكی دەربارە نەنووسین. هیچ جارێ نەبووە ئاهەنگی (ئۆركستر) لەسەر شانۆ پێشكەش بكرێو سەمفۆنیای لەگەڵ نەبێ، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات كە سەمفۆنیا مۆسیقایەكی تایبەت بە ئۆركستر دەگرێتە خۆیو سەربەخۆیی لە جوولانەوەكانیدا دەنوێنێو هەموو ئامێرەكانی مۆسیقا بە یەكسانی بەشداری تێدا دەكەن و ئاوازی میلۆدی[4] سەمفۆنیە وەكو بڵێی تایبەتە بە ئامێرە ژێدارەكانەوە بەتایبەتی كۆمەڵی (كەمانچەكان)، گەرچی هەندێ جار هەست دەكەین كە ئەم ئاوازە هەر جارێ لە ئامێرێكەوە دەبیسترێو لەكاتی بیستنی ئاوازی میلۆدیدا ئاوازێكی تر یاخود چەند دەنگێكی مۆسیقا دەبیسترێن، ئەم ئاوازەی دەبیسترێ لە مۆسیقادا زاراوەی «هاوەدەنگ ی هارمۆنی (Harmony) بۆ بەكاردێت، ئەم هاودەنگییەیە كە سۆزو خۆشی دەداتە ئاوازە میلۆدییەكەو وا لە مرۆڤ دەكات كە هەست بە خۆشیو گەورەیی ئەو ئیشە بكات كە خۆی دایهێناوە. .

پەیدابوونی مۆسیقای سەمفۆنیا لەشێوەی مۆسیقای ئامێرەكانەوە دروست نەبووە وەكو كۆنشێرتۆ[5] «Concerto» یا سۆناتە[6] «Sonata» . بەڵكو لەدایك بوونی سەمفۆنیا لە «ئۆڤەرچورەی[7] ئۆپێراكانی ئیتالی ئەو كاتە دروست بووە، ئۆڤەرچور یاخود كە جاران پێیان دەگوت سەنفۆنیا لەسەر دەستی «ئەلیساندرۆسكارلاتی»[8] دا لەسێ جوولانەوە پێك هاتبوو 1- Allegro. 2- Allegro. 3- Allegro كەواتە لە شێوازی كلاسیك دا سەمفۆنیا تەنیا لەسێ جوولانەوە پێك هاتبوو، ئینجا ئۆڤەرچور لە ئۆپیرا[9] جیابووەوەو بەتەنیا پێشكەش دەكرا لە ئاهەنگەكان دا، ڕۆڵێكی گەلێ چاكیشی هەبوو بۆ ڕووتێكردنی زۆربەی مۆسیقارەكان لە دانانی مۆسیقای سەمفۆنیو لەبەر بارو دۆخی گەشەكردنی سەمفۆنیاو سەرهەڵ دانیدا، ئەوا ناتوانین ناوی تاقە كەسێك بێنین و بڵێین ئەم مرۆڤە سەمفۆنیای داناوە، چونكە زۆربەی مۆسیقارەكانی ئەوكاتە دەستێكی باڵایان هەبوو لەدانانیدا لەوانە «جۆزێف هایدن»[10] كە «١٢٥» سەمفۆنیای داناوەو لەنێو مۆسیقارەكان دا بە

(باوکی سەمفۆنیا) ناوبراوەو هەروەها «ڤۆلفگانگ امادیۆس مۆزارت» [11] کە (٤١) سەمفۆنیای گەلێ بەرزی داناوە، (لۆدڤیگ ڤان بتهۆڤن)ی کەڵە هونەرمەندی ئەڵەمانی (٩) سەمفۆنیای داناوەو ئەوانەی ژمارەی تاکیان هەیە تێکڕا هەموویان بەناوبانگن واتە سەمفۆنیەکانی (- ٣ - ٥ - ٧ - ٩) ئەوەی دوایی‌یان واتە سەمفۆنیای نۆیەم لەوپەڕی بەرزی‌و پوختەیی دایە، چونکە ئەوپەڕی بلیمەتی «بتهۆڤن»ی تێدا دیارخست و بۆ یەکەمین جار لە مێژووی مۆسیقادا «گورال» [12] لەگەڵ سەمفۆنیادا بەکارهێنراو، هەروەها دەبێ ڕۆڵی (پیتر ئیلیتش چایکۆفسکی) [13] مۆسیقاری ڕووس لەبیرنەکەین کە (٦) سەمفۆنیی گەلێ ڕێك وپێکی نووسیوە هەروەها مۆسیقارەکانی تریش، (ئەنتۆن دڤۆرجاك)ی [14] چیکی‌و (بیلابارتۆکێ) [15] مەجەری‌و (یۆهان برامز) [16] و (فرانزشۆبرت) [17] ی ئەڵەمانی‌و گەلێ هونەرمەندی‌تر، لەو تیپانەی کە ناوبانگێکی گەلێ چاك و بەرزیان هەبوو لە لێدانی مۆسیقای سەمفۆنی لەساڵی (١٧٣٤ - ١٧٧٧) تیپی شاری (مانهایم) بوو لە ئەڵەمانیا، هەر لەو کاتەدا گەلێ پێشکەوتن ڕوویدا لە بواری (دینامیتا) [18] ی مۆسیقاو ئەو تیپانەی کە ناوبانگێکی چاکیان هەیە لە لێدانی مۆسیقای سەمفۆنیادا:

١) ئۆرکسترای فلهارمۆنیکی (لەندەن).

٢) ئۆرکسترای نەتەوەیی (چیکۆسلوفاکیا).

٣) ئۆرکسترای باڵای (پاریس).

٤) ئۆرکسترای (ئەڵەمانیای یەکگرتوو)

هەروەها گەلێ ئۆرکسترای پێشکەو تووی‌تر.

سەمفۆنیا لەلایەن ئۆرکستراوە لێدەدرێ‌و ئۆرکستراش لەلایەن سەرکردەی ئۆرکستراوە بەڕێوە دەبردرێ‌و پێی دەگوترێ (مایسترۆ). ئەگەر ئۆرکسترا مایسترۆی نەبوو ئەوا یەکەمین کەس کە لەلای چەپی ئۆرکسترا کەوە دادەنیشێ سەرکردەیی ئۆرکسترا کە دەکات، مەبەستمان لەیەکەم کەسە کە ئەوەیە کە کەمانچەکەی بەدەستەوەیە، هەر مۆسیقاژەنێك کە لەلای چەپی ڕیزی پێشەوە دانشتبێ‌و ئامێرێکی جیاوازی پێ‌بێ ئەوا بە ئامێر ژەنێك ناودەبرێ.

ئێستا با بزانین: ئامێرەکانی ئۆرکسترا چین؟؟

ئامێرەکانی ئۆرکسترا دەکرێن بەچوار بەشەوە:

١) ئامێرە ژێدارەکان (الوترية) (کەمان - ڤیۆلا - ڤیۆنسیل - کۆنترباس).

٢) ئامێرە فووتێ‌کراوە دارەکان: (فلووت - ئۆبوا - کلارنێت - فاجووت - بیکولو - کورتۆنگلیزی - کەنترا - فاجووت)

٣) ئامێرە فووتی‌کراوە مسەکان: (ترمپێت - کورتۆ - تۆبا - ترمبۆن)

٤) ئامێرە ترپەدارەکان واتە (ئیقاعیەکان):

(تمبانی - زەنگ - اکسلیفۆن - سیلستا - فبرافۆن - کاسات - کاستایش)

(نقرزان - سێ‌گۆشەی کانزا - تەپلی گەورە)

هەروەها هەندێ ئامێری تر هەن کە هەندێ جار لەگەڵ ئۆرکسترادا دەبینرێن ئەمە لەکاتی لێدانی کۆنشرتۆدا، چونکە ئەم ئامێرانە خۆیان ڕۆڵی ئۆرکسترا دەبینن و دەتوانرێ میلۆدی‌و هاودەنگی لەیەك کات دا تێدا لێبدرێ، ئەم ئامێرانەش بریتین لە (ئورگۆن - هاربسکورد - پیانۆ).

## سەرکردەی ئۆرکسترا

هەندێ خەڵك وای بۆ دەچن کە ئیشی مایسترۆ لەوە دەچێ کە هەموو کەس بتوانێ بەڕێوەی بباو ئیشی تێدا بکات، بەڵام ڕاستی‌یەکەی وا نی‌یە، ئیشی مایسترۆ گەلێ گران و ماندووبوونی تێدایە کەس بۆی ناکرێ بەڕێوەی ببا ئەگەر چەند ساڵێك مۆسیقا نەخوێنێ، هەروەها دەبێ ئەو کەسە ئامادەبوونێکی تایبەتی‌و ورەیەکی بەرزی هەبێ بۆ ئەوەی بتوانێ سەرکردەیی ئۆرکسترا بکات. گرنگترین ئەدگار کە دەبێ مایسترۆ هەیبێ بەهرەیەکی خۆڕسکە کە لە سەرەتای بوونی خۆیەوە لەگەڵی‌دا هەبووبێ، ئەو بەهرەیەی هەبێ کە هەرگیز ناتوانرێ نە لە پەیمانگاو ئەکادیمیەکانی مۆسیقا وەدەست بهێنرێ نە بە خوێندنی چەندان ساڵ.

مایسترۆی ئۆرکسترا لەگەڵ خوێندنی مۆسیقاو هاودەنگی‌و دابەش کردن دا، دەبێ شارەزایی‌یەکی تەواویشی هەبێ لە هەموو ئامێرەکانی کە لە ئۆرکسترادا بەکار دەهێنرێن بۆ ئەوەی دەنگی ناساز دیار بخات و ڕاستی بکاتەوە، جگە لەوە دەبێ مایسترۆ لە ئامێرێك لە ئامێرەکانی ئۆرکسترادا پسپۆر بێ‌و زۆر چاك شارەزای بێت، شایانی باسە زۆربەی مایسترۆکان ئامێری کەمانچە لێدەدەن، هەروەها شتێکی دی کە گەلێ گرنگەو بە ئیشی مایسترۆوە بەستراوەتەوە ئەویش بەکارهێنانی ئەو داردەستە بچووکەیە کە بە دەستی ڕاستی‌یەوەیە، ئەم دارە دەبێ زۆر بە هێمنی‌و زانستی‌یانە هاتوچۆی پێ‌بکرێ تا وەکو بتوانرێ هێما مۆسیقیەکانی بە تەواوەتی پێ شی‌بکرێتەوە بۆ مۆسیقاژەنەکانی ئۆرکسترا.

مایسترۆی سەرکەوتوو لە ئیشەکەی‌دا بیر لە جووڵانەوەی دەستی ناکاتەوە، بەڵکو ئەو هێمایانەی کە دەیەوێ بیان گەیەنێتە مۆسیقاژەنەکان لە خۆیانەوە لە مێشکی فراوانی‌دا دیاری دەکرێن و دەردەچن و پێش ئەوەی هەر نۆتەیەکی مۆسیقا دابەش بکرێ بەسەر ئۆرکستردا دەبێ مایسترۆ ببینێ‌و دینامیتای بۆ دابنێ، ئەوجا مۆسیقا ژەنەکان لەسەر پەیڕەوی مایسترۆ دەڕۆن و هەرگیز لە هێماکانی دەستی دەرناچن..

## ژیانی بتهۆڤن

لودڤیگ ڤان بتهۆڤن لە ساڵی ١٧٧٠ی زایینی لە شاری «بۆن» لە ئەڵەمانیا لەدایك بووە، باوکی لە کلێسای تایبەتی حاکمی بۆن دا گۆرانی‌بێژی تێنۆر

بووەو نەوەی موسیقاکارێکی هۆڵەندی بووە لە زووێکەوە هاتبووە (بۆن)و نەوێدا ببوو بە ڕێبەری مۆسیقا لە کلێسەدا.

بتهۆڤن هەر لە منداڵی یەوە پێگەیشتنی مۆسیقای پێوە دیاربوو، ئەم کارە وای لەباوکی کرد بیر لە دوارۆژی کورەکەی بکاتەوەو بتوانێ مونسارتێکی نوێی لێ دروست بکا، بەڵام ئامانجی باوکی بتهۆڤن لەم کارەدا تەنیا ئەوە بوو کە بە هۆی کورەکەیەوە پارەو سامان وەدەست بهێنێ و هەر بە تەنها لەخۆیدا خەرج بکات و خۆی پێ سەرخۆش بکات. . . بتهۆڤن بۆ یەکەمین جار دەرسی مۆسیقای لە ئەندامانی تیپی مۆسیقای کلێسە وەرگرت، هەروەها باوکە بێ بەزەیی یەکەی بە زۆرەملی وانەی مۆسیقای دەدایێ و زۆر بەخەراپی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرد، بتهۆڤن ئەم زۆرە ـ ملی یەی بەدڵ نەبوو، ئەمە وای لێکرد هەر لە منالی یەوە باوکی خۆی خۆش نەوێ و لەدایکی نزیك بێتەوە. . بتهۆڤن لەتەمەنی (٦) سالیدا بوو کە بۆ یەکەمین چار لە ئاهەنگی کونسێر[19] بە ئامێری پیانۆ بەشداری کرد، ئەم ئاهەنگە لە شاری (کۆلۆنیا)ی ئەڵەمانیدا بوو، دوای ئەمە شارەزایی یەکی تەواوی لەسەر ئامێری ئۆرگن و کەمانچەدا پەیدا کرد، لەو کەسانەی کە ئەوکاتە فێرکەری بتهۆڤن بوون ئەلفریسکانی فیلیالد»ی ڕاهیب و هەروەها «ڤان دن ئایدن»و «نیڤە»ی ئۆرگن ژەن، ئەوەی دوایی واتە (نیڤە)، فێری دانان و دابەش کردنی مۆسیقای کرد. لەساڵی ١٧٨٢ لە دەستەی مۆسیقای کلێسەدا بە ئەندام وەرگیرا، ئەندامی مۆسیقای کلێشەش دەبوایە بزانێ پیانۆ یاخود ئۆرگن لێبدات لەگەڵ شارەزایی یەکی تەواو لە دانانی مۆسیقاو دابەش کردن و دانانی مۆسیقای کۆراڵ دا.

لە تەمەنی «١٧» ساڵیدا بتهۆڤن یەکەم جار چووە دەرەوەی ئەڵەمانیاو بەرەو (ڤیەنا)ی پایتەختی بەرزی مۆسیقا کەوتەڕێ، بەڵێ ڤیەنا پایتەختی هونەری مۆسیقاو ئاواتی هەموو مۆسیقا ژەنەکان بوو کە ڕووی تێبکەن و لەوێوە بنخوێنن، لە وکاتەدا بتهۆڤن زۆر بە لێهاتوویی ئامێری پیانۆی لێدەدا، لەسەردانەکەیدا چاوی بە (مۆزارت) کەوت، بەڵام لەم سەردانەیدا هیچی وەدەست نەهێناو بە پەلە گەڕایەوە بۆ بۆن چونکە هەواڵی نەخۆش کەوتنی دایکی پێگەیشت و داوای کردبوو کە کورەکەی ببینێ. . کە گەیشتەوە ماڵ دایکی لە سەرەمەرگ دا بوو و پاش چەند ڕۆژێك کۆچی دوایی کرد. . بەمە بتهۆڤن خۆشەویست ترین کەسی لەدەست چوو، بە مردنی دایکی گەلێ غەمگین بوو، چونکە دایکی خۆی گەلێ خۆشەویست بوو. هەموو شتێك بوو بۆی، هەر لە منداڵی یەوە لەبەر باوکە بێ بەزەیی یەکەی لەدایکی نزیك ببووەوو هەموو جارێ کە سەرکەوتنێکی مۆسیقای وەدەست هێنایا پێش هەموو شتێك ناوی دایکی خۆی دەهێناو دەیگووت :ـ دایکم منی پێ گەیاندو کردمی بەو مرۆڤەی وا لەبەر دەمتان دایە. پاش مردنی دایکی بەربوەبردنی خێزان کەوتە ئەستۆی بتهۆڤن و گەلێ چەرمەسەری کێشا تا توانی پێیان بگەیەنێ و ڕێگای ژیانیان بۆ دەست نیشان بکات.

سەردانەکەی جاری یەکەمی بتهۆڤن بۆ (ڤیەنا) وای لێکرد کە هەرگیز ئەم پایتەختە هونەری یە لەبیرو هۆشی دەرنەچێ، بڕیاریدا دیسان بچێتەوە ڤیەنا، بەڵام ئەم ئارەزووە پێنج ساڵی ڕەبەقی بەسەردا تێپەری تا هاتەدی.

لەساڵی ١٧٨٨ زایینی حاکمی (بۆن) دەستی کرد بەرێك خستنەوەی دەستەی مۆسیقای کلێسەو ـ بڕیاریدا، شانۆیەکی نەتەوەیی دروست بکات، وەکو ئەو شانۆیەی کە لە ڤیەنادا هەبوو، ئەمە بووە هۆی ئەوە کە تیپێکی ئۆرکسترا پێك بێت. ژمارەی ئەندامانی ئەم ئۆرکسترایە گەیشتە (٣١) کەس و (بتهۆڤن) ئەندامێك بوو لەم ئۆرکسترایە، پاش دروست کردنی شانۆی نەتەوەیی خێرا پەرەی سەندو گەلێ گۆرانی بێژی ئۆپێراو کلێسە ڕوویان تێکردو توانیان لەسەر ئەم شانۆیە ئۆپێراکانی (دۆن جوان)و[20] (شووکردنی فیجارۆ)ی[21] مۆتسارت پێشکەش بکەن.

لەساڵی ١٧٩٢ زایینیدا بتهۆڤن بۆ جاری دووەم سەری لە ڤیەنا داو ئەم جارە ویستی ببێ بە پیانۆلێدەر لەوجێگایەی کە مۆزارت کاری تێدادەکرد، بەڵام پێش ئەم ئارەزووەو هیوایە ئەیویست زیاتر دەربارەی مۆسیقا و دابەش کردنی ئۆرکسترا بزانێ، جارێکیان کاتێك کە بتهۆڤن پیانۆی لێدەدا (هایدن) گوێی لێبوو و زۆری بەدڵ بوو چونکە زانی لە ئەڵەمانیاوە بۆ سوود وەرگرتن و فێربوونی مۆسیقا هاتووە، بتهۆڤن کە زانی (هایدن) وانەی مۆسیقای دەداتێ گەلێ دڵ خۆش بوو، لەسەر دەستی هایدن فێریدا (کونترا کنت)[22] بوو لەدابەش کردن دا

دوای هایدن، (ئەلبر خسترجر) وانەی (تەکنیکی پۆلیفۆنی)[23] دایێ و بەم جۆرە بەردەوامی سوودوەرگرتن و فێربوون وای لە بتهۆڤن کرد کە زۆر ماندوو بێ و سوودێکی گەورە وەربگرێ بۆ پێش خستنی خۆی، لە نێوان ساڵانی (١٧٩٥ ـ ١٨٠٢) بە ڕای هەموو هونەرمەندان بە ـ باشترین پیانۆلێدەر دانرا، بتهۆڤن خاسیەتێکی گەلێ بەرزی هەبوو لەبابەتی مۆسیقاوە، ئەم خاسیەتەش مۆسیقا لێدانی سەرپێیی (العزف الارتجالي) بوو. پسپۆرەکانی مۆسیقا دەیان گووت مۆسیقا لێدانی سەرپێیی ئەو بەس بوو بۆ ئەوەی ناوبانگ دەربکات و وەکو مۆسیقازانێکی بلیمەت بناسرێ.

هەروەکو لەپێش دا باسمان کرد کە یەکەم کارەسات لە ژیانی بتهۆڤن دا مردنی دایکی بوو دووەم کارەساتی ناهەموارو کاریگەر لە ژیانی بتهۆڤن دا گران بوونی گوێچکەکانی بوو) ئەم کارەساتەش لەساڵی (١٧٩٨) تووشی هات کە تازە تەمەنی (٢٨) ساڵان بوو. چ کارەساتێکە کە مۆسیقاکارێك گوێچکە مۆسیقاناسەکانی تووشی کەم بیستن بێ؟. ئەم ئازارەی گوێچکەکانی بەرەبەرە لێی پتر دەبوو و وای لێدەکرد لە هەموو مافەکانی ژینی لەگەڵ خەڵك دا دووربکەوێتەوەو تێکسەڵی خەڵك نەبێ و هەموو کاتێ بە تووڕەیی بیبرێ، یەکەم باس و خواسی ئازاری گوێشی لەنامەیەك دا کە بۆ «ئەمیندا» ناوێکی نووسیوە لە یەکی حوزەیرانی ساڵی (١٨٥١) بەدیاردەکەوێ، «ئەمیندا! بتهۆڤنی گەورەت بەردەوام لەگەڵ سروشت و ئاسمان لەبەر

بەرەکـانی دایـە» بەردەوام دەبیٚ و دەڵیٚ «زۆرجـار دەبینین خونچـە گوڵـەکـان پێش ئەوەی ببن بە گوڵی جوان و ڕەنگاوڕەنگ هەڵ دەوەرێن و نامێنن» دەبیٚ منیش وام بەسەربیٚ؟..»

«ئـەمینـدا! مۆسیقـا بۆمن هەمـوو شتێکـە، ئێستا تەنیا بیر لەوە بکەرەوە کە هەستی بیستنم وا بەرەبەرە دەدۆرێ و لەدەست دەچیٚ... بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو دەردەسەرییەو ئازارەدا هیوام پتەوەو ناڕووخێم، دەڵێن ئازاری گوێیە کانم بەسـتـراوە بە ئازاری ریخـەڵـوکـەکانمەوە، ئێستا ئازاری ـ ریخەڵوکەکانم نەماوەو لەشم ساغە. بەڵام وا بەرەبەرە گوێیەکانم تەپ ئەبن، ئای چەند ئازار دەکێشم، چونکە ئەم نەخۆشیانە زۆر درەنگ و بەزەحمەت چاك دەبنەوە» هەروەهـا لە نامـەیـەکی تردا کە بۆ «فیگـر» پزیشکـەکـەی نووسیـوە دەڵیٚ:- «هەستی بیستنم کزبووە وا زیاترش بەرەو کزی دەڕوات.. بۆ ئەوەی ئاگاداری گران بوونی گوێیەکانم بیت ئەوا پێت دەڵێم، دەبیٚ بۆ ڕاهێنانی مۆسیقا زۆر نزیك بم لە شانۆوە، ئەگەر کەمێك دوورکەوتمەوە ئەوا گوێم لە دەنگتێژەکان نابیٚ، خۆ ئەگەر دوو سیٚ هەنگاوی تر دووربکەومەوە ئەوا گوێم لە هیچ شتیٚ نابیٚ. شتێکی سەیرە کە خەڵك نازانن و هەستی پیٚ ناکەن کەمن تووشی ئەم دەردەسەرییە هاتووم! ئای تەنیا ئاسمان دەزانیٚ من تووشی چی هاتووم!» ئەوەبوو ئەم کارەساتە گەورەیە وازی لیٚ نەهێناو بەتەواوی تووشی «کەڕی» بوو و لەم کاتـەدا تەمـەنی (٤٩) ساڵ بوو واتـە لەسـاڵی (١٨١٩)دا، هەر لەم ساڵـەدا دەفتـەری لەگـەڵ خۆی هەڵ دەگـرت و ئەو کەسـەی بیـوستایە قسەی لەگـەڵ بکـات ئەوا دەبـوایـە لەسـەر دەفتـەرەکە بۆیبنوسیٚ یاخود بەهێما پێی بڵیٚ، هەر لەبـەر ئەم کارەسـاتـەش بوو کە بتهـۆڤن بەدرێـژایی (٢٩) ساڵی دوایی تەمـەنی بە تەنیـایی دەبینـراو هەر بە تەنیـاش لە باخچـەکـانی (بۆن)و لادێیـەکـانی دەوروبـەری (میـونخ) دەسووڕایەوەو چاوی لە ئاسمان دەبڕیو مۆسیقای دادەنا!!... هەروەها لایەنێکی گرنگی ژیان زۆڵێکی کاریگەری هەبـوو لە ژیـانی بتهـۆڤن دا ئەم لایـەنـەش «خـۆشـەویستی» بوو، بەڵیٚ خۆشەویستی پایەیەکی گەلیٚ بەرزی هەبوو لای بتهۆڤن. بتهۆڤنی مەزن بە درێـژایی (٥٧) ساڵی تەمـەنی ژنی نەهێنـا!!... بەڵام خۆشـەویستییەکی گەلیٚ بەسـۆزی هەبـوو بۆ (کـۆنتـستـای ئامـۆزای) کەچی بەردەوامی بۆ ئەم خۆشەویستییە نەنوسراو بە کت وپڕی کۆتایی پیٚ هات، هەروەها لە تەمەنی (٣٥) ساڵیدا کە وانـەی فێـربـوونی پیـانـۆی دەگوتەوە کچێك بەناوی (تریزا براندویج)ەوە زۆر بتهۆڤنی لا خۆشەویست بوو، بەڵام ئەم خۆشەویستیەش سەری نەگـرت و بتهـۆڤن خۆی وازی لیٚ هێنـاو لیٚی دوورکـەوتەوە چونکە لەم تەمەنەدا گوێی زۆر گران ببوو، لەبەر ئەمە لەم خۆشـەویستیـەش بیٚ بەش بوو. لەکـات ژمێـری (٥) ئێوارەی رۆژی (٢٦)ی ئاداری ساڵی ١٨٢٧ زایینیدا بتهۆڤن کۆچی دوایی کرد.

بەڵیٚ کە بتهۆڤن مرد هێشتا سەدەی نۆزدەهەم هەر لە منالیدا بوو واتە تازە چارەگە سەدەیەکی تەواو کردبوو. ساڵ لەدوای تیٚ پەڕین و سەدەی نۆزدەهەم پیـری دۆیشت و واخـەریکـە سەدەی بیستەمیش پیری پەکی بیەخیٚ. کەچی مۆسیقای بتهۆڤن لە هەموو کاتێك دا هەروەکو خۆیەتی، شەپوورێکە بۆ ئەو جەنگـاوەرانـەی لەپێنـاوی سەربـەستیدا دەچـەنگن و دەنگی هەر لەبـەرز بوونـەوەدایـەو هانی خەڵـك دەدا بۆ هەنگـاونـان بەرەوە ئامـانجیـان، بۆ فەیلەسـوفـەکـانیش رووناکییەکە پەردە لەسەر ڕاستییەکانی وجود لادەدات، لای مۆسیقیەکانیش هەڵبەتە مەسەلەی تەکنیکی مۆسیقا لیٚدانی تیٚدایە کە دەبیٚ پسپۆری تیٚدا بەدی بهێنریٚ تاوەکو ئەوەی بتهۆڤن دەیەویٚ وا دەربچیٚ.

## گرنگترین بەرهەمە مۆسیقییەکانی بتهۆڤن

١) ئۆپیرایەك بەناوی (ڤیدیلۆ)وە

٢) (٩) سەمفۆنیا لەمانە (ئیرویکا ـ داخوازەیەك بۆشادی).

٣) کۆنشێـرتـۆیـەك بۆ کەمـانچـە لە سکێڵی (ری)ی گەورە (ئـەم کۆنشێرتۆیە بەنـاوبـانگـترین کۆنشێرتۆیە لەهەر (٥) کۆنشێرتۆیەکانی جهانیو[٢٤] بە (شای کۆنشێرتۆیەکان) ناوبراوە.

٤) (٣٢) سۆناتە بۆ ئامێری پیانۆ لەمانە (سۆناتای ئیمپراتۆر، سۆناتای مانگەشەو.

٥) (٥) کۆنشێرتۆ بۆ ئامێری پیانۆ.

٦) قەداسێك لەسکێڵی (ری)ی بچووك.

٧) (٢) رۆمانـس بۆ ئامێری کەمانچە یەکەمیان لەسکێڵی (صول)ی گەورەو دووەمیان لەسکێڵی (فا)ی گەورە.

«لەمۆسیقای سالۆن»[٢٥]

٨) سـۆناتەیەك بۆ ئامێری کەمانچەو پیانۆ لە سکێڵی (لا)ی گەورە.

٩) (١٤) چوارینی ژێدارەکان (الرباعي الوتري) کە بۆ ئامێرەکانی (کەمان ١ ـ ٢، ڤیولا، چەلۆ) دەنووسریٚ.

١٠) سۆناتەیەك بۆ چەلۆو پیانۆ) لەسکێڵی (لا)ی گەورە.

١١) دووسیانی (Trio) کە بۆ (کەمان ـ چەلۆ ـ پیانۆ نووسراوە لەسکێڵی «ری»ی گەورە.

١٢) (٤) ئۆڤـەرچـور کە ئەمـانـەن (کـوریـولان ـ ئیکمـونت ـ برومیثیـوس ـ پاشماوەی ئەثینا)

١٣) تێکڕایی بەرهەمە مۆسیقاکانی بتهۆڤن کە بۆ هەموو ئامێرەکانی ئۆرکـستراو کۆرالی نووسیوە (١٣٨) بەرهەرمی جۆراوجۆرن.

* * *

## سەمفۆنیای نۆیەم ـ داخوازەیەك بۆشادی

ئەو کاتـەی بتهـۆڤن دەستی بە دانـانی سەمفـۆنیـای نۆیـەم کرد لە ساڵی

(١٨١٥)دا بەربەرەکانی یەکی توندو تیژ لە نێوان سەرمایەدارەکان و ڕەنجبەرەکان دا هەبوو، سەرمایەدارەکان فەرمان ڕەوایی یەکی سەربەخۆیان دەکرد بە سەر بارو دۆخەکەدا، لەلایەکی ترەوە هەموو هونەرمەندو ئەدیب و شاعیرەکان دژی کاری توندوتیژی و فەرمانڕەوایی کۆنەپەرستی هەستان کە ڕژێمی بۆگەنی ئەو کاتە سەپاندبووی بەسەریان دا...

لەساڵی (١٧١٥) زایینی شاعیری گەورەی ئەڵمانیا «فریدریك شیللر» قەسیدەیەکی بەناوی «بۆ سەربەستی» نووسیبوو، ئەم کەڵەشاعیرە کاریگەریەتی شۆڕشی فەرەنسی بە قەسیدەکەوە دیاربوو کە چەند ساڵێك پێش ساڵی (١٧١٥) هەڵ گیرسابوو و لەبەر ناتەواوی بارو دۆخی ئەو کاتە «شیللر» ناونیشانی شیعرەکەی گۆڕی و «بۆسەربەستی» بوو بە (داخوازی‌یەك بۆ شادی) هەروەکو وتمان بتهۆڤن لە ساڵی (١٨١٥) دەستی بەدانانی ئەم سەمفۆنیە کردو تا ساڵی (١٨٢٣) تەواو نەبوو (٨) ساڵی ڕەبەقی بەسەردا تێپەڕی و لەشاری هرتزندورف) تەواوکرا.. ئەم سەمفۆنیەیە هەر بەناوی قەسیدەکەوە ناسرا (داخوازەیەك بۆ شادی).

لەشاری (هرتزندورف) لە کۆشکی بارۆن (برۆنای) جێ‌نشین بوو و لەبەر ڕێزلێنان و تەکلیفێکی زۆر کۆشکەکەی جێ‌هێشت و بەرەو شاری (بادن) کەوتەڕێ و هاوینەکەی ئەو ساڵەی لەوێ بەسەربرد..

دوایی ئەوەی ئەم سەمفۆنیەیە تەواو بوو ئامادەبوو کە پێشکەش بکرێ. بڕیاردرا لە (٧)ی مایسی ساڵی (١٨٢٤)دا لەسەر هۆڵی (الکارنیتە) Alcarenth لە شاری (ڤیەنا) پێشکەش بکرێ و وا بە باش زانرا کە دەوری مایسترۆی ئۆرکسترا بدرێ بە (ئارمیلوف)ی مۆسیقازان.

ڕۆژی پێشکەش کردنەکە هات و بتهۆڤن لەگەڵ هاوڕێیەکی لەنزیك شانۆوە دانشتن، هۆڵەکە جێگای دانشتنی تێدا نەمابوو، هەموو جەماوەر تێکرا بەچاوی ڕێزلێنانەوە سەیری (بتهۆڤن)یان دەکرد، مێژوونوسەکانی ژیانی بتهۆڤن، ئەم هەڵوێستە باس دەکەن و دەڵێن:ـ دوای ئەوەی ئەم سەمفۆنیەیە پێشکەش کراو تەواوبوو کە نزیکەی (کات ژمێرێك ونیوی) خایاند بۆ ماوەی چەند چرکەیەك بێ‌دەنگی‌یەکی کپ باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشاو مۆسیقاکە وا سەرنجی جەماوەری ڕاکێشابوو هەموویان کەوتبوونە داوی بیرکردنەوەیەکی زۆر قووڵەوە. ئەوجا دەستکرا بە چەپڵە لێدانێکی زۆر توندو بەهێز وەکو هاژەی ئاوێکی ساف لە بەرزایی‌یەکی بڵندەوە بێتە خوارەوە وابوو، شەپۆلەکانی جەماوەر بەگشتی بڵندکران لەم کات مدا پەردەی شانۆ دادرایەوەو (بتهۆڤن) هیچ ئاگایەکی لەم چەپڵە لێدان و ڕێزلێنانە نەبوو، چونکە پشتی لە جەماوەرەکە بوو، دیسان پەردەی شانۆ کرایەوەو هێشتا خەڵکەکە لە چەپڵە لێدان نەکەوتبوون و تێکرا هەموویان چاویان بڕیبووە (بتهۆڤن) بەڵام (بتهۆڤن) لەجێگای خۆی نەجوولایەوەو بۆ جاری سێیەم پەردەی شانۆکە کرایەوەو (ئارمیلوف)ی مایسترۆی ئۆرکستراکە بتهۆڤنی بە هێما ئاگادار کردەوەو پێی‌گوت کە ـ خەڵکەکە ڕێزو ستایشی خۆیان دەردەبڕن بۆی.. ئینجا بتهۆڤن

ڕووی لە جەماوەرەکە کردو هەڵسایە سەرپێ و وەڵامی ڕێزو خۆشی جەماوەری دایەوە، کە خەڵکەکە زانییان هەردوو جار پێشو (بتهۆڤن) ئاگای لەهیچ نەبوو و گوێشی لەهیچ شتێك نەبووە، هەڵوێستێکی کاریگەر باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشاو هەموویان بەزەیی‌یان پێ‌دا هاتەوە، چونکە گوێی لە سەمفۆنیەکەی خۆی نەبوو.

بەڵێ ئەیدیت کە پێشکەش دەکرێ، بەڵام هەرگیز گوێی لێ‌نەبوو، گوێی لەسەرسامی گەلەکەی نەبوو، لەم هەڵوێستەدا (بتهۆڤن) خۆی پێ‌ڕانەگیراو چووە سەر شانۆکەو گەلێ گریا، گریانەکەی، خۆشی و شادی خۆی دەردەبڕی بەرامبەر گەلەکەی.

ئەم سەمفۆنیەیە بەرزە لە سکێلی (ڕێ)ی بچووکەو لەچوار جوولانەوە پێك هاتووە، جوولانەوەی چوارەمی سەمفۆنیاکە قەسیدەی شاعیری گەورەی ئەڵمانی (فریدریك شیللر)ە کە بە دەنگی کۆراڵ و چوار دەنگی (سۆلیست)[٢٦] واتە دەنگی تەنیا لەگەڵ کۆراڵ و مۆسیقادا. بتهۆڤن لەم سەمفۆنیەیەدا ئەم ئامێرانەی خوارەوەی بەکارهێناوە.

(١٢) کەمانی یەکەم
(١٢) کەمانی دووەم
(٨) ڤیولا
(٦) چەلۆ
(٤) کۆنترباس
(٢) فلوت
(١) بیکلو
(٢) کلارنێت
(٢) فاجوت
(٤) کورنو
(٢) ترمپێت
(٣) ترمبون
تمپانی
تەپڵێکی گەورە
سێ‌گۆشەی کاتدا
کاسات
نقرزان
باسۆن

ئێستا با بێینە سەر جوولانەوەی یەکەم:

(١) جوولانەوەی یەکەم: Allegro «واتە بەخێرایی لێ‌دەدرێ»

تەعبیر لە جیهان و سیستەمی دونیا دەکات و هەڵوێستی مرۆڤی سەرسام لە ڕووی ئەم جیهانە بە دیاردەخات کە (بتهۆڤن)ی شۆرشگێر لە سەرووی هەموویانەوە، واتە لە سەرووی هەموو سەرسامەکانەوە بووە ... مۆسیقا کە

وا دەکەوێتە بەرگوێ وەکو ئەوەیە کە بانگەوازی (گەلێ) بکات لەژێر زوڵم و قورسایی ئازارەکانی‌دا نباڵێنێ، بە ئاوازێکی وا بانگە دەکات کە پڕە لە خۆشی‌و هیواو ئاسۆی ڕوون. شێوەی ئەم ئاوازەش لە زۆربەی مۆسیقاکانی ئەم کەڵە هونەرمەندە دا باوە، ئەم ئاوازەش بریتی‌یە لە « ترپەکانی ڕۆژگار» ئینجا هێمنی‌و لەسەر خۆیی مۆسیقاکە بەرەبەرە بزر دەبێ‌و دە چێتە چوار چێوەی مۆسیقایەکی توندی پڕ لەسۆزو دەربڕین، ئەم مۆسیقایە ئاوازی سەرەکی جوولانەوەیەکە واتە میلۆدی‌یەکەیە، ئەم میلۆدی‌یەش ئامێرەکانی (کەمان ـ ڤیلا ـ چەلۆ) بە دەری دەخەن و لەدەست پێ‌کردنی‌دا بە نەرمی دەڕاوو بەرەبەرە بەرز دەبێتەوە واتە (Piano to forte) تا دەگاتە ئەو شوێنەی کە ئامێرە فووتێ‌کراوەکان ئاوازە وەردەگرن و هەر بەم ئامێرانەش ئەم جوولانەوەیە کۆتایی پێ‌دێت..

ئاوازی سەرەکی ئەم جوولانەوەیە بووە سەرچاوەی داهێنان بۆ گەلێ لە مۆسیقاکارەکان، بەدڵی زۆریشیان بوو، کەچی کەسیان نەیانتوانی ئاوازێکی وا دابهێنن.

(٢) جوولانەوەی دووەم: (Allegrovivace) زووڕ خێرایە)

لێرەدا هەست دەکەین کە (بتهۆڤن) لە جێگای جوولانەوەی لەسەرخۆ واتە Andante یاخود (ئەداجیو) Adagio کە لە هەموو سەمفۆنیایەك لەدوای جوولانەوەی یەکەمەوە دەبیسترێ (سکرتسو)ی بەکارهێناوە، لە سەمفۆنیادا (سکرتسو) دەکەوێتە جوولانەوەی سێ‌یەم کەچی (بتهۆڤن) لە جوولانەوەی دووەمی ئەم سەمفۆنیایەی داناوە، وادیارە بتهۆڤن ویستوویەتی وا لە گوێگر بکات کە بکەوێتە هەڵوێستی بیرکردنەوەو بەخۆدا چوونەوە بۆیە جوولانەوەی (لەسەرخۆ)ی Adagio خستۆتە جوولانەوەی سێ‌یەمەوە ئەو بیرکردنەوەو بەخۆداچوونەوەیە بە تەسەوفەوەیە.

ئەم جوولانەوەیە بە ئامێرە ترپەیی‌یەکان (ئیقاعیەکان) دەست پێ‌دەکات، هەر لە سەرەتاوە ئاوازی بە جۆشی ئەم پارچەیە بە دیار دەرکەوێت، ئامێرەکان هەموویان بەشدارن لە دروست کردنی ژیانێکی گێژاو لە بەربەرەکانی‌یەکی توندو تیژ لەگەڵ دەوروبەردا، ئەم توندو تیژی‌یەش هیوای لەدواوەیە، ئەم هیوایەش لە ئاوازی سەرەکی جوولانەوەکەدا بەدیاردەکەوێت کە لە ئامێرە ژێدارەکانەوە دەبیسترێ. ئەم ئاوازەش خۆشترین و بەجۆشترین ئاوازە کە بتهۆڤن بەجێی هێشتووە بۆمان. هەر ئەم ئاوازە دووبارە لە ئامێرە فووتێ‌کراوەکانەوە دەبیسترێتەوەو تا ئەو شوێنەی هەموو ئورکسترا پێکەوە لێی دەدەن دوای ئەوەی ئاوازی یەکەم بە ئورکسترا کۆتایی پێ‌دێت. کەمانچەکان بە دەنگی باریك ئاوازێکی زۆر جۆش لێ‌دەدەن و ئەم ئاوازە بەدوای ئاوازی سەرەکی یەکەم کەوتووەو ڕێگا بۆ ئاوازێکی‌تر ساز دەکات و لێرە دەکەونە ناو هارمۆنیایەکی بە خوڕو پڕ لە سۆزەوە، لە هەمان کات دا (ترپەکانی‌ڕۆژگار) بە بەردەوامی لە تەپڵەوە دەبیسترێ، ئەم لێ‌دانی تەپلە وەکو ئەوەی بانگەوازی هێزی شەڕ بکات بۆ ئەوەی بە تاریکی ڕەشی خۆی هەموو ڕۆشنایی‌یەکی ڕاستی بشارێتەوە بەڵام ئەم تاریکی‌یە بەزوویی لەناو دەچێ‌و ڕووناکی‌یەکی بەتیشك بەدی دەکەین ئەویش بە بیستنی ئاوازێك کە وەکو (نافورە) لەبەرزی‌و نزمی دایە، ئەم ئاوازە گەلێ بەجۆش و سۆزە وا لە مرۆڤ دەکات کە هەموو ناخۆشی‌و ئازارەکانی لەبیر بچێتەوەو هەمیشە دەست لە ملی هیواو خۆشی بکات، ئەم ئاوازەش وەکو ئاوازێکە کەبۆ هەڵپەڕ کێ‌یەك لێ‌بدرێ ئینجا ئاوازێکی لەسەرخۆ لەئامێری (باسۆن)ەوە دەبیسترێ تا کۆتایی ئەم جوولانەوەیە بە شێوەی (فوجە) [27] دەمان گەیەنێتە (کۆدا) [28] Coda کەو جوولانەوەکە بەم شێوەیە کۆتایی پێ‌دێت.

(٣) جوولانەوەی سێ‌یەم : (Adagio) لەسەرخۆ

ئەم جوولانەوەیە لەسەر دوو ئاوازی بەرهەڵستی‌یەك دانراوەو سکێڵەکەی جیاوازە لەگەڵ سکێڵەکانی جوولانەوەی یەکەم و دووەم، سکێڵی ئەم جوولانەوەیە (سی‌بیمول)ی گەورەیە. دەست پێ‌کردنی ئەم جوولانەوەیە بە ئامێرەکانی (باسۆن ـ کلارنێت ـ ئۆبوا) یە لەگەڵ بەشداربوونی ئامێرە ژێدارەکان، ئاوازی یەکەم یەکێکە لە قووڵترین ئاوازەکانی بتهۆڤن لەبارەی هەست و سۆزەوە.. ئەم ئاوازە واڵە گوێگر دەکات کە بەندی نیگەرا نی‌یەکی قووڵ بێت، ئاوازەکە زۆر بەهێمنی دەڕوا وەکو شنەبای ئێوارانی پایز کە لە گەڵا زەردەکان دەداو یەکە یەکە دەیانخاتە خوارەوە وا دەردەکەوێ‌و دەکەوێتە بەر گوێ ئنجا هەست بە درامایەکی مۆسیقا دەکەین کە هەموو گەنجینەی مرۆڤایەتی لە گریان و هەستی بەسۆزی تێ‌دا خڕبۆتەوەو هێمنی دەروونی مرۆڤ چاك دەکاتەوە لە هەموو ئێش و ئازارەکانی، ئەم دراما مۆسیقی‌یە لە هەموو ئامێرەکانی ئۆرکستراوە دەبیسترێ ئینجا کۆمەڵی کەمانچەکان بە گشتی لەگەڵ (ترمبون) و ترمپێت) بەرەبەرە هێمن دەبنەوەو تا بەتەواوەتی بزر دەبن لە نێوان هاژەی «کۆنترپاسەکانەوە» ئینجا ئاوازی سەرەکی دووەم چەند جارێك لەگەڵ ئاوازی یەکەم یەك لەدوای‌یەك دووبارە دەبنەوە، ئاوازی یەکەم لەچەند شێوەیەکی هەمەڕەنگە دا دەبیسترێ واتە هەر جارێك بە شێوەیێ گۆڕانی بە لە چوارچێوەی ئاوازە سەرەکی‌یەکە دەرناچێ، کۆتایی ئەم جوولانەوەیە بە ئامێری (ترمپێت)ەوە دێت، وەکو بڵێی بتهۆڤن ئاگادارمان دەکاتەوەو پێمان دەڵێ وریا بینەوە وا گەیشتینە ڕووداوە گەورەکە..

(٤) جوولانەوەی چوارەم Allegro assiai presto زۆرزۆر خێرایە

بتهۆڤن لەکاتی دەست پێ‌کردنی نووسینی ئەم جوولانەوەیە نزیکەی (٢٠٠) لاپەڕەی نۆتەی مۆسیقای نووسی تا گەیشتە ئەو ڕایەی کە موسیقایەکی تەواوی داناوە بۆ قەسیدەکەی (شیللر) هەروەها بتهۆڤن هەواڵێکی گەلێ گرنگی لە مێشکابوو بۆ ئەوەی بە کلۆڵەکانی ڕابگەیەنێ تاوەکو شۆرشە دامرکاوەکان هەمیسان بەرپابکەنەوە بەڵێ ئەم هەواڵەی بتهۆڤن شۆرشێکی ناوخۆیی‌یە هەموو گیان دەلەرزەنێ‌و دەی‌خاتە باوەشی خۆشی‌یەکی پاکەوە. لێرەدا هەمان دەنگی (ترپەکانی‌ڕۆژگار) کە لەجوولانەوەی یەکەم و دووەم سێ‌یەم دا بیستمان دەووبارە دەبێتەوە. بتهۆڤن لە سەرووی ئەم جوولانەوەی یەکەمی ئەم

سەمفۆنیایەوە نووسیوەو دەڵێ : - نەخێر ئەم جوولانەوەیە یادگارمان دەگەڕێنێتەوە سەر باری شپرزەیی و ناخۆشیمان هەروەها لەدوای تەواوبوونی جوولانەوەی دووەم ئەم چەند وشانەی نووسیوە:- ئەم جوولانەوەیش وەکو گاڵتەجاڕی وایەو هەندێ خۆشی لێوە بەدی دەکرێ، هەمیسان لەدوای تەواوبوونی جوولانەوەی سێیەمیش وتویەتی:- ئەمەشیان نەء ، ئەمەیان زۆر باری بەزەیی پێهاتنی تێدایە پێویستە بەدوای شتێکی ترا بگەڕێین چالاکی و خۆبەخت کردنی تێدابێت. نەخێر ئەوەی گیان، هەست دەیەوێ شتێکی نوێیە، پاکە، ئاوات و هیوای لێ چاوەڕێ دەکرێ، دەبێ خۆشی بیشانی خەڵك بدات و ڕێگایان بۆ ڕووناك بکاتەوە تا بە شادی بژین.

بتهۆڤن لە سپاردەکەیدا کە بەناوی (هیلیجستاد)ە وەیە نووسیوەتی و دەڵێ:- « لەزوێکەوە دەنگە دا نەوەی خۆشی و شادی لە گیانم دا بزرەو پێم نازانێ، ئاخ کەی هەستی پێدەکەم؟ کەی دەتوانم ئەی خوای خۆشی و شادی دەست لەملی ئەم بەختەوەرییە بکەم؟ نەخێر هەستی پێناکەم.. ئەم خۆشییە زۆر ئازارو ئەشکەنجەی پێگەیاندم. بەڵام ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەی بتهۆڤن، لەگەڵ تەواو بوونی جوولانەوەی چوارەمی سەمفۆنیای نۆیەم کۆتایی پێهات و گیانی ئەم کەڵە هونەرمەندە بە یەك جاری حەسایەوە. ئەو خۆشی و شادییەی بتهۆڤن داوای دەکرد لە ئاوازی قەسیدەکەی (شیللر)دا بوو، ئەو قەسیدەیەی کە هەموو کاتێ داخوازی شادی خۆشی بۆ خەڵك دەکات، هەموو کاتێ کە گوێمان لەدەنگی ئەم کۆراڵە دەبێ هەست بە خۆشیەکی گەلێ گەورە دەکەین و زەردەخەنەیەکی بەردەوام لەسەر ڕووی جەماوەر دەبینرێ.

بتهۆڤنی مەزن دیسان بۆ ئەوەی گوێگر ئاگادار بکاتەوە دەست پێکردنی ئەم جوولانەوەیەی داوە بە ئامێرە فووتێ کراوەکان، ئەم پێشەکییە (٧) (مازۆرە)[٢٩] ی مۆسیقایەو زۆر بەخێرا لێدەدرێ، دوای ئەم لێدانە (چەلۆ کونترباس) ئەم دەنگانەدا دەمرکێننەوەو چەند گۆڕان کارییەك لەسکێڵەکان ڕوو دەدەن و دیسان (کونترباس)ەکان ئەم دەنگانەش دادەمرکێننەوە بە ژەنینێکی گەلێ نەرم و پڕ لە هەست و سۆز.. دوای ئەمە گوێمان لەچەند برگەیەك دەبێ کە لە شێوەی سکێڵی مۆسیقایە، ئەم سکێلانەش بە ئامێرە فووتێکراوەکان دەست پێ دەکەن و بەردەوام دەبن تا ئامێرە ژێدارەکان لێیان وەردەگرنەوە .. ئینجا ئاوازی سەرەکی (کۆراڵ) لە سکێڵی (ڕێ)ی گەورە دا دەبیسترێ بە بەشداربوونی (ڤیۆلاو چەلۆو کونترباس) ئەم ئاوازەش میلۆدی دەنگی کۆراڵەکە دەخاتە بەر گوێ ئینجا بەرەبەرە ئامێرەکانی تری ئۆرکسترا بەشداری تێدا دەکەن و تا بە تەواوەتی لەهەموو ئۆرکستراوە دەبیسترێ، بەم جۆرە پێشەکی مۆسیقا بە ئۆرکسترا کۆتایی پێدێت و ئەو ئاوازەی کە لە سەرەتای جوولانەوکە گوێمان لێی دەبێ دووربارە دەبیتەوە.

ئاوازی کۆراڵ دەنگی (باریتۆنی)ی سۆلۆی لەگەڵەو دەڵێت:-

## - داخوازەیەك بۆ شادی -

**برادەرینە .. برادەرینە**
**ئەم دەنگانە چیتر بەردەوام نابن**
**کەواتە با گۆرانی برایەتی .. گۆرانی شادی ببێژین**
**ئەی شادی هەر شکۆدار بیت..**

ئەم چوار دێرە شیعرە زۆر بە خێرایی دەگوترێ لەگەڵ ئۆرکسترا.

دوای ئەوە بە بەشداربوونی کۆراڵ بەگشتی سێ دێری شیعری تر دەبیسترێ لەلایەن چوار دەنگی (سۆلیست)وەو لەناو کۆراڵەکەداو هەموویان تێکرا بە دەنگی باریتۆن دەڵێن:

**ئەی شادمانی.. ئەی چاووگیء ڕووناکیی نەمر**
**ئەی نەوەی بەهەشت**
**بۆ ئەوەی بگەینە بەر دەرگات خۆمان بە ئاگر شوشت**
**بۆ بارەگای پیرۆزت هاتووین**
**بە تیشکی ڕوونی دڵ فرێنت خەڵك زنجیری سەختیان دەپچڕێنن**
**هەر کە شەقەی باڵت بێ**
**خەڵك وەکو برا دەژین**
**تۆ ئەی سەرفرازو دڵشاد ئەی ئەو کەسەی**
**برادەری وەفادارت هەیە**
**تۆ کە دڵی ئافرەتێکت داگیرکردووە**
**لێگەڕێ با بە یەکەوە گۆرانی شکۆداری بڵێین**
**هەر کەسێکیش دڵی خۆی نەخاتە سەردەستی**
**با لە ئەشکەوتەکەیدا .. بەتەنیایی شین بکا**
**شادمانی باڵی بەسەر خەڵکا کێشاوە**
**لە هەموو لایەکی زەمنیەوە دەنگی داوەتەوە**
**بۆ چاك و خراپ .. بۆ هەموو شتێ لەم سروشتە**
**با بە شادییەکی پاك هەڵپەڕین**
**چونکە ئەم شادییە.. چەش و دڵ خۆشی خۆشەویستیمان دەداتێ.**
**باوەش بۆ هەموو گێتی دەکاتەوە**
**لەم پەپولەیەی کە شەیدای بەهارە**

تا دەگاتە ئەو فریشتەیەی کە لە تەنیشت عەرشی خواوە دانیشتووە.

ئەم کۆپلەیە زۆر بە هێمنی و سەردانواندنەوە، بۆ گەورەیی قەسیدەکەو ئاوازەکەی دەگووترێ دوای تەواو بوونی ئەم کۆپلەیە لەلایەن چوار دەنگە سۆلیتەکان دەنگی (تینۆر)[٣١] لەگەڵ کۆراڵ بەگشتی بەشدار دەبن و هەموویان پێکەوە دەڵێن:-

**با دڵ خۆش بین... تا خۆری پرشنگدار لە کەشکەلانی فەلەك**

بسووڕێتەوە برایان .. وەرن
با چاوتان بە پاڵەوانێتی‌و دڵ خۆشی‌و سەرکەوتن بگەشێتەوە.
(پارچەی دووەم لێرە دووبارە دەبێتەوە)

ئینجـا کۆرس بە دەنگێکی پڕ لە سۆزەوە بە تێکسرایی بانگـەوازی «شـادی» دەکەن و دە ڵێن :-

**خەڵکینە ئەی ئەوانەی لە ژماردن نایەن**
**هەستنە سەرپێ‌و کۆببنەوە**
**بە دڵشادی ماچی برایەتی بگۆڕنەوە**
**خوای گەورە.. خۆشەویستی**
**بۆ جیهان دەبەشێتەوە**
**بۆ ملیۆنەها بەندەی خۆی**
**کە بە ڕێگای خۆشەویستیدا دەچن و دەیلۆزنەوە**
**بە شوێنیدا بگەڕێن... وا لە بەرزاییە**
**جێگای وا لەنێوان ئەستێرەکانە!**

هەمیسان کۆرس بەشەکەی پێشوو دووبارە دەکەنەوە...

بەم جۆرە ئەم سەمفۆنیا گەورەیە بە دەنگی بەسۆزی مرۆڤ کۆتایی پێ‌دێت هەموو کاتێ ئەم دەنگانە وا دەزرینگێنەوە لە گوێمان دا، وامان لێ‌دەکەن هەردەم شادی بیەخشینە کلۆڵەکان بۆ ئەوەی ئەوانیش چێژ لەم ژیانە خۆشە وەرگرن، چونکە ئەوانیش ئادەمیزادن، مافی ژیانیان هەیە...

**سەرچاوەکان:**

بۆ ڕێك خستن و پێش کەش کردن و شیکردنەوەی ئەم بابەتە ( مۆسیقای سەمفۆنی‌و سەمفۆنیای نۆیەمی بتهۆڤن)ە سوودم لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگرتووە


| | |
|---|---|
| ١) دەروازەیەك بۆ ئاوازو گۆرانی کوردی | محمود زامدار |
| ٢) نزعات إنسانیه في موسیقی بتهوفن | تألیف. غانم الدباغ - من کتب الموسوعة الصغیرة |
| ٣) موسوعة موسقی فاگنەر | تألیف د. ثروت عکاشه |
| ٤) الموسیقی في العصر الرومانتیکی | تألیف. الفرد انشتین - ترجمة. د. احمد حمدی محمود |
| ٥) تراث الموسیقی العالمیة | تألیف. کورت زاکس - ترجمة د. سمحة الخولي |
| ٦) کیف تتذوق الموسیقی | تألیف. ارون کوبلاند - ترجمة. محمد رشاد بدران |
| ٧) تاریخ الموسیقی العالمیة | تألیف. تیودور فینی - ترجمة. د. سمحة الخولی |
| ٨) مجلة القیثارة | عدد ٣٣ ایلول ١٩٧٦ |
| ٩) مع الموسقا | تألیف عزیز الشوّان |
| ١٠) دعوة الی الموسیقی | تألیف المایسترو یوسف الیسی |
| ١١) تعال معی الی الکونسیر | تألیف یحیی الحقی |
| ١٢) أساطین النغم | تألیف بثینة فرید |
| ١٣) روح الموسیقی | تألیف. سمیر الحاج شاهین |
| ١٤) بتهوفن دراسة في تطوره الروحي | تألیف جي - دبلیو - ان - سولیفان - ترجمة نجیب المانع |
| ١٥) تمهید للفن الموسیقی | تألیف ماکس پنشار - ترجمة - محمد رشاد بدران |


**پەراوێزەکان**

١) مۆسیقای سەمفۆنی :- زاراوەی سەمفۆنیە لە دوو بەش پێك هاتووە (SYN) ی ئەغریقی واتە (لەگەڵ) و (Phone) واتە (دەنگ). مۆسیقای سەمفۆنی واتە ئەو مۆسیقـایـەی کە تایبـەتـە بە شێـوەی سەمفـۆنیـاو دەبێ هەر چوار جۆری ئامێرەکانی ئۆرکسترای تێدا بەکار بهێنرێ: ( ئامێرە ژێدارەکان ئامێرە فووتێ کراوەکان ( چ دار چ مس) ( ترپەیی‌یەکان).

٢) کلوددیبـوسی :- مۆسیـقـازانێکی فەرەنسی‌یـە لەسـاڵی (١٨٦٢) لە سان جرمان لەدایك بووە لە (٢٦) ئاداری ساڵی (١٩١٨) لەپاریس مردووە، بە هەڵگری ئاڵای بزووتنەوەی کاریگەرخوازی دا دەنرێ لە هونەری مۆسیقادا.

٣) ئورکسترا:- ئۆرکسترا لە چەنـد مۆسیقـاژەنێکی لێ‌هـا توو پێك دێت کە ژمارەی مۆسیقا ژەنەکان لە (١٠) کەس کەمتر نەبێ‌و بەپێی پێویست دەتوانرێ ژمارەیان زیاد بکرێ جا گرنگ نی‌یە (٥٠) کەس بن، یان (١٠٠).

٤) میلودی:- ئەو بیرە مۆسیقیەیەکە لەکاتی زنجیرە ئاوازی ئەوتۆ دا هەستی پێ‌دەکـەین کە لەبیـەك سەرچاوەی دەنگی‌یەوە دەردەچێ بە گوێرە یاسای

زنجیرەی ئاوازو کێشی ترپە.

٥) کونشیرۆ :ـ کونشیرتۆ لە ناوی لاتینی (کونشیرتاری) وەرگیراوە بەمانای پێش برکێ- کردن دێت. مۆسیقای کۆنشیرتۆ بۆ ئامێرێك یاخود دووان • دەنووسرێ لەگەڵ بەشداربوونی ئورکستراو رۆڵی ئامێرەکە بە تەواوی دیار دەبێت، ەونکە ئیشە مۆسیقی یەکە بۆ ئەو ئامێرە نووسراوەو ئۆرکسترا شان بەشانی ئامێرە کە دەڕوا .

٦) سۆناتە :ـ سۆناتە چوارچێوەیەکی مۆسیقای سەربەخۆیەو لە سێ جوولانەوە پێك دێت و بۆ ئامێرێك لە ئامێرەکانی ئۆرکسترا دەنووسرێو تەنیا ئامێری (پیانۆ)ی لەگەڵ بەکار دەهێنرێ لەکاتی لێدانی مۆسیقادا.

٧) ئۆڤەرچور واتە (پێشکەکی) وشەیەکی ئیتالی یە بەمانای پێشەکی دێت و چوارچێوەیەکی مۆسیقای سەربەست دەگرێتە خۆی، واتە کە ئەم مۆسیقایە لەلایەن دانەرەکانی مۆسیقاوە دادەنرێ تەنیا بۆ ئەوە دادەنرێ کە بۆ پێشەکی لێبدرێ لە ئاهەنگە ئورکسترالیەکان دا.

٨) الساندروسکارلاّنی :ـ مۆسیقازانێکی ئیتالی یە، لە شاری (سەقەڵیە) لە ساڵی ١٦٥٨دا لەدایك بووە بە بەرهەمترین دانەری مۆسیقا دەژمێررێ نزیکەی (١٥٠) ئۆپێرای داناوە لە ساڵی ١٧٢٥ لە (ناپولی) مردووە.

٩) ئۆپێرا Opera) شانوگەری یەکە بەگۆرانی یەوە دەگوترێو لەسەر شانۆ شان بەشانی مۆسیقای ئۆرکسترالی. باسی سەرگوزشتەیەکی دڵداری یاخود کۆمەلایەتی دەگێرێتەوە.

١٠) جوزیف هایدن. لەساڵی (١٧٣٢) **لە بنەماڵەیەکی هەژار لەشارێکی** بچووکی نەمسا لەدایك بووە... **لەناو دانەرەکانی مۆسیقادا بە (باوکی** سەمفۆنیا) ناوبراوە، چونکە نزیکەی **(١٢٥) سەمفۆنیای داناوە لە ٣١ مایۆی** (١٨٠٩)دا مردووە.

١١) مۆزرات :ـ لەساڵی **(١٧٥٦) لەسالزبورگ لەدایك بووە، هەر لە** منداڵی یەوە لەلایەن **(لیوپولدموزارت)ی باوکیەو وانەی مۆسیقای خوێندووەو** باوکی کەمانچەی لێدەدا، **بەناوبانگترین بەرهەمەکانی مۆسیقای (سرنیاد)و** سەمفۆنیای (٤٠). کەساڵی **(١٧٩١) لەتەمەنی (٣٥) ساڵیدا کۆچی دوایی** کردووە.

١٢) کۆڕال Coral لە چەند گورانی بێژێکی لێهاتوو پێك دێت کە ژمارەیان لە (٣٠) کەس تا (٨٠) کەس بێت، بەڵکو زیاتریش لە (٨٠) کەس، دەکرێت بە سێ بەش یاخود چوار بەشەوە، لەکاتی گوتن دا هەر بە شێکی گورانی یەکە دابەش دەکرێتە سەر بەشێك لە کۆڕاڵەکەدا.

١٣) چایکۆفسکی :ـ لەساڵی ١٨٤٠دا لەروسیا لەدایك بووەو تا تەمەنی (٢٣) ساڵی لەکۆلیژی (یاسا)ی خوێندووەو ئنجا جێی هێشتووەو ڕووی کردۆتە مۆسیقا. بەناوبانگترین بەرهەمی مۆسیقای (باڵێی دەریاچەی لیبید)و (سەمفۆنیای شەش)مە لە ساڵی ١٨٩٤دا بە نەخۆشیی رشانەوە (کولیرا) مردوە.

١٤) ئەنتۆن دفورجاك :ـ لە ساڵی (١٨٤١)دا لە چیکۆسلۆفاکیا لەدایك بووە، بەناوبانگترین بەرهەمی (ئۆپێرای رۆزالکا)و (سەمفۆنیای جهانی نوێ)یە لە ساڵی (١٩٠٤)دا مردووە

(١٥) بیلابارتوك :ـ لە ٢٥ ئاداری ساڵی ١٨٨١دا لە شاری (ناجندنتملکوش) لە هەنگاریا لەدایك بووە. لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا یەکەم پارچە مۆسیقای خۆی داناوەو پێشکەشی جەماوەری کردووە. بەناوبانگترین بەرهەمی بریتی یە لە توێژینەوەیەکی شی کردنەوەی فۆلکلۆری هەنگاریو کۆکردنەوەیو لە چاپ دانی. لە ساڵی ١٩٤٥دا تووشی نەخۆشی (لوکیمیا) بوو و هەر لەو ساڵەدا لە نەخۆشخانەیەکی نیویۆرك مردووە.

١٦) یوهان برامز :ـ لەساڵی ١٨٨٣دا لە شاری هامبورگ لە ئەڵەمانیا لەدایك بووە. باوکی کونترباسی لێدەدا. لە تەمەنی (٨) ساڵان دا وانەی خوێندنی پیانۆی وەرگرتووە، بەناوبانگترین بەرهەمی (کۆنشێرتۆی کەمانچەو ئۆرکسترا)یە لە ساڵی ١٨٩٧دا بە نەخۆشیی شێرپەنجە مردووە.

١٧) فرانز شوبرت :ـ لە ساڵی (١٧٩٧)دا لە (ڤیەنا) لەدایك بووە. بە یەکەمین و گەورە ـ ترین مۆسیقازانی رۆمانتیکی ناو دەبرێ. بەناوبانگترین بەرهەمەکانی گورانی یەکانیەتی هەروەها سەمفۆنیای ناتەواو (السمفونیة الناقصة) ژمارە (٨) لە ساڵی (١٨٢٨)دا مردووەو لەسەر راسپاردەی خۆی لە نزیکی (بتهۆڤن)ەوە نێژراوە. تەنیا (٣١) ساڵ ژیاوە.

**١٨) دینامیتیا :ـ هەموو جۆرە شتێك دەگرێتە خۆی کەبۆ دادەنرێت لە مۆسیقادا بۆنموونە (گریشاندۆ ـ دیمنیاندۆ ـ فۆرتیە ـ پیانۆ ـ دۆلسێ ـ کاتابل تادوایی...**

**١٩) کۆنسێر :ـ کۆنسێر بەواتای ئەو ئاهانگانە دێت کە مۆسیقای تایبەت دەگرێتە خۆیو لەسەر شانۆکانی گشتی یاخود جێگای تایبەت پێشکەش بەخەڵك دەکرێ** هەندێ جار دەکەوێتە بەرگوێ کە ئاهەنگێکی کۆنسێر هەیە، لەم جۆرە ئاهەنگانەدا گشت ئامێرەکانی ئۆرکسترا بەشداری تێدا دەکەن.

٢٠) دۆن جوان :ـ ئۆپێرایەکی (مۆزارت)ی مۆسیقازانی گەورەیە.

٢١) شووکردنی فیگارۆ :ـ ئۆپێرایەکە مۆزارت مۆسیقای بۆ داناوەو لە شانوگەری یەکی (بومارشێە) وەرگیراوە. به سەرکەوتووترین ئۆپێرای مۆزارت دادەنرێ.

٢٢) کۆنترابنت :ـ کرداری مۆسیقی کۆنترابنتی ئەو کردارەیە کە میلودییەکان هەندێکیان لەسەر هەندێکیان ئاوێتە دەبن و بەهەموویان کەسێتی یەکی (مۆکد) دروست دەکەن، لە کاتێك دا کە ئەم میلۆدیانە دەگوترێنەوە یاخود لێدەدێن لەهەمان کات دا هەموویان ڕێك دەکەون بۆ دروست کردنی کۆمەڵێك لە پەیوەندی هاودەنگیەتی (هارمۆنی).

٢٣) پۆلیفۆنی :ـ مۆسیقای پۆلیفۆنی بۆ یەکەمین جار لە سەدەی نۆیەم دا لەژێر ناوی (ئۆرجانم) دابوو، سەرەرای دەنگە سەرەکی یەکەی خۆی دەنگێکی

دووەمیش لەژێرەوەی زێدە دەکرا لە مەیانەیەکی مۆسیقای دیاری کراودا (مەیانەی چوارەم).

٢٤) کۆنشێرتۆیەکانی جهانی :- مەبەست لە کۆنشێرتۆیە جیهانی‌یەکان ئەو پێنج کۆنشێرتۆیەن کە ناوبانگێکی گەلێ بەرزیان هەیە لە جیهان دا ئەم کۆنشێرتۆیانەن :-

١) - کۆنشێرتۆی کەمان وئۆرکسترا (بتهۆڤن)

٢) کۆنشێرتۆی کەمان وئۆرکسترا (برامز)

٣) کۆنشێرتۆی کەمان وئۆرکسترا (چایکۆفسکی)

٤) کۆنشێرتۆی کەمان وئۆرکسترا (منا.لسۆن)

٥) کۆنشێرتۆی کەمان وئۆرکسترا (سیبیلیۆس)

٢٥) مۆسیقای سالۆن :- ئەو مۆسیقایەیە کە لە جێگایەکی تایبەتی لێ‌دەدرێ. بو یەکەمین جار لە ئیتالیا دەستی پێ‌کراو پێیان وت سۆناتای‌حوجرەو دەکرا بە دوو بەشەوە: بەشی یەکەم سۆناتایەك بۆ ئامێرێك لەگەڵ لێ‌دانی ئامێرێکی‌تر دەنگی قەرار بە بەر دەوامی. بەشی دووەم - لە (سۆناتای حوجرە) بریتی بوو لە سۆناتای چەند ئامێرێك پێکەوە وەکو (دووئامێر، سێ‌ئامێر. . . .).

٢٦) سولیست :- واتە مۆسیقاژەنێکی گەلێ چاك و لێ‌هاتوو یاخود گورانی‌بێژێکی گەلێ چاك دەگوترێ کە بەتەنیا لەگەڵ ئورکسترا لێ‌بدات یاخود دەوری لەگوتنی ئۆپێرادا هەبێت. .

٢٧) فوجە :- داتانێکی پۆلیفۆنی‌یە بۆ گورانی‌و ژەندن لەسەر (ئامێرەکان و ناوبڕەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تاکە میلۆدیەك.

٢٨) کۆدا [illegible] :- لەکاتی لێ‌دانی مۆسیقا ئەم نیشانەیە لەسەر یەکێك لەپێنج هێڵەکانی مۆسیقادا دەبینرێ، هەر مۆسیقاژەنێك ئەم نیشانەبە ببینێ ئەوا یەکسەر ئەوەی دوای ئەم نیشانەیە بەجێ دێڵێ، واتە لێی نادات تا دەگاتە نیشانەیەکی‌تر وەکو هی پێشوو و کۆتایی بە پارچە موسیقاکە دینی. .

٢٩) مازۆرە. لەکاتی نوسینەوەی، مۆسیقادا بە گوێرەی ئیقاع، پێنج هێڵەکانی نۆتە بە گوێرەی کاتی ئیقاع چەند نۆتەیەك دەگرنە خۆیان وەکو (رۆند - بلانش - نەوار - کرۆش) جا بە دابەش کردنە دەڵێین (مازۆرە).

٣٠) باریتۆن:- دەنگی ناوەنجی پیاوانە واتە: دەنگێکی قەبەیە.

٣١) تیـۆر:- بەرزترین دەنگی پیاوانە، ئەو کەسەی ئەم دەنگەی هەبێ هەردەم داواکراوە بو وەرگرتنی ئەم جۆرە دەنگە لە ئۆپێراکان و قەداسەکان دا.

تێبینی (١)

شایانی باسە ئەم لێکۆڵینەوە بەهەمان ناونیشان لە کۆڕێکی هونەری‌دا لە رۆژی ١٥/٤/١٩٨٧ لە هەولێر پێشکەش کراو لەگەڵ ئەم کۆرەدا نموونەی چەند پارچە موسیقایەکی جیهانی پێشکەش کرا

تێبینی (٢)

قەسیدەی (فریدریك شیلل) مامۆستا (عەبدوڵا ئەحمەد داود) کردوویە بە کوردی. سوپاسی‌دەکەم.

# الموسيقى السمفونية وتحليل السمفونية التاسعة لبتهوفن

## امانج غازي رواندزي

يقدم الباحث في بحثه شرحا وافيا عن معنى الموسيقى السمفونية وتعريفا باعظم المؤلفين الذين الفوا هذا القالب الموسيقي المبدع، كما ويتحدث عن الالات التي يتكون منها الاوركسترا السمفوني، انواعها ووظائفها وادوارها في العمل الابداعي السمفوني.

ويقدم فيما يتعلق بالموضوع نبذة عن حياة المؤلف الموسيقي الالماني العظيم بتهوفن والاسباب التي ادت الى اصابته بالصمم، كما ويعرفنا بأهم المؤلفات التي الفها هذا العبقري خلال حياته، وبعد ذلك يقدم شرحا مكملا عن ظهور السمفونية التاسعة لبيتهوفن ويعرفنا بالشاعر الالماني (فريدريك شيللر) ومن ثم يحلل الحركات الاربع لهذه السمفونية ويقدم لنا القصيدة الرائعة (دعوة الى الفرح) كاملة مع الحركة الرابعة.

ومن الجدير بالذكر ان الباحث الموسيقي فنان قدم بحثه في ندوة ثقافية عقدت بمحافظة اربيل يوم ١٥ /٣/ ١٩٨٧ مع مجموعة من الاعمال الموسيقية الكلاسيكية لاعظم المؤلفين (شوبرت، برامز، ارام خاچا دوريان، بيتهوفن، ڤيردي) نال الاستحسان.

# دوو مەقامی فۆلکلۆری و چەند تێبینییەک

خالد دلێر

کاك «تایەر تۆفیق»ی هونەرمەند، دوو مەقامی: [حیجاز ـ لە کۆیە بە هۆی هۆنراوەکەیەوە بە «نیوەشەو» ناسراوە]، لەگەڵ (محیر ـ کە لقێکە لە مەقامی ـ بەیات ـ و لە کۆیە ئەمیش بە هۆی هۆنراوەکەیەوە بە «ئەی لێ زاڵم» ناسراوە]، ئەم دوو مەقامەی تۆمار کردووە. لە هەندێ جێگای هەر دوو مەقامەکەدا، بە نیازی چاکەکردن دەسکاری لە هۆنراوە فۆلکلۆرییەکانیان دا کردووەو مانای ئەو جێگا دەسکاریکراوانەی ناو هۆنراوەکانی لە دەست داوەو تێچوواندوە، یان لە نرخی کەم کردۆتەوە. لە مەقامی ناوبراوی یەکەمیشیان دا، کۆپلەیەکی لێ تۆمار نەکردووە.

بۆ پارێزگاری‌کردن لە دەقی هۆنراوە فۆلکلۆرییەکانی ئەم دوو مەقامە، ئەوەندەی من بیان زانم و بۆ هەندێ دوان لە بارەی دانەری شیعری هەر دوو مەقامەکەوە، هەروەها لە بارەی هەندێ لایەنی هونەری مۆسیقەیی هەر دوو مەقامەکەوەو ئەو کەسەی دەسکاری ئاوازەکانی کردوون و مەقامەکانی لەسەر ئاوازی کوردیو زەوق و سەلیقەی کوردانەی خەڵك دارشتوتەوە، دەڵێم بۆ ئەو مەبەستە گرنگانە، تا ئەوەندەی شارەزایی من لەگەڵیان داو لە ناویان دا بر دەکات، یان بە لێکدانەوەی خۆم بۆیان چووم، ئەم وتارە بە خوێندەواران پێشکەش دەکەم.

بەر لە کۆتایی ئەم پێشکەشکردنە، دەبێ ئەوەش بڵێم کە: دەقی شیعری مەقامی «نیوەشەو» لە جێگای دیکەدا بڵاوکراوەتەوە، بۆیە نامەوێ جێگای پێ بگرم و جارێکی‌دیش بڵاوی بکەمەوە. مەقامی دووەمیانم ـ وەکو شیعر ـ تا ئێستا بە بەرچاو نەکەوتووە، کە لە جێگایەك دا بە چاپ گەیاندرابێ، بۆیە وا لێرەدا ئەو دەقەی کاك تایەر تۆماری کردووە، لە جێگای خۆیدا بڵاو ـ دەکەمەوەو ئەو چەند جێگایەش کە ئەو دەسکاری کردوون، یان لێی فرێداون، وەکو ئەوەی کە من دەیان زانم، ڕاستیان دەکەمەوەو دەیان نووسمەوە.

بۆ ئەوەی خوێندەوار، ئەو دوو مەقامە بناسن و بزانن کە ئەوان و گەلێ مەقامی دیش، کە هەر لە هەمان ماوەی مێژوویی‌دا سەریان هەڵ داوە، کە ئەم دوو مەقامە تێیان دا دەرکەوتوون، چۆن و لە چی بارو دۆخێکی کۆمەڵایەتی‌یەوە، لە چی سەرچاوەیەکی هونەرییەوە داهێندراون و لە مانای هۆنراوەکانیان، تام و چێژ و بۆن و بەرامەی ڕەسەنی خۆیان و لە ئاوازەکانیان، زرنگەو خرنگەو دەنگ و سۆزو لەرانەوەی هەوەڵینی خۆیان وەربگرن و بێتەگوێ، خستنە بەرچاوی ئەم کورتەیەی خوارەوە لە بارەی مێژووی هونەری کۆیە، وەکوو ڕێگا خۆش کردنێك بۆ ئەو مەبەستانە، بە پێویست دەزانم.

لە مرۆڤی سەرنج و هەست وردو ناسك دەوەشێتەوە، لە کاتێك دا کە مێژووی ئاسایی نەتەوەیەکی بێگانە دەخوێنێتەوە، یان بۆی دەگێردرێتەوە، تا ڕادەیەکی باش، زۆر لایەنی باس نەکراوی ئەو ماوە مێژوویی‌یەی ئەو نەتەوە بێگانەیە، بۆ نموونە: وەکوو لایەنی هونەریو ئابووریو... تاد، دەرك

پێبکا، چ جای ئەوەی کە مێژووەکە هەر خۆی مێژووی هونەریێو لە هونەری بەشێك لە نەتەوەو وڵاتەکەی خۆشی بدوێ؟

هەروەك ڕوونە، لانەکانی ژیان هەموویان بەیەکەوە پەیوەندییان هەیەو زانینی هەر لایەنێك لە لایەنەکانی ژیان، تیشك و ڕووناکی دەخاتەسەر لایەنەکانی دیکەشەوە. ئەمە شێوازی لێکۆڵینەوەو گورج وکۆڵی زانستیانەی ئەم سەردەمەیە.

وەکوو ڕوونە، هەر نەتەوەیەك (هونەر ـ بە مانای هەرەفرەوانی)ی تایبەتی خۆی هەیە کە وڵاتە تایبەتییەکەی، ئاو و هەواو باری جیۆلۆجیو جوگرافیی وڵاتەکەیو چۆنییەتی ژیانی ئابووریو گوزەرانی نەتەوەکەو باری کۆمەڵایەتیو زۆران و ململانێی نێوانیان و لەپاش ئەوانەش دا، ڕەخسانی زەوق و سەلیقەو هەست و ئارەزووی تایبەتی نەتەوەکە دەستی هەرە کاریگەرو دروستکەریان لە دروست بوونیدا هەیەو هونەرەکە وەکوو هونەرێکی گشتی بەیەکەوە دەبەستێتەوەو لە هونەری نەتەوە دراوسێکانیانی جودا دەکاتەوە.

لە هەمان کات دا، هەر هەرێمێکی جوگرافی، لە هەمان وڵات دا، بە هۆی هەندێ تایبەتیەتی خۆی، کە بارێکی ئابووریو کۆمەڵایەتیو دەروونی جودا لە هی هەرێمەکانی دیکەی دەوروپشتی خۆی، لە چوارچێوەی تایبەتییە گشتیو فرەوانەکەی سەرجەمی هونەری نەتەوەکە، تایبەتییەکی بچووکتری، تەسکتری، (خود)تری خەڵکی ئەو هەرێمە دێنێتەکایەوە کە کەسایەتیو پێناسی خۆی لەناو هونەری نەتەوەکەدا، لە هونەری تایبەتی هەرێمەکانی دیکەی ئەو وڵات و نەتەوەی جودا دەکاتەوە.

وەکوو ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان دەبینین، یان ڕاستتر، بە گوێی خۆمان دەبیسین، کە هونەری گۆرانی هەرێمەکانی: (لوڕ)و (موکری)و (کۆیە)و (هەولێرو دەورو پشتی)و (کرمانجی ژووروو)و (گەرمیان)و (هەورامان)و. . . تاد لە یەکدی جییان و تایبەتییەتی خۆیان تێدایەو هەر هەموشیان لەناو چوارچێوەی فرەوانترو گەورەترو خۆشتری (هونەری کوردی)دا یەك دەگرنەوە.

شاری کۆیەش، زیاتر لەبەر ئەوەی کە لە دەمێکەوەیە شارە، لە ڕۆژگارێکی دێرینەوە ناوچەو مەڵبەندی ئابووریو بازرگانیو پیشەسازیو هونەرو ئەدەبی کوردی بووە، لە هەموو کوردستانەوە ڕوویان تێ کردووەو کەڵکیان پێ بەخشیوەو کەڵکیشیان لێ دیوەو ئیش و کارو فرمانی خۆیان تێدا ڕایی کردووە.

ئەم بەیەکەوە ژیانە دوورو درێژەی خەڵکی شارەکە، لە زۆر ڕووەوە، ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لەناو یەك دا تواندۆتەوەو جۆرە یەك بوون و تەباییو لەیەك نزیکیو خزمایەتییەکی لە زۆر ڕووەوە، لە ڕووی سەلیقەو ئارەزو و هەستی هونەریو وێژەییشەوە، لە ناویان دا دروست کردووەو شێوەو ڕوخسارو تام و چێژێکی تایبەتی بە هونەرو ئەدەبەکەی داون. بەتایبەتی هونەری گۆرانی کە بە ئاشکرا شێوە ناوچەیی یەکەی خۆی پێوە دیارەو بەمە لە شێوەو تام و بۆن و بەرامەی گۆرانی ناوچەکانی دیکەی کوردستان جیادەکرێتەوە.

ئەو گۆرانیو مەقامانەی لە کۆیە سەریان هەڵ داوەو سەر هەڵ دەدەن، لە هی هیچ ناوچەیەکی دیکەی کوردستان ناچن، لە هی ناوچەی سابلاغ و موکریان نەبێ، کە هەندێ جار، جۆرە لە یەك چوونێك، یان تەرزە تام و چێژێکیان لە یەك دەچێ، کە ئەمەش بۆ هۆیەکی کۆمەڵایەتی مێژوویی دێرین دەگەڕێتەوەو تا ڕۆژگار، زیاتر بەسەر شاری کۆیەدا برواو تێ پەڕێ، تایبەتییەکەی خۆیو بە هونەری هیچ لایەك نەچوونەکەی خۆی زیاتر تێدا سەر بەرز دەکاتەوە، ئەمە بەو مەرجە کە ڕێگەی گەشەکردنی لە بەردەم دا هەبێ.

ڕۆژگارێکی دوورو درێژ، کۆیە مەڵبەندی بازرگانیو پیشەسازیو ئاڵ وگۆڕکردن و بازاڕێکی گەورەی ئابووریو کاڵای کوردستان بووە، لەبەر گەلێ هۆ، چەشنە هێمنیو بەیەکەوە ئیدارەکردن و هەڵ کردنی دوو چینە کۆمەڵایەتییەکەی دەرەبەگ و برجوازی تازە پێ گەیشتووی بە خۆیەوە دیوەو زۆرانەکە هەر لە نێوان هەژارەکە لە سەرێك و ئەم دوو چینە لە سەرێکی دیکەوە بووەو بە ڕادەیەك کزبووە کە هەژان و کولاندنی سەرانسەری کۆمەڵی لە توانادا نەبووە. بۆیە ئەو دوو چینەو پیاوانی ئاینییش لە کۆیە، لە ژیانێکی خۆش و ئاسوودەییدا ژیاون و تێیشیان دا هەڵ کەوتووە کە هاندەری پێشکەوتنی هونەری گۆرانیو شیعر بوون.

لەو ڕۆژگارە دوورو درێژەدا، گۆرانیبێژی داهێنەرو بەتوانا لە کۆیە سەریان هەڵ داوەو گەلێ لە مەقامە ڕۆژهەڵاتییەکانیان، وەکوو: حیجاز، بەیات، چوارگاو. . . تاد شیتەڵ کردۆتەوەو بە زەوق و سەلیقەی کوردانە، کە ئەمیش لە سروشتی کوردستان و هەموو لایەنەکانی ژیانی سەردەمەوە ڕسکاوە، دەسکاری کردووەو دروست کردۆتەوەو داڕشتۆتەوەو بە دەیان بەستەو گۆرانییان لەو مەقامە تازە داڕێژراو و تازە دروستکراوانەوە هەڵێنجاوەو داناوەو ئەم ئەرکە گران و وەستایانەی ئەو هونەرمەندانە، هەندێکیان دەماودەم بە ئێمە گەیشتوون و بێ گومان هەندێکیشیان لەناوچوون و لەوانەیە، ئەوانەی کە بە ئێمەش گەیشتوون، بە هۆی ئەوەوە کە دەماودەم هاتوون، گۆڕانیان بەسەر ئاوازو شیعرەکانیش دا هاتبێو کرابێ.

ماوەی بە خۆنازینی شاری کۆیە، وەکوو مەڵبەندێکی بەپێزو دەستەڵات داری تایبەتی دیارو ئاشکرای هونەری گۆرانی کوردی، لە مێژوویەکی دێرینەوە دەست پێ دەکات کە ساڵ و دەیەساڵیشی بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی دوورو درێژ نەبێ دیاری ناکرێو درێژەی کێشاوەتەوە، هەتا دەیەی چلەکان و پەنجاکانی ئەم سەدەیەشمان. دەست نیشان کردنی ئەو سەردەمە مێژووییە بۆ ئەوە پێویست بوو، بەتایبەتی ماوەی نزیکی سەردەمەکە، لە خۆمان، واتا ناوەڕاستی ئەم سەدەیەی خۆمان، کە خوێندەوار بزانێ، نووسەری ئەم وتارە، سەردەمێك لە تەمەنی هەرزەییو لاوێتی، لەناو ئەو مەڵبەندە هونەرییەدا ژیاوەو بەسەر بردووە. جگە لەمە، وەکوو خاوەن ئارەزوویەکیش، هەوڵی فێربوونی مەقام و گۆرانییەکان و خۆراهێنان بە گوتنیانەوە داوەو لەگەڵ زەوق و سەلیقەی هونەرە تایبەتییەکەی کۆیەدا ژیاوەو تام و چێژی چەشتووەو دەیان ناسێ. بەم هۆیانەوە، لە خۆی ڕادەبینێ کە لە

بارەی مەقـام و گۆرانی یـەکـانی ئەو ناوچـەیـەوە قسـەبکـات و لە دەمێکیشـەوە هەندێ تێبینی و بۆچوونی تایبەتی وەهای لە بارەیانەوە هەیە، بەتایبەتی لەسەر ئەم دوو مەقامەیان کە کەس دەری نەبڕیون.

لە سەرەتای ساڵی /١٩٨٧دا دەستم بە نووسینی کتێبی «شیعری گۆرانیی کوردی» کردو وابزانم لە کۆتایی مانگی ئاب دا بوو، لە نووسینی بوومەوە. هەندێ تێبینی، کە لە بارەی هۆنراوە فۆلکلۆری یەکەی مەقامی «نیوەشەو»ەوە هەم بوو لەوێدا، لەپێش مەرگی کاك تایەر (١)، دەرم بڕیبوون، بەڵام لە بارەی مەقـامـەکـەی دیکـەیـان «ئـەی لێ زاڵم» ئەمـە یەکەم جارە لە بارەیەوە دەنووسم. وابزانم نەختێ لە باسە؛ سەرەکی یەکە دەرچووین، با بگەڕێینەوە بۆ ئەوێ.

لەو کاتـەدا کۆیـە گۆرانیبێـژ ی دەنـگ خۆش و باشی، لاویـان کامڵی زۆر تێـدابـوو، کە لە گوتنی هەمـوو بەستـەکانی دەوروپشـت، دەستەڵاتی باشیان دەنواندو هەر یەکەشیان لە گوتنی چەند مەقامێك دا، وەستایی، یان شارەزایی دەردەخست. تێشیان دا هەبوو لە گوتنی هەموو مەقامەکان دا، وەستا، یان بەتوانا بوو.

لە هەمـوو گۆرانیبێـژەکـانی ئەو سەردەمـە، بەتواناترو دەنگ خۆشـتر دووان بوون، هونەرمەندانی گەورە (تایەر تۆفیق) و (سێوە).

(تـایـەر تۆفیق) لەبـەرئـەوەی بە تەمـەن لە (سیـوە) بچـووکتـر بوو، ماوەی پێشکـەوتنی زیـاتـر لەبـەربـوو، جگـە لەمـەش، دەنگی بە چریکـەترو پلەی مۆسیقـەیی دەنگی بەرزتـربـوو. زووتـریش گەیشتە ئیستگەی بەغدادو بەشی کوردی و زۆربـەی گۆرانی یـەکـانی ناوچـەی کۆیـەی قۆستەوەو تۆماری کردن. لەبەر ئەو هۆیانە، لە (سێوە) زیاتر ناسراو پێش ئەم کەوتووە. ئەمە ئەگەر هەر لایەنە هونەری یەکان باس بکەین، دەنا کاك تایەر لەگەڵ کەسانێکی کە ئەو دەمـە هاوتـەمـەنی بوون و کوردایـەتی و نیشتمـانپـەروەری یـان دەکـرد، تێکـەڵاوی یـەکی باشی هەبـوو. لەم ڕێـگـایـەوە بوو کە ڕچی گوتن و بڵاوکـردنـەوەی گۆرانی نیشتمـانی و میللەت پەروەری گرتـەبـەرو هەتـا مردن لەسـەری بەردەوام بوو، بەری نـەدا. ئەم لایـەنـانـەش یارمەتی گەورەی کاك تایەری دا بۆ دەرکەوتن و دیاربوون.

لەپێش دا «تایەر تۆفیق»و ئەمجا «سێوە»ش، ئەم دوو هونەرمەندە گەورەو بە توانـایـانـە، زۆربـەی سامـانی فۆلکلۆری، کەڵـەکـەبووی سەردەمێکی دوورو درێژ ی کۆیەو دەوروبەریان، لە گۆرانی، لە مەقام و بەستە قۆستەوەو لەگەڵ تیپی مۆسیقەی ئیستگەی ڕادیۆی بەغدادو بەشی کوردی دا، تۆمارکرد. کاك تایەر کۆمەڵێك مەقام و بەستەو (سێوە)ش پێنج مەقامە بەناوبانگەکەیان تۆمارکرد.

بە هەڵسانی ئەم دوو هونەرمەندە، بەم ئیشە، ئەم گۆرانییانە لە فەوتان و لە گۆرانکاریی زیاتریان تێداکـردن ڕزگـارکـرد. ئەگەر درەنگتر تۆمار بکرابانایە، لەوانەبوو گۆرانکاریی زیـاتریان لەلایـەن گۆرانیبێـژی دیکـەوە تێـدا بکـرابـایـەو بەو بارەی دوایی یان تۆماریان بکـردنـایـە. بەتـایبـەتی دەقـە شیـعـرەکـانی مەقامەکان کە زۆر لایەنی ژیانی دێرینەی نەتەوەکەمان ڕوون دەکەنەوە.

لەپـاش ڕوون بوونـەوەی ئەو ڕاستیـانـەی سەرەوە، بابـەسـەرپێیش بێ، لەبارەی مەڵبەندی هونەری شێوە تایبەتی کۆیەوەو لەپێش ئەوەی گفتوگۆ لەسەر دوو دەقی هۆنراوەی فۆلکلۆری مەقامەکان بکەین، دەبێ گرنگیی فۆلکلۆر، بە کورتیش بێ، یەك دوو قـەی هەر لەسەر بکرێ، لەم بارەیەوە لە نووسینێکی دیکەم دا گوتوومە:

«ئـەو دەقـە فۆلکلۆری یـانـەی لە گۆرانیی کوردیدا بەکـارهێنـراون و بەکـاردەهێنـدرێن هەروەکـوو هەموو دەقە فۆلکلۆری یەکانی دی، تا ڕادەیەکی باش، ژیانی ڕابردووی نەنووسراوەو لێکۆڵینەوە تێدانەکراوەی نەتەوەکەمان، لە زۆر ڕووەوە، لەسـەر دەمی دانـانی شیعـرو گۆرانی یـەکـەو لەوەوپێشتـریش، دەردەخـەن. بۆ زانینی کون و قوژبنـەکـانی ئەو ڕابـردووە، لەوانـەیـە ئەو دەقە فۆلکلۆری یانە لە سەرچاوە هەرە ڕاست و دروستەکان بن کە لێکۆڵەرەوە بتوانێ پشتیان پێ ببەستێ و بۆ ئەم مەبەستی یارمەتی چاکمان دەدەن.»[٢]

جا کە فۆلکلۆر، ڕاگەیاندنی ئەم ئەمانەتە گەورەیەی پێ سپێردرابێ، کە بە ئێمەی ڕابگەیەنێ، نابێ بە هیچ جۆرو شێوەیەك دەستی لێ بدرێ و لە کاتی هەڵس وکـەوت کردن لەگـەڵی دا، لە کاتێ لێ وەرگـرتن و بەکـارهێنـانی دا، گۆڕانکـاری تێـدابکـرێ، بازۆریش گۆڕانکـاری یـەکی کەم بێ، نەوەکـا لە گرنگی یەکەی و ئەمانەت دەست پاکی یەکەی کەم بکرێتەوە.

گۆرا نیبێژ و ئاوازدانەرو هونەرمەندەکانی دیکەمان، یان لە ڕووی ئەوەوە کە ئەم ڕاسـتـی یـەی تازە لەبـەردەمـمـان تێ پـەڕی، نازانن، یان دەی زانن و ڕای ناگرن و دەستی پێوە ناگرن. یان لە هەر ڕوویەکی دیکەوە بێ، زۆریان ـ بەداخـەوە ـ دەسکـاری فۆلکلۆر دەکـەن و بەپێی تێ گـەیشتن و بۆچـوون و بەرژەوەنـدی خۆیـان، گۆڕانکـاری تێـدادەکـەن. بۆ نمـوونـە، (تایەر تۆفیق) دەهێنمـەوە کە خزمی خۆم بوو، پەیـوەنـدی یـەکی یەکجـار برایـانـەو دۆستانەو بێ فڕوفێڵمان لەنێوان دا هەبوو، نموونە ـ کانیش هەر لەم دوو مەقامەدان.

**یەکەم: هۆنراوەی مەقامی «نیوەشەو».**

---

بە پێـویـستی نازانم جارێکی دی، یان، سەرلـەنـوێ، هەر لەم بارەیـەوە بنـووسـم. بۆیـە، ئەوەی کە لەم ڕووەوە لە کتێبی دەست نیشـان کراوی پێشووم دا نووسیومە، ئەگەرچی هەندێکیش دوورو درێژە، بەڵام لەبەرئەوەی کە مەبەست بەدەستەوەدەدا، بۆ ئێرەکانەی دەگوێزمەوە:

سەرنجێکی ورد لەم کۆیلە پەخشـانـە شیعـرە بدەن، کە لەسەر ئاوازی مەقـامی «حیجـاز»، (سێـوە)و (تـایـەر تۆفیق)و هی دیکەش گوتوویانە، ناوی پەخشـانـە شیـعـری گۆرانی یەکە «نیوەشەو»ە. دوای سەرنج دانەکە، مەبەستی خۆمتـان پێ دەڵێم و گۆڕانـەکـەی کاك تایـەر کردوویـەتی، چی یـەو مەبـەستی چی بووە، دەی خەمە بەرچاو. سەرنج لە دێری پێش دوایی بدەن.

ـ ئەمن ناوێرم دەنگ و سەدایێ غەریبە ماڵ وێرانێ خۆم هەڵێنم

**- لەترسی بەژنەکا بڵندو چاوێ بەلەك**

**- بیٚتەوە مەترسی‌و هاوارو خافڵەتە**

**- مەمکێ ئەو بابان وێرانەی لە بۆ من بمینێ**

**- بەوان فنجان و فەخفووری‌یان**

**- کەوەتانێ لە دیوەخانەکان**

**- پیٚ دەخۆنەوە قاوە لەگەڵ هەرامە شەربەتە.**

دەبێ لەپیٚش دا سەرنج لە هەموو کۆپلەکە بدەن، ئەوجا لەو دیٚرە کەوشەی «دیوەخانەکان»ی تیٚداهاتووە.

کاك تایـەر لە ڕووی ئەوەوە کە گوایـا، لە نرخ و گرنگی بەرو دیـوەخـانی ئاغاو دەرەبەگەکان و هاوچەشنەکانیان کەم دەکاتەوە، وشەی «دیوەخانەکان»ی لابـردووەو «لـە هەمـوو جیٚگـایـەکـان»ی خستۆتە جیٚگەکەیەوە. بیٚ‌گومان ئەم کارەی کاك تایەر، لەسەرێکەوە دەبێ ئەوەی بۆ بژمیٚردرێ کە لە هەستیٚکی پیـرۆزو بیـروبـاوەڕیٚکی دژ بە دەرەبـەگـایـەتی‌و ستـەمی کۆمـەڵایـەتی‌یـەوە هەڵ قوڵاوە. بەڵام لەسـەرێکی‌تـرەوە، ئەوەشی لەسـەر دەژمیٚـردرێ کە ئاگای لەوە نەبووە ئەو کردەوەیە لە دوولاوە زیان دەبەخشێ.

١ ـ ون کردن، یان تارمـایی خـستنـە سەر زانینی میٚـژووی دانـانی ئەو دەقـە فۆلکلۆری‌یە سـەردەمەکە ئەو کاتە بووە کە جارێ قاوەو فنجان و فەخفووری لەماڵان دا نەبووە بە دیاردەیەکی گشتی‌و تەنیا لە دیوەخانەکان دا بووە.

٢ ـ شاردنەوەی جەورو ستەمی کۆمەڵایەتی بەوە کە، وەهانیشان بدرێ کە کۆمـەڵگـای کوردسـتـان، لە سەردەمی دانـانی ئەو دەقـە فۆلکلۆری‌یەدا، یەك چین و تویٚـژ بووەو چەوسیٚـنراوەو چەوسیٚنـەرەوە، هەژارو دەوڵـەمـەنـد نەبووە. ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێ کە لەپاش ئەو دەستکاری‌کردنە بچکۆلەیەی دەقەکە ئەو مانـایـە دەبـەخشێ کە قاوەو فنجـان و فەخفـووری، هەر لەگـەڵ پەیـدا بوونیـان دا، یەکسـەرو بەیـەك خیٚـرایی ڕووی لە «هـەمـوو جیٚگـایـەکـان»ی کوردسـتـان، بەبیٚ جیاوازی کردووە. کۆمەڵگایەك لەو سەردەمە زووەدا، هەموو خەڵکەکەی کە لە «هەموو جیٚگایەکان»دا ژیاون، قاوەو شەربەت خۆرەوەی بە فنجان و فەخفووری بووبن، دەبێ بوونی چ ستەمیٚکی کۆمەڵایەتی لەناودا ڕەچاو بکرێ؟

بەبـۆنـەی باس کردنی پەخشـانـە شیعری «نیوەشەو»ەوە کە هونەرمەندەکان (سیـوە) یەکیٚکـە لەوانـە، بە ئاوازی مەقـامی (حیجاز) تۆماریان کردووە، لەم دواییەدا، بۆ دەقی پەخشانە شـیعری «کراسی شەنگە میٚرەمێ» لە کتیٚبەکەی کەریم شارەزادا دەگـەڕام، چاوم بە «نیـوەشـەو» کەوت، دەبینم بەشیٚـك لە کۆپلەی چوارەم، بەپیٚی ئەو زنجیـرەیـەی کە لە کتیٚبـەکـەدا نووسراوە، کەمە. نیوە کۆپلەکە خۆی هەیە، بەڵام لە کتیٚبەکەدا نەنووسراوە. بۆ لەناونەچوونی ئەو بەشەو گرتنەوەی جیٚی خۆی لەناو «نیوەشەو»ە نەمرەکەدا، وا لە خوارەوە کۆپلەکە هەمووی بە تەواوی دەنووسمەوە.

ئەوەی لە کتیٚبەکەدا هەیە ئەمەیە:

**- ئەمن بە گەرەکی ژێریدا دەچمەوە خوارێ**

**- لە عامی دەرو جیرانان دەپرسم: داخوا ش و چ مەجالە؟**

**- کیژ دەرێ: هەتیمە لاوە، مەجالی نیوە شەوێم لێ بەسەر چووینە**

**- دەم لەسـەر ناسکێ ڕوومەتم هەڵ بگرە**

**- بەسم شەمامەو شەمامەبەندی باخەڵان بگوێنە!!**

ئەو بەشـەی لە کتیٚـبەکـەدا نی‌یـەو تایـەر تۆفیقیش هەر تۆمـاری نەکردووە، ئەمـەیـە: هەر ڕاستـەوخـۆ دەخـرێتـە پاش ئەو بەشەی کە تازە لە نووسینەوەی بووینەوە. ئەوجا کۆپلەکە تەواو دەبێ:

کوڕ دەڵێ:

**- خەمێ من ئەوان جووت و جووتە شەمامە بەندی باخەڵان نینە**

**- خەمێ من ئەو خەمەیە**

**- هەتیوە گولەی میٚردان، شەوێ لەسیٚباری نیوەشەوێ**

**- دیٚتەوە مارێ**

**- دەرێی بەرازەکی بە حەوت گوللان، گەرمە برینە!!**

بیٚ‌گـومـان نیـوە کۆپلە کەش، هەر خۆی هاوار دەکـات، کە بەشیٚکـە لەو کۆپلەیەو هیچ ماوەیەکی بۆ پیٚویستی سوێندخواردنی شایەت و بەڵگە خستنە بەردەم لەسەر ئەم ڕاستی‌یە نەهیٚشتۆتەوە.»[٣]

گۆرانیبیٚـژیٚکی کە من دیتبیتم و ئەم مەقـامـەم لیٚ‌بیستبێ‌و بەلای منـەوە بە چاکتـرین شیٚـوەو خۆشتـرین گوتن مەقـامی «نیـوەشـەو»ی گوتبێ، پیـاوێکی هەژاری هونـەر کارتێ‌کـردووی تا ڕادەی ئەوەی کە کردوویـەتی بە مریـدو دەرویٚـشـی گۆرانی کوردی «مـەلا ئەحمـەدەکـوێرە»ی پیٚ‌دەڵیٚن و لە کۆیـە دادەنیشێ. بۆ دواجار لە مانگی ئەیلوولی ١٩٨٥/ چاوم پیٚی‌کەوت. ئومیٚدی لەشی ساغ و تەمەنی دریٚژو خۆشی ژیانی بۆ دەخوازم.

**دووەم: هۆنراوەی مەقامی «ئەی لێ زاڵم»**

---

هۆنـراوەی ئەم مەقـامـە، لە فۆلکلۆرە دیٚـرینـەکـانی شاری کۆیـەیـەو بەستـەکـەشی بە تیٚـك هەڵ کیش، هەر لەنـاو گوتنی مەقـامەکەدا دەگوترێ. کۆپلەیـەك لە مەقـامـەکـەدا دەگـوترێ، هەر دوابـەدوای ئەو کۆپلەیـەك لە بەستـەکـەدا دەگـوترێ، ئەمجـا گۆرانیبیٚژەکە دەچیٚتەوە سەرگوتنی مەقامەکە، هەتا هەموو بەشەکانی مەقامەکە، بەم نۆرە ڕاگرتنە، کۆتایی دێ. هۆنراوەو ئاوازی بەستـەکـەش، هەردووکیـان، داهیٚنـانی وەستـای هونـەرمـەنـدی، نەناسراوی دیٚرینی کوردن. واتە فۆلکلۆرن.

ئەوەی من لیٚم بیستبێ کە ئەم مەقامەی بە چاکترین شیٚوەو گوتن گوتبێ، پلەی دەنگی بە ڕادەی پیٚـویـست بەرزبـوویی‌و بین و هەنـاسـەیـەکی دریٚـژو دەنگی بەچریکەو خۆش بوویی‌و وشەکانی بە ڕوونی‌و ئاشکرایی، لە کاتی گوتنی‌دا، دەربڕیبێ، کاك تایەر تۆفیق بوو.

لەگـەڵ ئەم ڕاستی‌یـەی سەرەوەش دا، کاك تایـەر لەم مەقـامـەش دا، لە هەنـدێ جیٚگـای شیعـرەکـەی‌دا، گۆڕانکـاری کردووە. لە هەنـدێ جیٚگـای دیٚ‌دا، وشـەو نیـوەڕستـەی لیٚ‌فڕیٚداوە، یان وشـەی لە جیٚگـایـەکـەوە، بۆ

جێگــایــەکی دی کە جێی نی‌یــە، گوێـزاوەتــەوە. بەم کردەوانــەی، یان مانـا گرنــگە و مێـژوویی‌یــەکــەی لە دەست داوە، لەو جێگــایــەدا، ناوەڕۆکــەکــەی پووچــەڵ و بێ مانـاکـردووە، یان لە پلەو ڕادەو تونـدوتیـژیی جەورو ستـەمـە کۆمەلایەتی‌و مرۆڤانەکەی کەم کردۆتەوە.

ئەم مەقـامـە چواربـەشــە، هەر بەشــەی، دوو پارچە مەقام و کۆیلەیەکیش بەستـەکـەی لەگـەڵ دایـە یان بابڵێین، چوار کۆیلەیەو هەر کۆیلەیەکیشی دوو بەشەو بەشێکیش بەستەی مەقامەکەی لەگەڵ دایە.

بۆ ئەوەی هەنـدێ لەو گۆڕانـانــەی «تـایـەر تۆفیق» کردوونی، کە زیانی بە دەق و نرخی شیعرەکە، یان پەخشانە شیعرەکە گەیاندووە، بخەمە بەرچاوی خوێندەوار، ئەم نموونانە دەهێنمەوە:

١ ـ لە بەشی یەکەم و دووەمی پەخشانە شیعرەکەدا، تەنیا هەندێ وشەی لێ فرێ‌داون، یان جێ‌گــۆڕکێی بە هەنـدێ وشــە کردووە کە بەمــە، زۆرکـاری نەکـردۆتـە سەر مانـای شیعـرەکـە. من وشــە فرێـدراوەکان لە جێی خۆیان دا دەنێمــەوەو وشــە جێ‌گـۆڕکێ پێ‌کـراوەکانیش بۆ جێگای خۆیان دەگەڕێنمەوەو گیروگرفتەکان بەبێ دەنگی چارەسەر دەکرێن.

٢ ـ لە بەشی سێ‌یەمی‌دا، دەقی شیعری مەقامەکە دەڵێ:

ـ پار ئەوان مەجالان غولام بووم

ـ ڕەزاللاهی خودا

ـ ئەمساڵەکە، بمگرنەوە بە کۆیلە.

کاك تایەر، دێری دووەمی سەرەوەی فرێ‌داوە، کە پڕە لە پاڕانەوەو سکالا کردن و خوایان بەگژدا دەکات کە شاعیرەکە، یان ئاشقەکە، لە پلەو پایەی کۆمــەلایــەتــی ساڵــی ڕابــردووی، کە (غــوڵامــەتــی) بووە، واز دەهێنێ‌و دێتەخوارەوەو تکایان لێ‌دەکات، کە ئەمساڵەکە، هەرنەبێ بە (کۆیلە = عبد) قبــووڵی بکــەنــەوە. ئەم هەر بۆ ئەوە کە لە ماڵی خۆشــەویستــەکــەی دابێ‌و جاروبارێکیش چاوی پێی بکەوێ.

دەبێ ئەم ئەشق و خۆشەویستی‌یە چەند بەتاو و تەووژم بوبێ، کە کابرای ئاشق لە جیــاتی ئەوەی داوابکـات لە پار زیـاتـر، پلەو پایـەی کۆمـەلایـەتی بدرێتێ‌و لە (غلامەتی)یەکە ڕزگاربێ‌و بە پیاوێکی خاوەنی کەسایەتی خۆی بێ‌و کەس خاوەنی ئەو نەبێ. ئێستا لەپێناو نزیکی لە دڵدارەکەی، نەك هەر ئەمە داواناکات کە (غولامەتی)یەکە بووە، ئێستا بە کۆیلایەتیش منەت بارەو قبووڵیەتی‌و بۆ بەدەستکەوتنی دەپاڕێتەوە!![٤]

لادانی ئەو دێـرە لە هۆنـراوەکـە، دیـارخـستنی پلەی ئارەزووی ئاشقـەکـەو تامەزرۆیی‌یەکەی‌و هەلپەی بۆ دیتنی خۆشەویـستەکەی کەم دەکاتەوە.

٣ ـ لە بەشــیـی چوارەمـی‌دا، کە بەشـی زۆری قســەمــان دەربــارەی ئەم بەشەیانە، دەقی شـیعری مەقامەکە دەڵێ:

ـ فەسڵێ بوهاران

ـ کیژوکار پێی‌دەچنەوە ڕوباری

بێ‌گـومـان، ئەم مەقـامـە، بە هۆنراوەکەشی‌یەوە، لە ڕۆژگارێکی‌دێرین دا داندراوە، کە ئەو کاتە، ئاو بە بۆڕی، لە کۆیە، بەسەر ماڵان دا، دابەش نەکرابوو. ئاو بۆ خواردنەوەو هەموو پێویــستی‌یەکی دی، بە شانان، یان لەسەر پشتی چوارپێ، لە کانی‌یەکان و ڕووباری دەوروبەری شار، بۆ ناو شاری دەکێشرا.

بوهـاران، کە سـەرمـاو سۆڵ بەسـەر دەچـوو، ئافـرەتـان، بەتایبەتی کچ و کاری بەهەرەکەو گورج و گۆڵ، ڕایەخ و پێخەفی قورس و گرانی، هەڵگری چڵك و پیـسی زستــانی ڕابــردوویــان دەبــردە ڕوبـارێ. ئەو هەمــوو چڵك و پیسی‌یـە، کە لە ماوەی دوورو درێـژی زستـان دا کۆدەبـۆوەو ڕەنگ و نەخشی ڕووی ڕایەخ و پێخەفەکانیان دادەپۆشی، بە ئاوهێنان بە جەڕەو گۆزەو سەتڵ و تەنەکەو دێمکە پاك نەدەبۆوە. بە ئاوی زۆرو زەبەندی ڕووبارو «ئەسپوون»و[٥] «گەلاکوتك»[٦] نەبا چۆن پاك دەبوونەوە؟! ئەو هەموو ڕایەخ و پێخەف و جلکـە ئەستـوورو ناوبـەلـۆکـانە، لەپاش شوشتن و پاك کردنەوەیان، لە کوێ لەبـەر هەتـاو هەڵ بخـرابـانـایـە، لەســەر شاخ و دارو بەردی دەوری ڕووبارو چەمی کۆیە نەبێ چۆن وشك دەکرانەوە؟!!

ئەم پێویـسـتـیانە، ماوەی «عەیبە» گوتنی ئەو خێزانانەیان نەهێشتبۆوە کە لە ڕۆژێکی هەتاو و خۆش دا، کچ و کارو ئافرەتیان تفاقی نان و پێویستی ئەو ڕۆژەیان لەگەڵ خۆیان دا هەڵ گرتباو بۆ ئەو مەبەستە چووبانە ڕووباری.

بۆ کوڕی ئاشقی ئاگـرگـرتـوو، دەروون برژاو، کە لە ڕۆژانی ئاســایی‌دا، یارەکەی لەنێوان چوار دیوارو دەرگەی داخراودا بەندکرابوو، کە بە ڕێکەوت و زۆر بە دەگمەن نەبا نەی‌دەبینی، چۆن دیتـنێکیش، وەکوو خەیاڵێکی خۆشی ئەفســوونـاوی، بۆ چەنـد چرکـەیـەکی کەم، دووربـەدوور، بە بەرچـاوی‌دا تێ‌دەپـەڕی‌و بەس. لەو بارو دۆخـەش دا، لەبـەرچـاوی ناحـەزان، لەتـرسی (بەکرۆك) ان نەدەبوو سەیری بکات، دەنا خۆی‌و دڵدارەکەشی، تووشی سزاو قسـەی سووك دەبـوون. چی تاوانێـك لە تاوانی خۆشـەویستی گەورەتر هەیە؟ مرۆڤ ئابرووی پێ‌دەتکێ!!

بۆ ئاشقێــك، لە وڵات و شارێکی پڕ لە جوانی‌دا بووبێ‌و ژیــان بەســەر بەرێ، وڵات و شارێکی وەهــا کە خۆشـــەویستی، تەنـانـەت خۆشـویـستنی جوانیش تێیــدا بە تاوان بژمێــردرێ!! فەسڵێ بوهــاران، کیـژ وکـار چوونـە ڕووبار، هەلەو ساڵی جارێك هەڵ دەکەوێ. خۆشـەویستەکەی لەناو ئەو ڕەزو باغ و ڕووبـاره، (بـەڕە)و (جـاجم)و (لێفـە)و (لبـاد)و. . . تاد دەشواو هەڵیان دەخا. نەدیوار ماوەو نەدەرگای داخراو. ناحەزو بەکرۆکانیش کەمتر لەو ناوەدا دەبیندرێن. دەبێ بچێ‌و چاوی بە خۆشەویستەکەی گەش و ڕوون بێتەوە. بەلام ئەدی ئەگەر خەڵك لەو دەورو بەرەدا دیتیان، چی پێ دەڵێن؟ ئەوا قیری سیـا لە خۆی، ئەدی چی بە خۆشـەویستـەکـەی دەڵێن؟ قســەوقســەلـۆکی بۆ دروسـت دەبێ. ناوی دەزڕێ. سووك و ڕیـــسوا دەبێ. «قسـەکـەوتـە زارەکی دەکـەوتـە شارەکی». [٧] هەرهێنـدە ئەم هەواڵـە بگـاتەدەمی پیرەژنێك. ئەدی بابم، حەیـاو شەرم لەنـاودا نەمـاوە! ئەم شارە بۆ وا حەیـای لێ‌هـەڵ گیراوە. کچێ فلانـی حەز لێ‌کــردەیـی دەکـــات، کوڕی فلانـی خۆش دەوێ، بە

دەنگەدەنگ و خوتەخوتەوە لەسەریەك لینگی ئەم سەرو ئەو سەری شارەکە جاردەدا.

بۆ ئاشقێك، کە لە بارو دۆخێکی ئاوەهادا بژی، بە تێرامانێکی سەرپێی، ئەو هەموو مەترسی یەدێنێتەبەرچاو. لەگەڵ ئەوەش دا، ئەو هەر دەبێ بچێ. ئەدی چار چی‌یە؟ لەو تێرامانە سەرپێی‌یەدا، هیچ چارێکی بۆ نادۆزرێتەوە. لەو بارەدا، وەکـــوو هەمـــوو یەکـێکی بێ‌دەستـــەڵاتی دی، کاتێ بارو دوخی ناهەموار تەنگی‌پێ هەڵ بچنێ، بیری بۆ خەیاڵ دەچو خێرا هانای بۆ دەبا بەو هیـوایـە کە بەهـەشتێکی بەسـووك و ئاسانی بۆ دروست بکات. ئەم ئاشقەی ئێمەش لێی دەدوێین هەروەها. کەواتا چی بکا؟ پەنای بردۆتە بەر خەیاڵێ بە پێتی شاعیرانەو کۆپلە شیعرەکەی بەم جۆرەی خوارەوە تەواوکردووەو گوتوویەتی:

- دەستێ من دامێنی
- ئەوان هەڵاڵ و سووسن و بەیبوونان
- دەبا حەشارم دەن لەبن لقی هەنارێ.

ئەمە کۆپلە هۆنراوەیەکی فۆلکلۆری دێرینەو بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرای گوفتوگۆ پێ‌نەویستە لەسەر قەدەغەکردنی خۆشەویستی کۆمەڵگای دواکەوتوو لە مرۆڤی نەتەوەکەمان. کاك تایەر، ئەم بەڵگە بەنرخە، بەتێداکردنی گۆڕانێکی بچووك هەر بەتەواوی لە دەست دەداو پووچەڵ دەکاتەوە، ئەمەش بەوە کە وشـــەی (کیـــژ) لە دێـری دووەمی‌دا بە وشـەی (کـوڕ) دەگـۆڕێ. بۆ زیـاتـر ڕوون کردنەوە دەڵێم: کۆپلەکە بەم جۆرە لێ‌دەکات:

- فەسڵێ بوهاران
- کوڕوکار پێی دەچنەوە ڕووبارێ
- - - - هەتادوایی کۆپلەکە.

کاك تایـەر ئاگـای لەوە نەبـووە کە ئەگـەر وشـەکـە هەر لە سەرەتادا (کیژ) نەبـایـە، (کـوڕ)بـایـە، پێـویـستی بەوە نەدەکرد، کوڕە ئاشقەکە دەستی خۆی دامێنێ ئەوان هەڵاڵ و سووسن و بەیبوونان بکات، هەتا حەشاری‌دەن لەبن لقی هەنارێ!! دوای ئەوەش، لە هەموو کەژ و وەرزەکانی ساڵ دا (کوڕوکار) بۆیان هەبووە کە بچنە ڕووبارێو ڕێگرێکی «عەیب»ەو لەم تەرزە پەیوەندەی نەریتی کۆن، بەرهەڵستی لە چوونی نەکردوون.

هەر لە هەمان بەشی هۆنراوەکەدا، کاك تایەر واتای «حەوت ڕۆژان»ی لەو دێرە هۆنراوەیەدا، کە دەڵێ: «حەوت شەوو حەوت ڕۆژان» فرێ‌داوە. بەمە، لەلایـــەکـەوە ئارەزووی کوڕە ئاشقـەکـەی بۆ دیتنی کچـە خۆشـەویـستـەکـەی کەم کردۆتـــەوە. کوڕە حەزی‌کـــردووە کە «حـــەوت شەو و حەوت ڕۆژان»و زیاتریش و هەمیشە هەر لە ماڵی کچەدا بایە، بە بیانووی شەوارێ، ئەگەر بۆی بکـرابـایـە ئەو شەوارەیـەی لە مانـگە و دوومانگیش زیاتر درێژدەکردەوە. کەچی کاك تایـەر کردوویـەتی بە «حـەوت شەوان». لە لایـەکی دیکەشەوە، نەریـتی دێـــرینی شەوارەشی تێـــك داوە. ماوەی شەوارە کە هەر بە ئاســـایی حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بووە، ئەم کردوویەتی بە حەوت شەو.

بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەمە، دەڵێم:

جاران خانـەدان و دەردی‌وتـەنی: خواپێـداوەکان. کە تازە کـوڕیان دەبـوو (کچ نا !!) حەوت شەو و حەوت ڕۆژان قەڵەباڵغی ئاپوورەیان لە دەوری ئافرەتە زەیستانەکەو کۆرپە نێرینەکەدا کۆدەکردەوە بۆ ئەوەی «شەوە»و «ئارە = کە لە ئاڵی ڕەنگی خوێنـــەوە هاتـــووە)، دەرفـــەتیـــان بۆ نەڕەخسێ‌و نەتـوانن، کۆرپـــەکـــە بخنکێنن و ئافـــرەتـەکـەش تووشی خوێن لە بەرچـوون بکـەن. (شەوارە)ش لەم دوو وشەیە پێك هاتووە. لەو ماوەیەش دا، کە حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بووە، ئەگەر دایکەکە خوێنی لەبەر نەڕۆیشتبێ، مەترسی مردنی لەسـەر نەمـاوەو خۆی گرتـۆتـەوەو لە کاتی مەمـك دانی کۆرپـەکـەی، بەسەر کۆرپەکەدا نەکەوتووەو مەترسی لەسەر هەر دووکیان لاچووە.

وەکـــوو دەبینین ئەم گۆڕان و لابـــردن و دەست لە فۆلکلۆروەردانـــە، چی زیانێك دەبەخشێ.

لە کۆتـایی ئەم بەشـەی نووسینـەکـەدا گوتنی ئەوەم لەبیـر نەچێ کە: کاك تایەر لەو کاتەدا کە تازە وەکوو گۆرانیبێژێکی بەتوانا دەرکەوت، لە چلەکانی ئەم سەدەیـەمـان داو لە کاتی تۆمـارکـردنی ئەم دوو مەقامەدا، خوێندەوارترین گۆرانیبێژی بەرچاوەکانی ئەو کاتەی هەموو کوردستان بوو. بۆ خوێندن، پلەی خوێندنی گەیشتبووە «پۆلی سێ قوتابخانەی ناوەندی» کەچی گۆرانیبێژەکانی دی زۆربـەیـان، ئەگـەر نەڵێم هەر هەمـوویـان، یەك ڕۆژ لە قوتـابخـانە یان نەخـوێنـدبـوو ئەو سەردەمـەش خوێندەواری بە پۆل و بە ڵگەنامەی خوێندنی قوتـابخـانـە هەڵ دەسـەنگێنـدرا. بۆ تێکـەڵاویش، لەگەڵ توێژ و دەستە هەرە خوێندەوارەکانی کورد، ئەوانەی دەمیان لە بزووتنەوەی کوردایەتی‌و ڕۆشنبیری ئەو سەردەمـــەو بووژانـــەوەو ڕاپـــەرین وەردەدا، لەگـەڵ ئەوانـەدا تێکـەڵاوی‌و برادەرایـــەتـــی هەبـــوو. بەڵام بە داخـــەوە، بە هۆی ئەو دەورو بەرەی تێـــی کەوتبوو، کە ئەوانیش گەشەکردنی بیرو باوەڕی کۆمەڵایەتی‌یان قاڵب و قاوغی بەستـوو زیـاتـر بەرەوپێشـەوە نەچـوو. هەروەهـا بە هۆی نەبوونی ڕۆشنبیری‌و ئاراستەکردنێکی هونەری‌یەوە، نە لە ئێستگەی بەغداد بەشی کوردی، نە لە هیچ دەزگایەکی دیکەی میری بێ، یان میللی، کاك تایەر گەشەی نەکردو بەرەوپێشەوە نەچوو.

دەقی هۆنراوەی مەقامەکە:

«ئەی لێ زاڵم»

---

- ئەمن بە مەعبوو بە گچکە لانەکەی خۆم هەر دەڵێم
کەڵە شیلانەکی باریکە
مەمکێ ئەو بابان وێرانەی لەبۆمن بمێنێ
بەوان سێوێ لاسوور
کەوەتانێ
لە باخچەی (هیران)و (نازەنین) ان
تازە فەریکە.

وەی زاڵم غەمیٚ من. ئامان ئەی هاوار
- کیژ دەڵیٚ:
هەتیمە لاوە
ئەگەر ئەمن ڕۆژەکی ئەتو نەبینم
بە نوێژی نیوڕۆیی
لێم دەکەیە شەوی دەیجوورو تاریکە
وەی زاڵم غەمیٚ من.

بەستەکەی: سەرسوٚنەی گەردن مراوی
بیستوومە دایکت لێیداوی
دەستی بشکیٚ، کوێربیٚ چاوی
ژیکەڵیٚ بە خوٚم عەملاندی

(٢)

- ئەی لیٚ زاڵم
دارە خرکەڵەی بەرماڵاٚن
هەتا عەیامەکی زوٚر
لەبوٚ من بمینیٚو هەر دار بیٚ
- ئەمن دەچمەوە سەربانی باژێری
هەتاکوو دوو چاوی
مەعبوبە گچکەلانەکەی خوٚم
لیٚ دیار بیٚ
وەی زاڵم غەمیٚ من... ئامان ئەی هاوار
- کوڕ دەڵیٚ:
یارەبیی خودایە
ئەوی دەبێتە باعسی دوو دڵاٚن
قەت خێریٚ لە ماڵ و مەنزڵی خوٚی نەبینیٚ
لە ئاخری ساڵیٚ
هەر ڕەنج بە خەسار بیٚ
وەی زاڵم غەمیٚ من

بەستەکەی: لە مابەینی هەولێرو پرد
یەکێك لەناکاو بانگی کرد
قوڕ بە سەرت لەیلیٚیان برد
ژیکەڵیٚ ماچت بە چەندی

(٣)

- ئەی لیٚ زاڵم
پار ئەوان مەجالان غولاٚم بووم
ڕەزاللاهی خودا
ئەمساڵەکە بمگرنەوە بە کوێلە
دەستیٚ من دامێنی ئەوان وەستاو وەستاکاران
لە شارەکەی کوێیە
دەبا لەبوٚ لەیلایەکەی من
بدروونەوە جوٚتە سوٚلە
- کیژ دەڵیٚ: وەی زاڵم غەمیٚ من... ئامان ئەی هاوار
هەتیمەلاوە
ئەگەر ئەمن ڕۆژەکی ئەتوو نەبینم
دونیا لەپێش چاوی من وێران و خاپوورو چوٚلە
وەی زاڵم غەمیٚ من

بەستەکە: پوٚشینی ڕەش گوڵینگەی پێوە
بەسمان چاوان لیٚبیزێوە
ئاگرت بەردایمیٚ، بەپێوە.
ژیکەڵیٚ بە خوٚم عەملاندی.

(٤)

- ئەی لیٚ زاڵم
فەسڵیٚ بوهاران
کیژوکار پێی دەچنەوە ڕوباریٚ
دەستیٚ من دامێنی
ئەوان هەڵاٚڵ و سووسن و بەیبوونان
دەبا حەشارم دەن لەبن لقی هەناریٚ
وەی زاڵم غەمیٚ من - ئامان ئەی هاوار
- کوڕ دەڵیٚ:
یارەبیی خودایە ماڵی کچەتیوە لەیلایەکەی من
کوڕێکیان بیٚ
بەڵکوو حەوت شەو و حەوت ڕۆژان
دەچمە ماڵێیان
بە بیانووی شەواریٚ
وەی زاڵم غەمی من

بەستەکە:ی بەرخوٚڵەم چوویتە بژاریٚ
سوٚلی لێکەوتە ڕوباریٚ
بە عام بابچین بوٚ هاواریٚ
ژیکەڵیٚ بە خوٚم عەملاندی.

ئەوەی ڕاستی بیٚو دەبیٚ خوێندەواری لیٚ ئاگادار بکریٚ:

١ - وشەکانی ئەم مەقامە، لە سەرەتادا بەشێوە زمانی پوختی کوێیە بووە. لەپاش ئەوەی ماوەیەکی دورو درێژی بەسەردا تیٚپەڕیوە، چوٚنییەتی جوٚری دەربڕینەکانیان، یان سەرو بوٚرەکانیان، بەکارتیٚکردنی شێوەزمانەکانی دی، وەکوو سەرەتاکانیان نەماون و لە هەندیٚ جێگایان دا گوٚڕاون. بوٚ نموونە، جاران گوتراوە: «لەبوٚ من بمینیٚو هەر دار بی» کەچی ئێستا بەو شێوەیەی

لێ‌هاتووە، کە لە سەرەوە نووسراوە.
٢ ـ لە کۆیلە هۆنراوەی (بەستەی بەشی چوارەم)ی مەقامەکە نەبێ، دڵنیام، کە ئەوە هەر لەگەڵ مەقامەکەدا لەدایك بووەو هی خودی مەقامەکەیە. کۆیلە بەستەکانی دی جێگەی گومان لێ‌کردنن و لەوانەیە دواتر، گۆرانیبێژەکان، هەربەکەیان کۆیلەی بە ئارەزووی خۆی بۆ هەڵبژاردبووە. کاك تایەر یەکێك لە کۆیلە هۆنراوەی بەستەکە، دوو جار، واتە بۆ دوو بەشی مەقامەکەی گوتووەتەوە. بۆیە من لەو جێگایەی کە ئەو دووبارەی کردۆتەوە، نەم نووسیوەتەوە.

سێیەم: هەندێ لێکدانەوەو بۆچوون.

---

داوا لە خوێندەوار دەکەم، هەندێ بەشێنەیی ولەسەرەخۆو کەمێکیش بە قووڵی سەرنج لە هەر چوار کۆیلە هۆنراوەکەی بەستەکە بداو ناوەرۆکی ئەو کۆیلە هۆنراوانە لەگەڵ ناوەرۆکی بەشەکانی هۆنراوەی مەقامەکەدا بەراوورد بکات و بزانێ چی خزمایەتی‌و نزیکی‌و بەیەکەوە گونجانیان لە نێوان دا هەیە، یان نا؟ لەپاش ئەو سەرنج دانە، بۆی دەردەکەوێ کە لە نێوان هەموو کۆیلە هۆنراوەکانی بەستەکەدا، تەنیا ناوەرۆکی کۆیلەی چوارەمیان لەگەڵ ناوەرۆکی بەشی چوارەمی شیعری مەقامەکەدا دەگونجێ‌و ئەوەندەی دووبرا زیاتریش لەیەك دەچن و هەروەکوو چێشتی مەنجەڵێك و هی دەستی یەك کابان بن وەهان. بەتایبەتی کە سەروای کۆیلە شیعری گۆرانی‌یەکە، لەگەڵ سەروای بەشی چوارەمی مەقامەکەدا یەکن. لەمەدا بۆمان دەردەکەوێ کە:

١ ـ شاعیری دانەری شیعری مەقامەکە، هەر هەمان شاعیر بووە کە شیعری بەستە کەشی داناوە. بەڵگەی زیاتریشمان لەسەر ڕاستی ئەم بۆچوونە لەبەردەست دایە. هەر لەو کۆیلە، بەستە، بچکۆلەو کورتە، سێ دێری‌یەدا، کە لە بەردەستمان دایە، دوو وشەی (سۆل)و (ڕووبار)ی تێدا بەکارهێناوە کە لە شیعری مەقامەکەش دا هەن. جۆری قسەکردن و دەربرینەکانی، هەر دەڵێی قسەی ناو شیعری مەقامەکەیە. لەم بۆچوونەدا، هیچ گومانم نەماوە.

٢ ـ لە سەرەتادا، هەر چوار بەشی شیعری مەقامەکە، هەر بەشەیان بە جیا، کۆیلە شیعری بەستەی تایبەتی خۆی بووە، کە ناوەرۆکی لەگەڵ ناوەرۆکی شیعری مەقامەکە خۆی‌دا گونجاو و تەبابووە. بەمە شاعیرە هونەرمەندەکە، ئەو مەقامەی وەکوو مەقامێکی نایاب و زۆر دەگمەن، بە خۆماندوکردن و خۆتواندنەوەیەکی زۆرەوە، بۆ داهێناوین و بۆ بەجێ هێشتووین.

٣ ـ کۆیلە شیعری بەستەی بەشی چوارەمی مەقامەکە، ماوەو ئەمەندەی لێ‌پارێزراوە کە ئێستا لەبەر دەستمان دایەو کۆیلە شیعری بەستەی بەشەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمی مەقامەکە لەناوچوون.

بۆ ئەوە دەچم کە، ئەو مرۆڤە هونەرمەندە گەورەیەی بە گوێچکەو سەلیقەی کوردانە مۆسیقە زانە، وردو هەست ناسکەی دەسکاری ئاوازی مەقامی (محیر)ی کردووەو بەو شێوەو زەوقە بەرزو بلیمەتانەیە کردوویەتی بە کوردی، هەر هەمان کەس ئەو پیاوە بووە کە شیعری مەقامەکەو بەستەکەشی دانابێ.

ئەم وشە لە بارو گونجاو و بێ‌گرێ‌و گاڵانە، کە بەو شێوەیە لەگەڵ ئاوازی مەقامەکەدا دەگونجێن، یان ڕاستتر، لەناو یەکدی‌دا تواونەتەوە، بە ڕادەیەکی وەها یەك و تەبان، لە کاتی گوتنی مەقامەکەدا، گوێگر نازانێ، ئایا ئاوازەکە لەپێش هۆنراوەکەدا ڕێ دەکات، یان هۆنراوەکە بەپێش ئاوازی مەقامەکە دەکەوێتەوە. گوێگری بە سەلیقەو سەرنج وردیش نازانێ، کە ئایا ئاوازەکە بۆ شیعرەکە دارێژراوە یان هۆنراوەکە بۆ ئاوازەکە وەکو نەخشی هۆنراوەتەوە؟ ئەم دوو فرمانە هونەری‌یە گرنگە، دەبێ هەر هی یەك هونەرمەندی بە سەلیقەی بەتوانای بەدەستەوڵات بێ. دەنا، هەندێ ناهەمواری، نالیکی، بە زۆر بەیەکەوە لکاندن، وشەقرتاندن، وشەدرێژکردنەوەی ناپەجێی هەرتێدا دەردەکەوت. بەڵام بۆ ئەو هونەرمەندە لێهاتووە، هەموو شتێك بە ئاسانی‌و بەبێ خۆگوشین و زۆری لەخۆکردن هاتوونەتە دەستەوە.

ئەوجا با سەرنجێکی وردو پشکنەرانە، لە شیعری مەقامەکەی «نیوەشەو» بدەین و بزانین چی تێدا بەدی دەکەین:

ئەم خاڵانەی خوارەوە، بەئاشکرا لە هەر دوو دەقی شیعری مەقامەکان «نیوەشەو»و «ئەی لێ زاڵم»دا دەبینین:

١ ـ شێوەی زمانیان یەکە، نەك هەر ئەوە کە هەردووکیان بە شێوە، یان بە دیالیکتی کۆیە نووسراون، بەڵکوو دەم و دوو، شێوەی دەربرین و ڕستەکان و واتاکان و سادەیی‌و ئاسۆی بیرکردنەوەی ناو هەر دوو هۆنراوەکە، یەکە.

٢ ـ چەند وشەیەك و چەند واتایەك، لە شیعری هەر دوو مەقامەکەدا، بە هەمان مەبەست و جۆری بەکارهێنان و دارشتن هەن. وەکوو: عام، مەجال، کچەتیم، کیژدەڵێ، کوردەڵێ‌و هەتیمەلاوەو... تاد، هاتوون. ئەمەش هەر بۆ یەك شاعیر دەشێ کە هەر دوو هۆنراوەکەی هۆندبێتەوە. ئەگەرنا، بەلاساکردنەوەو شوێن پێ‌هەڵ گرتن دەژمێردرا، کەئەمەش لەوسەردەمە دازیاتر بەبێ دەستەڵاتی شاعیری دووەم دەژمێردرا بۆیە شاعیرەکان خۆیان لێ‌لادەدا.

٣ ـ گوفتوگۆکردنی ئاشق و ماشقی ناو شیعری هەر دوو مەقامەکە، بە یەك شێوەو دەم و دوو گوڕو گەرمی‌و ڕوانینە یەکدی‌یە. لە هەر دوو گۆرانی‌یەکەدا، دەڵێی هەر یەك ئاشق و ماشقن و لە مەقامێك دا ڕاگوێزراون بۆ مەقامەکەی دی.

ئەگەر پشت بەو سەرنجانە ببەسترێ، مرۆڤ بۆی هەیە کە بە دووری نەزانێ کە شاعیری هەر دوو مەقامەکە، بە بەستەی مەقامی «ئەی لێ زاڵم»یشەوە، یەك شاعیر بێ، یەك بلیمەت دەقی شیعری هەردووکیانی هۆندبێتەوە. بەراووردکردنێکی بە سەلیقەو زەوق و ترازووی وێژەوانانەی ئەو یەکدوو کۆیلە هۆنراوەیەی مەقامی «نیوەشەو» کە لەم نووسینەدا بەرچاو دەکەون، بە هۆنراوەکەی مەقامی «ئەی لێ زاڵم» ماقووڵی، ئەگەر نەڵێم ڕاستی، ئەم بۆچوونە نیشان دەدا. بۆیە بە پێویستم نەزانی لێرەدا مەقامی «نیوەشەو» بنووسمەوە.

لەمەش زیاتر دەڵێم کە تا ئێستا گوتوومە:

دەڵێم، تا دەگاتە دڵنیایی لە گوتەکەم دا، کە ئاوازی مەقامی «حیجاز»،

ئەو ئاوازەی کە شیعری «نیوەشەو»ەکەی پێدەگوترێ، ئەو ئاوازەش هەر هەمان هونەرمەندو مەقام زان، هونەرکاری‌و وردەکاری‌و جوانکاری تێداکردبێ‌و زەوق و سەلیقەو تام و چێژی کوردانەی پێداکردبێ‌و بلیمەتانەو وەستایانە ئاوازی مەقامەکەی بەو شێوەیە لێ‌کردبێ کە «تایەر تۆفیق» هۆنراوەی «نیوەشەو»ی پێ‌تۆمارکردووە. بۆ بەڵگە لەسەر ئەم بۆچوونەش، سەرنجی خوێنەر بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕادەکێشم:

١ ـ دەست پێ‌کردنی هەر کۆپلەیەك لە هەر یەکێك لەو دوو مەقامە، بە جوابێکی یەك جوون و لە یەك چوو دەست پێ‌دەکات. هەموو کۆپلەکان هەر بەو چەشنە دەست پێ‌دەکەن. پلەی مۆسیقەی بەرزو، هەناسەو بینی درێژ و پڕ لە لەرانەوەی کوردانە، پێناسی ئاشکرای دەست پێ‌کردنی هەر یەکێکە لە کۆپلەکانی هەر دوو مەقامەکە.

٢ ـ قەراری هەر کۆپلەیەك، لە هەر یەکێك لە دوو مەقامەکەدا، بە یەك ڕستەی مۆسیقەو ڕستەی لە وشەپێك هاتووی لەیەك چوو، یەك سەلیقەیی‌و تام و چێژ کۆتایی دێ‌و تەسلیم دەکرێ. لە نیوەشەودا «ئای لە من وای»و لە «ئەی لێ زاڵم»دا «وەی زاڵم غەمێ من»ە.

٣ ـ گوتنی سەرتاسەری هەر دوو مەقامەکە، هەر لە دەست پێ‌کردنی‌یەوە، هەتا دوایی، پێویستی بە هەناسەو بینی درێژی لە ڕادەی ئاسایی بەدەر هەیە. کە ئەمە وا لە خەڵك دەکا بڵێ داهێنەری ئەو مەقامانە، خۆی پلەی دەنگی بەرزو هەناسەی درێژ بووەو زەوقی تاکە کەسی‌و شکاندنی بڕو تینوویەتی دەروونی خۆی، پاڵیان پێوەناوە کە هەر دوو مەقامەکە بەو شێوەیە دابهێنێ، یان بسازێنێ.

٤ ـ لەبەر ئەوەی گوتنی هەر یەکێك لەو دوو مەقامە، ئەگەر بە چریکەو پلەی بەرزی دەنگ و بە هەناسەو بینی درێژ نەگوترێ، ئەو تام و چێژە خۆشە نابەخشێ کە مەقام دانەرەکە لەبەر چاوی خۆی داناوەو خستوتیە ئەستۆی مەقامەکانەوە، مەقام دانەریش لەلای خۆیەوە، ماندووبوونی گۆرانیبێژی لەبەرچاو بووەو حیسابی بۆ کردووە. هەڵساوە گوتنی هەر بەشێکی لە هەر یەکێك لە مەقامەکان دا، کردووە بە دوو پارچە نێوانی دوو پارچەی هەموو بەشەکانی مەقامی «نیوەشەو»ی بە گوتنی ڕستەی (ئەیەمان، ئەیەمان... با لەبۆت بمێنم) کردووەو نێوانی دوو پارچەی هەریەك لە بەشەکانی مەقامی (ئەی لێ زاڵم)یشی بە گوتنی ڕستەی «وەی زاڵم غەمێ من... ئامان ئەی هاوار»و هەتا دوا بەشی گۆرانی‌یەکە، کردووە. بەم دوو پارچەکردنی هەر بەشێك لە بەشەکانی هەر دوو مەقامەکە، پشوویەکی باشی بە گۆرانیبێژەکە داوە، ئەوجا ئاوازەکەی وەها سازاندووە کە هەر یەکێك لە پارچەی دووەمی هەر بەشێك لە بەشەکانی هەر دوو مەقامەکە، بە (کیژ دەڵێ)یان بە (کوڕ دەڵێ) بەپێی پێویستی مانای ئەو بەشەی هۆنراوەکە، دەست پێ بکاتەوەو لەگەڵی‌دا بڕوا هەتا ئاوازەکە، بەتەواوی‌و بەسەرو بەرو بەتێرو تەسەلی تەسلیم دەکاتەوە.

لە هەر دوو مەقامەکەدا ئەم دووربینی‌و هونەرکاری‌و وردەکاری‌یە ئاشکرایە. ئەمە ئەگەر لەلایەن یەك وەستاوە نەکرابایە، وەها بە یەك نەدەچوو. لە هونەری مۆسیقەش دا، وەکوو پیشەسازی‌یەکانی دیکە، بەرهەم و دەسکردی وەستاکان دەناسرێنەوە.

بەم پێ‌یە بۆ کورت کردنەوەی ئەم بەشەی دوایی نووسینەکە، من بۆ ئەوە دەچم کە هۆنراوەی مەقامی «ئەی لێ زاڵم»و هۆنراوەی بەستەکەشی، هەروەها هۆنراوەی مەقامی «نیوەشەو» لەگەڵ ئاوازی مەقامی «ئەی لێ زاڵم»و ئاوازی بەستەکەیشی، دواجار، ئاوازی مەقامی «نیوەشەو»یش، ئەمانە هەمووی، هۆندنەوەو دانان و داهێنان و گەشەپێدان و سازاندن و گونجاندنی، یەك تاکە مرۆڤی، شاعیری، هونەرمەندی، لە هونەری شیعرو گۆرانی‌و مۆسیقەی کوردی‌دا هەتا ناو ئێسقان کوڵاوی، ئاشقی، بلیمەتی کۆیە بن. وەختە بڵێم:

زەینم بۆ ئەوەش دەچێ کە ئەو مرۆڤە، لە هونەرو شیعری گۆرانی‌دا کەڵەمێردو بلیمەت و بەتوانایە، دەستی لە شیعرو ئاوازی گۆرانی‌یەکانی (سێوە)شدا هەبێ. مەبەستم لەناو ئەو مەقامانەیە کە لە ئێستگەی بەغداد بەشی کوردی تۆماری کردوون. ئەمەیان هەروەکوو بۆچوونێکی سەرپێی‌و ڕاگوزاری بەبیرم دا هات و لە دەربڕینی دوودڵیم نەکرد. هیوادارم کە ئەم دەربڕینە، پاڵ بە لێزانێکەوە بنێ، لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانە لە بارەیەوەبکات و ئەنجامەکەیمان، وەکوو کاکڵە گوێز بخاتە ناو دەستەوە.

ئەوجا، ئەو کەڵەهونەرمەندە، کێ بووە؟ کوڕی کێ بووە؟ وەکوو کۆیی‌یان کە زۆربەی خێزانەکانیان، نازناویان هەیە، نازناوی ئەویش چی بووە؟ ئەمانە، ئێستا هەموو پرسیاری بێ‌وەرامن. کەسێ بتوانێ وەرامی ڕاستی ئەم پرسیارانە بداتەوە، مانای وایە هونەرمەندێکی گەورەی نەك تەنها هی کورد، بەڵکوو هونەرمەندێکی ڕۆژهەڵاتی‌و بگرە، جیهانی دەست نیشان دەکات.

کانوونی یەکەمی /١٩٨٧

### پەراوێزەکان

١ ـ تایەر تۆفیقی هونەرمەندی گۆرانی‌گوتن (١٩٢١ یان ١٩٢٢ ـ نووسەری ئەم وتارە لە خۆی بیستووە ـ مێژووی کۆچ کردنی ـ بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٧/١٠/٢٠.

٢ ـ شیعری گۆرانی کوردی ـ کتێبێکی دەستنووسە ـ خالید دلێر ـ ١٩٨٧

٣ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤ ـ سەرنجی ئەو نووسەرانەی لێکۆڵینەوە لە بارەی: «تێپەڕبوون و تێپەڕنەبوونی کۆمەڵگای کوردستان، بە قۆناغی کۆمەڵایەتی «کۆیلایەتی»دا دەکەن، بۆ بوونی ئەم کۆپلە پەخشانە شیعرە لە فۆلکلۆردا ڕادەکێشم.

٥ ـ ئەسپۆن: بەرهەمی ڕووەکێکی تایبەتی بوو. جۆرە کەفێکی وەکوو کەفی سابوونی دەکرد، لە جیاتی سابوون بەکاردەهێندرا.

٦ ـ گەڵاکوتك: دارێکی پان و درێژ و ئەستوور بوو، جێ دەستی هەبوو، دارتاش بە تایبەتی دروستی دەکرد. لە کاتی شوشتنی ڕایەخ و پێخەف و جلکی قەبەدا، بەو دارە دەیان کوتی، هەتا چڵکەکەی لێ‌ببێتەوە.

٧ ـ قسەیەکی پێشینانە.

# مقامان فولكلوريان

## خالد دلير

ان النصوص الفولكلورية ولاسيما المستخدمة في الأغاني تظهر الى حد بعيد حياة الماضي غير المدون وغير المدروس لشعبنا من كثير من الوجوه وقت نظم هذه الأغاني وقبله. وربما تكون هذه النصوص أصدق المراجع والمصادر التي تعين الدارس لمعرفة زوايا هذا الماضي وأبعاده. فالفولكلور الذي حددت له هذه الوظيفة الجسيمة، لايجوز بأي شكل من الأشكال التصرف فيه وتحويره عند الاقتباس منه واستخدامه في الفنون مهما كان هذا التحوير طفيفاً لان التحوير من شأنه ان يخل بوظيفة إيصال الأمانة التاريخية من الماضي الى حاضرنا.

ومع هذا فقد نجد بعض المتعاملين مع التراث القديم يحورون النصوص التراثية عن جهل أو تجاهل أو بحجة عدم مطابقتها مع روح العصر، علماً بان عملهم يؤدي الى ضياع أو تعتيم معرفة تاريخ النص وعصره أولاً والى اظهار الأوضاع الاجتماعية القديمة على غير حقيقتها ثانياً. وكمثال على هذا التصرف أجرى المطرب طاهر توفيق بعض التبديل في مقامي (نيوهشەو) المغنى بنغمة مقام الحجاز و (أى لى زالم) المغنى بنغمة مقام المحير، وقد قام الباحث بمقارنة المقاطع المحورة مع المقاطع الأصلية السليمة على أساس تحليل معانيها ومدلولاتها، فتوسع في شرح بعض العادات والتقاليد القديمة للمجتمع في بيئته المغايرة لبيئتنا والتي انعكست في المقامين المذكورين بصورة فنية، وان اي اخلال بها يذهب عنها انسجامها مع البيئة والتاريخ ويجعل منها شيئاً نشازاً.

فحينما أراد الشاعر الشعبي القديم تشبيه نواهد الحبيبة شبهها بالكؤوس والفناجين التي يشرب فيها الناس في مضائف الأغوات القهوة والعصير.

اما اذا قام أحد بحذف عبارة مضائف الأغوات أو تبديلها بعبارة اخرى بحجة ان عصرنا ليس عصر المضائف والأغوات، وان ذلك يدل على مدح الاقطاع فأنه يرتكب خطاء فادحاً ـ كما وقع في المقام الاول ـ لايرتضيه الذوق الأدبي السليم ولا البحث العلمي.

کەلەپوور

# • خەملا ژنکێ، دسترانا کوردیدا

حجي جعفر

ئارمـانجـا ڤێ گوتـارێ، ناڤێ وان زێـرو زیڤـا، وان جل وبەرگا، وێ خەمل و کۆکێ، دیار بکەت، یاکو ژنکا کورد خۆ پێ دخـەمـلانـدو سـتران بێژێ کورد ژی، دناڤ سترانا خۆدا ڤەدچنی.

لاوکی کورد، گەلـەك جارا ئەڤین و دلـداری‌یـا خۆب خەلـەکـا ڤان چەکـا دەربـڕیـە. بەرەڤـاژی کچکێ ژی ب تڤەنگ و ڕەخت و خەنجەرو ڕوما..... کوڕکی گوتیەو[٦] ئەڤینا خۆ ب هاریکاریا ڤان چەکا بۆ کوڕکی ئاشکرا کریە.

بۆ ڤێ مەخسـەدێ، ئەمێ دەرگـەهێ سـترانـا کوردی ڤەکەین، داکو ڤێ خەملێ تێدا ببینین:

١ ـ خەملا ژنکێ، دسترانا داوەتادا:

چونکی سـترانـا داوەتـا بۆ شاهی‌و دیلانـا بتنێ هاتیـە ڤەهاندن، لەوما پتر خەم ژئاوازو پەیڤا خواری‌یە، ژ ڕامان و بیروهزرا.

ژ بەرهندێ، چونکی شاهی‌و دیلان، بێ خەمل و کۆك ناهـێـنـە کرن، دێ بینـین ژنکـا کورد، زەلامێ کورد، جوانتـرین و باشتـرین، چەك و زێـرو زیڤ و جل و بەرگ، دبەر خۆ کرینە.

ژنکێ سـتـران ب چەك و سیـلاحێ زەلامی گوتینـە، ب شەل وشـەپکێت وی گوتینـە، ب کەپـەن و مەتـال و ڕم و.. گوتینـە، بگـرە ب کوین و قەسـرا وی ژی گوتینە، ب ماهین و هێستـرا وی ژی گوتینـە، ئانکـو خەمل و کۆکا زەلامی پشکـەك ژلاوینی‌و مێـرانیـا وی بویـە، بۆ نمـونـە، دسـتـرانـا «هـای هۆزێ هۆزێ»دا، کچـك ب ڕێکـا «مەتالی» ڤە، پەسنا مێرانیا «تەمێ باکۆزی» دکەت و ئەڤیا خۆ بڤێ ڕێکێ‌ڤە دیار دکەت:

**های هۆزێ، هۆزێ، تەمێ باکۆزی**

**ڕیشێت مەرتالی ل ملی ئالۆزی**[١]

دبـەرێدا ـ نهـۆ ژی ل ڕەخـێ زاخـو ـ زەلامێ کورد «شال» ل پشتا خۆ گرێدا، شال ژی نیشانا خەمل و جوانیا زەلامی بویە، لەوما دڤێ سترانێ‌دا ڕەنگ دایە:

**هە کراسێ ڕەش، هەر کراسێ ڕەش**

**هە کراسێ ڕەش، جەبارێ ڕەش**

**«شالا» زاڤا پڕ لێ قوماش**

**هە کراسێ ڕەش، جەبارێ ڕەش**

× × ×

**هە کراسێ سۆر، هە کراسێ سۆر**

**هە کراسێ سۆر، جەبارێ سۆر**

**«شالا» زاڤا ب مەرجان و مۆر**

**هە کراسێ سۆر، جەبارێ سۆر**[١]

وە نەبیت «شال» بتنێ بۆ پشتا زەلامی بکار هات بیت، بەلکـو ژنکێ ژی دپشتـا خۆ ئالانـدیـە، وەکـو دڤێ سترانا خوارێ‌دا دیار دبیت:

**های وێلی وێلی، حەسەنۆ وێلی**

**ستێرێت عەسمانا، بێت بینە خێلی**

**حەسەن زاڤایە، خودێ تۆ بهێلی**

× × ×

**چوومە دکانێ، خاجێ عەمەرە**

**من «شالەك» کڕی، ب سەد زێرێت زەرە**

**نادم پشتا خۆ، «شانەك» بێ بەرە**

× × ×

**چوومە دکانێ، خاجێ ئەدریسە**

**من «شالەك» کڕی، ب سەد زێرێت سیسە**

**نادم پشتا خۆ «شالەك» بێ ڕیسە**[٣]

خەنجەر چەکەك پیرۆزە، ل جەم کوردان، کێم کەس هەبون، دبێ خەنجەر، هەتا بویە نیشان و درویشمێ کوردان.

دسـترانـا «کـەهی‌و حمێ برانـە»دا، دەڤێ خەنجـەرێ

ل سەر كۆزك و چەپەرا بريسيا ڤەددەت، ددەستێ هەردوو
برادا:

كەهى‌و حمێ‌برانە
«خەنجەرێت» وان سەڤانە
لباسكێت كەلا گەريانە

× × ×

كەهى‌و حمێ هێژ كورن
هەردوو برا هێژ كورن
«خەنجەرێت» نوى ڤەدبرن
لباسكێت كەلا دزڤرن[٤]

رم چەكەك كەڤن بويە، دشەرو جەنگادا بكارهاتيە، وە ديارە كوردان ژى بكارهينايە، لەوما ناڤێ «رم»ێ وەكو چەكەكێ شەرى دسترانا كوردى‌دا دەنگ دايەو ب مێرانيا وى‌ڤە هاتيە گرێدان:

بەيرم بەگۆ، بەيرم بەگ
وەز يا بەيرم بەگێ‌مە
بەيرم بەگۆ تۆى دينى
وەز يا بەيرم بەگێ‌مە
سوارە «رم»، ل سەر زينى
وەز يا بەيرم بەگێ‌مە
ناڤ شەرا تۆ چ نينى!
وەز يا بەيرم بەگێ‌مە

× × ×

بەيرم بەگۆ تۆى مەستى
وەز يا بەيرم بەگێ‌مە
سوارە «رم» ل سەر دەستى
وەز يا بەيرم بەگێ‌مە
ناڤ شەرا تۆ مێرخواسى
وەز يا بەيرم بەگێ‌مە[٥]

ژنكا كورد گەلەك ستران و لاڤژە ب شڤانى گوتينە، هەتا ب گوپالێ وى، ب كەپەنێ وى ژى گوتيە:

لۆ شڤانۆ، لۆ لۆ شڤانۆ
لۆ شڤانۆ، مالك وێرانۆ
ناڤێ شڤانى عەمەرە
هۆ دەلالى مالێ عەمەرە
دارو «گوپال» ژگولا زەرە
«گوپالێ» وى ژگولا زەرە
پەز بەردا بو، دۆر بێدەرە
پەز ئانى بى دۆر بێدەرە
پا لبەر بێرێ رەش لەسمەرە
دوستا شڤان رەش لەسمەرە[٦]

«كەپەنە» دسترانا «عندەلى»دا، رەنگ ددەت، بويە رەوش و خەمل بۆ سەر ملێت «عندەلى»:

عندەلى هاى عندەلى‌عندەليكێ من داوا
خوينا دبرينا دكەلى‌عندەليكێ من داوا
خراب كر، مالا عەلى‌عندەليكێ من داوا
عندەليكێ شڤانە عندەليكێ من داوا
«كەپەنێ»سەر ملانە عندەليكێ من داوا
دلێ دايێ ب كوڤانە عندەليكێ من داوا
«كەپەنێ» سۆرو شينە عندەليكێ من داوا
سێ رێزكێت سپى دروينە عندەليكێ من داوا
دلێ دايێ ب كەيف نينە عندەليكێ من داوا[٧]

زەلامێ كورد ژكەڤن دا، كولاڤ كريە سەرێ خۆ، چونكى سەرێ وى ژسەرماو گەرمايێ پارستى‌يە، هەتا وەلێ هاتى هەمى كەسا كريە سەرێ خۆ، هەكە وە نەبيت پا بۆچى مەزنا گوتيە: «چ سەر دبێ كولاڤ نينن»[٨].

گەلەك جارا «كولاڤ» وەكو خواستن بكارهاتيەو شوينا ناڤى گرتيەو بويە خەمل و كۆك بۆ زەلامى:

هە «كولاڤ» رەشێ، هە كولاڤ تێژ
بەر گارانێ ڤيژە ڤيژ
چەرمێ چێلێ، دا ب مێويژ

× × ×

هە «كولاڤ» رەشێ، هە كولاڤ پان
بەر گارانێ هانە هان
چەرمێ چێلێ دابو ب نان

خوزکا ئەڤ شەڤ باران با
پەزکێ مە لرەخ مالان با
«کولاڤ» رەش ل.مە مێڤان با[9]

بۆ دیار کرنا لاوینیو مێرانیو خەملا زەلامی، کچکێ ب قەسرو کوین و تەخت و ماهینا زەلامی گوتینە:

عەلۆ دینو، عەلیئاغاو
سمبێل رەشو، ڤەترە داو
تە ماڤیلو ژن ژێ ماو
تە خۆش مێرو تە براو

× × ×

«قەسرا» عەلو ل سەرێ گری
«برجا» ئاغای ل سەرێ گری
کۆلەك و پەنجەری لێ ڤەکری
کۆلەك و پەنجەری لێ ڤەکری
مالا عەلوی تێدا بری
مالا عەلوی تێدا بری[10]

کوردیت خوجهـ دخانیو قەسرا ڤەبون، بەلێ رەڤەندا رەش مال و کوین بکاردهینان، ڤی کوینی قەوارەك بەرفرەهـ دسترانا کوردیدا گرتیە:

های رەشکە رەشکە رەشکە
رەشکو وەللای وە ناکەم
های رەشکە رەشکە رەشکە
رەشکو وەللای وە ناکەم
«کوینێ» رەشوی ل ملێوۆ
رەشکو وەللای وە ناکەم[11]

ماهینێ دەورێ خو ل دەوات و سەیرانا کریە، هەر وەکو دشەرو جەنگادا کری، ب رێکا ماهینێو جانیا وێ، پەسنا زەلامی هاتیە کرن، وەکو دسترانا «هوی هوی مەممو»دا، دەیکا مەمموی ب رێکا پەسنا ماهینێ سۆزو لەڤینا خۆ بۆ کورێ خۆ و خەلکی دیار کریە، هەروەسا ب رێکا ماهینا مەمموی جوانیو مێرانیا مەمموی بۆ خەلکی دیار کریە گەلەك جارا مێرانیا زەلامیو چەلەنگیا ماهینێ پێکڤە گرێدانە، ئانکو مێرانیا زەلامیو سەرکەفتنا وی دشەرادا، ب زیرەکیو چەلەنگیا ماهینێ بویە:

هوی هوی مەممو «ماهینا» مەمێ بوزالی
هوی هوی مەممو | گرێدا ل دەرێ خانی
ژارو لاوۆ | دەیکا کۆرە نەزانی
هوی هوی مەممو «ماهینا» مەمێ کمێدە
هوی هوی مەممو ل دەرێ خانی گرێدا
ژارو لاوۆ کۆرێ دایێ رم لێدا[12]

لەڤە چەند سەر قەلەمەك بون، مە ل خەمل و کۆکا زەلامی داین، داکو رێ بۆ قەلەمێ مە خۆش ببیت و بچیتە دناڤ خەمل و کۆکا ژنکێدا... هەر دناڤ باغچێ سترانا داوەتادا، رستك و مەرجانا، پوشیو کوفیا، کراس و لەوەندیا، خزێم و قەرەفلا، گوها روزنجیرا، بازن و خرخالا.... جهەك مەزن و بەرفرەهـ گرتیە، ستران بێژی کورد بارا پتر سترانێت داوەتا ب خەمل و کۆکا ژنکێ گوتیە و ئەڤ خەمل و کۆکە ب جوانیو خشکوکیا وێڤە گرێدایە، ئەڤ خەمل و کۆکە، پێك هاتیە:

١ - قەرەپوشی
٢ - کۆفی
٣ - گوستیرك
٤ - گوهارك
٥ - بازن
٦ - خزێم
٧ - قەرەفل
٨ - کەمەر
٩ - بشکۆژك
١٠ - حەمایلۆك
١١ - موریو مەرجان
١٢ - چارك - چارۆك
١٣ - تیت
١٤ - خرخال
١٥ - خێلی
١٦ - هیزار
١٧ - قوتك
١٨ - کورتەك و کراس و لەوەندی
١٩ - پێلاڤ و شمك
٢٠ - کل و کلدان
٢١ - خەنا
٢٢ - شال
٢٣ - دەق
٢٤ - قۆتیك «نەینیك، عەینە، ئاوێنە»
٢٥ - گردانە

نهۆ ئەمێ ب ڤێ خەملێدا چینە خوار:

قەرەپوشی:

پەیڤەکا لێکدراوە، پێك هاتیە ژدوو پەیڤا، ئێکا تورکییە (قەرە)، ئانکو رەش، یا دی کوردیە (پوشی)، ئانکو (پوشییا رەش).

ژنکا کورد دشاهیو دیلانادا، قەرەپوشی ب پارچەکا جوان و ب خەملەکا شرین زانیە. ب گرێدانا پوشیێو کوگراندنا وێ، جوانیا ژنکا کورد ب رەوش تر کەڤتیە، لەوما ل هەمی داوەت و گوڤەندا ل سەرێ خوٚ کوگراندیە، بوٚ دەربرینا جوانیا خوٚ و خەملا خوٚ.

قەرەپوشیێ، ل گەریا گوڤەندێ، ل سەر زمانێ ستران بێژا و، ل سەر سەرێ بەژن تێلا سەما کریە:

خانم جانا ئەرتوشی — خانم جانێ، خانم جان
خانم جانا ئەرتوشی — خانم جانێ، گوزەلێ
تە ل سەری «قەرەپوشی» — خانم جانێ، خانم جان
تە ل سەری «قەرەپوشی» — خانم جانێ، گوزەلێ
توٚ سەرمەکا نافروٚشی — خانم جانێ، خانم جان
توٚ سەرمەکا نافروٚش — خانم جانێ، گوزەلێ (١٣)

ستران بێژێ کورد، پەیڤا کوردیا رەسەن ژی «رەش پوشی»، ژبیر نە کریە، یا ژمن ڤە بەری گوتبیت، «قەرەپوشی»، گوتیە «رەش پوشی»، لێ نزانم چەوا ستران بێژێ کورد، ئەڤ پەیڤا «قەرە» ب باشی زانی‌یە بهینتە دناڤ سترانا کوردی‌دا!!

دسترانا «کنا رەندە»دا، پەیڤا «رەش پوشی» هاتیە:

یالبن بیبێ، یالبن بیبێ
کنا رەندە، یالبن بیبێ
ڤەد هژینیت «رەش پوشیێ»
ڤەد هژینیت «رەش پوشیێ»
قەداو بەلا ل ئەڤینێ
سەد قەدا بت، ل ئەڤینێ (١٤)

ژبلی پوشیا رەش، پوشیا سپیو سوٚر ژی هەبوینە، ب گیڤک بوینە، چەند گیڤک و رویشێت وێ پتربانە، رەوش و خەملا ژنکێ جوانتر دبو...

هندەک ستران تایبەتی، ل سەر پوشیێو بوٚ پوشیێ هاتینە ڤەهاندن، ئەڤ سترانا ژێری، یاکو بناڤێ «پوشی» هاتیە ڤەهاندن، تێکدا پەسنا پوشیێو جوانیا ژنکێ کریە:

های پوشی پوشی پوشی — خەملێ منێ پوشی رەشێ
پوشیا یارێ رەشە — خەما منێ پوشی رەشێ
ژگیڤیا بیست و شەشە — خەما منێ پوشی رەشێ

× × ×

جهکێ دەستێ من حوەشە — خەما منێ پوشی رەشێ
پوشیا یارێ سپیە — خەما منێ پوشی رەشێ
ژگیڤیا سێ ریزیە — خەما منێ پوشی رەشێ
جهکێ دەستێ من نیە — خەما منێ پوشی رەشێ

× × ×

پوشیا یارێ سوٚرە — خەما منێ پوشی رەشێ
ژگیڤیا دوٚرمان دوٚرە — خەما منێ پوشی رەشێ
جهکێ دەستێ من زوٚرە — خەما منێ پوشی رەشێ (١٥)

ستران بێژێ کورد، گەلەک خوٚب خەملا سەرێ ژنکێ ڤە مژویل کریە، پەسنا پوشیا وێ کریە، پەسنا جەمەدانیا ل سەرێ

شۆڕشگێڕو دیموکراتی خوازەکان.

سەرەڕای ئەوەی کە ئافرەتان لە وڵاتانی پەرەئەستێن و (جیهانی سێیەم)دا لە ڕووی فەرمانبەری میریدا تاك و تەرایان لێ بوونەتە وەزیرو بەڕێوەبەرو ئەندامی پەرلەمان و ئەنجومەنی گەل. بەڵام نەگەیشتوونەتە ماف و شوێنی ڕەوای خۆیان شان بە شان لەگەڵ پیاوان دا لە دەرکردنی بڕیارە گرنگەکان و هەڵسووڕاندنی کاروباری دەوڵەت و کۆمەڵ.

ئافرەتان بە زۆری لەم وڵاتانەدا بە وانە گوتنەوەو کاروباری پزیشکەوانیو ئیش کردن لە نەخۆشخانەکان داو کاروباری بەڕێوەبردن (الاعمال الادارية) لە فەرمانگەکانی دەوڵەت دا خەریکن و بە زۆریش لە ژێر سەرپەرشتی بەڕێوەبەرو بەرپرسیاری پیاودا کاردەکەن. بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی بێبەش بوونی ئافرەتان لە دەرکردنی یاساو ڕژێمێ کە پەیوەندی بە ژیانی خۆیانەوە هەبێت و مافە ڕەواکانیان دابین بکات و بتوانێ ئافرەت کار لە سیاسەتی دەوڵەت بکات تاکو تواناو وزەی ئافرەتان بە تەواوی بخرێتەکار.

وەنەبێ تەنیا لە داوو دەزگاو فەرمانگەکانی میریدا هەست بەم دیاردەیە بکرێت، بەڵکو ڕێکخراوە کۆمەلایەتییەکانیش گرتوتەوە، وەکو نەقابەکانی کرێکاران و ڕێکخراوەکانی پیشەییو کۆمەلەکانی جوتیاران کە دەبینین دەوروو دەسەلاتی ئافرەت لەم ڕێکخراوانەدا لە خوار دەوروو دەسەلاتی پیاوەو بڕیارو دەنگی سەرەکی بۆ پیاوە.

بەمەش ئافرەتان ناتوانن ئەم ڕێکخراوانە بە گوێرەی پێویست بۆ دابین کردنی مافە ڕەواکانیان بەکار بێنن.

زاناکان لە ئەنجامی شیکردنەوەی زانستانەی یاساکانی گەشەکردنی کۆمەڵ دا، ئەو پەیوەندییە بەهێزەیان دۆزیوەتەوە کە لە نێوانی ژێردەستەیی ئافرەت داو لە نێوانی موڵکداریتی تایبەتیو دەرکەوتنی کۆمەڵگەی فرەمەچیندا هەیە.

هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەم بۆچوونەش دا ئەوەیان ساغ کردەوە کە هەوڵدان لە پێناوی ڕزگاریی ئافرەت دا بەشێکی نەپچڕاوە لە تێکۆشان لە پێناوی سوشیالیزم و لە پێناوی پەیوەندی کۆمەلایەتی نوێو لە پێناوی کۆمەڵگەیەکی یەکسان دا.

ئافرەت تەنیا لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ڕاستەقینەدا، ئەو کۆمەڵگەیەی لەسەر بنچینەکانی سوشیالیزمی زانستیدا دامەزراوە لە ژێر سێبەری یەکسانیو خۆشەویستی ڕاستەقینەدا دەژیت.[٢]

بەڵێ لەو کاتەی مرۆڤ لە ڕژێم و چەوساندنەوەی چینایەتی ڕزگاری دەبێت و ڕووتاندنەوەو چەوساندنەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە بنەبڕ دەکرێت داوودەزگا کۆمەلایەتیو فیکریو ڕۆشنبیرییە دواکەوتووەکان گۆڕانی بنەڕەتییان بەسەردا دێت و ئافرەت شانی بە شانی پیاو دەچێتە مەیدانی کارکردنی سەربەست و شەرەفمەندو پێویست بۆ بنیادنانی سوشیالیزم. تا تەنیا لەم کاتەدا ئافرەت هەست دەکات لە جیهانێکی ئازاددا هەوا هەڵ دەمژێت و یەکسان لەگەڵ پیاودا تام و چێژ لە ژیان وەردەگرێت.

## چەند ڕاستییەك دەربارەی ژیانی ئافرەتی کورد:

بەر لە هەموو شتێ ئەگەر بە خێراییش بێت پێویستە هەڵوەستەیەك بەلای پەیوەندییەکانی ئابووریو کۆمەلایەتی ناو کۆمەڵی کوردەواری بکەین و بە چاوی زانستی هاوچەرخەوە تێیان بڕوانین، تاکو لە ئەنجام دا دیاردەکانی سەرخانی کۆمەڵمان بە شێوەیەکی ئاسایی بێنە بەرچاوو ژیانی ئافرەت لە ژیانی کۆمەڵ دانەبڕین و بە دوای سۆزو پیاهەڵدانی ڕووت و گلەییو گازاندە دەربڕینی دوور لە زانست و بێ بنچینە نەکەوین.

ئاشکرایە کە کوردستان هەرێمێکی کشتوکاڵییە (بە تایبەتی بەر لە جەنگی دووەمینی جیهان وا پەرەسەندنی شارەکان و بزووتنەوەی پیشەسازیو جموجوڵی بازرگانی تیایاندا)، پەیوەندییەکانی دەرەبەگایەتیو نیمچە دەرەبەگایەتی تیا بەهێز بووە، سەرەڕای لە برەوبوون و باوی پەیوەندییەکانی خێلایەتی. تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمینیش خێلە کۆچەرەکان کە گەرمیان و کوێستانیان دەکرد سێیەکی دانیشتووانی کوردستان بوون. ئەم خێلانەش بە شێوەیەکی هەرەوەزی خاوەنی زەویو ئەوانەی کۆچەریش بوون خاوەنی لەوەڕگا بوون.

لە کوردستان دا عەشیرەت لە «بەرە» یان لە «تیرە» پێك هاتووە کە ئەویش بە بنەماڵەو بنەماڵەش بە بەرەباب دابەش دەکرا. سەرۆکی عەشیرەت مەزن یا میر یا بەگەو سەرۆکی بەرەش ئاغایە. بەگ و ئاغا دەسەلاتی قانوونیو ئیداری بێ سنووریان بووە. لە پاش مردنی ئاغا یان میر کوڕە گەورەکەی لە جێگای دانیشتووە، ئەگەر کوڕیشی لە پاش بەجێ نەمابا ڕدێن سپییەکانی عەشیرەت سەرۆکێکی تازەیان هەڵ دەبژارد.. هەندێك جار ڕێك کەوتووە کە ژنیش بۆتە سەرۆك عەشیرەت وەك (عادلە خانم) کە لە پێش جەنگی یەکەمی جیهان دا سەرۆکی عەشیرەتی گەورەی جافان بووە[٣] یان وەك خانزادە خانی سۆران گەورە میری کوردستان و میرنشینیتی سۆران.

شایانی باسە کە ئەم جۆرە ئافرەتە هەڵکەوتووانە بە نموونەی ئافرەتی کورد داناندرێت، چونکە ئاشکرایە کە لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا زۆربەی زۆری ئافرەتان بە ژیانێکی کۆلەمەرگیو لە ژێر باری چەوساندنەوەی دوو سەرەدا ژیانیان بەسەر دەبرد.

بەڵام ئەم ئافرەتە ناودارانەو ئیتریش لە ئەنجامی بارو زرووفێکی تایبەتیدا لە ڕیزی چینی دەرەبەگ و دەسەلات دارو میرەکان دا هەڵکەوتوون و لە ئەنجامی زیرەکیو بیرتیژیو نەتەوەو هۆزپەروەریشیانەوە تا ڕادەیەك خزمەتیان کردووەو بە شانازییەوە ناویان کەوتۆتە ناو لاپەڕەکانی مێژووی گەلەکەمان.

هەر لێرەدا پێویستە لە لایەنی سەرەکی ژیانی زۆربەی ئافرەتانی کورد ورد

سیـەوەو سەرنج لە شیکـردنـەوەیـەکی زانستـانـەی ژیـانی ئافـرەتـانی چینـە رەنجـدەرەکـانی لادیـی کوردەواری بدەین و کاتیش دیسـان بۆ سەردەمی دەرەبەگایەتی و لە پاشان دا بۆ سەردەمی نیمچە دەرەبەگایەتی و تا ئەم سالانەی دوایی دەگەرێتەوە.

(ئەگەر پیاو لە لادێدا خاوەنی پارچەیەك زەوی و چەند سەر ئاژەڵی تایبەتی خۆی بێت و بە تەنیا دوور لە ژیـانی هاریکـاری لەگـەڵ جوتیـارەکـانی تردا بژیت. ئافرەت وەکو دیلێکی بەردەستی پیاو دەمێنێتەوەو رادەی بیرکردنەوەی بەرتەسکبێت. چونکـە سەرەرای کاری کێڵگەو پەلەوەر بەخێوکـردن و مەر دۆشینی.. هەنـد ئیش وکـاری ماڵـەوەش جێبـەجێ دەکـات. بێ‌شـك بە خێوکردنی منداڵیش لە ئەستۆی ئەمە..

ئەمـەو هەمـوو سەرمـایـەیـەکیش بە ناوی پیـاوەکـەیـەتی ئەویش وەکـو رەنجبەرێکی ماندوو و بێبەش و کابانێکی ماڵ و دیلێکی بەردەستی پیاوەکەی ژیان بەسەر دەبات.

لە لایـەن مێـردەکـەیـەوە کەم بیـروڕای وەردەگیرێت و کەمتریش بە قسەی دەکـرێت. سەرپێچی فەرمـانێکی مێـردەکـەشی بکـات هەستی بریـندار دەکرێت و بێبەزەییانە لێی دەدرێت!!.

لە لادێکـانی کوردسـتـان دا راستـە لە سەرەتـای لاوێتی‌دا کوڕوکـاڵ و کچگەل سەربەستی تێکەڵاویان هەیەو لە بێرو مازووچنین و ئەم جۆرە کارانەدا پێکـەون و پێکـەوە رەشبـەڵـەك دەکـەن، بەڵام ئەم سەربـەستی‌یـە ناگـاتـە سەربەستی دڵداری..

ئافـرەت لە لادێکـانی کوردسـتـان و لە کۆمـەڵگـا لادێیی‌یـەکـانی شارەکـانیش دا. زۆرجـار دەفـرۆشـرێ. سەنـدنی شیـربـایی و ژن بە ژن و مارەکـردنی ئافـرەت لە تۆڵـەی خوێنی کوژ راوداو بە شوودانی کچی منـداڵ دیمەنێکی دیاری ئافرەت فرۆشتنن. هێشتا یاساو نەریتی کۆمەڵایەتی تێکرا رێگای دوو ژنەو سێ ژنەو چوار ژنە دەدەن!!.[٤]

## ئافرەت لە پەندی کوردیدا:

لە ناو فۆلکلۆرو پەنـدی کوردیشـدا ژیـان و چەوسـانـدنـەوەی ئافرەت و بیروڕاو تێڕوانینی کۆمەڵ و پیاو بەرامبەر بە ئافرەت رەنگیان داوەتەوە.

ئەمەش نەك تەنها لە فۆلکلۆری کوردیدا بەدی دەکرێت، بەڵکو لە پەندو فۆلکلۆری هەمـوو کۆمـەڵگـایـەکی چینـایـەتی‌داو لە ژێـر سایەی موڵکداریتی تایبەتی و چەوساندنەوەی ئافرەت دا بەدی کراوەو رەنگی داوەتەوە.[٥]

لە کۆمەڵگای دەسەڵاتداریتی (پیاوان)دا پیاو بە تایبەتی پیاوی چەوسێنەرو کورت بین؛ ژنی بە (زەعیفە)!! و کەم دێتە پێش چاوو پەندو جنێوی تایبەتی بۆ ریسـواکردنی نارەواو بە کەم زانیـی ئافرەت داهێناوەو پێی شوورەیی‌یە لە ناو مەجلیـسی پیاوان دا ئەگەر پێویـستیش بێت ناوی ژنەکەی بێنێت و ئافرەتیش بە (حورمە) دادەنێت!!.

ئەمەو لە کاتێك دا ئافرەت دایکە یان خوشك یان خێزانەو ئەو ئەرکە زۆرو گرانانەیش کە ئافرەت لە کوردەواریدا چ لە ماڵ یان لە دەرەوەی ماڵ دا بە رێکوپێکی و دەست ڕەنگینی پێی هەڵـساوە بە پیاو نەکراوەو ناکرێت.

ئەمـانـەی خوارەوەیش بریتین لە ژمـارەیـەك لەو پەنـدە کوردیـیانـەی کە بیـروبـاوەڕو بۆچوونی کۆنەپەرستانەی سەردەمی دەرەبەگایەتی و چەوساندنەوەی چینـایـەتی‌یـان رەنـگ رشتـوەو دەچنـە خانـەی لایەنە تاریك و نا پەسـندەکەی پەندی کوردی کە نەوەی نوێ رەتی‌کردوتەوەو بیری تازەو پێشکەوتنخوازانەیش جێگای گرتۆتەوە:

«ئەوەی لە کیژی خۆی نەدا لە چۆکی خۆی دەدا»! «ئەگەر کوڕە خوات لێ نەسێنێ، ئەگـەر کیـژە ئەوەی خوا بدا ئەو باشـە»!! «مـەکـری ژنـان چیـا دەڕوخێنی»!! «چـەکی ژنـان جوونـە غیـرەتیـان گریانە»!! «خوشکی بێ برا ماری بێ چرا»!! «زەلام کەرەبابو لەسەر ژنی حیـسابە»!! «ژن بە سەرو پۆڕ وراغ بە جل وجۆڕ»!! «کەس بە شەیتانی نەوێرا ژن نەبێ! «گۆتە گۆتی ژنان کوشتنی مێـردان»!! «مـاری بە کیـژان هەر چۆلـە»!! «مـەکـری ژنـان باری کەران»!! «مێرکی کورمانج گاڤا تێر خوار وێ مێرەکی بکوژت، یان ژنەکێ برەڤینت»!! «ئەو مال خراب بیت ئەوا ژن تێدا بیت مالخوێ»!! «ژن هەمی گاڤـا ژنـە، بەلێ مێـر هەمی گاڤـا مێـر نینـە»!! «ژنـا پیـرا بە وەکی میرا بە» «پیاویان پیاو گۆتی‌یەو ژنیان ژن گۆتیە»!! «باوەریا خۆ ب ژنا خۆ نەهینە»!! «بینە کچا چل سالی، نەهینە بێژنا بیست سالی»!![٦]

هەر لەم بارەیـەوە دوکتـورە شوکـریـە ڕەسوول لە (پەندی پێشینان و قسەی نەسـتـەقی کوردی)دا کە نامـەی دوکتـۆراکـەیـەتی نووسیـویـەو دەڵێ: «لـە کۆمەڵگای چینایەتی‌دا، کە لە سەر بناغەی چەوساندنەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە دامەزراوە، پەندو قسـەی نەستەق دەربارەی قازانجی نارەواو بێگاری و زۆرەملێ و «گەوج»ی ژن پەیدا بووە».

بۆ وێنەش ئەم پەندانەی هێناوەتەوە:

«ژن قژی درێژە ـ لە بیردا زۆر کورت و گێژە»!!

«دارێك لەسەر سەگ و سەد لەسەر ئافرەت»!!

«ژن و ماڵیان گوتووە»!!

«ئافرەت عەقڵی نوقسانە»!!

پیرەمێردی نەمریش لە ناو پەندەکانی‌دا ئەم پەندەی سەبارەت بە ئافرەت تۆمار کردووە:

«خوا ژنی بە ژن دروست کردووە
ماڵ و زاووزێی پێ سپاردووە
موویان درێژەو عەقلیان کورتە
ئیتر چییانە لەم جرت و فرتە»[٧]

برای عەرەبیش وتوویەتی: «للنساء شعر طویل وعقل قصیر»!![٨] دیـارە ئـەم پـەنـدە لـە سـەرەتـادا لـە نـاو گـەلـی ئـینـگـلـیـز سـەری

هەڵداوە، زادەی ئەو سەردەمە بووە کە ئافرەت بە کەمی تەماشا کراوە[9] -women have long hair and short wisdom- کەچی ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە ئافرەتان شان بە شانی پیاو هاتوونەتە مەیدانی ئیش کردن و گوزەران و گەڵێ جار گرەوی ئازایەتی و بەرهەم هێنانیان لە پیاو بردۆتەوە.[10]

ئاشکرایە کە لە کۆمەڵگای چینایەتیدا لە بەرامبەر چینی چەوسێنەرو کەسانی کۆنەپەرست و کورت بین و کەم هوشیاردا چینی چەوساوەی شەرەفمەندو مرۆڤی بلیمەت و هوشیارو مەندو دووربین و پێشکەوتنخواز هەڵکەوتوون کە بە چاوی پڕ لە ڕێزو بایەخ و خۆشەویستییەوە سەیری ئافرەتیان کردووە لەبری قسەی ئاسایی و ووت گەوهەربان هەڵ ڕشتووە، قسەی پڕ لە ماناو ماقوول و نەستەقیان لە زار دەرچووە، قسەکانیان بوونەتە پەندو دەستووری پەسندو بە جێی زەمانە،

لە پەندەکان دا دەوری ڕاستەقینەی مرۆڤی کوردو ئافرەتی چەوساوەو کەیبانوو کۆڵەکەی ماڵ و دایکی میهرەبان و پاشکۆی ماندووی پیاویان خستۆتە ڕوو..

دوکتۆر عیزەددین مستەفا نووسیویە دەڵێ:

«.. ڕۆژهەڵاتناسەکان زۆر بەڵگە لە فۆلکلۆری کوردییەوە وەرئەگرن بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کەوا کورد ژنی لە لا بەڕێزەو بە بەرزییەوە ئەڕوانێتە ئافرەت. لە مێژووی کوردا (بە تایبەتی لە مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا) ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە ئافرەت بە زۆری هاوشانی پیاو بووە لە ئیش کردن و لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، بەڵگەی ئەم قسانەش لە پەندی پێشینان دا ئەبینین:

کورد ئەڵێن: «ژن کۆڵەکەی ماڵە»!!.

ئەم پەندانە ژن لە سنووری ماڵ ئەبەنە دەرەوە بۆ ناو سنووری کۆمەڵ و بە شێوەیەکی ژیرانە ئەڕواننە ئافرەتی باش و بە بناغەی بەختیاری کۆمەڵی دائەنێن. کورد دەڵێن:

«ژنیش هەیەو ژانیش هەیە»، واتە ئەوی باش بێت لای کورد ئەوە ژنی ڕاستەقینەیە. دوکتۆر لە لێکدانەوەکەیدا بەردەوام دەبێ و دەڵێ: لە ژیانی ئابووری دێهات دا، کورد ئافرەت بە بناغەو کۆڵەکە دائەنێت و ڕۆڵێکی گەورەی لەو مەیدانەدا ئەداتێ و ئەڵێ: « ژنێکم ئەوێت ژنانە، پێستە بکا بە هەمانە». لە پاڵ ئەمانەدا ئافرەت لە لای کورد وێنەی شەرەف و مەردی و سەرفرازییە، کورد ئەڵێن: «کچ قەڵایە ناگیرێ».

لە مەیدانی ئازایەتیش دا کورد شانازی بە ژنیشەوە ئەکات، پێشینان وتوویانە: «شێر لە بێشە دەرچێت چ نێر بێ و چ مێ».[11]

هەروا لە پەندی پێشینانی کوردیدا ڕەوشت و پەیوەندی هاوسەریی ژن و پیاو جێگایەکی تایبەتی هەیە، ئەو پەیوەندییەی بە پێوانەی ئاستی ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی دانراوە. ئەم پەیوەندییە ڕاست و بەجێیە هەڵوێستێکی باشی دەروونی و ڕەوشت بەرزی لە ناو خێزان دا دروست دەکات و دەبێتە هۆی

پەیدابوونی باری لەبار بۆ بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ وەك «دایك بینەو دۆیتە بخوازە»

ئەم پەندە ئەوە دەسەلمێنێ کە دایك گەورەترین دەوری هەیە لە پەروەردەکردنی منداڵ دا، وە بە تایبەتی کچ.

بە پێی شەریعەتی ئیسلام پیاو دەتوانێ چوار ژنی هەبێ بەڵام کورد بە چاوێکی جیاواز دەڕوانێتە ئەم کارە بۆیە دەڵێ:

«پیاوی دوو ژنە، جەرگی کون کونە»

لە کوردستان دا بە دەگمەن خێزان لە ئەنجامی تەلاق دا یان دا تێك چووە. تەلاق دان بە شوورەیی دانراوە، چونکە پێیبەستی سەرەکی دایك و باوك ئەوەیە کە منداڵەکانیان بە جۆرێکی پەروەردە بکەن شایەنی ئەوەبن خێزانی پتەو پێکەوە بنێن.

دەربارەی پێکەوەنان و پتەوکردنی پەیوەندی ژیانی خێزانی بەسەدان ئامۆژگاری وتراوەو ئەو ژنە زۆر بە بەختیار دادەنرێ کە هەموو ژیانی لەگەڵ یەکەم مێردیدا بباتە سەر، وەك:

«سواربوون عەیبێك و دابزین دوو عەیب»

«حەوت جار ڕۆینی بخوازە، تەڵاق دانی مەخوازە»

لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا بە تایبەتی لە دوای جەنگی دووەم کاروباری بازرگانی و پیشەسازی لە شارەکانی کوردستان دا پەرەی سەندو سەرمایەدارو بۆرژوای شارو بازرگانەکان دەوریان لە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و بەرهەم هێنان دا دیارترو کاریگەرتر بوو. چینی کرێکاری شار سەری هەڵداو لە پاشان دا ئافرەتیش شان بە شانی برەکەی بەڵام بە ڕادەیەکی زۆر کەمتر لە کارگەو کاردا دامەزراو لە خەباتی پیشەیی و چینایەتیش دا دیسان بە ڕادەیەکی کەمتر بەشدار بوو.

تاکو ناوەڕاستی ساڵی ۱۹۸٥ ژمارەی ئافرەتە کرێکارەکان بە نیسبەت ژمارەی گشتی کرێکارکان (ژن و پیاو) لە هەندێ شاری کوردستان دا بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

١ ـ سلێمانی: ژمارەی گشتی کرێکارەکان = ٦٢٢١٤ کرێکار بوو کرێکارە ئافرەتەکان تەنیا ٣٨٢٩ کەس بوون!!.

٢ ـ هەولێر: ژمارەی گشتی کرێکارەکان = ١٩٦٥٥ کرێکار بوو تەنیا (٣٧١١) کەسیان ئافرەت بوو!!.

٣ ـ دهۆك: ژمارەی گشتی کرێکارەکان = ٢٢٩٨٠ کرێکار بوو لە ناویاندا تەنیا (٦٥٦) کرێکار ئافرەت بووا![12]

لەم سەرژمێرییەی سەرەوەدا دەردەکەوێ کە تاکو ئێستا ڕێژەی بەشداربوونی ئافرەت لە کارکردن دا چەند نزمەو مەسەلەی جێبەجێبوونی یەکسانی ئافرەت لەگەڵ پیاودا لە بواری ژیانی ڕاستەقینەو کارکردن دا چەندی ماوەوچەند لە دواوەین.

بەڵام سەرەڕای ئەمە دان بەم ڕاستییە نراوە کە (پاش شۆڕشی ساڵی

١٩٥٨ دەوری ژن زیادی کردو ئاسۆی نوێی لە بەردەم کرایەوەو بە ئاسانی دەتوانرێ ئەو گەشەکردنە ببینرێ کە لەم (چارەگە سەدەی) دواییەدا لە ژیانی ئافرەتەکانی ولاتەکەمان دا رووی‌داوە، کەوا کاری لە مەیدانی نیشتمانی‌و کۆمەلایەتی‌دا زیادی کردووە.

چونکە گەشەکردنی هوشیاری سیاسی‌و پەرەسەندنی جوولانەوەی نیشتمانی کارێکی باشیان لە ژیری‌و لێکدانەوەی ژنان کردو بەشێکیشیانی راکێشایە کۆری خەباتی نیشتمانی‌و کۆمەلایەتی‌و لە راپەرین و شۆرشەکانی گەل لە سالانی پەنجاکان بەشداربوون.[14]

ئەگەر کەمێکی تریش بۆ دواوە بگەرێینەوە دەبینین یەکێك لە نیشانە جیاکەرەوەکان و دەسکەوتێکی دیاری کۆمەلایەتیی راپەرینی کانوونی سالی ١٩٤٨ ئەوەبوو کەئافرەتی شار، چ عەرەب و چ کورد، بە شێوەیەکی فراوان و رێکوپێك تێکەلی ژیانی سیاسی‌ی بوون و شان بە شانی پیاو بۆ رووخاندنی «پەیمانی پۆرتسمۆث» هاتنە کۆری خەباتەوە. یەکێك لە بەشدارانی ئەم راپەرینە بە تایبەتی باسی شوێنی ئافرەتی کوردی لە خۆپیشاندانەکانی بەغدای پایتەخت دا کردووە.[15]

هەروا لە ماوەی سالانی رابوردوودا، ئاستی خوێندەواری‌و بیری ئافرەت بەرزبۆتەوەو شووراکانی نێوان ئافرەت و پیاو دەستیان بە رمان کردووەو وای لێهاتووە بە چاوێکی دی سەیری ژیان بکات، ئەوەبوو گەلێ مافی لێ‌زەوت کراوی خۆی وەرگرتەوەو لە هەمان کاتیش دا رای پیاو بەرامبەر بە ژن گۆراو وەکو جاران نەمایەوە چونکە ئێستا دەبینین ئافرەت لە ژیانی ئابووری‌و کارکردن و بەرهەم هێنان دا شان بە شانی بە دەوەستێت، ئەمرۆ شتێکی سروشتی‌و باوە ئەگەر ژن لە کارگەو دایەرەو کۆمپانیاکان دا هەموو ئەو کارانە بکات کە جاران هەر بۆ پیاو رەوا بوون..[16]

ئافرەت لە کۆمەلی کوردەواری‌دا شان بە شانی پیاو وەکو ئافرەتی هەر کۆمەلگەیەکی تر ئەگەر یاساو نەریتە کۆمەلایەتی‌یەکان بواریان دابێت دەوری دیاری‌کراوو کاریگەری خۆی وەکو؛ مرۆڤ، کەیبانووی مال، کارزانی زیرەك و لێهاتوو، تێکۆشەری بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیان بینیوەو دەبینێت. لە ناو خوشکانی‌دا کچە میرو سەرەك خێلی دەسەلات دارو پالەوانی گۆرەپانەکانی جەنگ و کرێکارو فەرمانبەری دەست رەنگین و بیرتیژ و پزیشك و ئەندازیاری پسپۆرو ئەدیب و هونەرمەندی داهێنەر هەلکەوتوون.

بەلێ ئەگەر هەر لە سەرەتاوە دابەش بوونی ئابووری‌و کارو نەریتە کۆمەلایەتی‌یەکان و یاساو رژێمە پەیرەوکراوەکان و رەوشتە باوەکەی ناو کۆمەل جیاوازی نەخەنە نێوان کورو کچ و لە دوایشی‌دا نێوان ژن و پیاو لە هەموو بوارەکانی پەروەردەکردن و خوێندن و کارکردن دا، بێ‌شك لە ئەنجام دا ئافرەت شان بە شانی پیاو وەکو مرۆڤێکی ئاسایی وەکو پیاوێکی ناو کۆمەل خۆی لە مەیدانەکانی ژیان دا دەبینێتەوەو بەشداری لە بنیات نانی ولاتەکەی‌و خزمەت کردنی میللەتەکەی‌دا دەکات.

سەرەرای بەجێ‌گەیاندنی ئەرکی دایکایەتی‌و بەرێوەبردنی کاروباری ناو مال بە هاریکاری هاوسەری ژیانی بێ چەوساندنەوەو جیاوازی‌و بە دلێکی فراوان و هەستێکی ناسك و بەرز.

گەلێك لە رۆژهەلات ناس و دیپلۆماسی‌و مێژوونوسە - بیانی‌یەکان، بە تایبەتی ئەوروپایی‌یەکان لە بارەی ئافرەتی کوردیان نووسیوەو پیایان هەلداوەو لە ئافرەتانی گەلە موسلمانەکانیان سەربەست ترو ئازاتر لە قەلەم داون.

لە گشت سەرچاوەکان دا کە باسی چۆنیەتی ژیانی کۆمەلایەتی ئافرەتی کورد کراوە، هەموویان لە سەر ئەوە رێك کەوتوون کە کورد لە چاو میللەتانی دراوسێیەوە زیاتر ژنی بەلاوە بە نرخ بووە، مینورسکی لە (الاکراد)دا دەنووسێ: «بۆ دیاری‌کردنی رەوشتی هەر گەلێك باس کردنی باری ئافرەتیان شتێکی گرنگ و پێویستە، کورد لە چاو گەلانی دیکەی ئیسلامی‌دا زۆر لەگەل ژنەکانیان هێمن و لەسەرخۆن، ژن کارە گرانەکانی مالەوە دەکەن و لە کانی‌یەوە ئاو دێنن، بە چیا بەرزەکان دا هەلدەگەرێن، مەر دۆشین و داروگیا هێنان لە ئەستۆی ئەوان دایە، سەرەرای ئەوەش هەمیشە مندالەکانیان بە کۆلەوەیە..[17] مینۆرسکی پتر لەسەر باسەکەی دەرواو دەلێ: ئافرەت لای کوردەکان خاوەنی کەسایەتین گەلێك کور بە ناوی دایکیانەوە ناویانگیان دەرکردووە.[18]

## رۆلی شاعیرو رووناکبیرەکان:

هەر لێرەدا پێویستە سەری رێزو خۆشەویستی بۆ ئەو رووناکبیرو شاعیرە پێشکەوتنخوازانە دابنەوێنین کە هەر لە کۆتایی‌یەکانی سەدەی نۆزدەدا لە پاش یان لەگەل بەرزبوونەوەی دەنگی دلێرانەی رووناکبیرە ناودارەکانی ولاتەکانی تری نزیك کوردستان وەك؛ دەنگی سەید ئەمیر عەلی لە هیندستان و جەمالەددینی ئەفغانی لە ئێران و تورکیاو میسرو دەنگی محەمەد عەبدەو قاسم ئەمین و ئەحمەد شەوقی لە میسرو (بطرس بستاني) لە سووریاو لبنان و مەعرووفی رەسافی‌و جەمیل صدقی زەهاوی لە عیراق دا؛ دەنگی ئەمانیش (شاعیرو رووناکبیرە کوردەکان) لە کوردستان دا بۆ ماف و ئازادی ئافرەتان بەرزبۆتەوە.

چونکە هەر لە سەرەتاو لە هەموو شوێنێك دا؛ ئافرەتان خۆیان بە تەنیا لە مەیدانی بەرگری‌کردن لە مافە سروشتی‌و رەواکانیان دا نەدۆزیوەتەوە، بەلکو ژمارەیەك لە پیاوە پێشرەوو رووناك بیرەکان لە هەر ولاتێك دا، ئەو پیاوانەی دروشمی ئازادکردنی ئافرەتان و بەرگری لە مافی ئافرەتانیان بەرزکردۆتەوە لە تەکیاندا وەستاون. ئەو مرۆیانەش لە رێزی رۆشنبیرو رووناکبیرە پێشەنگەکان بوون و مێژووش سەلماندوویەتی کە سەرقافلەی کاروانی پارێزگاری‌کردنن لە مافی ئافرەتان دا.

لە کوردستانیش دا حاجی قادری کۆیی بە دەنگێکی دلێرانە فەرموویەتی:
«بۆچی فەرموویەتی نەبی‌ی ئەمین

(اطلبو العلم ولو بالصين)

نێرو مێ لەو حەدیسە فەرقی نی‌یە

گەر مەلا نەهیی فەرموو دینی نی‌یە»!

وەچەی دووهەمی بیری حاجی قادر لە کوردستان دا مەلا موحەمەدی جەلی زادەی کۆیە بوو کە بۆ یەکەم جار بە ئاشکرا لایەنی ئازادی‌و مافی ئافرەتانی گرت و بە نموونە دانی پیانا کە ئافرەت بۆی هەیە ئەگەر حەزی لە مێردەکەی نەبێ دەست بەرداری ببێ‌و لە کاتێك دا کە خەڵك ئامادە نەبوون بێ‌ترس کوریان بخەنە قوتابخانە، ئەو کچی خۆی (لە ساڵی ١٩٢٣ - ١٩٢٤ دا لە کۆیە) خستە قوتابخانەی کوران!!.[١٩]

فائق بێ‌کەسی نەمر راستی پێکاوە کە چل ساڵ لەمەو بەر فەرموویەتی:

**نێرو مێ هەردوو بە جووتە بۆ وەتەن هەوڵێ نەدەن**

**دوورە دەرچوونی لە دیلی، مەل بە باڵێ نافرێ**

**هەوڵی راستی هەردوو لا ئامانجی میللەت سەر ئەخا**

**چونکە مەعلوومە بە یەك دەس چەپڵە قەت لێ نادرێ!!**

هەروا (ئەوەی پێویستە لەم بارەیەوە بنووسرێ‌و شایانی باس بێت ئەوەیە کە حەپسە خانی نەقیب و مێژوونووسی گەورەی کورد ئەمین زەکی بەگ و حاجی تۆفیقی پیرەمێردی شاعیری نەمر بە مەردانەو ئازایی‌یەوە لە کاردا بوون، لە هاندان و بانگاشەو جاری واش بە زۆرو خواهیش کۆتایان نەدەکرد، بەردەوام بۆ سەربەستی‌و رزگار بوونی ئافرەت لە کۆت و پێوەندی رزیوی کۆمەڵایەتی‌و کۆنەپەرستی ئیشیان دەکرد.[٢٠]

لە چلەکانی ئەم سەدەیە بە سەرەوە، سەرەرای هەوڵ و تێکۆشانی هێزە پێشکەوتنخوازەکان لە پێناوی یەکسانی‌و مافی ئافرەتان لە کوردستان دا، ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرو نووسەرو شاعیرە پێشکەو تنخوازەکان گەلێك بەرهەمی بە نرخیان دەربارەی ژیانی ئافرەتی کوردو بەرگری‌کردنی لە مافە رەواکانی‌دا لەسەر لاپەرەی گۆڤارو رۆژنامەکان یان لە دوو تۆ بەرگی کتێبی سەربەخۆدا یان لە میانەی هۆنراوەو داهێنانی هونەری‌دا پێشکەش کردووین.

## دەوری رۆژنامە گەری‌و رۆژنامەنووسانی کورد

جێگای شانازی‌یە بۆ کاروانی رۆژنامەنووسی گەلەکەمان کە سەرنج دەدەین زۆربەی ئەو گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یانەی لە بەغدا یان لە شارەکانی کوردستان دەردەچوون درێغی‌یان نەکردووە لە داکۆکی کردن لە مافە رەواکانی ئافرەتی کوردو هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵك بە گرنگیتی‌و بە رەوا زانینی تێکۆشان لە پێناوی گۆرانی شۆرشگێری‌و نەهێشتنی چەوساندنەوەو وەدی هێنانی ئازادی ئافرەتان.

هەمیشە گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یەکان لاپەرەو گۆشەی تایبەتی‌یان بۆئافرەت تەرخان کردووە. نووسەرە پێشکەوتنخوازەکانیش بە ژن و پیاوایانەوە ئەم بوارەیان کردۆتە مینبەرێکی پیرۆزو لە رێگایەوە لەسەر مافە رەواکانی ئافرەت وەدەنگ هاتوون و خامەیان خستۆتە کارو وشەی کاریگەریان پێ دارشتووە.

ئێمەیش لە پێناوی هەڵسەنگاندن و یادکردنەوەی دەورە پر لە شانازی‌یەکەی رۆژنامەنووسانی کورد لە پێناوی ئازادی‌و مافی ئافرەتان دا بە پێویستمان زانی چەند نموونەیەك لە نووسینی گۆڤارو رۆژنامەکان بئاخنینە ناو باسەکەمانەوە.

رۆژنامەی (ژیان) لە ژمارە (١٣)ی ساڵی یەکەمیدا کە لە رێکەوتی ٢٢ی نیسانی ١٩٢٦دا دەرچووە وتارێکی بە رێوەبەری قوتابخانەی کچانی سلێمانی خوشکە (گنیدە عەزیز خانم)ی بڵاوکردۆتەوە کە تیایدا هاتووە: «ژنێتی موجودیەتێ کە کە قسمێکی تری حیات و حتی قسمی مهمی اشغال کردووە. نابی تأثیراتی ژن لە حیات دا لە پیش چاو دوور بخرێتەوە. ژن عضویکی مهمە کە پیاو دینیتە دنیاوەو سعی خوی پیاو پی اگەیەنی‌و بم لونە لە ریگایکی کورت و باریك و راستوە اینیری بو مدنیت و ترقی. امرو ابی ژنی کورد پی بگات تا صبحینی قومی کورد بی‌تە وجودو پایدار بیت».

شایانی باسە کە رۆشنبیران لە رێگای رۆژنامەی ژیانەوە هێرشی گەورە گەورەیان ئەبردە سەر خوو نەریتی کۆن، پەردەیان لەسەر ئەو بیرورایە لا ئەدا کە ئافرەتی کردبووە دیل و کۆیلەی کۆمەل. دژی مانەوەی ئافرەت بوون لە چوار دیواری تەنگەبەری ماڵەوەدا کەسەرتاپای ژیانیان بە جل شتن، چێشت لێنان، کلاو چنین، تەشی رستن، منداڵ بەخێوکردن ببەنە سەرو ئامانجیان فێرکردن و خوێندەوارکردن و چاوکردنەوەو هاوبەشی کردنیان بوو لەگەڵ پیاودا تا لە پێناوی بەرزی گەل و پێشکەوتنی وڵات دا هەنگاو بنێن.[٢١]

لە وتارێکیدا بە ناوی (پەروەردەو پێ‌گەیاندنی ئافرەت پێویستە) (زاری کرمانجی) لە ساڵی ١٩٢٧دا بەم چەند وشە بە نرخە دەوری ئافرەتی هەڵسەنگاندووە: «وردبینەوەو لیك دەینەوەو حالات اجتماعیات تماشا کەین هەنگینی تیدەگەین کە اساس و بناغەی همو مالان آفرەتە. بە بی ئافرەت هیج پیك نایت... آفرەت ماموستای ولاتە، آفرەت طبیب و حکیمی ولاتە، آفرتە منداڵ آزادو سربست و بی ترس بکا.. بە راستی گیانی ملت آفرەتە.[٢٢]

(زاری کرمانجی) لە وتارێکی تری‌دا دەربارەی (عایشە تەیمور) دەڵێ: «ئەوەل ژنیکی آلای شعرو ادبی بۆ بلندبونی ژنانی دەوری تازە لە مصر هەڵدا کچە کوردێك بوو بە ناوی عایشە تەیمور»...

گۆڤاری (گەلاوێژ) لە ژمارە (١٠)ی ساڵی یەکەمیدا کە لە ئەیلوولی ١٩٤٠دا دەرچووە وتارێکی بە ناوی (زانستی بۆ ژنانمان) بە پێنووسی (ق. قزار) بڵاوکردۆتەوەو تیایدا هاتووە: «زانین بۆ ژنانمان لە هەموو شتی لە پێشترو پێویست ترە چونکە هەروەك ماڵ بێ ژن بە ماڵ ناژمێردری ژنیش بێ زانین بە ژن ناژمیردری.

زانینی ژنانمان نابی بخرینە پشت گوێ تەنها لەبەر ئەوە کە مێینەن هەروەك لەمێشکی هەندی کەسدا جی‌گیر بووە، چونکە لە ژنا گەلیکی وا هەل کەوتوە کە لە علم و فن دا زور پیش پیاو کەوتون لەمانە زوریان ئەناسین پی‌ویست بە ناوبردنیان نیە»...

گۆڤاری (هیوا) لە گۆشەی (حقوقی ئافرەت) کە لە لایەن کچە کوردێکی کەرکووکی ناو (پرشنگ) ئامادە کراوە، لە یەکێ لە وتارەکانی ساڵی ١٩٥٧یدا دەربارەی وەزعی ئافرەتی کورد نووسیویە دەڵێ: «. . . ئەگەر بێت و بە چاوێکی لێ وردبونەوە سەیری ئافرەتانی لای خۆمان بکەین ئەبینین وەکو ئالەتێك وان بە دەس پیاوەوە، هەر چەند پیاوەکان خۆشیان وەکو ئالەتیك وان بە دەس ڕەنج خۆرەکانیانەوە بە هەموو بارێکا هەڵیان ئەسووڕێنن، لەم کۆمەڵەی ئێمەدا پیاو ئەگەر دەستی برواو گیرفانی پر بی ئەتوانی لای خوی چەند ژن ڕاگری، وەك چوون ئەتوانی چی پیویست بی لە بازار بیکری»!. .

لە هەمان وتاردا لە بارەی ئافرەتی لادێ نشینی کوردەواری پرشنگ خان بە کەسەرەوە نووسیویە کە «ئافرەتی لادی شان بە شانی پیاوان ئیش ئەکەن و لە چاندن و گیرەکردن و شەن کردنی دەغڵ ودان و سەرپەرشتی بیستان و گەلی شتی ترا بەشدارن، ئەمە جگە لە ئیش وکاری ناو ماڵ و ئاگاداری حەیوان و بە خێوکردنی مناڵ و گەلێ جار دروست کردنی قالی و بەڕەو ڕستنی خوری و. . هتد بەڵام هیچ مافێکیان نیە، واتە تەنها لە واجب دا بەشدارن نەك لە حقوقیشا»[٢٣] . . . هەروا (هیوا) لە ژمارە (نۆ)ی دا بابەتێکی تایبەتی لە پێناوی دەرکردنی گۆڤارێکی تایبەتی بۆ ئافرەتانی کورد بڵاوکردۆتەوە.

گۆڤاری (شەفەق) کە بڕیاری کردنەوەی گۆشەیەکی تایبەتی داوە بۆ ئافرەتان، لە ژمارە (٢)ی ڕێکەوتی (١٥)ی شوباتی ١٩٥٨دا بەم چەند دێرە ڕێبازی گۆشە تایبەتی یەکەی بەیان کردووە: «ئێمە لە هیچ کاتێکا گیروگرفتەکانی کۆمەڵ و ژیانی خوێندەواری ناکەین بە دوو کەرتەوە لە بەین ژن و پیاوا، باوەڕمان ئەوەیە کە بوونی ژن و پیاو لە کۆمەڵا ڕووداوێکی خۆڕسکی یە. . لێرەدا ئافرەتی کورد، دوو باری قورسی بەسەر شانەوەیە، یەکەمیان:ـ

ئەو زانیاری یە گشتی یانەیە کە زانستی تازە دای هێناوە بۆ چاك کردنی ئەو بارە کۆمەڵایەتی یە تایبەتی یەی کە هەڵی گرتووە، ئێمەش لەم بەشەدا هەوڵ ئەدەین، بە پێی توانا، ڕیگا بۆ ئافرەتی کورد ڕووناك بکەینەوە لەم بابەتەوە. دووەمیان:ـ

پاراستنی گیانی نەتەوایەتی لە ناو کۆمەڵی ئافرەتی کوردایە

ئەبێ ڕێگا بۆ ئافرەتی کورد خۆش بکرێ بۆ ئەوەی بتوانی سوود لە عیلم و تەربیەی تازە وەربگری». .

لە دووای شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ یش بە دواوەو تاکو ئێستا بەردەوام نووسەرو ڕۆژنامەنووسە پێشکەوتنخوازەکان بایەخیان بە چارەسەرکردنی مەسەلە کۆمەڵایەتی یەکان بە گشتی و کێشەی ئازادی ئافرەتان بە تایبەتی داوە. ئەوەی بابەتەکانی ئەم ساڵانەی دوایی لە بابەتە بڵاوکراوەکانی ساڵانی زوو جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە ئێستاکە نووسەرەکانمان پتر بە شێوەیەکی زانستیانەی هاوچەرخ لە مەسەلەی ئافرەت دەدوێن و لە کۆمەڵ و باری ماددی جیا ناکەنەوە. هەروا لەم ساڵانەی دوایی دیاردەیەکی سروشتی و شارستانێتی بەدی دەکەین و دەبینین لە گەڵ پێشکەوتنی کاروانی مرۆڤایەتی و شارستانیەت؛ ئافرەتان پتر هاتوونەتە مەیدانەکان خوێندن و کارکردن و داهێنان و تێکۆشان. ئافرەتی هۆشیاری ئەم سەردەمە نەك تەنیا وەکو ئافرەتێك بەڵکو وەکو مرۆڤێکی ئاسایی لە پێناوی پاشەڕۆژێکی باشتر خەبات دەکات.

ئەنجام:

---

ئەگەرچی ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمەیش یەکەم بابەتی نووسراو نییە دەربارەی ژیانی ئافرەتی کورد، بەڵام هەوڵدانێکی ترو ڕێزلێنانێکی ترە لە دەورە گرنگ و پیرۆزەکەی ئافرەت.

دیسان لە میانەی نوسینی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا کە پشت بە چەند سەرچاوەیەکی زانستی دەبەستێت بەلمێنرایەوە کە پێویستە لە چوارچیوەی قۆناخەکانی مێژووی مرۆڤایەتی و هەر گەلێك دا لە ژیان و دەوری ئافرەت بکۆڵدرێتەوە تا بزانین لە چ سەردەمێکداو لە ژێر سێبەری چ جۆرە رژێمێکدا ئافرەتان پایەدارو سەرفرازو یەکسان ژیاون و لە چ شوێن و سەردەمێکی تردا گلۆڵەیان کەوتۆتە لێژی و زەبری چەوساندنەوە لە تەمەنی لاوی دا پشتی چەماندوونەتەوەو کارەساتیان گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە لە هەندێ شوێنی جیهانی چەوساندنەوەو دوواکەوتن دا بە سووك و سانایی کۆرپەی ساوا لەبەر ئەوەی کچ بووە زیندە بەچاڵ کراوە!!.

تاکو ئێستا جیاوازی یەکی زۆر لە نێوان ژیانی زۆربەی ئافرەتان و ژیانی پیاوان لە کۆمەڵگەی کوردەواری دا بەدی دەکرێت، بەشێکی فراوانی نیوەی کۆمەڵ کە ئافرەت لە بوارەکانی کارکردن دا دوورن و لە نێوەندی ژیانی ڕۆشنبیریشدا کەم هەست بە ئامادەبوونیان دەکرێت. بە تێکراییش تاکو ئێستا چەوساندنەوەی دوو لایەن باڵی گرانی بەسەر بەشێکی زۆری ئافرەتانی کورددا کێشاوە.

تاکو ئێستا لە کۆمەڵگەی لادێیی کوردەواری شارنشین دا بەهاو نرخی ئافرەت بە پارەو زێر دەپێورێ و بە زۆری کچ بەشوودان بە گوێرەی مامەڵەی کرین و فرۆشتن بە ئەنجام دەدرێت و ژن بە ژن و بە کەم سەیرکردنی ئافرەتی نەزۆك و ئەوانەیش کە تەنیا کچیان بووە لە لایەن کۆمەڵ و پیاوەوە باویان ماوەو پلەی شارستانێتیمان دەخەنە ڕوو!!.

کچ کەمتر ڕەوانەی بەر خوێندن دەکرێت و بەشێکی کەمی کچە قوتابی یەکانمان لە لایەن کەس وکاریانەوە ڕێگایان دەدرێ قۆناخەکانی خوێندن ببڕن و بە ئەنجامێکی چاك بگەن

جا گواستنەوەی ژیانی ئافرەتان لەم ئاستەی تیایدا دەژین بۆ پلەیەکی بەرزو گونجاوتر پێویست بە هەوڵدان و خەباتێکی سەخت و جۆراوجۆر

دەکات و هەر هەوڵدانێکیش لەم ڕێگایەدا بە کارێکی پیرۆز دانراوەو جێگای خۆی گرتووە. بەڵام تەنیا بە گۆڕانی بنەڕەتی شۆڕشگێرانەی ژیانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رامیاری کۆمەڵ (هەر کۆمەڵێك بێت) ئافرەتان بۆ یەکجاری لە چەوساندنەوەو ماف خوراوی ڕزگاریان دەبێت و ئازادو بەختیار دەژین.

**پەراوێزو سەرچاوە:**

(١) ل. سیغال، لمحة عن تطور المجتمع منذ بدء التاریخ لاپەرە (١٣)

(٢) بۆ بەراوردکـردن لە نێـوان ژیـانی ئافـرەت لەژێـر سێبەری رژیمی سوشیالستی لەگەڵ رژیمی سەرمایەداری بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، ئافرەت لەمێژوودا، بەغدا - ١٩٧١.

(٣)دوکتـۆر عەبـدولرەحمـان قاسملو، کوردستـان و کورد، وەرگێـر عەبدوڵلا حەسەن زادە، ١٩٧٣، ل١٣٠.

(٤) محـەمـەدی مەلاکـەریم، خەبـاتی شیعـری کوردی لە پێنـاوی ئازادی ئافرەتان دا، گۆڤاری (بەیان)ژ (٢٦)، ١٩٧٥.

(٥) بۆ نمـوونـە چەنـد پەنـدێکی عەرەبی دەهێنینـەوە کە دەربـارەی ئافـرەت وتـراون: «المـرأة قفـل البیت»، «المـرأة ضلع اعـوج» «بنت الـدار عورا» «المرأة درة ثمینة» «شوجابت بنت» «الزواج نصف الدین» «ضرب الحبیب زبیب» «للنساء شعر طویل وعقل قصیر»..

سەرچاوە: (نحو سوسیولوجیا للثقافة الشعبیة) نووسینی دکتور خەلیل ئەحمەد خەلیل، ل٩٦).

(٦) پەنـدی کوردی، کۆکـردنـەوەو ئامـادەکـردنی عومـەر شیخ الله عەلی، لە بڵاوکـراوەکـانی دەزگـای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨١. حجی جعفـر، پەنـدی کوردی لە ناوچـەی بادینـان دا هەروا پشتمـان بە سەرچاوەی زارەکیش بەستووە.

(٧) کاکەی فەللاح، لە پەندەکانی پیرەمێرد، ب٤، ل١٠٣.

(٨) د. ممـدوح حقي، المثـل المقـارن بین العـربیـة والانگلیـزیة، بیروت ١٩٧٣، ل١٥٢.

(٩) هەمان سەرچاوە.

(١٠) کەریم شارەزا، پەنـدی بەراوردکـاری لە نێـوانی ئینگلیـزی‌و عارەبی‌و کوردی، چاپخانەی (سمیرامیس) بەغدا ١٩٨٣

(١١) د. عیزەددین مستەفا رەسووڵ، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دووەم ١٩٧٩، ل١٤١. دوکتۆریش بۆ هێنانەوەی پەندەکان پشتی بە (پەندی پێشینان)ی محەممەدی خاڵ بەستووە.

(١٢) د. شـوکـریـە رەسـوول ئیبـراهیم، پەنـدی پێشینـان و قسەی نەستەقی کوردی، (نـاوەرۆکی فیکـری‌و ئەدەبی)، دوکتـۆر شوکـریە رەسووڵ و جەلال تەقی لە رووسی‌یەوە کردوویانە بە کوردی، ل ١٠١.

(١٣) رۆژی (٢٦ - ٢ - ١٩٨٥) ئەم زانیاری‌یە سەر ژمێری‌یانەمان بە هۆی کاك شێرزاد شێخانی پەیامنێری گۆڤاری (وعي العمال)و فەرمانبەر لە بەشی رۆشنبیری‌و راگـەیـانـدن لە یەکێتی نەقابەکانی کرێکاران لە پارێزگای هەولێر دەست کەوتوون.

(١٤) اسمـاعیـل رسـول، سەربـەستی ژن بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی‌یەوە بەندە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ ٨٦، ١٩٨١.

(١٥) د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ل: ٢٢٢.

(١٦) اسماعیل رسول، هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

(١٧) صەبـاحی غالـب، ئافـرەت لە چیـرۆکی کوردی‌دا، ل١٨، هەروا سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: (مینورسکی، کورد، وەرگێرانی حەمە سەعید حەمە کەریم).

(١٨) دیـارە ئەم بۆچـوونـەیش کە مینـورسکی دەربـارەی ژنی کورد تۆمـاری کردووە، هەر لە مەوە هاتـووە کە ئافـرەتی کورد گەلێـك ئەرکی لەسـەر شان بووەو هەمیشـە مانـدوو چەوسـاوە بووە، بۆیـە پیـاو (تـا رادەیـەك نرخی لەم ماندووبوونەی ژن ناوەو رێزی لێ ناوەو هەندێ بە هێمنی‌و لەسەرخۆ رەفتاری لەگەڵدا کردووە).

بەڵام بۆ مەسەلەی ناوبانگ دەرکردنی هەندێ کەس بە ناوی دایکیانەوە، پتـر بۆ کوری بێـوەژنـەکـان دەگـەڕێتـەوە، چونکە هەندێك لەم ئافرەتانە دوای نەمانی مێردەکانیان سەربەرزانە چوونەتە مەیدانی کارو کاسبی‌و تێکۆشانەوەو منداڵەکانیان پێ گەیاندووەو بە دەور بینینی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌یەوە چوونەتە ریزی پیاوان.

(١٩) غەفووری میرزا کەریم، کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی، ل٦٤.

(٢٠) گۆڤاری (زاری کرمانجی) رەواندوز، ژمارە (٨) سالی (یەك) ٢٠ی شوباتی ١٩٢٧.

(٢١) کەرکوك: کچە کورد. پرشنگ، گۆڤاری هیوا، ژمارە (٥) ساڵی (١) ت٢ ١٩٥٧.

# نظرة الى المرأة الكردية

مغديد حاجى

يتناول البحث نبذة مختصرة عن وضع المرأة الاجتماعي والاقتصادي والثقافي عبر مراحل التأريخ بشكل عام ومن ثم وضع المرأة الكردية بشكل خاص فبعد عرض واقع المرأة الكردية التي تعرضت بدورها الى الاستغلال والاضطهاد نتيجة للعلاقات السائدة في المجتمع الاقطاعي وشبه الاقطاعي، يتطرق الى وضع المرأة في التراث الأدبي الشعبي كالامثال والحكم فهناك أمثال تُعبّر عن مفاهيم المجتمع السلبية تجاه المرأة وهناك أمثال تؤكد دور المرأة الفعّال وأهميتها في الاسرة والمجتمع بل وفيها نظرة تقدير وإعجاب إليها ومن هذه الامثال (الخارج من العرين أسداً كان او لبوة)او «المرأة قلعة» وهناك أمثال تعكس دورها في الاسرة وعلاقتها مع الزوج والاولاد باعجاب. ويستشهد بآراء بعض المستشرقين عن وضع المرأة الكردية ومنهم (مينورسكى) وهم يقارنون حالها مع حال النسوة لدى شعوب الشرق. ويتناول البحث بعد ذلك الوضع الاقتصادي والاجتماعي للمرأة. فيذكر الاعمال التي تقوم بها المرأة في الريف والحضر. ويشير الى ازدياد الايدي العاملة النسوية في المدن بعد سنين الخمسينات والى ازدياد وعيها الاجتماعي والثقافي ايضاً. ويبحث بعد ذلك دور الشعراء والمثقفين الذين وقفو الى جانب الدفاع عن حقوق المرأة ورفعوا شعار تحريرها ومنهم الحاج قادر الكويى من القرن التاسع عشر.و الملا محمد الكويى.

و(بي كهس) و(پيرهميرد)و (أمين زكي) الذي كان لقصائدهم ومقالاتهم الدور الكبير في توعية أذهان الشعب في سبيل المساواة وحقوق المرأة في كوردستان. اما دور الصحافة في هذا المجال فدور مشهود فنشرت منذ الربع الاول من القرن العشرين. مقالات تفضح العادات والتقاليد البالية التي تعيق تقدم المجتمع وكانت تدعو الى تعليم المرأة ودخولها الى ميدان العمل ومنها صحيفة (ژيان) و(زارى كرمانجى) وگلاويَژ وهيوا وشفق وغيرها. اما في السنوات الاخيرة فنرى ظاهرة طبيعية وحضارية اذ نجد المرأة قد دخلت اكثر فاكثر ميادين التعليم والعمل والابداع والكفاح وأصبحت المرأة الواعية العصرية انسانة تناضل من أجل المستقبل الافضل للوطن. ويستخلص في ختام البحث بان هناك فرقاً كبيراً بين حياة الكثرة الغالية من النساء وحياة الرجال في المجتمع الكردي ولازال قسم كبير من النساء بعيدين عن مجالات العمل وحضورهم في الميدان الثقافي حضور واهى، ولازالت العادات والتقاليد الاجتماعية التي تعكس مفاهيم اضطهاد المرأة وتحملها الاستغلال المزدوج باقية بين اهل الريف. وإن تطور وضع المرأة يتطلب نضالاً شاقاً متعدد الجوانب وإن تغير القاعدة الثورية للحياة الاقتصادية والاجتماعية والسياسية لأي مجتمع يحرر المرأة من الاضطهاد والحرمان..

# وەرزانەی رۆشنبیری

**چالاکی دەزگاکەمان لە بەغدا:**

**دەزگـای رۆشنبـیری و بلاوکـردنـەوەی کوردی بە چاودێری ماموستا مصلح جەلالی بەڕێوەبەری گشتی، لە یادی ئەم بۆنە پیرۆزانەدا لە بارەگاکەی خوی‌دا ئاهەنگی گێراوە.**

**١ ـ یادی دامەزراندنی حزبی بەعـسی عەرەبی سوشیالستی لە ٧ی نیسان دا.**

**٢ ـ ئاهەنگ گێران بەبۆنەی جەژنی ئافرەتانی عیراق و جیهان لە ٨ی ئادار.**

**٣ ـ یادی رۆژنامەنووسی کوردی لە ٢٢ی نیسان دا.**

**٤ ـ یادی لە دایك بوونی سەرەکی فەرماندە صدام حسین لە ٢٨ی نیسان دا.**

**هەروەهـا ئاهـەنگی میـوانداری و پیرۆزبایی تیپی مۆسیقای پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی لە ١٩/٤دا.**

**لەم کۆڕ و ئا هەنگانەش دا ماموستا مصلح جەلالی بەعەرەبی و بە کوردی وتـاری سەرزاریـی پێش کەش کردووەو هەنـدێ خەلاتیشی بە فەرمانبەرانی دەزگاکە دا.**

---

**یادی ئادار لە دهوکێ.**

لە یادی جەژنی ئاداردا لە ٣/١٨ شاعیران: پیزان ئالیخانی، صدیق شرو، غنیـة پطـرس، کامیـران هروری، هاریـوان اسماعیل، صدیق هروری، عبـدالرحمن بامـەرنی، کامیران بەرواری، مسعود بۆتانی، کریم بالەتە، خالد نجم، کوڤان شعبان.. لە میهرەجانەکی رازاوەدا سەرو پارچە هەڵبەستێك خوێندەوە.

**لە یادی محمد مولود ـ مەم ـ دا**

رو‌ژی ٢٣و ٢٤/٤ لقی دەزگای روشنبیری لە هەولێر دیدارێکی رێك خست کە کۆمەڵێ نووسەر لە مەمی چیرۆك نووس دوان و تیپی هونەری هەولێریش (پایزەخەون)ی بە شانۆ پێشان دا کە حەمە علی هونەرمەند دەری هێنابوو.

**لە رۆژی رۆژنامە نووسیی کوردی‌دا**

دەزگـاکـەمـان رۆژی ٤/٢٠ یادی نەوەد ساڵـەی رۆژنـامـە نووسـی بە ئاهـەنگێکی جوان کردەوە کە بەرێـز مامـوستـا مصلح جلالی وتاریکی گشتی باس کرد دوای ئەو ماموستایان مصطفی نەریمان و عبدالرزاق ومحمد البدري سەرو وتاریان خوێندەوە.

**یادی محمد توفیق وردی**

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی لە یادی ماموستا وردی‌دا لە رۆژی ٣/٣١ دا لە هەولێر کۆڕێکی لێکۆڵینەوەو بیرەوەری و رێزلێ‌نانی رێك خست، لەم کۆڕەدا ماموستایان: عمر ابراهیم عزیز، مصطفی نەریمـان، عبـدالرزاق بیمـار، کریم زەنـد، کەریم شارەزا، طارق جامبـارز، حەمـەبـۆر، مدحت بێخـەو، أحمـد تاقـانـە لێکـۆڵینەوەیان پێش کەش کرد.

**یەکەم دیداری‌شیعری نوێی کوردی**

ئەمینـداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان دیـداری یەکـەمی شیعری نوێـی کوردی لە هەولـێـر لە ٢٧ ـ ٢٨ی ئادار رێـك خسـت، لەم دیدارەدا ئەم ماموستایانە باس و لێکۆڵینەوەیان پێشکەش کرد: ئومێد ئاشنا، احمد سالار، کمال غەمبار، کریم شارەزا، عبدالله عباس، محسن قوچان، ئازاد عبدالواحد، بەهات قەرەداغی.

# بریارێك

# لە دەستەی نووسەرانەوە

**دەستـەی نووسـەرانی رۆشنبیری نوێ لە کۆبوونەوەی دواجاری‌دا بریاری‌دا:**

**باس و لێکـۆڵینـەوەی وەرگێـردراو لەزمـانـانەوە بلاو نەکـاتـەوە و باسـەکانیش نابێ زۆر درێژبن، بەوهیوایە هەر یەکەی لە سنووری چوار هەزار وشە دابێ.**

## لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی تیشکی لیزەر

لە زانکـۆی صلاح الـدین دکتـۆر شلیمـون برواریو دکتـۆر سەرتیپ کاکەیی سەرپەرشتی ئەو لێکۆڵینەوانە دەکەن کە سەبارەت بە دەوری تیشکی لیزەرە لە چاك کردنەوە و ساڕێژکردنی برینی لەش. واشیان دەرخستووە کە تیشکی لیزەر لە ڕێگای کەڵەکەبوونەوە کاردەکاتە سەر ئەو برینـانـەی خەریکی ساڕێـژ بـوونن و لیزەر زۆر بەکارە لە مەسەلەی دابەش بوونی شانەکان و ئەو سروشتانەی هەیانە

### نامەی ماجستێر

ڕوژی ١٨ / ٤ لە نامـەی ماجستێـری قوتـابی صلاح ابـراهیم عبـدالقـادر نەقشـەبـەنـدی کۆڵـرایـەوە کە د. عبـدالستار طاهر شەریف سەرپەرشتی بوو، نامەکەش بەناونیشانی (کۆمەڵی کوردەواری لەکوردستانی ئێران دا) بوو کە لە زانکۆی مـستنصریة وەرگیرابوو پەسندکرا.

# هونەرە جوانەکان

### شانۆ:

**هەڵۆ بەرز دەفڕێ**

**بە چاودێـریی دەزگـای ڕۆشنبیـریو بڵاوکـردنـەوەی کوردی، تیپی (سالار) لە بەغدا لە ڕۆژانی ١٥ و١٦ و١٧/٢/١٩٨٨ دا شانۆگەریی (هەڵۆ بەرز دەفڕێ)ی پێشکەش کرد.**

**ئەمیکلا**

**- لە ڕۆژی ٣/١٠ دا بە بۆنـەی ڕۆژی ڕۆشنبیـریی کوردییـەوە بە چاودێـری دەزگـاکـەمان، تیپی شۆڕشڤان شانۆگەریی «ئەمیکلا»ی لە بەغدا پێشکەش کرد.**

**خۆناسەکان**

**تیپی شانـۆی زانکـۆی صلاح الـدین شانـۆگەریی «خۆناسەکان»ی لە ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٠ دا لە هەولێر پێش کەش کرد. نووسینی محمد رشید فتاح ودەرهێنانی ئاسایش عثمان.**

**محمد عارفی جزیری**

لە ٣/٢٣ ڕوشنبیریی جەماوەر لە دهۆکێ لە قەزای سێمیل کۆڕێکی ڕێـك خست نزار محمـد سعیـد باسێکی دەربـارەی محمـد عارفی پێشکەش کردو کۆڕەکەش بە بۆنەی جەژنی ئادارو نەوروزەوە بوو.

## دووەم میهرەجانی شانۆیی کوردی

لە ڕۆژی ٤/١ - ٤/٨ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلیمانی لە حەوت ڕۆژ دا ئەم شانۆگەریانەی خوارەوەی پێشکەش کرد:

١ - ڕاپەرە ئەی گەلی فەلەستین، دەرهێنانی خاتوو بەدیعە دارتاش

٢ - گالیسکەی لێ خوڕ، ئامادەکردن و دەرهێنانی سەرکەوت مجید

٣ - کاتێ هەڵۆ بەرز ئەفڕێ، نووسین و دەرهێنانی احمد سالار.

٤ - ڕێگا، نووسینی چیخوف، دەرهێنانی دانا علي سعید.

٥ - گۆرانیی چایکا، نووسینی چیخوف، دەرهێنانی سیروان بەرقی.

٦ - کلیلی مێژوو، نووسینی کامران رفیق، دەرهێنانی کاوە جوتیار.

٧ - باخچەی ئاژەڵان، نووسینی ئەدوار ئەلبی، دەرهێنانی دانا رؤوف.

٨ - گوڵـەکـان بۆ کێ؟ نووسینی محي الـدین زەنگنـە، دەرهێنـانی ئەرسەلان أحمد درویش.

٩ - سێتای ئاسن، نووسینی ئوکونور، دەرهێنانی جهاد دلپاك.

١٠ - گەلە گورگ، نووسینی حسین عارف، ئامادەکردن و دەرهێنانی شفیق محمد.

١١ - وانەیەك لە بێ کەسەوە، تیپی چەمچەمال، دەرهێنانی ابراهیم مولود

١٢ - پارچەیەك دراو، نووسینی فرحان بلبل، دەرهێنانی جبار ابراهیم.

١٣ - گەر فەلەستینی بویتایە چیت دەکرد، نووسینی ممدوح عدوان، دەرهێنانی عصمان فارس

١٤ - کارەسات نووسینی پیکیت، دەرهێنانی وەلید معروف جارۆ

١٥ - مەم و زین، بنووسینی طلعت سامان، دەرهێنانی فەرهاد شەریف

١٦ - ڕێبازەکان، تیپی یەکێتی قوتابیان و لاوان.

### ڤیستڤالی شانۆ لە هەولێر

لە ڕۆژی ٣/٢٧ ەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ کۆمـەڵـەی هونـەرە جوانـەکـانی کورد لە هەولێـر بەرنـامـەیـەکی هونـەریی بەم جۆرەی پێشکەش کرد:

١ - وتاریك لەلایەن مەغدید حاجیەوە.

٢ - شانـۆگـەریی (ئـەو پیـاوەی کە مەرگ لێی ئەسڵەمێتـەوە) نووسینی ابراهیم البصري ودەرهێنانی زرار محمد مصطفی.

٣ - وتـارێـك بەنـاوی (دراماو ئەزمـونـەکـانی ڕشتەی دراما) لە لایەن مامۆستا محمد تیمورەوە.

٤ - شانۆگەریی میوان - دەرهێنانی ئازاد مولود.

## گۆرانیی چایکا له بەغدا

له ١٧ تا ٤/٢٠ هونەرمەند کامران رؤوف له هۆڵی گەل له بەغدا شانۆگەریی یەکتەنیی گۆرانیی چایکای پێشکەش کرد که چیخوف نووسیویەتی سیروان بەرقی سالار دەریهێنابوو.
شانۆیی(نامو) که پشتیوان عبدالله نووسیبوی‌و دەریهێنابوو له ١/٣ له لایەن لقی دەزگاکەمانەوه له هەولێر پێشکەش کرا.

## گۆرانی‌و مۆسیقا

١ ـ له ٣/١٥ دا کۆمەڵەی هونەره جوانەکانی کورد له هەولێر ئاهەنگیکی مۆسیقاو گۆرانیی رێک خست. ، لەم ئاهەنگە دا ئۆرکسترای هەولێر به سەرپەرشتی تەلعەت حویزو تیپی ئۆرکسترای پاشای گەورەی رەواندز بەش دار بو

## تیپی مۆسیقای هونەره جوانەکانی سلێمانی له بەغدا

له ١٧ ەوه تا ٤/٢٠، دەزگای روشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی میوانداریی تیپی موسیقای پەیمانگای هونەره جوانەکانی سلێمانی کرد بۆ پێشکەش کردنی چەند پارچە مۆسیقاو گۆرانیی کورد له هۆڵی «الشعب»دا له بەغدا. تیپەکه چەند پارچه مۆسیقاو گۆرانیی کۆراڵی تەعبیر دەری جوانی پێشکەش کرد کەوا مامۆستایان ئەنوەر قەرەداغی‌و سەلاح رؤوف و غەمگین فەرەج دایان نابوو.

## پێشانگای هونەری تەشکیلی:

لەم وەرزە دا پیشانگای ئەم هونەرمەندانه پێش کەش کراوه:
١ ـ ئازاد شەوقی له هۆڵی رەواق ـ بەغدا له ١٩٨٨/١/٣دا
٢ ـ حسام حەکیم، نورالدین ابراهیم ـ له هۆڵی میدیا له هەولێر
٣ ـ حسین عبدالله، محمد مولود، دارا محمد علی ـ لەهەولێر له ١٩٨٨/١/١٠ دا
٤ ـ فؤاد کریم رسول ـ له هۆڵی رۆشنبیری ولاوان ـ هەولێر له ١٩٨٨/٢/١٥
٥ ـ حیکمەت هیندی ـ له هۆڵی گەل له سلێمانی ـ بەرابەریی کۆمەڵەی هونەره جوانەکانی کورد.
٦ ـ وفیق زامدار، سیروان قادر، سەردار أحمد، صالح بەکر، له رۆژانی ٢٦ تا ٢٩ی مانگی ئادار ـ له هۆڵی پەیمانگەی ئالای تەندروستی له هەولێر.
٧ ـ کمال علی وخەسرەو محمد له نەقابەی هونەرمەندانی سلێمانی له هەفتەی یەکەمی نیسان دا.
٨ ـ عەلی جوڵا له گالەریی سلێمانی
٩ ـ أحمد نوح له ٣/٢٣ له زاخۆ.
١٠ ـ نوزاد محمد علی، سەربەست عمر، هەڵمەت سمکۆ له رۆژانی ٧ ـ ٢/٩ له شاری کۆیه.
١١ ـ علی لطیف، له دوای حەفتەی یەکەمی مانگی شوبات دا لەگالەریی سلێمانی
١٢ ـ عدنان وهاب لەهۆڵی ئەمینداریتی گشتی روشنبیری‌و لاوانی هەولێر
١٣ ـ نامق علی قادر، له هۆڵی میدیا له هەولێر.

## پیشانگای وێنەی فۆتۆگرافی:

١ ـ نەوزاد شیر دل، پیشانگایەکی وێنەکانی شێخ مەحموودی، گەورەی له هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی بۆ ماوەی هەفتەیەك رێك خست.
٢ ـ دووەم پێشانگای فولکلور له ١٢ ـ ٣/١٤ له هەولێر لەلایەن عمر ابراهیم عزیزەوه له زانکۆی صلاح الدین رێك خرا.

## پیشانگای کتێب:

دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی لەم شوێنانەدا پیشانگای کتێبی کردوەتەوەو بۆ کڕیاران به ڕادەیەکی باش لەنرخ داشکاندنی بڕیارداوه:
١ ـ له ١/٧ له دهۆك بەبۆنەی رۆژی سوپاوه.
٢ ـ له ١/٩ له سلێمانی، بەبۆنەی رۆژی سوپاوه.
٣ ـ ل ٣/١٥ له پیشانگای گشتی دەوڵەتانی بەغدا.
٤ ـ پیشانگای کتێبەکانی قوتابخانه له لایەن بەریوەبەرێتی پەروەردەی سلێمانی‌بەوه له سەرەتای مانگی نیسان دا.
٥ ـ له ٤/٩ له دهۆك.

## کۆرێك دەربارەی بیری سەرۆکی بەرێز سەبارەت به گەلی کوردو حوکمی زاتی

**به چاودێریی مامۆستا سیروان جاف سەرۆکی ئەنجومەنی**

تەنفیـذی حوکمی زاتیی کوردستـان، ئەمینـداریتی رۆشنبیریو لاوان بە هاوکاری لەگەڵ یەکێتی ئەدیبان و نووسەرانی کورد لە ٣/١٢ دا کۆرێکی لێکۆڵینەوەی فراوانی لە هەولێر رێك خست کە ژمـارەیـەکی زۆر نووسـەرو رۆشنبیـرو سیاسـەتکـارانی کوردتیی‌دا بەشداربوون کۆمەڵێك باس و لێکۆڵینەوە دەربارەی حوکمی زاتیو بیروڕای سەرۆکی بەرێز هەڤاڵی تێکۆشەر صدام حسین خوابپیاریزیت سەبارەت بە کوردو دوا رۆژی کورد لە عیراقی سەر بەرزو گەشەدار دا پێشکەش کرا.. کۆڕەکە دوو رۆژی خایاند

## کۆری ئەدەبیو رۆشنبیری:

- چلەی ماتەمینی شاعیری کۆچ کردوو میرزا محمد أمین مەنگوری لەلایـەن دەزگـای رۆشنبیـریو بڵاوکـردنـەوەی کوردی لە سـلیمانی‌یەوە رۆژی ٢/٢٢ گیرا.
- رۆژی ٢/٢٥ کۆرێکی شیعر خوێندنەوەی شاعیران: نافع ئاکرەیی، سەعـدولـلا پەروش، فەریـد زامـدار، محمـد امین پێنجوینی، عەبدولکەریم دەشتی، نەوزاد رەفعەت لە سلێمانی لەلایەن رۆشنبیری جەماوەرەوە ساز کرا.
- لە ٢/١٣ دا لە هەڵـەبجـە کۆرێکی شیعـر خوێنـدنـەوە بۆ جەلال عازەبانیو جەمال مۆردینی گیرا
- هەر لەم مانگـەدا لە هەڵـەبجـە نووسـەری لاو توفیق رەحیم بە ناونیشانی «سەرەتایەکی کورتی قوتابخانە ئەدەبی‌یەکان» باسێکی خوێندەوە.
- لە سلێمـانی لە ٨٨/٢/٩ کاوە جوتیـار بە ناونیشـانی (چـۆنیـەتی راکێشانی جەماوەر بۆ شانۆ) وتارێکی خوێندەوە، هەروەها رفیق فایق چیرۆکی (عارەق)ی خوێندەوە
- لە ٢/١١ لە دهۆك: کریم جمیل بیانی، بایز عمر أحمد، صبیح محمد حسن، جلال مصطفی سەرو چیرۆکیان خوێندەوە. هەروەها نزار محمد سعید بە ناونیشانی (کەس دە کورتە چیرۆکدا) باسێکی خوێندەوە، ئەم کۆڕەش دەزگاکەمان سازی کردبوو
- لە ٢/١٨ لە دهـۆك، صدیـق شرۆ بە ناونیشـانی (تـۆرو مرۆڤ) کۆرێکی گێرا کە لەلایەن روشنبیریی جەماوەرەوە سازکرابوو
- لە ٣/٣ لە دهـۆك، جلال مصطفی بە ناونیشـانی (حـەیـرانـۆك و پێداچوونەوەیەك) کۆرێکی پێش کەش کرد.
- لە ٢/١٨ لە هەولێر، محمدی ملا مصطفی لەسەر صافی هیرانی باسێکی پێشکەش کرد.
- لە ٢٧ و ٣/٢٨ لە دیـداری یەکـەمی شیـعـری نوێی کوردی دا لە هەولێـر ئەم شاعیـرانـە شیعـریان خوێندەوە: پیربال محمود، لویلان، خالد حسێن، فەریدون بەرزنجی، محمد عمر عثمان، عبدالخالق سەرسام.
- لە ٣/٢٤ لە رانیە، هەمزە گولانی، خالید فاتی، عوسمان توفیق، سەردار راوچی، محمـد رەنجـاو، عمـر نوورە دینی، حمـەئەحمـد جاف، کمال کەریم، تەنیا ئاکو لە کۆرێك دا شیعریان خوێندەوە.
- لە ١/٩ بەبـۆنـەی رۆژی سوپـاوە لقی دەزگـاکـەمـان لە سلێمـانی دەربارەی دامەزراندنی سوپاوە باسێك پێش کەش کرا.
- لە ١/٨، لەرانیـە حەکیم عەزیـز لە بابـەت (گـەنـج خەلیـل و حەفسـەخـان)و تارێکی خوێنـدەوە لە کۆرێـك دا لەلایـەن لقی دەزگاکەمانە وەساز کرابوو.
- لە ١/٨ لە هەڵـەبجـە لقی دەزگـاکـەمـان کۆرێکی بۆ محمـد فریق حسن سازکرد، لەم کۆرەدا سێ چیرۆکی خوێندەوە.
- رۆژی ١/٣ شاعیرانی لاو عمر فارس، مەهاباد قەرەداغی وفاتیح سەلام لە هەولێر میوانی دەزگاکەمان بوون بۆ شیعر خوێندنەوە.
- لقی دەزگـاکـەمـان لە هەولێـر لەسـەرەتـای شوبـاتـا دەربـارەی مێژووکۆرێکی بۆ أنور حامد بەست.
- لە ٢/٤ دا چوار شاعیری لاو: عرفان احمد، طارق فقێ، سۆران عثمـان، ئاوات أحمـد لە لایـەن لقی دەزگـاکـەمـان لە سلێمـانی‌یەوە کۆرێکی شیعر خوێندنەوەیان بۆ ساز کرا.

## - رۆژی شەهیدان -

- دەزگاکەمان بەم بۆنەیەوە کۆری شیعر خوێندنەوەی لە قەزای ئاکرێ ساز کرد.
- لە بارەگای دەزگاکەمان دا یادی ئەم رۆژە کرایەوە.
- ئەمینـداریتی روشنبیـریو لاوان کۆرێکی بەم بۆنـەیـەوە ساز کرد ئەم شاعیرانە شیعریان تێدا خوێندەوە: حسن تەنیا، ساجد ئاوارە، تیلی ئەمین، هیڤی بروارى، أحمـد رەزا، اسمـاعیـل گەیـلانی، مەغـدید سۆران، محسن قوچـان، عبـدالله شارباژیری، عبدالعزیز خەیات، محمد صالح و حاجی عبدالله.
- لقی دەزگاکەمان لە هەولێر کۆرێکی بۆ ماموستا خسرو جاف ساز کرد دەربـارەی هونـەری ئاواکـاری. هەروەهـا لە ١٧و ١٨ی نیسـانیش دا کۆرێکی چیروك خوێندنەوەی بۆ برایان عبدالله جندی، عبدالکریم حسن اسماعیل فرج ساز کرد.

